# مانیفستۆی شارستانێتی دیموکراتی

عەبدوڵڵا ئۆج ئالان

و: لوقمان عەبدوڵڵا

٢

## شارستانی سەرمایەداری





## مۆدێرنیتەی دیموکراتی و
## کێشەکانی تێپەڕاندنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری

نووسینی: **عەبدوڵلا ئۆج ئالان**
وەرگێڕان: **لوقمان عەبدوڵلا**
بابەت: **فکری فەلسەفی (بەرگرینامە)**

چاپ: **چاپی یەکەم**
تیراژ: **٣٠٠٠ دانە**
نرخ : ٣٥٠٠
چاپخانە: **رەنج**

**لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی**
**( ٢٢٥٣ ) ی ساڵی ( ٢٠٠٩ ) ی پێدراوە**

پەرتووکی دووەم

# شارستانی سەرمایەداری

## - سەردەمی خوداوەندە بێدەمامک و پادشا رووتەکان -

ن: عەبدوللا ئۆجەلان
و: لوقمان عەبدوللا

## ناوەڕۆک

## پێشەکی

کاتێک بەرامبەر بە سیستەمی سەرمایەداری بەرگری لەخۆم دەکەم، یەکێک لەو کارە لەپێشانەی پێویستە ئەنجامی بدەم رزگاربوونە لە فۆرمی زهنی سەرمایەداری. هەروەکو چۆن لە ئایینی ئیسلامدا لە سەرەتای هەر کارێک بە ناوی خودا (بسم الله) دەست پێدەکرێت، سەرمایەداریش پیرۆزی هاوشێوەی هەیە. مادام خوازیارین لێی رزگاربین، لە حاڵەتێکی وەهادا بەر لە هەموو شتێک پێویستە نزای سەرمایەداری رەت بکەینەوە. لە سەرووی ئەمانەشەوە "پیرۆزی زانست" دێت کە لەزهنی مرۆڤدا جێگیری کردووە. ئەوەی باس دەکرێت "ئەخلاقی ئازادی" و رەوشتەکەی نییە کە بە پالاوتکەی ژیانی کۆمەڵگادا تێپەڕیوە و تا کۆمەڵگای مرۆڤ بوونی هەبێت بەبێ ئەو نابێت. بەپێچەوانەوە پێشکەوتووترین زهنییەتی ژیانی کۆیلەداری کە لەسەربنەمای نکۆڵیکردن، ئەخلاقی ئازادی بێواتا کردووە و رێگای لەپێش پەرتەوازەبوون و خراپبوونی کردۆتەوە: کلتوورە ماددی و مەعنەوییە خوڵقێنەرەکەیەتی.

لە کاتێکدا هەوڵی رزگاربوون لەم رەوشە دەدەم، خاڵی دەستپێکردنی لە خۆم بەولاوە نابێت کەسی دیکە بێت. دیکارت لە رێگای فەلسەفەکەیەوە

و بەبێ ئەوەی ئاگاداربێت زەمینەی بۆ سەرمایەداری رەخساند، گومانی لەهەمووشتێک کرد، هەرە دوایی تەنیا خۆی مایەوە. ئایا دەبوو گومان لەخۆشی بکات؟ لەمەش گرنگتر، چۆن کەوتە ناو ئەم رەوشەوە؟ ئاگادارین کە چەند قۆناخێک لە مێژوودا هەیە لە رەوشی دیکارت دەچێت: ئافراندنی خوداوەند لەلایەن راهیبەکانی سۆمەر، گومانە قووڵەکانی حەزرەتی ئیبراهیم سەبارەت بە ئیلاهیبوون (دوا نموونەکەی ماجەرای حەزرەتی محەمەدە) و سەپیتیزم (گومانکردن)ی ئیۆنیا یەکەمین نموونەن کە بەبیری مرۆڤدا دێن. ئەو زهنییەتانەی لەم پرۆسە مێژووییانەدا دەگیرێنەبەر پێویستییان بە رەتکردنەوەی ئەوانەی پێشوو هەیە و خەسڵەتێکی بەمجۆرەیان هەیە کە لەبواری شێوە و شێوازدا کۆمەڵگا دووچاری گۆڕانکاری بنەڕەتی دەکەن. بەلانی کەم پارادیگمای بنەڕەتی فەراهەم دەکەن. ناتەواوی زهنییەتێکی بنچینەیی (دەشێت بە پێکهاتەی ئایدیۆلۆژیش بەناوبکرێت) بەرامبەر بەشێوازێکی تازە چەکەرەکردووی ژیان هۆکاری سەرەکی گومانکردنە. هەرچی ئەو قاڵبانەن کە بۆ ژیانی نوێ پێویستە، قەڵەمباز و وەرچەرخانێکی ریشەیی و قورسی کەسایەتییان دەوێت. چ قەڵەمبازی پێغەمبەرایەتی، یان قۆناخی فەیلەسوفی یاخود دۆزینەوەی زانستی پێبکوترێت، لە بنەڕەتدا لە وەلامی هەمان پێداویستی دەگەڕێن. ئەمەش ئەوەیە "**چۆن قاڵبی زهنییەتی نوێ بناخەڕێژ بکرێت کە ژیانی کۆمەلایەتی نوێ بەبێ ئەو نابێت؟**" هەبوونی گومانگەرایەکی مەترسیدار خەسڵەتی ئەم قۆناخەی ناوینە.لەو شوێنەی (نزیک بە هۆڵەندای رۆژگاری ئەمڕۆمان) لە سەدەی شازدەهەمدا بووە لانکەی هەڵکشانی هەمیشەیی سەرمایەداری،

ژیانی سەرسورهێنەرانەی دیکارت[١]، سپینۆزا[٢] و ئاراسمۆس[٣] ئاسەواری قۆناخێکی مێژوویی بەمجۆرە لەخۆوە دەگرن.

مێژووی لە دایکبوونم رێکەوتی سالانی ١٩٥٠کانە. سالانێکە کە سەرمایەداری لە هەلمەتی جیهانگیریدا گەیشتبووە لووتکە. شوێنەکەشم بەپیتترین خاکەکانی میزۆپۆتامیای سەرووی هیلالی زێرینی بەناوبانگە، کە زنجیرە شاخەکانی زاگرۆس ـ تۆرۆس دەورەی داوە و بۆماوەیەکی درێژخایەن یەکەمینەکانی شارستانی شار و چاخی نیولیتیک (شۆڕشی گوند وکشتوکال) تێیدا ژیاوە کە تا ئێستاش بەشێوەیەکی ریشەیی قالبە زهنییەکانی ماوە. بناری ئەم چیایانە کە فاکتەری قەلەمبازی شارستانێن گۆرەپانی سەرەکی پێشکەشکردنی قوربانییە شکۆدارەکانی سەردەمی پەرینەوەیە بۆ چاخی نیولیتیک (باوەڕی ئەو پەرستگایانەی کە هەرچوار لای بە بەردی گەورەی ستوونی دەورە دراوە و نموونەکەی لە نزیک ئورفا دۆزراوەتەوە و بۆ دوانزدە هەزار سال پێش ئێستا دەگەڕێتەوە).

لەکاتێکدا دەلێین: "**بەشێوەیەکی زۆر سەختتر لەوەی کە زیۆس پرۆمیتۆسی لەبەردەکانی قەفقاسیا بەستەوە مەحکومکردنم لە دوورگەی ئیمرالی لەلایەن زێرەڤانەکانی سیستەمی سەرمایەدارییەوە، هەلوەشانی سیستەم بەدەستی رکابەرەکەی دەکاتە ناچارییەک**" بەو واتایە دێت

---

١ ـ دیکارت زاناو فەیلەسوف و مامۆستایەکی بیرکارییە، لەسالی ١٥٩٦ دا لە فەرەنسا لەدایک بووە ولە سالی ١٦٥٠دا لە هۆلەندا کۆچی دوایی کردووە. دوای گەڕان و شەڕ و ماجەرایەکی پازدە سالی سیستەمێکی فەلسەفی دروستکرد کە هزری رۆژئاوای سەراوژێر کرد. تاکە شتێک کە دلنیا بووە لە بوونی "هزر" بووە. گەردوونی بەپێی "بیردەکەمەوە کەواتە من هەم" لێکدایەوە. بەرهەمەکانی: دووانی لەسەر میتۆد: چەند رێسایەکی پەیرەوی ئەقلی، بنەماکانی فەلسە، هزرە میتافیزکییەکان، خولیاکانی رۆح: شتێکی رەها بوونی هەیە.

٢ـ بارۆج سپینۆزا یەکێکە لە فەیلەسوفە راسیۆنالەکانی سەدەی حەڤدەهەم لە ١٦٣٢ دا لە هۆلەندا لەدایک بووە و لە سالی ١٦٧٧دا کۆچی دوایی کردووە. گەورەتر لای سپینۆزا کێشەی سەرەکی فەلسەکەی بووە و لەم روانگەیەوە کێشەی بوونی لێکداوەتەوە. پێی وابووە جەستە و رۆح هیچیان بەسەر ئەوی تریاندا زال نییە، بەلکو هەردووکیان بەشێوەیەکی هاوتەریب پێکەوە بەڕێوەدەچن، دژبەری هۆکارگەرایی مەبەستدار بووە. لێرەوە سروشتێکی پاراوی خستۆتە جێی خودایەکی ناکۆتا. بەمجۆرە لەجێی ئەو مرۆڤەی دروستکراوی دەستی خودایە و رۆح بەڕێوەی دەبات، سروشتێکی هەمەڕەنگی بێ مەبەست دادەنێت. لەم روانگەیەوە لەسێ رێنەی وەک تێگەیشتن و ئازادی و سەرابی زانستیانەی خودادا خەلەتێنەری مرۆڤ لەچوارچێوەی مەبەستدارییدا دەنەخشێنێت. هەروەها لە لێکۆلینەوەکانیدا لەجیاتی شێوازی بیرکاریانە، شێوازی ئەندازەیی گرتۆتە بەر. بەرهەمەکانی ئەتیکا، خودا: تیۆلۆژی ـ سیاسەت، لێکۆلینەوەی بەشی یەکەم و دووەمی پەرتووکی پرەنسیپەکانی فەلسەفەی دیکارت بەشێوازێکی ئەندازەییانە.

٣ـ دیبێر ئاراسمۆس: هۆلەندییە لەنێوان سالانی ١٤٦٩ـ ١٥٣٦دا ژیاوە. تیۆلۆگ و لێکۆلەرەوەی ئەدەب و بیرمەندێکی هیومانیستیە و بەیەکێک لە پێشەنگەکانی رێنسانسی ئەورووپای باکوور دەژمێردرێت. دەقی یۆنانی عەهدی جەدیدی بلاوکردۆتەوە؛ لەو بڕوایەدابووە کە زۆربوونی باوەڕییەکان ناوەڕۆکی پەتی مەسیحیەتی راستەقینەی شاردۆتەوە.

تا سەرلەنوێ ئەم راستیە مێژووییانە بەبیرەخۆمان نەهێنینەوە و شینەکەینەوە، دەرک بە واتا ناکەین. خۆگیرۆدەکردنم بە کۆماری تورکیاوە، جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئەو (گا)یە ئیسپانیانەی تایبەت بە زۆرانبازی نابێت کە هێرش دەکاتە سەر پەڕۆیەکی سوور. بێگومان کۆماری تورکیا کراوە بەو زۆرانبازەی پەڕۆ سوورەکە بۆ گاکە دەگرێت. رۆڵێکی بەمجۆرەی پێدراوە. خوازیارن بەشێوەیەکی هەمیشەیی و لێهاتوانە ئەم رۆڵە ببینێت. بەڵام ئەوەی بۆ ئێمە، بۆ من پێویستە: پێناسەکردنی خاوەنە راستەقینەکانی ئەم گەمە هۆڤانەیە- کە گەمەی پادشایە- و تەواوی راستییەکانی ژیانیانە.

بۆ ئەوەی نەکەوینە ناو ئەو بەهەڵەداچوونانەوە کە یەکپارچەیی کۆمەڵگا پەیوەندیداردەکەن، پێویستە بە بەیاخەوە نموونەی کارل مارکس لەبەرچاو بگرین. هیچ گومانێک لەوەدا نییە کە مارکس کەسایەتییەک بووە یاخود خوازیاربووە ببێت بەو کەسایەتییەی کە سەرمایەداری شیکاربکات و لێی رزگار بێت. بەڵام ئەم بۆچوونەش لای هەمووان پەسەندکراوە کە ئەو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییە مەزنانەی ئیلهامیان لێوەرگرتووە، رەوشی باشترین خزمەتکاری سەرمایەدارییان تێپەڕنەکردووە. ئاشکرایە کە منیش نابم بە گێلە موریدێکی مارکسیستی.

لە کاتێکدا هەوڵی پێناسەکردنی ناسنامەی خۆم دەدەم، داخوازییەکانم بۆ جووڵانەوە لەسەر بنەمای پارەمەترە بنەڕەتییەکان، بۆ تێگەیشتن بەهادارە. ئەمانە چین؟ پەڕینەوە بۆ چاخی نیۆلیتیک، خوو و رەوشتەکانی ژیان و پاشماوەکانی زهنییەتی نیولیتیک، پلەدارییەکانی دەسەڵات و باوەڕی دەوڵەت کە پشت بە شارستانی شار دەبەستن، هەرە دواییش راستینەی گەمەکانی سەرمایەداری کە لەگەڵ هیچ قۆناخێکی دیکەی مێژوودا پێودانگ ناکرێت.

دەبێت باس لە چینێکی ژێرتریش بکرێت: خەسڵەتە جیاکەرەوەکانی جۆری مرۆڤ. ئەو ریسک و ئاسانکاریانەی پێشکەش بە ژیانی کردووە.

کاتێک ئەم دێڕانە دەنووسم دەرک بەوشوێنەم دەکەم کە لەناو

چوارچێوەی سنووری مەشروعییەتی سەرمایەداریدایە. ناتوانم نکۆڵی بکەم کە پاڵپشت بەم راستییە دەژیم یاخود کراوم بە پرۆمیتۆس. لە میانەی ئەو کرانەوەیەی بەردەوام لە هێزم و واتاکەیدا خەست دەبێتەوە ئەم دەرک پێکردنەم پەرە پێدەدەم.

ئەگەر لە نموونە ناسراوەکانەوە دەست پێبکەین: مانی بەردەرگای دەسەڵاتی ساسانییەکان، ئیمام حوسێن، مەنسوری حەللاج، سوهرەوەردی[1] بەر دەرگای دەسەڵاتی ئیسلامی، بە سەدان رەبەنی ژن و پیاوی نەریتی عیسایی، هەروەها ئەو قوربانیانەی لە ـمەترسی دەسەڵات رایانکرد و پەیڕەوکاری نەریتی بودا بوون، ئەوانەی دووچاری ئاگری ئەنگیزاسیۆنی کڵیسا بوون و کۆمەڵکوژییەکانی سەرمایەداری نموونە ئەوپەڕگەرییەکانی چەسپاندنی کلتووری نووسراون. خەسڵەتی هاوبەشی ئەو نموونە لەپێشانە، سووربوونیان بووە لەسەر دەرککردن و هەستکردن بە ژیان. تاوانیان ئەوە بووە: نەیانویستووە گیرۆدەی ئەو پەردەیە بن کە ویستراوە لەنێوان ئەوان و ژیاندا هەڵواسرێت.

ئەگەر دوالیزمی ژیان ـ مەرگ خراوەتە ناو بنبەستبوونێکی سەرسوڕهێنەوە، مسۆگەر هۆکارەکەی کۆمەڵایەتییانەیە. لەبنەڕەتدا نە مردنێک بەو واتایە هەیە کە پیشانمان دەدرێت، نە ئەو ژیانەی بەردەوام ویکلامی بۆ دەکرێت هیچ پەیوەندییەکی بە ژیانەوە هەیە. دەبێت تێبگەین کە سیمولاسیۆن[2] (کە پێویستە بەلاسایی کردنەوەیەکی میکانیکانەی ژیانی بزانین) کراوە بە راستینەی ژیانمان. رێژێکی هەرە بچووک بەرامبەر بە ژیان پێویستی بە رزگاربوون لەم گەمارۆ نەزۆک و نەعلەتییە هەیە.

تەمەنم گەیشتە شەست ساڵی، بەڵام مەراقەکانی ژیانی منداڵێتی بەر لە قوتابخانەی سەرەتاییم هەر ماوە، تاکو ئێستاش لەو سنوورانەدام و لە سنوورەکانی مەشروعییەتی سەرمایەداریدا گەورە نابم. لەناو سنوورەکانی ئەودا یان ژیانێکی ساختەکارانە یاخود مانەوە بەگرکنی

---

١ـ شەهابەدین عومەر سەهرەوەردی: فەیلەسوفێکی رۆژهەلاتی، شافیعی بووە .لەناوچەی سەهرەوەردی باکوری رۆژئاوای ئێران لەدایک بووە. لەگەورەترین سۆفیگەراکانی سەردەمی خۆی بووە، شارەزا و دانایەکی کاروباری ئایین و فەلسەفە بووە، بە دامەزرێنەری فکری فەلسەفی رۆژهەلاتی دادەنرێت. بەتۆمەتی زەندیقی و ئیلحاد سزای لە سێدارەدانی بەسەردا سەپێنرا و لەساڵی ٦٦٥ی کۆچی کوژرا.

٢ـ Simulation لێکچواندن، چۆنیەکسازی، لاسایی کردنەوە یان کۆپیەیەکی ساختەی ئۆرژینەکە.

دەبێتە ناچارییەک. ئەمەش بەگشتی: سیمولاسیۆن، ساختەکاری، گرگنی، خەڵەتاندن، بێ ویژدانی، دزێوی و نەزانییە. بەڵام پێویستە ژیان لەسەرووی سەرجەم بەهاکانەوە ببینرێت. ئەرکی سەرەکیشی بوونە مایەی تێگەیشتنەلێی. **توانای تێگەیشتن ژیانە. توانای ژیان (ژیانکردن) لەپێناو تێگەیشتندایە.** باوەڕناکەم گەردوون (کۆزمۆس) شرۆڤەیەکی دیکەی جیاوازی هەبێت. چەندە بەدیهاتنی واتای رەها (موتڵەق) ئاستەم و نزیک بە مەحاڵی بێت، بەڵام من سوورم لەسەرئەوەی راستییەکە بەردەوامی بە ژیان دەدات. هیچ هێزێک لە هێزی واتا بەهێزتر نابێت یاخود ناتوانێت لەخۆ نواندنێکی ساختە بەرامبەر بەواتا تێپەڕێنێت.

با دیسان بێمەوە سەر خۆم. ئەم (گوایە) پارەمەترانەی ژیان کە هەوڵی پێشاندانیماندا، هەروەکو چۆن لە وەڵامدانەوەی مەراقەکانم لەبارەی ژیانەوە دوورن، هۆکاری سەرەکی گومانە قووڵەکانمن.

تەنیا گومانم لەو ژیانە نییە بەڵکو قێزیشم لێیدەبێتەوە. لەو شوێنەی بەرگریکردن لە واتای ژیان کۆتایی پێهات، یاخود بێواتایی بەناوی واتا پێشکەشکرا ئەو کاتە بوویەر و رووداوە شێرپەنجەییەکان بە دۆخێک دەگەن چیتر بەربەست ناکرێن. مسۆگەر هۆکارەکەشی کۆمەڵایەتییانەیە. ئەمە راستینەیەکی ئاسایی ئەنترۆپۆلۆژیانەیە کە شێرپەنجە نەخۆشییەکی کۆمەڵایەتییە. کاتێک بێواتایی یاخود ماددەی کوێرەوەبوو چڕببێتەوە و دەوری خانە بدات شێرپەنجە دەستپێدەکات.

پێشخستنی هەندێک دەستنیشانکردن بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەی ئاراستەمکراون پێویستییەکی رێزگرتنە. کاتێک دەستم بە نووسینی ئەم دێڕانە کرد بەرزترین شاندی بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردنی کۆماری تورکیا لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی هەرە بەرزی سیستەمی سەرمایەداری، واتە بەڕێوەبەرایەتی ئەمریکا دیداریان ئەنجامدا و گووتیان "PKK وەکو **دوژمنی هاوبەشی ئەمریکا، تورکیا و ئێراق رادەگەیەنین**". بۆیە بەشێوەیەکی قووڵتر دەرککردن بە واتای کات و شوێنەکەم پێویستییەکی ئەزموونییە.

دەمەوێت بڵێم: شێوازی ژیانی سەرمایەداری بەگوێرەی من نییە.

ناتوانم بڵێم جاروبار لاساییم نەکردۆتەوە. بەڵام هەست دەکەم کە لەو بوارەدا توانا و بەهرەی سەرکەوتنم نییە. ئاگاداری ئەو راستییەشم کە نابم بەو پیاوەی 'مێردی ژنێک' کە سیستەمەکانی پێشتر و سەرمایەداری بۆ خۆشی بەیەکەوە پەسەندیان کردووە. دەتوانرێت بگووترێت کە بەگوێرەی سیستەم لە رەوشێکی کۆمیدیدام. بەڵام من سیستەم بەچەوسانەوە و فشار و خوێناوی بوونێکی مەترسیدار دەبینم. لە هەبوونگەرایی ئەم دیاردانەدا ژیان قێزەونی و لێبێزاوییە، ئەمەش دژە پارادیگما یاخود دژە پارامەتری ژیانی فەیلەسوفیمە. دڵنیام کە بەهیچ شێوەیەک خۆ بەزلزانی ناگرێتەوە. بەڵام وەک مرۆڤێک بەرگریکردن لە خۆم هەم سەرەکیترین نیشانەی ژیانە، هەم ئەرکێکی ئەخلاقی بنەڕەتییە بەرامبەر ئەو کەسانەی لە کۆمەڵگابووندا خاوەن بانگەشەی ژیانن. هەرچەندە تەڤلی ئەو واتایە نەبووبم کە لەلایەن دەسەڵاتەوە سنوورەکانی دانراوە، بەڵام دیسان ئەگەر باسی هاوڵاتیبوونێکی واتادار بکرێت و بەهەند وەربگیرێت، بەرامبەر بەمەش ژیانێکی بەرپرسیارانە پێویستییەکی ئەم ئەخلاقەیە. کێشە ژیان یان نەژیان نییە، بەڵکو ئەوەیە کە بزانیت راست بژیت. هەرچەندە لە ژیانکردنی ژیانێکی راست زۆر سەرکەوتووش نەبین، گرنگتر ئەوەیە دەستبەرداری لێکەڕینەکانی نەبین، ببین بە رێبواری ئەم رێگایە.

خیانەتێک جێگای باسە کە لە مێژوودا روویندداوە و لە دابڕانی نێوان گووتە و کردار بەولاترە. هەروەکو بڵێی بەردەوام گووتەکان بۆ بەدرۆخستنەوەی کردارە. هەرچی کردار (چالاکی)ە لەژێر بەندایەتیکردنیدا بۆ سیستەمی هەژموونگەرایی بەجۆرێک رۆڵی ئامێرێکی میکانیکی پێدراوە کە وێنەکەی نەبینراوە.

تا سروشتی ئەو سەرمایەدارییە شیکار نەکرێت کە لە قۆناخی ئیمپراتۆریەتێکی جیهانگیردایە، هەروەکو لە چەندین نموونەی مێژوویيدا بینراوە خەملاندنی هەر فۆرم و بەرنامەیەک دەرهەق بە ژیانی ئازاد بۆ هەموو جۆرە لادان و سەرلێشێوانێک کراوە دەبێت. هەر گووتەیەکی بگووترێت، هەر کردارێکی ئەنجام بدرێت، بەگوزارشتێکی دیکە لەبەرئەوەی تیۆری ـ پراکتیک دەکەوێتە ناو گۆڕەپانی بەرامبەر (رەقیب)ەوە ناتوانێت

هیچ ڕۆڵێکی تایبەتی بە خۆی هەبێت. تا هەڵوێستی تۆکمەی ئەولیا، پێغەمبەریی و بودایی بەرامبەر دەستەواژە و کردەوەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پێشنەخرێت کە چوارسەد ساڵە بە دۆخێکی هەژموونگەرایی گەیشتووە، تەنانەت بووە بە نەریت و لە دەمارگیرترین ئایین زیاتر بووە بە باوەڕی، ڕزگاربوون لە ڕەوشی گەمژەیەکی وەک ئاوکێشان بۆ ئاشی سەرمایەداری مەیسەر نابێت. دژە ـ سەرمایەدارییەکان زۆر باسیان لە بارەوە نووسرا و بوون بە ڕۆژەڤ . بەڵام لەو قۆناخەی پێی گەیشتووین دەبێت دان بەو ڕاستییەدا بنێین کە زۆرینەیان لە ڕەوشی ئەو گەمژەیە ڕزگاریان نەبووە کە ئاو بۆ ئاشەکەی سیستەم دەبەن.

نەخێر ئەو سەرمایەدارییە بەهێز نازانم کە لە لووتکەی جیهانگیریدایە. بەڵکو لەوانەیە لە لاوازترین قۆناخەکانی خۆیدا بێت. لە ڕاستیدا هەموو کاتێک ناسکەو بۆ شکان لەبارە. ئەوەی لەبەرامبەریدا ئەنجام نادرێت بەرگریکردنێکی ڕاست و پتەوی کۆمەڵگایە. هەژموونگەرایی سەرمایەداری کە نەک تەنیا وەک لێکچواندنێک، بەڵکو وەک ڕاستییەکەی دەتوانین بە نەخۆشی شێرپەنجەی کۆمەڵگا پێناسەی بکەین، ناشێت وەکو یەکێک لەچارەنووسەکان لێکبدرێتەوە. دەبێت سەرمایەداری وەکو لاوازترین سیستەمی هەژموونگەرایی بنرخێنرێت. ئەگەر بەیەک کەسیشەوە سنووردار بێت، گرنگ ئەوەیە بەشێوەیەکی ڕاست و بەهێز کۆمەڵگابوون لەخۆیدا بژیێنێت. ئەوەی بەردەوام لە مێژوودا کراوە و تا ئێستاش بەردەوامە بەرامبەر بە 'پیاوی بەهێز' یان 'هەیمەنە' بەکارهێنانی هەمان چەکەکانی ئەوانە. لەبواری چەمک و کرداردا پەیڕەوکردنی هەمان شت هاوشێوەکەی خۆی دەئافرێنێت. هەر ئەمەش ڕوویداوە. بەرامبەر ڕۆما چەندین ڕۆما سەریانهەڵداوە. نموونەی دێرینتر شاری ئوروکە کە ڕەسەنە (ئۆرژینال)ەکەیە، تائێستاش بەشێوەی "ئێراقی نوێ" درێژە بە وەچەخستنەوە دەدات. گۆڕان زۆر کەمە، دووبارەبوونەوە ئێجگار زۆرە.

زلنەکردنی هەژموونگەراییش گرنگە. هەروەکو چۆن کۆمەڵگاکان ئارەزوومەندانە دەسەڵات و چەوسانەوە و فشاریان پەسەند نەکردووە،

هیچ کاتێک لە قۆناغ و پرۆسەیەکی وەهاشدا نەبوون کە بەبێ ئەوانە بژین. پێویستە لەم جۆرە چەمکانەش رزگارمان ببێت: **"کۆمەڵگای نوژەن"** و **"شێوەی کۆمەڵگاکانی لە دوای یەکتر دێن و بەیەک ناچن"** دەستەواژەی پووچ و بێناوەڕۆکن. وەکو شێوازی پەیدابوونی جۆری مرۆڤ کۆمەڵگاکان گەشەدەکەن، بەڵام بەشێوەیەکی لێکچوو. ئەگەر چاوەکانی ئەشق کوێر بێت دەشێت مرۆڤ بەرەو کەوتووترین رەوش و خەستترین دۆخی نەزانی ببات. ئینجا ئەمە ئەشقی دەسەڵات بێت یان زایەندی هەر بەمجۆرەیە. کاتێک پڕ لە واتا بێت بەهای **"نیروانا"**[١]ی هەیە. دەبێتە توانەوە لە ناو ڕاستیدا (الفناء فی الله). **"ئەنا ئەلهەقە"**. حوکمڕانێتی خودی کۆمەڵگای ئازاد و دادپەروەرە، واتە دۆخی دیموکراسی تەواوە.

دڵنیام لەوەی کە خۆ رادەست نەکردنم بە کۆمەڵگای لادێ هەڵویستێکی راست بووە. ئەوەی هەڵە بوو: مەزندەکردنی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە وەک رووناکییەک. هەرچەندە درەنگوەخت شیکارم کرد، سەرباری ئەوەی کۆمەڵگای لادێی، هێشتا دیموکراتیزە نەبووە، تەنانەت زۆر دووری قۆناغە سەرەکییەکانی پۆلێنبەندی لەجۆری دەوڵەت ـ نەتەوە و پیشەسازیش بێت، بەڵام دابڕانی رادیکاڵانە لە گوند هەڵەیەکی گەورەبوو. سەرچاوەیەکی بنەڕەتی خەمگینییەکانم لێرەدا شاراوەیە. باوکم کە زۆر ناویم نەهێنا، لەکەسایەتی مندا بەشێوەیەکی راست دەرکی بە وزەی ژیان کردبوو، کاتێک رووبەڕوو راستییەکی پڕ بە ئازاری پێبگووتمایە، بەلانی کەم هێندەی دایکم پڕحیکمت بوو. وەکو داناکان دەئاخافت. ئێستاش لەبیرمە کە گووتی " کە مردم یەک دڵۆپ فرمێسک نارێژێت". یەکێک لە باوەڕمەندەکانی جیهانی کۆن بوو. ئەندامێکی جیهانی رەنج بوو، لە رووی ناوەڕۆکیشەوە دیموکرات بوو. تاکو ئێستاش وەستاوم و لێکۆڵینەوە دەکەم ئەم ئیلاهیبوونە نەعلەتی و خەڵەتێنەرەی سەرمایەداری، چۆن

١ـ نیروانا بە واتای دەست کێشانەوە لە دونیا دێت. ئەمە لەبودیزمدا وەک رێگایەک بۆ رزگابوون لەمەزمەت و ئێشوئازارەکان دەگیرێتەبەر. بە واتایەکی تر دەگووترێت ئەگەر ژیانێکی بێ مەزمەت و ئێشوئازارمان دەست ناکەوێت، چارەی نەهێشتنی ئێشوئازار نەبوونی ژیانە. لە بودیزمدا وەک کاردانەوەیەک بەرامبەر بەو بێداری و برسێتییەی بەهۆی خوداکانی براهمانیزمەوە بەسەر خەڵکی هەژار و بێدەرتاندا هێنراوە؛ دەرکەوتووە و بودیزم هەوڵیداوە لەم رێگایەوە لەئێشوئازاری خەڵک کەم بکاتەوە. بودا پێی وایە هەموو ئەو ئۆبژانەی مرۆڤ پێکەوە دەبەستێتەوە سەرچاوەی ئێشوئازارن و خودی ئێشوئازار لەداخوازی مرۆڤەوە سەرهەڵدەدات و بۆیە ئازار تەنها بەدەست کێشانەوە لەهەموو داخوازە دونیاییەکان و بە واتایەکی تر گەیشتنە دۆخی نیروانا نامێڵرێت.

بووە شتێکی سەرنج ڕاکێش بۆمن.

کارل مارکس زیاتر هەوڵیداوە لەمیانەی هەڵوێستێکی پۆزێتیڤستانە[1] سەرمایەداری شیکار بکات. ئەویش بە نیوەچڵی مایەوە. تەنانەت دەستی بۆ دەسەلات و دەوڵەت هەر نەبردووە. هیچ کاتێک ئەم هەڵوێستەیم قووڵ نەبینی. لە دیاردەی داگیرکاری تێدەگەم، بەڵام بەبڕوای من داگیرکاری ئەنجامێکە. دەستپێکردنی کارێک لە ئەنجامەکەیەوە، هەڵوێستێکی زۆر ناتەواوە و لە ڕووی سیاسیشەوە دۆخی بێ بەرگری مانەوەیە. لە ڕاستیدا هەر لە تەنیشتییەوە قۆناخی شۆڕشێکی وەک ١٨٤٨ جێگای باس بووە. بەئەندازەی بەدواداچوونی سەبارەت بە هەنگاونانی بۆرژوا بەرەو دەسەلات، چاودێرییەکی زۆر باشی بۆ هەڵوەرین و گۆڕانی دەربەگەکان هەبووە. بەشێوەیەکی چڕ بە ئابووری ـ سیاسەت، فەلسەفە و سۆسیالیزمەوە سەرقاڵ بووە. بەڵام نەک هەر تەنیا دەرکی بە دیاردەی دەسەلات نەکردووە کە سەرلەنوێ خۆی ڕێکخستووە و وەکو هەشت پێ (ئەختەبووت) زۆرینەی هەژاران و ڕەنجدەرانی کۆمەڵگای پێچاوەتەوە، نەیتوانیوە ببێتە بەربەست کە لەدەرئەنجامدا سیستەمەکەی خۆی نەبێتە ئامرازی دەسەلات. هەستی بەوە نەکردووە کە ئەو مۆدێلە تیۆری ـ پراکتیکییەی پێشنیازی دەکات هەژموونگەرایی سەرمایەداری بەخێودەکات. پراکتیکی وڵاتی چین کە دوا نموونەکەیەتی، بووە بە بەهێزترین کۆڵەکەی هەژموونگەرایی سەرمایەداری ئەمریکا، ئەمەش لە نزیکەوە پەیوەندی بە هەست نەکردنی بەمەوە هەیە.

ئەگەر هەژموونخوازی سەرمایەداری هێندە بەهێزە، سەرەکیترین هۆکاری دەگەڕێتەوە بۆ ڕێکردنەوەی لەپێش ئەو پێشبڕکێیەی لەپێناو کۆیلایەتی ئارەزوومەندانەدا دەکرێت. ئایا ئەمڕۆ تاکە کرێکارێک هەیە لەدژی کرێی زۆر بێت؟ بە ڕاستیش ڕەوشەکە خەمناکە.

کاتێک دەرهەق بە تێکۆشان بەرامبەر سەرمایەداری قاڵدەبمەوە، بەردەوام پەیوەندی نێوان ژن ـ مێردم بەبیردا دێنێت. ئەگەر بەگوێرەی

---

١. کەسێک کە پەیڕەوی ڕێبازی پۆزێتیڤیزم دەکات. پۆزێتیڤیزم هزرێکی فەلسەفییە کە لە ناوەڕۆکدا چەمکێکی زانستی داماڵراو لە تیۆلۆژی و میتافیزیک و پشت بە ڕاستییە فیزیایی یان مادییەکانی هەیە. تەنها ئەو زانستیانە بەڕاستترین زانایی دادەنێت کە پشت بە دیاردە بینراوەکان تاقیکرابێتەوە.

هەلومەرج مێرد ژیانێکی ئاسایی پێشکەش بە ژنەکەی کردبێت، راکێشکردنی ئەو ژنە بۆ تێکۆشان لەبەرامبەر ئەو مێردەدا چەندە زەحمەت بێت، ئەگەر کرێیەکی باش بە کرێکار درابێت، راکێشانی بۆ تێکۆشان بەرامبەر خاوەنە سەرمایەدارەکەی بەو ئەندازەیە ئاستەمە. ئازادی و ئازادیخوازی لەولاوە بمێنێت، تەنانەت لە ئاست کرێیەکی سادەشدا ئەو کرێکارەی بەرامبەر بە خاوەنە سەرمایەدارەکەی تەقلە لێدەدات، بە هەمەرەنگییەکانی کۆمەڵگا بەندە و خزمەتکارێکی سیستەمی خاوەنەکەیەتی. بەتایبەتیش لە حاڵەتێکدا کە سوپای بێکاران وەکو هەرەسی بەفر زیاد دەبێت، کرێکارێکی پێگە زامنکراو، هاوشێوەی فەرمانبەرێکی دەوڵەت، تەنانەت لەویش زیاتر خۆی لەژێر گەرەنتیدا دەبینێت.

چەندە بیرۆکراتەکانی دەوڵەت ببن بە پرۆلیتار، لە ریزەکانی پرۆلیتاریاش تا ئەو رادەیە بیرۆکراتبوون هەیە. ئەوەی لە بنکەی ژێریندا لەنێوان کرێکار و فەرمانبەردا بەدیدێت، جۆرێکە لەو تێکەڵبوونەی لە لووتکەی ژووریندا لەنێوان نەجیبزادە و بۆرژوا و دەرەبەگەکاندا هەیە.

کۆمەڵگای شار کە وەکو موگناتیس لە کۆمەڵگای لادێوە راکێشی کردم، بە رەوشە شیکارکراوەکەشییەوە بۆ من شوێنی بنەڕەتی کێشەی کۆمەڵگایە. بەئەندازەی رزینە ناوخۆییەکەی کۆمەڵگا، شار و ئەو کۆمەڵگابوونەش کە رێگای لەپێش کردۆتەوە تاوانباری سەرەکی دابڕانی کۆمەڵگان لە دەوروبەر و ژینگە. راستتر تاوانبار کۆمەڵگای شاری شارستانی دەوڵەتی و چینایەتییە. سەرەتاییترین کۆمەڵگای کلانیش هێندەی شارستانی شار بەرامبەر بە ژیان دەبەنگ و نەزان نییە. بە پێچەوانەوە ئەگەر لە قۆناخی سەرمایەداریدا کۆمەڵگای شاری شارستانی تەواو بۆ بەکۆمەڵکوژێکی ژینگە گۆڕاوە، هەڵبەتە سەرچاوەکەی ئەو دەبەنگی و نەزانییە سیستەماتیکەیە کە لە بونیادەکەیدا هەیە.

ئەو ئەقڵەی لەژێری سۆزداری دابڕاوە و ئەو زایەندخوازییەی لەمێژە واتای خۆی لە دەستداوە یەکێک لە هێما سەرەکییەکانی راستینەی شێرپەنجەیی سەرمایەدارییە. هەرلەپشت بەستنەوە بەهەڕەشەی ناوکی لەپێناو دەسەڵاتدا، تا دەگاتە ئەو ژمارە مەزنەی دانیشتوان کە لە جیهان

ژیری مرۆڤ گەیشتووە. چۆن بوو ماتەوزەی پەیدابوونی زیندەوەر لە تاکخانەوە بەرەو زیندەوەرێکی ژیری سەرسوڕهێنەری وەک مرۆڤ هەمەڕەنگی بەخۆیەوە بینی؟ لەوانەیە تەنیا لەپێناو خانەی زیندوودا، خۆ زیادکردنی (زۆربوون) تەنانەت بۆ وردە گەردوونەکانیش پێویست بێت، بەم ئامانجەش پشت بەژینگەی دەوروبەری خۆی تێربکات و بە پێی پێویست خۆی بپارێزێت. لەوانەیە تەنۆکە ناوکییەکان گرفتەکانی خۆراک و خۆپاراستن و بەڕادەیەک زۆربوون کە لەناونەچن، تەنیا لەمیانەی ئەم شێوازەی وردەگەردوونەوە چارەسەر بکەن. ئەو سنوورانەی پشتیان پێبەستووە، سنووری بێ کۆتای زۆربوون، تێربوون و ئاسایشە. لێرەدا بۆ تاوێک دەتوانین وەڵامی لێکەرینەکەمان سەبارەت بەژیری گەردوونی بدۆزینەوە. نابێت ئەم گەردوونە لە دەرەوەی خۆمان بژمێرین. هەموو شوێنێکمان پڕە لەوانە و دەوروبەرمانی تەنیوەتەوە. لەوانەیە لێکەرینەکانمان بۆ زۆربوون، تێربوون و ئاسایش گوزارشتێکی ڕەنگدانەوەی یەکبوونی ئەم دونیایە (وردە گەردوون) بێت. دەشێت گەردوونی مەزنیش خاوەن هەمان پێکهاتە (هەبوون) بێت. لەو ڕووەوە دووبارەیەکە بەزۆرلێکردن لەکات و شوێن دەگاتە، گەورەبوون لە سنوورە بێ کۆتاکان و ڕاوەستەی ژیرییەکی ئارام. دەشێت ڕەنگدانەوەی گەردوونی مەزن بێت لەژیری مرۆڤدا.

ئاگادارم کە کەوتووینەتە ناو ئەوپەڕی گریمانەییەوە. بەڵام ئەوەش لەجێی خۆیدایە کە ناتوانین ڕەوشی ماتەوزەی ژیری مرۆڤ وەها شرۆڤە بکەین کە لە ئاسمانەوە بە زەمبیل بۆی هاتۆتە خوارەوە. چەندە دەشێت بیر لە ژیرییەکی دابڕاو لە گەشە و هەبوون بکەینەوە؟ چەندە ڕاستە کاتێک ژیری وەکو مەسەلەیەکی تایبەت بە مرۆڤ ببینین؟ تەنانەت مردنیش بۆ تێگەیشتن لە ژیان و هەبوون وەکو ناچارییەکە. دەتوانین مەزەندە بکەین ئەگەر مردن نەبوایە هەستمان بە ژیان نەدەکرد. بەبێ هیچ گۆڕانێک ژیانێکی بێ کۆتایی لە ناوەڕۆکی خۆیدا ژیان نییە. چونکە زەمینە و نێوەندێک کە دەرک پێکردنی تێدا نەبێت، زەمینەیەکە هیچ شتێکی تێدا نییە. لێرەدایە کە مردن بۆ فەراهەمبوونی ژیان لە ڕاستیدا ناچارییەکە. لە

حاڵەتێکدا پێویستە وەکو نیعمەتێک ببینرێت، بۆچی هەروەکو بڵێی کۆتایی ژیانە لێی دەترسین؟ بەبڕوای من لەجیاتی ترسان لەمردن، تێگەیشتن لەو ژیانەی رەخساندوویەتی، لەوێشەوە هەڵێنجانی ئەنجام، زیاتر لەگەڵ بەشداربوون لە گەردووندا گونجاوە. هەروەکو چۆن ناتوانرێت لەمردن رابکەیت، ناشێت لەژیانیش رابکەی. راستتر دۆزینەوەی نهێنی گەردوون لەچارەسەرکردنی ئەم دوالیزمەدا وەکو تاکە ئامانجێک دەردەکەوێت.

کەواتە ئەوەی وەک پێویستییەکی شیکاردنی ئەم دوالیزمە لە گەیشتن بە واتای بەهێزی ژیان دێتە کایەوەچییە؟ ئەم پرسیارە هەم نابەجێ، هەم بەپێویست دەبینم. دەشێت گەیشتن بە زانینی نهێنی گەردوون وەک سەرکەوتنی هەرە کۆتایی ژیان بەناوبکەین. دەشێت بەهەشتی پەرتووکی پیرۆز، رەوشی نیروانا لە ئایینی بودیزمدا، هەروەها دۆخی وەجد[1] لە سۆفیگەراییدا وەکو پیرۆزکردنی ژیان و جەژنی بەردەوام شرۆڤە بکرێت.

هەندێک بیرمەندی رۆژئاوایی ئەو تیۆرە پێشدەخەن گوایە زەمینەیەکی ژیان جێگای باسە کە تەنیا بە هەسارەکەمانەوە سنووردارە و لەگەڵ کۆتاییهاتنی سیستەمی خۆردا دەکەوێتە ناو دۆخێکی بێواتای شێوەی جووڵەی گەردوونەوە. ئەمەش بە وێناکردنی دۆزەخ دەچێت. ئەم شێوە گریمانەش بەڵگەی خۆیان هەیە کە پشتی پێدەبەستن. بەڵام بانگەشەی شیکارکردنی ژیان نەزۆکترین گریمانە. نە بە تەواوی گەردوون دەناسین، نە واتای بەهێزی ژیان. بیانوو بۆ ئەم جۆرە گریمانانە هێندە بەهێزنین. تەنانەت خودی دونیاکەشمان هەروەکو چۆن رێگا بە ژیانێک نادات کە بەگوێرەی پێویست زەمینەی نەبێت، هێندە زیندوو و دادوەرانەشە بۆ هەر زیندەوەرێک کە کاتی خۆی هات بە ئەندازەی ماتە وزە زەمینەی ژیانیشی پێشکەش دەکات.

بە ئەندازەی گرنگی بە ناوەندینەکردنی چیرۆکی پەیدابوونی جۆری مرۆڤ، بچووک کردنەوەشی دەبێتە بێ رێزی بەرامبەر سووڕی

---

١. بەواتا فەلسەفییەکەی بەرامبەر بەگەورەیی و جوانی و عەشقی ئیلاهی جۆشگرتنێکە کە خۆی لەبیر دەچێتەوە و لەناویدا دەتوێتەوە.

سەرسوڕهێنەرانەی گەردوون. خراپترین میتافیزیک پۆزێتیڤیزمە کە دیاردەی مرۆڤ لە تەواوی گەردوون جیادەکاتەوە و ئەبستراکتانە تاوتوێی دەکات و بەمجۆرە باسی دەکات. کاتێک پەیوەندی پۆزێتیڤیزم وەک قەبەترین ماتریالیزم، لەگەڵ سەرمایەداریدا بخەینەڕوو، لەو بڕوایەدام کە بە ئەندازەی زیاتر واتاداربوونی ژیان بەڕێزیشەوە لێی نزیک دەبینەوە.

وەک ئەنجام، لەوە دەچێت خاوەن ئەو شانسەبین کە بەشێوەیەکی بەرکەماڵ بتوانین لە مرۆڤدا (کەجۆرێکی بایۆلۆژییە) دەرک بەگەردوون بکەین. پەیبردن بەو ماتەوزەیە شتێکە و ئەنجامدانی پرۆسەکەشی قۆناخ و شتێکی جیاوازترە. هەروەکو بڵێی ئەو گووتەیەی هزری رۆژهەلاتی کە دەڵێت "**هەرچی هەبێت لەمرۆڤدایە**" هەستی بەو راستییە کردووە. دیسان دووبارەی دەکەمەوە، هزرێک کە بەرەو ناوەندگەرێتی مرۆڤ خزابێت، تەواوی سروشت بە زیندوو ـ بێ گیانەکانەوە لە خزمەتی مرۆڤدا دەبینێت، ئەم چەمکە کە زەمینەی فەلسەفی چەمکی دەسەلاتی تۆتالیتار و پلەداری سەرەڕۆییە ئاشکرایە بەرەو ئەقڵێکی گریمانەیی دوور لە ژیانمان دەبات. راستتر بەرهەمی خودی ئەم ئەقڵەیە. هەندێک فەلسەفەی ئیکۆلۆژیش کە وەکو پێچەوانەکەی دیارن و مرۆڤ وەک بەلایەکی سەر تەواوی سروشت دەبینن بەهەمان ئاقاردا دەڕۆن. وەک جۆر لە قەڵەمدانی مرۆڤ بە بەلایەکی سەر سروشت، بەرهەمی فەلسەفەیەکی گریمانەیی نەزۆکە کە پەیوەندی بە ژیانەوە زۆر لاوازە. بەهانەدانێکی بەرکەماڵ بە گەشەسەندنێک کە بە ئاستی مرۆڤ گەیشتووە، بۆ سیستەمێک دەگەڕێتەوە کە یان لەسەر بنەمای پەیوەندییەکی لاواز بەژیانەوە لەسەر بنەمای چەوسانەوەیەکی ئەوپەڕگەری گریمانە کراوە و پێکهێنراوە.

پەرەسەندنێک کە بە سنووری مرۆڤ گەیشتووە، پرسیاری ئەخلاقی جددی دەخاتە بەردەستمان. بەرلەوەی بچینە سەر ئەم باسە پێویستە پەیوەندی ئەقڵیش بە کۆمەڵگاوە پێناسە بکەین.

٢ـ جۆری مرۆڤ چەندە ماتەوزەی ژیری خۆی بە کۆمەڵگابووندا تێپەڕبکات، بەوڕادەیە خەسڵەتی دەرخستنی ئەو ماتەوزەیەی هەیە. لەمەش

گرنگتر، پێکهاتەی بایۆلۆژی مرۆڤ کۆمەڵایەتیبوون (کۆمەڵگابوون) ی دەکات بە ناچارییەک. ناچاری بە کۆمەڵگابوونێک کراوە کە لە هیچ بوونەوەرێکدا نابینرێت. وەچەی مرۆڤ تەنیا لە پانزدە ساڵی بە دواوە لە قۆناخی منداڵیتی دەردەکەوێت، ئەم ماوەیەش پارچەیەکی زەمەنی ئەوتۆیە کە بێ بوونی کۆمەڵگا تێپەڕناکرێت. منداڵ زۆر بەلاوازی لە سکی دایکییەوە لەدایک دەبێت. وەچەی تەواوی ئاژەڵەکانی دیکە لەمیانەی ماوەیەکی رۆژانەییدا ژیانی خۆیان مسۆگەر دەکەن. کۆمەڵگابوونی مرۆڤ زەۆر تێکەلاوە و پێویستی بە تێگەیشتنی قووڵ هەیە. ئەو جۆرەی مرۆڤ کە کۆمەڵگابوونی خۆی لەدەستداوە یان دەبێت وەکو جۆرێکی نزیک بە مەیمون سەرلەنوێ دەست بەگەشەکردن بکاتەوە، ئەمەش گەشەکردنێکە بۆ دواوە و دەرفەتی هەیە، یاخود لەناو دەچێت. تەواوی بوونەوەرەکان هەم وەک جۆر، هەم وەکو یەکپارچەیی جۆرەکان پێویستیان بە بەیەکەوەبوونێکی تایبەت بەخۆیان هەیە. کۆمەڵگا کە تایبەت بەجۆری مرۆڤە، زۆر لەسەرووی بەیەکەوەبوون مەرجی هەبوونی مرۆڤ لەخۆیدا هەڵدەگرێت.

بەناوکردنی کۆمەڵگا بە دووەمین سروشت هەڵوێستێکی قووڵترە. خودی کۆمەڵگابوون دەرکەوتنی ژیرییە لە دۆخی ماتەوزەیی و بەشێوەیەکی بەهێز هەنگاونانێتی بۆ قۆناخی کارابوون. جڤات بەردەوام پێویستی بە هزرە. پەرەسەندنی کۆمەڵگا لە بنەڕەتدا پێشکەوتنی هزرە. بەمجۆرە بە کۆمەڵگابوون لە رێگای هزرەوە دەرفەتی بۆ دەرەخسێت. بەخێوکردن (تێربوون)، زۆربوون و ئاسایش لەگەڵ زیادبوونی بەکۆمەڵگابووندا زیاتر پێشدەکەون. بەشێوەیەکی راشکاوانەتر ئاماژە بەم خاڵە بکەم: فاکتەرەکانی تێربوون، زۆربوون و ئاسایش کە تایبەت بە تەواوی زیندەوەرەکانە جۆرێک لە ئەقڵە. ئەمانە توندترین شێوازی رەمەکەکانی فێربوونن. جموجۆڵەکانی زیندەوەر، جووڵەکانی فێربوونن. ئەگەر گشتگیری بکەین، تەواوی پێشکەوتنە گەردوونییەکان ژیری و فێربوون بەبیری مرۆڤدا دێنێت. کۆمەڵگا کە وەکو سروشتی دووەمە، جۆرێک لە قۆناخی ژووریی سروشتی یەکەم و دۆخی رەنگدانەوەیەتی.

تا کۆمەڵگابوون شیکار نەکرێت کە سروشتی دووەمە، لەو بڕوایەدام کە لادانێکی مەترسیدار لە بونیادی ئەو هزر و کردارەدا هەیە کە لەپێشینەیی بە سروشتی یەکەم دەبەخشێت. مادام مرۆڤ بەرهەمێکی سروشتی دووەمە، لە حاڵەتێکی وەهادا پێویستە سەرەتا دەرک بەم سروشتە بکرێت بۆ ئەوەی لە مرۆڤ تێبگەین. هەربۆیە لەم بارەیەوە هێشتا ئیقناع نیم کە زانستی تایبەت بەسروشتی یەکەم بابەتی بێت و لە سروشتی دووەم جیاواز بەشێوەیەکی سەربەخۆ پەیڕەو بکرێت. لای من وەکو لادانێکە. لەوبڕوایەدام کە زانستی فیزیا، کیمیا، تەنانەت زیندەوەرزانیش ناتوانن لە زانستی سروشتی دووەم و زانستی مرۆڤ جیا و سەربەخۆبن. ئاگادارم کە لە کەنارەکانی یاساگەرایی ئایینی نزیک بوومەتەوە. بەڵام کێشەی سەرەکی کە پێویستە ڕۆشنبکرێتەوە، لەکاتێکدا تەواوی یاساکانی تایبەت بە سروشتی یەکەم لەمیانەی سروشتی دووەمەوە لە مرۆڤدا ئاماژەی پێدەکرێت، ئایا جیاوازی ئۆبژە - سۆبژە هیچ واتایەکی هەیە؟ چەندە دەتوانرێت جیاوازی لەنێوان ئەوەی دەزانێت و بابەتی زانراودا بکرێت؟ پرسیارێکی وروژێنەرتر، دوالیزمەکردنی کەسی زانا و بابەتی زانین بەشێوەی ئۆبژە - سۆبژە نابێتە لادانێکی بنەڕەتی؟ بەبڕوای من جێگیرکردنی سروشتی یەکەم و دووەم بەشێوەی ئۆبژە و سۆبژە بناخەی تەواوی ئاراستە چەوتەکانی تایبەت بە مرۆڤ و تەواوی قۆناخەکانی کۆمەڵگایە کە ئازارەکانی چەشتراوە. سیستەمی ئەم لۆژیکە (ڕاهاتنەکانی هزر) لە ڕێگای سیستەمی سەرمایەدارییەوە تەواوی کۆمەڵگا دەخاتە ژێر چەوسانەوە و دیلێتییەوە. لایەنی ترسناکتریش ئەوەیە کە هەمان لۆژیکی فشار و چەوسانەوە بەرامبەر تەواوی فاکتەرەکانی سروشتی یەکەم بەکاردێنێت، لەمەشدا نیگەران نابێت.

کۆمەڵگابوون کە وەک ڕێگاچارەیەک بۆ ڕەوشی تراژیدی جۆری مرۆڤ کەوتە گەڕ، لە قۆناخە بەرچاوەکانی ئەم مەودایەی بڕیوەیەتی هەم لە بونیادی کۆمەڵگادا هەم لەسەر ژینگەی سروشتی دەبێت بە کێشە. دواتر هەوڵی تەواوکردنی باسی کێشەکان و فاکتەرە سەرەکییەکانیان دەدەین، لەسەررووی هەمووشیانەوە ئابووری، ئێستا بابچینە سەر

شرۆڤەکردنی پێشکەوتنەکانی رەهەندی زهنییەت.

دەستنیشانکردنی ئەم خاڵە گرنگە کە هێزی ئەو زهنییەتەی لەمیانەی گەشەی بایۆلۆژییەوە بە مێشکی مرۆڤ گەیشتووە لە ڕێگای پەرەسەندنی کۆمەڵگاوە هەم ئاکتیڤ بووە، هەم جیابۆتەوە. پێشتر ئاماژەم پێکرد کە خودی کۆمەڵگابوون رەوشێکی زهنی رەخساندووە هەروەکو بڵێی بێداربۆتەوە و بەردەوام کاردەکات. دۆخی کارکردنی بەردەوامی زهنییەت، بەشێوەیەکی هاوبەرامبەر ڕێخۆشکردنی بۆ پێشکەوتنی پێکهاتەی مێشک، پێویستییەکی پەرەسەندنە. هەرچەندە پێویستی بەماوەیەکی درێژخایەنیش بێت، ژیانێکی کۆمەڵایەتی چالاکانە هۆکاری سەرەکی پێشخستنی زهنییەتە. روونکردنەوەی ئەمە بەهەبوونی ژێری سوپەر لەهەندێک کەسدا هێندە جێگای باوەڕ نییە. تایبەتمەندێتییەکی کۆمەڵگایی لەبناخەی هەر رەوشێکی ژێریدا شاراوەیە.

لەمیانەی زانیارییە ئەنترۆپۆلۆژییەکانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە بەشێکی هەرە زۆری ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤ بەشێوەی نێچیروانی و کۆکردنەوەی خواردەمەنی تێپەڕبووە، لە ڕێگای زمانێکی ئیشارەتەوە پەیوەندییان لەگەڵ یەکتری بەستووە کە لەهی جۆرەکانی نزیک بە خۆی دەچێت. لەم قۆناخەدا ناتوانرێت باس لە پرسیارێکی جددی ئەوتۆ بکرێت کە کۆمەڵگابوون سەرچاوەی بێت. هێشتا پەرەسەندنی سروشتی حوکمڕانی خۆی دەکات و هاوسەنگی خۆی دەپارێزێت. ئاستی ژێری سۆزدارییە. راستتر بڵێین، کارەکتەری سۆزداری ژێری زاڵە. خەسڵەتی سەرەکی ژێری سۆزداری ئەوەیە کە لەمیانەی پەرچەکردارەوە کاردەکات. رەمەکە ناواخنییەکانیش ژێری سۆزدارییین. بەڵام کۆنترین جۆری ژێرییە (دەشێت بۆ یەکەمین خانەی زیندوو بگەڕێتەوە). شێوازی کارکردنی، پیشاندانی پەرچەکرداری لەناکاوە بەرامبەر بە ئاگادارییەکان. سیستەمێکی ئۆتۆماتیکی کارکردن جێگای باسە. ئەم شێوازە بە باشترین شێوە رۆڵی بەرگری (پاراستن) جێبەجێدەکات. تەنانەت بەئاسانی لە رووەکەکانیشدا دەبینرێت. لەجۆری مرۆڤدا بە بەرکەماڵترین شێوەی خۆی دەگات. گەیشتن بە ژێری پێنج هەستیارییەکە و هەماهەنگی نێوانیان لە هیچ

بوونەوەرێکدا بە ئەندازەی مرۆڤ نییە. بێگومان هەستیاری لە جۆری بیستن، بینین و تامکردن لەچەندین زیندەوەردا لە مرۆڤ پێشکەوتووترە. بەڵام جۆری مرۆڤ لەوەدا تاقانە و سەرکێشە هەر پێنج هەستیارییەکە تییدا گەیشتۆتە رەوشێکی گشتگیر و هەماهەنگ.

گرنگترین خەسڵەتی ژیری سۆزداری پەیوەستبوونێتی بە ژیانەوە. بەرگریکردن لە ژیان ئەرکی سەرەکییەتی. لەبواری پاراستنی ژیاندا زۆر پێشکەوتووە. هەرگیز نابێت ئەم لایەنەی بچووک بکرێتەوە، بەڕێژەی لە سەدا سفر هەڵەکردن کاردەکات، بەواتای وەڵامدانەوەی لەناکاو ئاماژەی پێدەکەم. بێبەشبوون لەم ژیرییە، ئاوالابوونی ژیانە بەرووی مەترسییەکاندا. بەهادارکردن و رێزگرتنی ژیان، گرێدراوی ئاستی پێشکەوتنی ژیری سۆزدارییە. پەیڕەوی هاوسەنگی دەکات. دەشێت بەو ژیرییەش ناوی ببەین کە ژیانی سروشتی دەرەخسێنێت. بۆ جیهانی هەست تەواو قەرزداری ئەم جۆرە ژیرییەین.

بەشێوەیەکی گشتگیر پێشکەوتنی ژیری سۆزداری لەجۆری مرۆڤدا، شانسێکی زیاتری داوەتێ بۆ پێکەوە بەستنەوەی هەستیارییەکان. لەسەرووی هەموویانەوە دەنگ، بینین و تامکردن، بەو ئاگادارییە دەمارییانەی بەیەکتری دەدەن و جوڵەکانی ژیری لە مرۆڤدا پێشدەخەن. جۆاتەکانی مرۆڤ کە ماوەیەکی درێژی لەمیانەی زمانی ئیشارەتەوە بەسەر برد، لەگەڵ رەخسانی هەلومەرجی فیزیۆلۆژیانەی قسەکردندا توانیویەتی بە زمانی "هێما" بگات. لەبنەڕەتدا، لەمیانەی وشەکانەوە پەڕیوتەوە بۆ هزری ئەبستراکت. لەجیاتی ئیشارەت، تێگەیشتن لە رێگای بەکارهێنانی زاراوەکانەوە، شۆڕشێکی گەورەی مێژووی مرۆڤایەتییە. ئیتر ئەوەی پێویستە بکرێت ناولێنانی ئەو شتومەکانەیە کەژیانیترین پێداویستییەکانی جێبەجێدەکەن. ناولێنان پرۆسە و قۆناخێکی گەورەیە. بەزاراوەکردنی پەیوەندی نێوان ناوە جیاوازەکانیش لەگەڵیدا پێشدەکەوێت. خەسڵەتی ئەو شتانەی بەناو دەکرێن و ئەو رۆڵەی لەنێوانیاندا هەیە رێگا لەپێش فرمان و ئامرازەکانی پەیوەندی دەکاتەوە. لەگەڵ هەنگاونان بۆ سیستەمی رستە دروستکردن، ئیتر شۆڕشی زمان سەردەکەوێت.

ئەمەش بە واتای شێوەیەکی نوێی هزر دێت. جێگیرکردنی وشە لە زهندا، بەو واتایە دێت کە بەبێ ئەوەی شتوومەک و ڕووداوەکان لە ئارادابن، دەرفەتی هزراندن لەبارەیانەوە ڕەخساوە. لە سەرەتای ژیری گریمانەیی یان ژیری تیۆریداین. پێشکەوتنێکی زۆر گرنگە. ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم بەشی پێشەوەی دالانی چەپی مێشک بە تەواوی تەرخانە بۆ ئەمجۆرە ژیرییە. ڕووبەڕووی جۆرێکی ژیرین کە بە ئەندازەی سوودەکانی دەشێت ڕێگا لەپێش ڕەوشی زۆر زیانبەخش و مەترسیداریش بکاتەوە. کارکردنی بەشێوەیەکی دابڕاو لە هەستیارییەکان خەسڵەتی سەرەکیەتی. دەشێت وەک ئەو ژیرییەش پێناسە بکرێت کە ڕێگا لەپێش هزری ئەنالیتیک یان گریمانەیی دەکاتەوە. گرنگترین خاڵی بەهێزی ئەقڵ یان ژیری ئەنالیتیکی ئەوەیە کە بەبێ خۆماندووکردنێکی زێدە، کاتێک پێویست بکات دەتوانێت لەبارەی تەواوی گەردوونەوە بیربکاتەوە. بێ سنوور خەیاڵکردن بەهرەی سەرەکییەتی. جیهانێکی سەرسوڕهێنەری لە تارماییەکان ئاوادەکات. توانای دانانی پیلان، تەڵەزگە و پیلانگێڕی پێشکەوتووە. لەمیانەی لاساییکردنەوەی سروشتەوە دەتوانێت هەموو جۆرە داهێنانێک پێشبخات. ئەو بەهرەیەی کە لە ڕێگای پیلان و تەڵەزگە و هەموو جۆرە پیلانگێڕیەکەوە توانای گەیشتن بەهەموو شتێکی هەیە کە خوازیارێتی، دەیکات بە سەرچاوەی سەرەکی کێشەکانی ناوەوە و دەرەوەی کۆمەڵگا.

بەناویەکداچوونی هەردوو ڕەهەندی ئەنالیتیک و سۆزداری ژیری بۆخۆی شانازییەکی تایبەت بە مرۆڤە. بەڵام گرنگتر ئەوەیە بەکامە ئامانج بەکاردەهێنرێت. کۆمەڵگا لەیەکەم قۆناخەکانی خۆیدا هەستی بەم دوالیزمە کردووە. ئەو وەڵامەی داویەتییەوە، بە بنەماگرتنی ئەخلاق بووە وەک پرەنسیپێکی سەرەکی خۆڕێکخستن. ئەگەر ئەخلاقی کۆمەڵگا نەبێت دەرەقەتی ژیری ئەنالیتیکی نایەین. بۆ نموونە یەکێک کەوتبێتە ناو هەستی تووڕەبوونەوە کەمێک ژیری ئەنالیتیکی خۆی بخاتە گەڕ، بەبێ داخوازی، دەشێت هەر بوونەوەر و جڤاتێکی مرۆیی لەناو ببات کە لە بەرامبەرێتی. بەرامبەر بەم هەڕەشەیە کۆمەڵگا ئەخلاقی کردووە

بە پرەنسیپێکی ئەوتۆ کە کۆمەڵگا بەبێ ئەو نابێت، بەمجۆرە دەخوازێت سنووری بۆ دابنێت. هەر کۆمەڵ و جڤاتێک پێگەیاندنی ئەندامەکانی خۆی بەشێوەیەکی ئەخلاقیانە بە ئەرکی یەکەم دەستنیشانکردووە. دوالیزمی سەرەکی "باش و خراپ" ی ئەخلاق پەیوەندی بە رۆڵی ئەم ژیرییە ئەنالیتیکەوە هەیە. ئەگەر بەشێوەیەکی سوودبەخشانە کاربکات لەلایەن ئەخلاقی باشەوە خەڵات دەکرێت. ئەگەر زیانبەخش بێت وەکو ئەخلاقی خراپە مەحکوم دەکرێت. راستتر، وەک ئەو شتەی پێویستە لە ئەخلاقدا نەبێت، وەک خراپە سەرکوت و سزا دەدرێت. ئەمەش تا ئەو کاتەیە کە ئەخلاقی باشە دەبێت بەپێشەنگ.

بەڵام ئەم چارەیەی کۆمەڵگا دۆزیویەتییەوە بەهێزێکی رەهای رێگریکردن ناگات. لە درزە کۆمەڵایەتییەکاندا بەردەوام ئەو فێڵبازانە جێگای باسن کە بەدوای نانەوەی تەڵەزگە و پیلانگێڕیدا وێڵن. خۆی لەخۆیدا کلتوورێکی زۆر کۆن رۆڵی لە بناخەی ئەمەدا هەیە: ئەویش نێچیروانییە. پرەنسیپی کلتووری نێچیروانی نانەوەی تەڵەزگە و پیلانە بەرامبەر زیندەوەرەکانی دیکە. کلتوورێکە، ریشەکەی لە جیهانی ئاژەڵ تەنانەت لە دونیای رووەکیشدا دەبینرێت. ئەم رەگانە لە هەمانکاتدا ریشە بایۆلۆژییەکانی ژیری ئەنالیتیکیشە: ئەم کلتوورەی نێچیروانی کە لە کۆمەڵگای مرۆڤدا جیاوازترە، کاتێک لەگەڵ پێشکەوتنی ژیری ئانالیتیکی دەبێتە یەک و سەنتێزێک دروستدەکات، لە بونیادی کۆمەڵگا و ژینگەی دەوروبەردا، بەهرەی گەیشتن بەچینێک و ئاواکردنی پلەداری یاخود هێزەکەی بەدەست دێنێت. بەمجۆرە کارەسات دەستی پێکردووە. جیاوازی بەهەشت ـ دۆزەخ شانبەشانی هێزی ئاواکردنی پلەداری کۆمەڵگا ،بەیەکەوە لەلایەن ژیری ئەنالیتیکەوە پێشدەخرێت. لەکاتێکدا لە کۆمە ای پلەداریدا تاقمێکی "پیاوی بەهێز" خۆیان بەسەر کۆمەڵگادا دەسەپێنن و رێگا لەپێش خەیاڵی ژیانی بەهەشتی دەکەنەوە، بۆ کۆمەڵگای ژێریش رێگای دۆزەخ دەکرێتەوە کە پێبەپێ قووڵدەبێتەوە، هۆکار و پەیدابوونیشی دەرکی پێناکرێت.

بەرامبەر بە پیاوی بەهێز یەکەمین قوربانی ژن بووە. بەشێوەیەکی

سروشتی لەبەرئەوەی ژن پەیوەندییەکی بەهێزی بەژیانەوە هەیە ژیری سۆزداریانەی لەپێشترە. وەک دایکی منداڵان لەمیانەی رەنجێکی پڕ لەئێش و ئازارەوە بەرپرسیاری سەرەکی ژیانی کۆمەڵایەتییە. بە ئەندازەی دەرککردن بە ژیان، باشتر دەزانێت کە چۆنیش بەسەر ببرێت. کۆکەرەوەی خواردەمەنییە، ئەمەش هەم ئەنجامێکی ژیری سۆزدارییە، هەم وەک پێویستییەکی ئەو وانەیە کە لە سروشت فێری بووە. یەکێک لە پێدراوە ئەنترۆپۆلۆژییەکان ئەوەیە کە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن ئەزموون و کەڵەکەبوونی کۆمەڵگابوون لە تەوەرەی دایک ـ ژن کۆبۆتەوە، رۆڵی جۆرێک لە دەوڵەمەندێتی و ناوەندی بەهاکانی بینیوە. ئیتر دەتوانرێت مەزەندەی ئەوە بکرێت کە دایکی زێدە ـ بەهاکانیشە. چاوتێبڕینی ئەم بەهایانە لەلایەن پیاوە بەهێزەکەوە کە نێچیروانی بە رۆڵی سەرەکی خۆی زانییوە، شتێک نییە مایەی تێگەیشتن نەبێت. لە حاڵەتێکدا دەسەلاتی خۆی ئاوابکات دەتوانێت ئەوەنتاژی مەزن بەدەست بێنێت. لە کردنی ژن بە بابەتێکی زایەندی تا دەگاتە باوکایەتیکردنی منداڵان، گەیشتن بە جۆرێک لە پێگەی خاوەندارێتی لەسەر کلتووری مەعنەوی و ماددییەکانی دیکە چەندەی بڵێی ئارەزووەکان دەوروژێنێت. رەوشی رێکخستەیی ئەو هێزەی لە نێچیروانی بەدەستی هێناوە، شانسی دەسەلات و ئاواکردنی یەکەمین پلەداری کۆمەڵگای پێدەبەخشێت. لەم جۆرە دیاردە و گۆڕانکارییانەدا بۆ یەکەمین جار دەبینین کە ژیری ئەنالیتیکی بە ئامانجی خراپە لە بونیادی کۆمەڵگادا بەکاردەهێنرێت و بە دۆخێکی سیستەماتیک دەگات.

لە باوەڕی دایکی پیرۆزەوە پەڕینەوە بۆ باوەڕی باوک دەبێتە هۆی بە بەرداکردنی قەڵغانی پیرۆزی بۆ ژیری گریمانە (ئەنالیتیک)یی. دەشێت بەم شێوەیە ریشە داکوتانی سیستەمی باوکسالاری بە ئەگەرێکی بەهێز دابنێین. لەڕووی مێژووییەوە لەمیانەی بەڵگەی بەهێزەوە دەتوانین بسەلمێنین کە سەرهەڵدانە شکۆدارەکەی زهنییەتی باوکسالاری لەحەوزی دیجلە ـ فوراتدا بووە. لە نزیکەوە ساڵانی ٥٥٠٠ـ٤٠٠٠پ.ز دوای سەرهەڵدانی لە میزۆپۆتامیای خواروو لە تەواوی میزۆپۆتامیا بڵاوبۆتەوە،بووە بە کلتوورێکی کۆمەڵایەتی پێشەنگ. لە رێگای تۆمارە شوێنەوارناسییەکانەوە

روون دەبێتەوە کە بەر لە پەڕینەوە بۆ ئەم کلتوورە، لە چاخەکانی میزۆلیتیک و نیولیتیکدا و بە زۆریش لە میزۆپۆتامیای سەروو و بناری چیا ـ پێدەشتەکاندا کۆمەڵگای دایکسالاری پێشەنگ بووە. لە کلتووری نووسراویشدا چەندین سەرەداوی ئەم راستییە دەبینرێت. فاکتەرە ئایینی و زمانەوانییەکانی پشت بەستوو بە ژن چەندەی بڵێی پێشکەوتووە.

دەتوانین بڵێین بۆ یەکەمین جار لە ئاستێکی جددیدا کێشە کۆمەلایەتییەکان لە جڤاتە باوکسالارییەکان سەریهەڵدا کە لەگەڵ تێپەربوونی کاتدا لەدەوری پیاوی بەهێز بوو بە باوەڕییەک. ئەم سەرەتایەی کۆیلایەتی ژنان، لە منداڵانەوە دەستپێدەکات و زەمینەی کۆیلایەتی پیاویش ئامادە دەکات. ژن و پیاوە کۆیلەکان چەندە ئەزموونی کۆکردنەوەی بەها بەدەست بێنن لەسەرووی هەمووشیانەوە زێدە ـ بەرهەم، بەو رادەیە دەخرێنە ژێر کۆنترۆڵ و باڵادەستییەوە. چەندەی دەچێت دەسەلات و دەسترۆیی بایەخدار دەبێت. رێککەوتنی پیاوی بەهێز ا پیاوە تەمەندارە بە ئەزموونەکە+ شامان پێکەوە وەک توێژێکی خاوەن جیاکاری ناوەندێکی دەسەلات پێکدێنن کە رووبەڕووبوونەوەی ئاستەمە. لەم ناوەندەدا بۆ بەدەستهێنانی حوکمڕانی زهنی، ژیری گریمانەیی چیرۆکێکی میتۆلۆژیانەی ئاوارتە پێشدەخات. ئەم دونیا میتۆلۆژییەی لە مێژووی کۆمەڵگای سۆمەردا دەیناسین لە دەوروبەری پیاوی ئیلاهیکراودا تا ئاستی خولقێنەری ئەرز و ئاسمان شکۆدار دەکرێت. لەکاتێکدا پیرۆزی و ئیلاهیبوونی ژن تا دەکرێت بچووک دەکرێتەوە و دەسڕێتەوە، پیاو وەکو خاوەن هێزێکی موتڵەقی باڵادەستی دەچەسپێنرێت و لەمیانەی تۆڕێکی سەرسوڕهێنەری ئەفسانەوە هەموو شتێک بۆ پەیوەندی حوکمڕان ـ حوکمکراو، خولقێنەرـ خولقێنراو دەگۆڕێت. ئەم دونیا میتۆلۆژییەی بەسەر تە ـی کۆمەڵگادا دەسەپێنرێت و وایان لێدەکرێت قبووڵی بکەن دوای ئەوەی وەک گێڕانەوەیەک بەهای سەرەکی بەدەست دێنێت دەبێت بە ئایین. ئیتر رووبەڕووی شێوەیەکی زهنییەتی گریمانەیی خاوەن دەزگا بووینەتەوە کە سنوور ناناسێت.

ژیری میتۆلۆژی کە بە بنەڕەت باوکسالارانەیە و قاڵبە زهنییەکانی

دوای بەدەستهێنانی مەشروعییەت یەکەمین شت کە سەرکەوتنیان تێدا بەدەست هێناوە سیستەمی داگیرکاری و چەوسانەوە و دەسترۆیی بەدەزگابووە. لە قۆناخە جۆربەجۆرەکاندا لە چەندین جڤاتدا ئاشنای ئەم پێشکەوتنە دەبین، هەرچەندە لەشێوە و چڕی جیاوازیشدا بێت. ئەو ژیرییەی دەرفەت بە فشار و چەوسانەوە بدات ناشێت سۆزداری بێت. تا بە ئاستی ئەنالیتیک نەگات و لەگەڵ یارییەکانی تەڵەنانەوەی کلتووری نێچیروانیدا یەک نەگرێت، بیر لە زهنییەتێک ناکرێتەوە کە رێخۆشکەری کێشە کۆمەڵایەتییەکانە. ئەم زهنییەتە لەپێناو شاردنەوەی رۆڵ و ئەرکی سەرەکی خۆیدا ناچارە ئەفسانەی ساختە بئافرێنێت.

بێگومان دەتوانرێت بگووترێت بەناویەکدا چوونی ژیری ئەنالیتیکی و ژیری سۆزداری بەدەزگابوون و نەریتێکی ئەرێنی هزرە. گێڕانەوەی تەواوی دونیای زهنییەت بۆ دەسەڵاتە پلەدارییەکان راست نییە. هەرلەبەر ئەم هۆکارانەیە، بەئەندازەی شەڕە گەورەکان، لەم قۆناخانەدا قاڵبی زهنی و شەڕی هزری بێ ئامان دەبینین. بەمجۆرە دەتوانین بە ریشەی ئەو رووداو و دیاردانە بگەین کە بەشێوەی ئایینی، فەلسەفی، ئاکاری و هونەری رووبەڕوومان دەبنەوە و شەڕی ئایدیۆلۆژی پێدەڵێین. ئەو پێکدادانانەی بە فراوانی لە میتۆلۆژی و ئایینەکاندا دەیبینین لە ناوەڕۆکی خۆیدا تێکۆشانێکی ئابووری و سیاسییە. تا سەردەمی زهنییەتی سەرمایەداری شەڕەکانی دەسەڵاتی سیاسی و ئابووری بەردەوام لەژێر پەردە و رووخساری ئایینی و میتۆلۆژیدا رەنگیان داوەتەوە. دەوڵەت نوێنەرایەتی بەدەزگابوونی هەمیشەیی پێکهاتە پلەدارییەکان دەکات. وەرچەرخانی پێکهاتەکانی دەسەڵات لە نوێنەرایەتی تاکەکەسییەوە بۆ نوێنەرایەتی دەزگایی پەیوەندی بە کۆمەڵگای چینایەتییەوە هەیە کە لەگەڵ ئەو شارنشینییەدا پێشکەوت کە لە مێژوودا شارستانی پێدەڵێن.

شار و جیاوازی چینایەتی زیاتر لەمیانەی سیستەمی سەرمایەدارییەوە دەکرێن بەزاراوە. بەڵام روونکردنەوەی رەگەکانیان گرنگترە. هەر پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی (کۆمەڵگا) کە پەیدابوون و رەگەکەیان روون نەکرێتەوە، بەگوێرەی پێویست واتاکەیان نادۆزرێتەوە. تاکو

ئێستاش پێکهاتەی شار دوورە لە پەیوەندییەکی چڕ کە چارەسەری بۆ دەدۆزێتەوە. بەلانی کەم هێندەی دەرکەوتنی سەرمایەداری گرنگە و پێویستی بە روونکردنەوە هەیە. من خۆم لەو بڕوایەدام کە ناوبردنی شار بە سەرمایەدارییەکی بەرایی (PROTO CAPITALISM) لەجێگای خۆیدا دەبێت. هەروەکو چۆن بازاڕ گۆڕەپانێکی پەیوەندییەکانە کە لە ڕێگایەوە سەرمایەداری سەرهەڵدەدا و گەورەدەبێت، دەشێت شاریش وەکو شوێنی هەمیشەیی و پێشکەوتووی بازاڕ پێناسە بکرێت. پەیوەندی شار بە بابەتەکەمانەوە ئەوەیە کە بەهێزترین شوێن و بازاڕی ژێری گریمانەییە. شار بەهۆی خەسڵەتی بازاڕییەوە دامەزراوە و بونیادێکە زیاتر پێویستی بە زهنی ئەبستراکتی و ئەنالیتیکی هەیە و ئامرازێکی خەستی بە کۆمەڵگابوونە. زەمینەکەی پەیوەندییەکانە کە لەگەڵ زیاتر ئەقڵانیکردنی دونیای ئایینی و میتۆلۆژیدا، بە ئەندازەی خێراکردنی زانست چەواشەشی کردووە، بە وێنەی ڕێخۆشکردن بۆ فەلسەفە پێشکەوتنە مێژووییەکانیشی خێراتر کردووە. زیاتر لە ڕێگای ژێری ئەنالیتیکەوە کاردەکات.

ڕەنگدانەوەی جیهانی ئەبستراکتی زاراوەکان لە هونەردا شار جوان و ڕەونەقدارتر دەکات. لەناو زەمینەیەکی پەیوەندی سوودوەرگرتندا کە لە ژێری سۆزداری دابڕێنراوە و سنوور ناناسێت، جیهانێکی خەیاڵ بەسەر زهنییەتی کۆمەڵگادا دەسەپێنرێت کە هەموو جۆرە تەڵەزگە و پیلانێک تێیدا تەراتێن دەکەن. لەزەمینەی شاردا ئەقڵ پێشدەکەوێت. بەلام ناوەڕۆکەکەی چییە؟ ڕۆشنایی یان تاریکی کامەیان لەگەڵ خۆی دێنێت؟ تائێستا وەلامێکی ڕاست بۆ ئەم پرسیارانە نەدراوەتەوە. شەڕ و چەوسانەوە، دەسەلات و جیابوونەوەی چینایەتی گلۆڵەی ئەو پەیوەندییە سەرەکیانەن کە کۆمەڵگای شاریان ئافراندووە. لە ناوەخۆیدا بەو ئەندازەیەی ڕێگا لەپێش ئالوودەبووانی چینایەتی دەکاتەوە کە بەشی زۆرینەی کۆمەڵگایە، بەرامبەر بە ژینگەش تەواو پێکهاتەیەکی کۆمەڵکوژییە. هەرچەندە گوزارشتی ئایینی و میتۆلۆژی جڤاتەکانی دەرەوەی شار پەیوەندییەکیان لەگەڵ ژێری ئانالیتیکیشدا هەبێت، زیاتر لەچوارچێوەی ڕۆڵێکی ئەرێنیدایە.

دونیای باوەڕییان و لەسەرووی هەمووشیانەوە خوداوەندەکانیان، دونیا دروستە پڕ لە سۆزەکانیان پیشاندەدات. دۆست و میهرەبان و بەخشندەن. کەمکەرەوەی ئازار و ئاسانکاری زەحمەتییەکانن. چەندە فۆرم (شێوە)ە میتۆلۆژی و ئایینیەکانیان ببن بە شارنشینی، خوداوەندەکانیشیان دەبنە خاوەن خەسڵەتی ئەبستراکت، سزادەر، تاقیکەرەوەی مرۆڤ و ناچاری رەوشی پاڕانەوەیان دەکات. ئازاردەرە و زیاتر حەزی بە بەحوکمڕانی کردنە. لە بنەڕەتدا رەنگدانەوەی ئەو شتانەیە کە لە دونیای موڵکدا کەوتۆتە ناو ئاڵوگۆڕی بازاڕەوە. خوداوەندەکانی بازاڕ و شار لەناو یەکتردان.

جیابوونەوەی چینایەتی لەمیانەی پارچەبوونی پەیوەندی کلان، تیرە، بنەماڵە ـ خێڵی ئەو گروپە پلەداریانەوە پێشدەکەوێت کە بە پەیوەندی خوێن بەیەکەوە بەستراونەتەوە. لەکاتێکدا گروپەکانی سەروو دەبن بە دەوڵەت، گروپەکانی ژێر بۆ خەڵکە بەڕێوەبراوەکان دەگۆڕێن. ئەمەش پرۆسەیەکی نامۆکردن و بێ بەزەییە. پەیوەندی بە دواکەوتنی ژێری سۆزدارییەوە هەیە. بەو رادەیەی کۆڵ و چەوساوەکان گرێدراوی گروپەکانی چینی بەڕێوەبەربن باڵادەستی زهنیان رەوا (مەشروع) دەبێت و پشتگیری بۆ ریسواییەکانیان بەدەست دێنن. ئەمە ساتی تێخزانی کۆڵەکانە بۆ نەعلەتکراوترین رەوش. ئەریکردنی چەوسانەوەی زۆردارەکانی سەرخۆت، خاڵی هەرە ژێری بێبەریبوونە لە هەردوو ژیری. بێبەشبوون لەزهنییەت لە ناو کۆمەڵگادا گوزارشت لە رەوشی هەرە خراپ و پەراوێزکراوی دەکات. چەندە لەسەرەوە ژیرییەکی گریمانەیی ئەبستراکت هەبێت کە، کۆیلەکردن و قوربانیکردن پێشدەخات، بەو واتایەدێت کە لە خوارەوەش بەو رادەیە گێل، گەمژە، سواڵکەر و کۆیلە پێکهاتوون.

کاتێک لەبواری زهنیەتەوە مێژوو بۆ چەند قۆناخێک پۆلێن بکەین دەتوانین بەمجۆرە جیای بکەینەوە: چاخە یەکەمینەکان (٥٠٠٠پ.ز ـ ٥٠٠ زایین) کە بە قورسایی قۆناخی میتۆلۆژی و ئایینەکانە، چاخی ناوین (٥٠٠ ـ ١٥٠٠ زایین)ی قۆناخی تیۆلۆژییە کە سەنتێزی ئایین و فەلسەفەیە، چاخی مۆدێرن (لە ١٥٠٠ی زایینەوە تا رۆژگاری ئەمڕۆمان)کە فەلسەفە

و زانست لەیەکتر جیابوونەتەوە.

بە دۆگمابوونی میتۆلۆژیا ئایین پێکدێنێت. تەواو ناتوانرێت میتۆلۆژیا بە ئایین بەناوبکرێت. ئایین پێویستی بەشێوەی پەرستن و باوەڕی نەگۆڕ هەیە. تەواو گریمانەییە، باوەڕکردن بەو گریمانانە بنەمای ئایینە. تاکە لایەنی ئەرێنی: لەکاتی پەڕینەوەدا بۆ هزری ئەبستراکت ڕێگا لەپێش درزێکی قووڵی ناو کۆمەڵگا دەکاتەوە، هزری زانستی و فەلسەفی دەکات بەناچارییەک، بە داخوازی خۆشی نەبێت زەمینەی بۆ ئامادە دەکات. هزری زانستی و فەلسەفە لەمیانەی پەیوەندییەکی دیالیکتیکیانەوە لەگەڵ هزری ئایینیدا پێشدەکەون، شوێنپەنجەی قووڵی ئایین لەخۆوە دەگرن.

هەرچەندە فەلسەفە بە قورسایی سەرچاوەکەی بۆ ژێری گریمانەیی (ئەنالیتیک)ی بگەڕێتەوە، بەڵام بەردەوام شتەکان دەبەستێتەوە بەچاودێرییەکی بەرچاوەوە. بەتەواوی پەیوەندی خۆی بە ژێری سۆزدارییەوە نابڕێت. فۆرمێکی هزراندنە کە خاوەن بەرزترین توانای ئەبستراکت کردنە. کۆمەکی بۆ زانست لە ئایین زۆر لەپێشترە.

لە ڕاستیدا زانست جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ فەلسەفەدا نییە. دەشێت وەک ئەو فەلسەفەیە شرۆڤە بکرێت کە بنەمای تاقیکردنەوەی بەهێزترە. لەمیانەی تێڕوانین و تاقیکردنەوە هەوڵی واتاپێدانی هەردوو سروشت دەدەن. هی ڕاستیش ئەمەیە. بەڵام گرنگترین کەموکوڕی نەبوونی وەڵامە بۆ پرسیاری 'بۆچی' کە ئایین دەیپرسێت. وەڵامدانەوەی 'چۆن سروشتێک' نابێتە وەڵامێکی تەواوی ژیان. مەزەندەکردنی گەردوونێکی زەبەلاحی بە بێ هۆ و بێ ئامانج هیچ نابێتە هەڵوێستێکی شایستە و جێگای چاوەڕوانی. ئەو زانستەی وەڵامی پرسیاری 'بۆچی ژیان'ی پێنەبێت، لە ئەنجامدا دەبێتە ئامرازی دەستی دەسەڵاتی بەکۆیلەکردن. وەک تێزێکی بەهێز ئەوە پێشدەخەم کە جیاکردنەوەی زانست لە فەلسەفە و ئایین (سەبارەت بە پرسیارەکانی بۆچی و ئامانج) زۆر لە نزیکەوە گرێدراوی زهنییەتی سەرمایەدارییە.

بەمجۆرە دەتوانم بیسەلمێنم: ئایین و فەلسەفە، تەنانەت میتۆلۆژیاش هێزی پاراستنی زهن، ناسنامە و یادگای کۆمەڵگایە. هەرچەندە

بەردەوام بشێوێندرێت، تەنانەت بکرێت بە دژی خۆشی (واتە بکرێت بەدژی کۆمەڵگاش)، راستییەکی کۆمەڵناسییە. کۆمەڵگایەک پەیوەندی بە مێژوو و یادگایەوە پچڕێنرابێت، زانستی کۆمەڵگایەکی بەمجۆرە تەنیا دەکەوێتە خزمەت ئەو دەسەڵاتەی هەیە، کە ئەویش سەرمایەدارییە. لە سەرمایەداریشدا میتۆلۆژی، ئایین و فەلسەفە بە رەوشێک گەیەنراون تەنانەت هیچ بەهایەکی نییە، بۆچی؟ وەڵام ئاشکرایە. لەبەرئەوەی بەهەزاران ساڵ میتۆلۆژی، ئایین و فەلسەفە بەردەوام فاکتەرە (ئەندامە) کانی سەرمایەداری (سووخۆرەکان و ئەوانەی سوودیان لە یاریکردن بە نرخ وەرگرتووە) پەراوێزکردووە، رەوا (مەشروع) یەتیان پێنەداون کە لە درزەکانی کۆمەڵگا بۆسەیان دانابووەوە. تا ئایین، فەلسەفە و ئەفسانە جێگای خۆی لەناو هزری کۆمەڵگادا بپارێزێت، ژێری سۆزداری لەناو کۆمەڵگا بەردەوامی بە قورسایی خۆی دەدات و مەحاڵە سەرمایەداری ببێت بەهێزی سەرەکی. هیچ دەسەڵاتێک لەناو ئەم کەش و زەمینەی زهنییەت (ئەخلاق)دا ناتوانێت مەشروعییەت بۆ سەرمایەداری بەدەست بێنێت. ناتوانێت وەک حاڵەتی سیستەمێکی ئابووری کۆمەڵایەتی بیپارێزێت.

کۆمەڵناس ماکس وێبەر مەزهەبی پرۆتستانتی ئایینی کرستیانی وەک جیهانێکی زهنییەت پێناسە دەکات کە زەمینەی زهنی بۆ سەرمایەداری رەخساندووە. لەبواری ئەخلاقیشەوە رێگای بە سەرمایەداری داوە. ئەم نرخاندنە کە لایەنی راستی هەیە، دەشێت لە دوو لایەنەوە رەخنەی بکەین.

ا- خودی پرۆتستانێتی بەواتای لاوازترین ئایین دێت. زۆر نزیکی شێوازی زانستی سەرمایەدارییە. گرنگتریش، سەردەمی ئایینە میللییەکان دەست پێدەکات. بەجۆرێک لەجۆرەکان قۆناخی ئامادەکاری میللیگەراییە. هەرچی میللیگەرایی (نەتەوە پەرستی)یە ئایدیۆلۆژیای سافی سەرمایەدارییە. لەم روانگەوە تەماشاکردنی شەڕە ئایینیە گەورەکانی ئەورووپا رێگا لەپێش واتایەکی تەواوکارتر دەکاتەوە.

سەرمایەدارەکان بۆ یەکەمین جار دەرفەتی بەدەستهێنانی

سەركەوتنیان لەو جوگرافیایانە (هۆڵەندا، ئینگلتەرا، ئەمریكا) بەدەستهێنا كە ئایینپەرستی تێدا زۆر لاوازبوو یاخود تازە ببوون بە مەزهەبی پرۆتستانی. لە هەمانكاتدا ئەم وڵاتانە ئەو شوێنانەن كە هەموو جۆرە گومڕاییەكی مەزهەبی پەنایان بۆ بردوون. لێرەدا مەزهەبی ئۆرتۆدۆكسی ئایین ناپارێزم. ئەوەی خوازیاری ئاماژەپێكردنیم، لەبەرئەوەی ئەخلاقی پرۆتستانی لاوازترین ئەخلاقی كرستیانییە، بووە بە بەردەبازێكی ئاسان. جیاوازییەكەم لەگەڵ ماكس ویبەر لەم خاڵەدایە. ئەوەی ئەو بە ئەرێنی دەیبینێت من وەک نەرێنی شرۆڤەی دەكەم.

ب ـ ئەگەر وەكو پارادۆكسیش دیاربێت، بەشێوەیەكی گشتی زهنییەتی سەرمایەداری لە قۆناخی هەرە دوایی كاروانی درێژخایەنی زهنییەتی ئایینی یان لە قۆناخە هەرە لاوازەكەیدا مەشروعییەتی بەدەستهێناوە. مسۆگەر من زانست وەكو بەرهەمێكی پێشكەوتنی سەرمایەداری نابینم. ئەوەی روویداوە، زانست هاوكاتی قۆناخێكی بێبەختانەی پێشكەوتن هاتووە. ئەو بێبەختییەش ئەوەیە كە شۆڕشی زانستی و شۆڕشی ئابووری سەرمایەداری ئەورووپای رۆژئاوا لە هەمان سەدەدا روویانداوە. ئەم هاوكاتبوونەش بە درۆیەكی گەورەی بونیادنەرانی زهنییەتی سەرمایەداری ئەنجامگیر بووە، گوایە سەرمایەداری ئافرێنەری زانستە، ئەم درۆ گەورەیان لە جێگای راستی داناوە. بێگومان ئەو تاكانەی رۆڵیان لە زانستدا هەبووە، لەهەمان ئەو كۆمەڵگایانەدا دەژیان كە بەخێرایی سەرمایەداری تێدا پێشدەكەوت. بەڵام ئەم رەوشە مسۆگەر رێگا لەپێش تێز و تۆتۆلۆژییەكی[1] لەمجۆرە ناكاتەوە كە سەرمایەداری ئافرێنەری زاناكانە. زاناكان ناكۆكییان لەگەڵ هزری ئایینی هەبوو، بەڵام زۆربەیان لە پێگەیەكی وەهادا بوون تەنازولیان بۆ زهنییەتی سەرمایەداری نەكردووە.

ئەوەی پێویستە بگووترێت سوودوەرگرتنی سەرمایەدارییە لەهەموو شێوەكانی هزر، هەروەكو چۆن لە رێگای دەلالێتی ئالوگۆڕكردنی موڵك

١ـ زاراوەیەكی یۆنانی كۆنە بەواتای (گوتنەوەی هەمان شت) دێت : بەپێی لۆژیكی كلاسیک ئەو گوزارشتە روون و جێگیرەیە كە ناكرێت رەتبكرێتەوە. لە لۆژیكی سیمبۆلیشدا بەو ئەنجامە دەگوترێت كە زانیارییە جیاجیاكان وەک یەک پشتڕاستی دەكەنەوە.

و دراوەوە قازانج ـ سەرمایە بەدەست دێنێت. تەواوی فۆرمە هزرییەکان لە تەرازوو دەدات، ئەوانەی لە خزمەت و بەرژەوەندی خۆیدا دەیبینێت بەشێوەی قوتابخانەی ئایینی یان فەلسەفەی نوێ پاوانیان دەکات، لەژێر ناوی لیبرالیزم و پۆزێتیڤیزمدا سەرلەنوێ دەیانخاتە بازاڕەوە. ئەوەی خەمناکترە، توانیویەتی لەمیانەی ڕەوشی شارەزایی یاخود فێڵبازییەوە وەک قوماشێکی نوێ بە قازانجێکی سەرسوڕهێنەرەوە بیفرۆشێت، واتە بە دۆخی زهنییەتی باڵادەستی بگەیەنێت.

لە زۆر لایەنەوە دەتوانرێت پێناسەی زهنییەتی سەرمایەداری بکرێت. یەکەمین پێناسەی ئەوەیە وەک پۆزێتیڤیزم و لیبرالیزم پێناسە بکرێت کە پارچە پارچەیە، دەکەوێتە ناو هەر قاڵبێکەوە، ریسکی فریودانی زۆر بەرزە، لەلایەکەوە لە وشکترین دۆگما ئایینیەکان دۆگماترە، لەلایەکی دیکەشەوە لە ئەبستراکتترین فەلسەفەکان ناماقوڵترە، سوودپەرستە، هێندە بتپەرستە کە هەرگیز خودی بتپەرستییەکان بۆ خۆیان بەوڕادەیە نەبوون. لەکاتێکدا لە ڕێگای پۆزێتیڤیزمەوە زانست دەخەسێنێت و دژ بە جیهانی ئەخلاق و باوەڕی بەکاری دێنێت، لەمیانەی لیبرالیزمیشەوە ڕۆحی کۆمەڵگا دەکێشێت، تاکڕەوێتی بۆ خوداوەندی دەوڵەت ـ نەتەوە گۆڕیوە کە تا ئاستی پاکتاوی نەژادی هەڵکشاوە. هیچ زهنییەتێکی ئایینی هێندەی زهنییەتی سەرمایەداری شەڕو فشار و چەوسانەوەی لەگەڵ خۆیدا نەهێناوە. هیچ کۆمەڵگایەک بەئەندازەی زهنی تاکی کۆمەڵگای سەرمایەداری، تاکی نابەرپرسیار، ئالوودەی قازانج، زۆردار، کۆمەڵکوژ، توێنەرەوە و دیکتاتۆری نەئافراندووە.

سەرمایەداری وەکو سیستەمێکی پاوانخوازی جیهانی دراو و موڵک، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا لەکاتێکدا زهنییەتی فینانسگەرایی خۆی ئاوادەکات، کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەو قاڵبە زهنیانەوە دەبەستێتەوە کە تەنانەت نەمرود و فیرعەونیش بیریان لێنەکردۆتەوە، مرۆڤایەتی لەسەرلەبەری جیهاندا بەرامبەر بە داتەپیوترین بتەکانی دەخاتە کڕنوشەوە، لەمەشدا تەنیا دەتوانرێت باس لە پووکانەوە و ئیفلاسی زهنی بکرێت.

لە نزیکەوە لێکۆڵینەوەی ناوەڕۆکی زهنییەتی سەرمایەداری جێگای

گرنگی پێدان و بایەخێكی مەزنە.

پێش هەمووشتێک پێویستە ئاماژە بەوە بکەم: بەشێوەیەكی تاكڕەهەندی پێناسەكردنی سەرمایەداری ئەنجامێكی ئەو كارە زهنیانەیە كە لەژێر كاریگەری قورسی سیستەمدان. تەنانەت ماركسیست و ئانارشیستەكانیش كە دژی سەرمایەدارین و بانگەشەی پەیڕەوكردنی كۆمەڵناسی زانستی دەكەن، كەوتوونەتە ناو ئەم جۆرە شرۆڤانەوە.

بەتایبەت جێگیركردنی ژێرخانی ئابووری لەسەرچاوەی روونكردنەوەی تەواوی فۆرمە حقوقی، سیاسی و ئایدیۆلۆژییەكاندا لەلایەن خودی ماركسەوە، لەوانەیە یەكێک بێت لەسەرەكیترین هۆكارەكانی سەرنەكەوتنی سۆسیالیزم، كە شەڕی هەرە مەزن لەپێناویدا بەرپاكرا. پێویستە ئەم بابەتە باش بزانرێت كە هیچ جڤاتێكی مرۆڤ تا ماوەیەكی درێژخایەن ئاشنای شێوەی زهنییەت نەبێت و تاقینەكاتەوە، ناتوانێت شێوازی ژیانی ماددی (ژیانی ئابووری) ئاوا بكات و بیكاتە سیستەمێک. ئەو ئەنالیزكردنانەی سیستەم كە دوورن لە رۆشنكردنەوەی پێشكەوتنە زهنییەكان، لە خزمەتكردنی هەژموونگەرایی خودی ئەم سیستەمانە رزگاریان نابێت. هەرچەندە لەسەربنەمای دژایەتیش پێشبخرێت، بەم شێوەیە. سیستەمە دەسەڵاتدارەكانی لەسەر بنەمای پێدراوەكان پێش هەمووشتێک دەسەڵاتداریتی خۆیان لەمیانەی بەدەزگابوونی سیاسی و زهنییەوە گەرەنتی دەكەن. تەنیا لەم چوارچێوەیەدا دەشێت ژیانی ماددی رێكبخرێت. بانگەشەی ماركس كە دەڵێت: "دیالیكتیكی هیگڵ راست دەكەمەوە"، بەپێچەوانەی مەزندەكانەوە راستكردنەوە نییە، بەڵكو بەهەڵەدا چوونێكی گەورەی ماركسە. ئیتر باش دەرک بەم راستییە كراوە: ئایدیالیزمی هیگڵ كە وەک لووتكەی هزری میتافیزیكییە یەكێک لە بەردە سەرەكییەكانی بناخەی ئەو رێگایەیە كە بەرەو دەوڵەت ـ نەتەوەی ئەڵمان رۆیشت. پێشتر مارتن لۆتەر[1] (دامەزرێنەری ئایدیۆلۆژیای پرۆتستانێتی) و ئەمانۆئێل كانت[2] (بەرامبەر بە ئۆبژەكتیڤیزمی رەها، سۆبژەكتیڤیزم،

---

١ ـ Martin Luther قەشەیەكی ئەلمانییە (١٤٨٣ـ١٥٤٦). دامەزرێنەری بزووتنەوە بەناوبانگەكەی ریفۆرمی ئایینە كە بە پرۆتستانێتی دەناسرێت.

٢ ـ ئەمانوێل كانت، فەیلەسوفێكی ئەڵمانە، لەنێوان ساڵانی (١٧٢٤ ـ ١٨٠٤)دا ژیاوە.

ئارادەیەکیش ئەخلاق گەریتی رەچاو دەکات) جێگای باسە. هەرچەندە وەکو پارادۆکس دیاربێت، بەڵام کارل مارکسیش ئەم رێبازەی لەژێر ناوی پرۆلیتار و سیستەمی دژە سەرمایەداریدا بەرێوە بردووە. ئەنجام، گەیشتنی ئایدیۆلۆژیا (زهنییەت)ی ئەڵمانە بە فاشیزم و رێبەرایەتی شێوازی هیتلەر. ئەوەی بەباشترین شێوە دەرکی بە مەترسی ئەم کێشە زهنییە کردووە فەیلەسوفی ئەڵمانی نیچە[1] بووە.

خەباتی زهنی لەجۆری شێوازی دژایەتییەکی راستەقینەی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە. پێشنەخستنی و وەرنەچەرخانی بۆ فەلسەفە و پراکتیکی سیاسی کەموکورییەکی مەزنە. هەوڵە درەنگ وەختەکانی فەیلەسوفەفەرەنسییەکان (دیلیزا[2]، گاتاری[3]، میشل فۆکۆ[4] و هتد) و

---

١ـ Fredric Nietzsche فەیلەسوفێکی ئەلمانییە لەساڵی ١٨٤٤ لەدایک بووە. بە هاورێی زەردەشت دەناسرێت. بە بڕوای نیچە ئایین چارەسەری نییە ، هەربۆیە لێپرسینەوە و لێتوێژینەوەی لەبارەوە ئەنجامداوە. لە فکر، ژیان و نووسینەکانیدا دژایەتیەکی توندی لە بەرامبەر نەتەوەپەرستی نازی ئەڵمانی نیشانداوە، هەروەها رکابەرایەتی تەواوی ئەو ئایدیۆلۆژیانەشی کردووە کە سووکایەتی بەتاک دەکەن، کۆسپی بۆ دادەنێن و سروشتەکەی بەرەست دەکەن. ئایدیالیزمی ئەلمانی بە نکولیکردن لەژیان تاوانبار کردووە، بانگەشەی دامەزراندنی فەلسەفەیەکی کردووە کە پێشوازی لەژیان دەکات. هەروەها مرۆڤی بالای وەک نموونەیەکی بەرزی مرۆڤایەتی رزگاربوو دەستنیشان کردووە. بانگەشەی فەلسەفەیەکی کردووە کە لەباشە و خراپە دەکۆڵێتەوە، مرۆڤ لە وەهمە دروستکراوەکان و هێزیش لە ساویلکەیی رزگار دەکات. لەساڵی ١٩٠٠کۆچی دوایی کردووە.

٢ـ گالێس دیلیزا فەیلەسوفێکی فەرەنسییە ١٩٢٥ لەدایک بووە و لە ١٩٩٥دا لە فەرەنسا خۆی کوشتووە و کۆتایی بەژیانی خۆی هێناوە. لە بوارەکانی سایکۆلۆژی، فەلسەفەی رۆژئاوا، میتافیزیک و ئێتیکای کۆڵیوەتەوە. یەکێکە لە ناوەپێشەنگەکانی فەلسەی بونیادگەرایی نوێ. لەفەلسەفەکەیدا لەهەبوونێکی جێگیر دەپێچێتەوە و ئەو بیرۆکانە رەت دەکاتەوە کە لەسەر بنەمای پەیوەندی دوبژە ـ سوبژە دانراون و هەرلێرەوە رەخنە لەمێژووی فەلسەفە دەگرێت و چەمکی باو لەمێژووی فەلسەفەدا دەرووخێنێت. بە واتایەکی تر وەک فەیلەسوفی فەلسەفەی رووداو یان پێکهات خۆی دەکاتە جێی باسی. لەجیاتی بیرۆکە ئەبستراکتەکان زیاتر لایەنگیری بیرکردنەوەیە لە خولقکارییەکانی پێکهاتن. بۆیە رەخنەکردنی ئەقڵگەراییەک کە بەرەو وشکایی و بەستەڵەکێکی گریمانەییانە دەچێت، تایبەتمەندی سەرەکی بیرکردنەوەکانی دەستنیشان دەکات. گرنگترین بەرهەمەکانی " شیزۆ ئانالیز" و "زیزۆم" و " حەزێکی ئاوارە".

٣ـ فەلیکس گاتاری فەیلەسوفێکی فەرەنسییە لەنێوان ساڵانی (١٩٣٠ ـ ١٩٩٢)دا ژیاوە. بۆچوونەکانی زیاتری لەبواری سیاسی و چاککردنەوەی رۆحیدایە. خۆی بەجیا کاری نەکردووە بەڵکو هەموو کارەکانی بەهاوبەشی لەگەڵ دیلیزادا کردووە. بەزۆری لەکارەکانیاندا لەسەر لێکدانەوەی سەرمایەداری وەک بونیادێکی شیزۆفرێنیانە کە تەواوی کۆمەڵگا و کۆمەڵ و خێزان...هتد هەموو پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکان بێ نیشتمان دەکات. بۆ ئەمەش کۆمەڵگا لە بەها کۆمەڵایەتی و پیرۆزەکانی وەک دابونەریت، ئەخلاق و باوەڕییەکان بێ بەری دەکات و لەناویان دەبات. هەروەها هەموو کارەکانی لەسەر تاک بەڕێوەدەبات و تاکێکی سەرمایەدارانەی وەهای دروستکردووە کەپێی وایە تاکە خاوەنی جەستە و رەنج و ژیانی تایبەتی هەر خۆیەتی.

٤ـ میشێل فۆکۆ نووسەر و رەخنەگرێکی فەرەنسی سەدەی بیستەمە. لەفەلسەفە، مێژوو، زانستی سیاسەت، کۆمەڵناسی و ئەدەب و زۆر بواری تردا نووسینی هەیە. لەساڵی١٩٨٤ لەپاریس کۆچی دواییکردووە. بەیەکێک لە حەوارییەکانی نیچە لەقەڵەم دەدرێت. لە هەڵوێستی تیژ و رادیکاڵانەیدا بەرامبەر سیستەمی مۆدێرنیتە بە ئانۆرتۆ دەچوێنرێت. لە ناوەڕۆکی کارەکانیدا هەڵگری سۆزی ئەوەکەی تر (هەموو شتێک کە خود بەشێکی بەدەر لەخۆی دادەنێت)ە کە بەوێنەی نیچە ئەمیش بەشێوەی جیاجیا وێنە بەرجەستەکەی پیشان دەدات. ئەوەکەی تر بەلای (میشل)ەوە هێز و سۆزێکە لە ناخیدا، شتێکە

گرامسی[1] ئیتالی زۆر ناتەواوە و نەگەیەنراوەتە دەزگابوونی سیاسی. ئەوەی لە ڕێگای سۆسیالیزمی بونیادنراوەوە سەرکەوتنی تێدا بەدەست هێنراوە، هاوبەشێتی بابەتی تاوانباری سەدوپەنجا ساڵەی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە لەژێر ناوی چەپێتیدا. ئەزموونی چین و رووسیای سۆڤیێت بەڵگەی سەلمێنەری ئەم داوەرییەمانە. ئومێدەوارم لەبەشە پەیوەندیدارەکاندا بە بەرفراوانی تاوتوێیان بکەین.

ڕەخنەی ئەنارشیستە لەپێشەکانی وەکو پرۆدۆن[2]، باکونین[3] و کرۆپۆتکین دەرهەق بە لەدایکبوونی سەرمایەداری لەچەندین بواردا ڕۆشنکەرەوەتره. توانیویانە باشتر ڕەهەندی ئایدیۆلۆژی و سیاسی

---

کە ڕەنگدانەوەی گۆڕانی بەردەوام و ناکۆتا دەدانە رووخساری کارەکانی و شێوە بەهەموویان دەدات. نووسراوەکانی بەهای مانیفستۆیەکیان هەیە بۆ ئەو لەڕێ دەرچووانەی بەرامبەر بە کۆمەڵگا شەڕدەکەن. لەمانەش سەیرتر ئەوەیە کە هۆکاری لێکۆڵینەوەی سەبارەت بە پێناسە و نموونە و هزر و هەمووشتێکی لەسنوور بەدەر سەرنج ڕاکێشی ئەم شتانەیە بەلایەوە.

١ـ ئەنتۆنیۆ گرامسی سیاسەتمەدار و بیرمەند و بیردۆزمەندێکی ئیتالییە، لەنێوان ساڵانی (١٨٩١ ـ ١٩٣٧)دا ژیاوە. ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری پارتی کۆمۆنیستی ئیتالی بووە و سەردەمێکیش بۆخۆی سەرۆکی پارتەکە بوو. لەساڵی ١٩٢٦ لەلایەن ڕژێمی فاشیستی مۆسۆلۆنییەوە زیندانی دەکرێت. لەماوەی ٨ ساڵی زیندانی بوونیدا ٣٠٠٠لاپەرە شرۆڤە و نووسینەوەی مێژوو دەنووسێت. لە رووی رۆڵی جیهانگیری،کۆمەڵگای مەدەنی، پەیوەندی سەرخان ـ ژێرخان و ڕۆڵی ڕۆشنبیرانی کۆمەڵگاوە کۆمەکی گرنگی خستۆتە سەر ئەجێندای مارکسی. بە تایبەتیش دەربارەی تیۆری دەوڵەت بۆچوونی زۆر بابەتی پێشکەشکردووە و بناخەی مارکسیزمی ڕۆژئاوای داناوە. دەوڵەت بە واتا تەسکەکەی حکومەت ناگرێتە دەست، بەڵکو وەکو ئارێنایەکی سیاسی دەیکات بەدوو بەشەوە: ڕ ـ کۆمەڵناسی سیاسی ب ـ کۆمەڵگای دەرەوەی دەوڵەت یاخود کۆمەڵگای مەدەنی. یەکەمیان بە گوێرەپانی زوڵم و زۆری و دووەمین بە گوێرەپانی ملدان و ڕازی بوون دادەنێت. هەروەها پێی وایە ئەم دابەشبوونە تەنها زاراوەیە و لە واقیعدا زۆر جار هەردووکیان تێک هەڵکێشن و لێک دەگیرێن.

٢ـ لییر جۆزێف پرۆدۆن بیرمەند و ئابووری زانێکی فەرەنسییە لەنێوان ساڵانی ( ١٨٠٩ ـ ١٨٦٥)دا ژیاوە. یەکەم کەسە خۆی وەک ئانارشیست ناساندووە. هەرگیز ئەم یاخیبوونەی بەرەو نەهیلیزمی نەبردووە. بەپێچەوانەوە بۆ داکۆکی کردن لەو دابونەریتانەی گەل یاخیبووە کە کۆمەڵگای هاوچەرخ هەوڵی شێواندنی داون. بەم شێوەیەش لایەنی شۆڕشگێڕانە و نەریتیانەی بیرۆکەکەی خستۆتە گۆڕێ. لێکۆڵینەوەکەی لەژێر ناوی " موڵکایەتی چییە؟" بەهۆی وەڵامەکەیەوە کە گووتویەتی: " موڵکایەتی دزییە" دەبێتە مایەی زۆربوونی خوێنەرانی شاکارەکانی. گرنگترین شاکارەکانی "داد لەشۆڕش و کەنیسەدا" و "دانپێدانانەکانی شۆڕشگێڕێک".

٣ـ میشل باکونین: ئانارشیستێکی رووسە لەنێوان ساڵانی (١٨١٤ ـ ١٨٧٦) دا ژیاوە. بە باوکی یەکەمین پشتێنەی ئانارشیستی لەقەڵەم دەدرێت. بەخودلشەوە هەموو سیستەمێکی دەسترۆیی و دەسەڵاتی ڕەتکردۆتەوە. لە شاکارە بەناوبانگەکەیدا بە ناوی " دەوڵەت و خودا " ئاماژەی بەوە کردووە کە ئازادی مرۆڤ وابەستە بووە بەم دووانەوە، چونکە مرۆڤ ناچارە پەیڕەوی یاساکانی سروشت بکات، نەک لەبەرئەوەی لەلایەن ئیرادەیەکی دەرەکییەوە بەشێوەیەکی مرۆیی بێت یان خودایی، یاخود تاکڕەوانە یان هەرەوەزانە بەسەریدا دەسەپێنرێت، بەڵکو لەبەرئەوەی خۆی وەها لێیان تێدەگات. هەرلەبەرئەوەش کە پێچەوانەی یاسا سروشتیەکانن گەیشتۆتە داوەری دەرحاڵ نەهێشتن و هەڵگرتنیان. بەهەمان شێوەی جیاوازی چینایەتیش ڕەتدەکاتەوە و دەڵێت: " مرۆڤێکی جیاکراوە جا لە رووی ئابوورییەوە بێت یان سیاسی، هیچ گرنگ نییە ئەو مرۆڤە لە زەین و دڵیدا شێوێنراوە". هەروەها لە رووی گەیشتنەوە بە کۆمەڵگایەکی ئازاد و یەکسانی بێ چین و دەوڵەت، لەگەڵ مارکسییەکاندا وەک هەموو ئانارشیستەکانی تر لەوەدا جیا دەبێتەوە، کە نابێت بە ڕێگای دامەزراوەیەکی وەکو دەوڵەت، بەڵکو دەبێت لە ڕێگای بەڕێوەبەرایەتی خۆیی ڕەنجدەرانەوە و بەبێ تێپەڕبوون بە قۆناخێکی وەک دیکتاتۆری پرۆلیتاریادا بکرێت.

مەسەلەکە ببینن. بەڵام سەرنەکەوتنیان لە فەلسەفەی سیاسی و بەدەزگاکرنی راستیدا و بێئاگاییان لە بابەتەکانی ئەخلاق و مێژوو، لە دوا شیکاردا لەبوون بەکاڵایەکی ئایدیۆلۆژی سەرمایەداری رزگاریان نەبووە. دیسان دەبێت ئاماژە بەم خاڵە بکەم: خەباتێکی زهنی لەگەڵ خەباتێکی بەهێزی سیاسی، ئەخلاق، مێژوو و پراکتیکی نەکرێن بەیەک، لە رێگای توانەوە یاخود لەناوبردنەوە بێت، لە بێکاریگەرکردن و بەکارهێنان لەلایەن دژەکەیەوە رزگاری نابێت. چەندە جێی داخە ئەوەی بەسەر خەباتە زهنییەکانی دژە ـ سەرمایەداری هاتووە، هەمان چارەنووس بووە کە لە مێژوودا نموونەکانیانمان بینیوە (لەسەرووی هەموویانەوە کرستیانی، بودیزم، زەردەشتی، مانیگەرایی). پێویستە یەکسەر روونی بکەمەوە: بانگەشەی ئەوە ناکەم کە ئەم بیروباوەڕانە بە فیڕوچوون و کەسیش ناتوانێت لە قەدەر رزگاری بێت. ئەگەر بەمجۆرە بوایە، نە ئەم دێڕانە دەنووسران، نە واتایەکیش بە ئەخلاقی ئازادی دەدرا. ئەوەی من تەنیا رەخنەیەکە.

ئەگەر لە رۆژگاری ئەمڕۆمان، راستتر لەناو یەکپارچەیی مێژوودا خوازیاری گەیشتن بەسیستەمێک بین کە ئەلتەرناتیفێکی سەرکەوتووبێت بەرامبەر دواقۆناخی شارستانی سەرمایەداری (ئەو خۆی وەها پێناسە دەکات) و کۆڵەکە مێژووییەکانی، پێویستە بەشێوەیەکی گشتگیر فەلسەفەی سیاسەت، بەدەزگابوونی سیاسەت و چالاکییەکانی ژیانی ماددی لەمیانەی رێبەرنامەیەک بەئەشقەوە لەناویەکتریدا بناخە رێژ بکرێن.

لەگەڵ ئەوەی پێگەی توندوتیژی سەربازی و سیاسی لە هەژموونگەرایی سیستەمی سەرمایەداریدا گرنگە، بەڵام ئەوەی لە بنەڕەتدا لەسەر پێیانی دەهێڵێتەوە چەککردن، تەنانەت ئیفلیجکردنی کۆمەڵگایە لە رێگای بەپیشەسازیکردنی کلتوورەوە. دەکرێت بگووترێت زهنییەتی ئەو جڤاتانەی لەژێر کاریگەری سیستەمدایە خراوەتە دۆخێکەوە لەو مەیمونانە دواکەوتووترە کە نزیک بەمرۆڤن، بەمجۆرەش لە رەوشێکدان یارییان پێدەکرێت.سیستەمی باخچەی ئاژەڵان لە راستیدا نموونەیەکی زۆر رۆشنکەرەوەیە بۆ ئەو دۆخەی کە تەواوی کۆمەڵگا بەشێوازی

باخچەی ئاژەڵان ڕێکخراوە. هەروەکو چۆن گیانلەبەرانی باخچەی ئاژەڵان بۆ تەماشاکردنە (فاکتەری نمایشکردنن)، لەلایەن چەندین فەیلەسوفەوە گوتراوە و دەست نیشانکراوە کە کۆمەڵگاش بۆ کۆمەڵگایەکی تەماشا (نمایش) کردن گۆڕاوە. هەرسێ پیشەسازییەکە[1]: پیشەسازی سێکس (زایەندی) پیشەسازی سپۆر (وەرزش)و پیشەسازی هونەر ـ کلتوور لە ڕێگای کامپینێکی بەرفراوانی ریکلامەوە بەشێوەیەکی خەست و بەردەوام ژیری ئەنالیتیک و سۆزداری بۆمباردومان دەکەن، بەتەواوی بێ ڕۆڵیان دەکەن، بەمجۆرەش فەتحکردنی زهنییەتی کۆمەڵگای نمایشکردن تەواو دەبێت.

ئەمە کۆمەڵگایەکە لە چەککردن خراپتر سیستەم چۆنی بیەوێت بەوشێوەیە بەڕێوەی دەبات. لە ڕاستیدا یەکەمین ئەزموونی فاشیزم سەبارەت بە کۆمەڵگای نمایشکردن شکستی نەخوارد، بەڵکو سەرکێشەکانی پاکتاوکران. بەڵام لە سەردەمی شەڕی سارد و قۆناخی دواتردا لە ڕێگای دەتەوە ـ دەوڵەت و کۆمپانیاکانی فینانسەوە سیستەم لەسەر تەواوی جڤاتەکان سەپێنرا. ئەوەی لەم قۆناخەدا ڕوویداوە چەندین قات فەتحی سیستەمی ئیمپراتۆریەتە بەهێزەکانی لەجۆری سۆمەر، میسر، هیند، چین و ڕۆمای لەسەر جڤاتەکان تێپەڕکردووە. قۆناخی ئیمپراتۆرییەتی سەرمایەداری ـ کە قۆناخەکانی پێشتری داگیرکاری و ئیمپریالیزمە ـ لووتکەی هەژموونگەراییە، هەرچەندە بەشێوەیەکی بابەتی و بەرفراوان لەناو نیشانەکانی کائیوس و پووکانەوەدا بژی، بەڵام بۆ بەرتەرەفکردنی ئەم ڕاستینەیەی خۆی، زۆر یاری بە کۆمەڵگا دەکات، واتا هەژموونگەرایی زهنی دەخاتە ڕەوشێکەوە کە دەرکەوتنی بۆ نییە.

لەگەیشتن بەم خاڵەدا، هەروەکو ئاماژەمان پێکرد بە پیشەسازیکردنی سێکس و بەمجۆرە پێشکەشکردنی یەکێک لە فاکتەرە دیاریکەرەکانە. مرۆڤ خراوەتە ڕەوشێکەوە سەرکەوتن لەهێزی سێکسکردندا ببینێت. کەچی لە تەواوی زیندەوەرەکاندا لە هەستکردن بەژیان و ئەبەدیکردنیدا

---

1ـ پیشەسازی بەو مەبەستە دەگوترێت کە هەرسێکیان لە ناومرۆکی خۆیان دەرکەوتوون؛ وەکو کارگە داهات و قازانج بۆ سەرمایەداری بەدەست دێنن.

سێکس ڕۆڵی فاکتەرێکی فێرکردن دەبینێت. لە زیندەوەرە تاکخانەکانەوە تا دەگاتە جۆری مرۆڤ دەشێت بەمجۆرە ڕۆڵی زایەند پێناسە بکرێت. لەم سۆنگەیەوە واتادارە، تەنانەت پیرۆزیشە. بە درێژایی مێژوو جڤاتەکانی مرۆڤایەتیش شرۆڤەیەکی بەمجۆرەیان بۆ خۆیان بە بنەماگرتووە. تەواوی لێکۆڵینەوە ئەنترۆپۆلۆژییەکان ئەم شرۆڤەیە ئەرێدەکەن. ئەگەر پەیوەندییەک، یان چەندین پەیوەندی جێگای باسبن کە ناکرێت بکرێت بەکاڵا (نابێت بکرێت بە پیشەسازی) پێویستە پەیوەندی سێکسی لەسەرووی ئەمانەوە بێت. چونکە پەیوەندی بە پیرۆزی، شکۆداری و بەردەوامی ژیانەوە هەیە. زیاتر بە بەرپرسیارێتی بەلاڕێدا نەچوون و هەڕەشە نەکردن لە ژیانەکانی دیکە رازاوەیە.

دەکرێت بگووترێت کە بەکارهێنانی زایەندی یەکێک لەسەرەکیترین ئامرازەکانی هەژموونگەرایی سیستەمە. تەنیا لە رێگای بەکاڵاکردنییەوە بۆ پیشەسازییەکی زەبەلاح وەرنەچەرخێنراوە: لەناو کۆمەڵگادا هەم ئیلاهییەتی فالوس[1] ی هیند تێکدراوە، هەم بەجۆرێک کە چل جار ئەوی لە دوای خۆی بەجێهێشتووە کراوە بە ئایینی رەگەزپەرستی باڵادەستی پیاو. بەتایبەتیش لەهەر پیاوێکدا ئەم نمایشە ئایینیە نوێیە بەوەی لە گۆشەی سەرەوەی هونەر و لەسەرووی هەمووشیانەوە لەئەدەبدا، جێگیرکراوە تەواو کراوە بە ئامرازێکی بێهۆشکەر. بەرامبەر بەم ئایینە نوێیەی زایەندپەرستی ماددە کیمیاوییە بێهۆشکەرەکان وەک سفری پاش فاریزەن. لەرێگای کاڵبینە ریکلامییەکانی میدیاکانەوە تەواوی تاکەکانی کۆمەڵگا دەکرێن بە گومڕایی و لادەری زایەندی. لاو، پیر، تەنانەت منداڵیش جیاوازی نییە، هەموو کەسێک بەکار دەهێنرێت. ژن کراوە بە بەهێزترین بابەتی سێکس. هەر تۆزقاڵێک (شوێنێک)ی سێکس نەوروژێنێت مەحکومی زهنییەتێک کراوە هەروەکو بڵێی پارە ناکات. لانەی پیرۆزی خێزان بۆ تەکییەی سێکس گۆڕاوە. "پیرە ژنەکان" وەک پاشماوەی خوداوەندە ژن و دایکی پیرۆز ماونەتەوە، کە فرێدراونەتە قوژبنێکەوە. رەوشێکی

---

١ــ ئۆرگانی زایەندی پیاوە، لە هیندی کۆن دەپەرسترا. ئایینی فیدای هیندی نەعلەتی لەو کەسانە دەکرد کە فالوس دەپەرستن.

خەمناک و پڕ بەئێشە. لە ڕێگای دووگیانی دروستکراو (پیتاندنی منداڵ لەناو لوولەکان)ەوە پرۆسەی بوونی ژن بە ئامرازی سێکس بە لووتکە گەیەنراوە.

ڕەوش و پێگەیەکی پێچەوانەش پێویستی سیستەم وەهای لێکردووە کە تەحەمول نەکرێت. داخوازی وەچەخستنەوەی زۆر و بەتایبەتیش کوڕ کە لە ناوەڕۆکدا نەریتێکی کۆمەڵگای پیاوسالارییە، لە ڕێگای خستنەگەڕی تەکنۆلۆژیای تەندورستییەوە لە ژنانی چینی خوارووەدا بۆ ڕۆڵی ئامێری منداڵبوون گۆڕاوە. بەمجۆرە بەخێوکردنی منداڵان کە کارێکی قورسە دەخرێتە ئەستۆی هەژاران، لەلایەک پێویستی کرێکاری لاو دابین دەکرێت، لەلایەکی دیکەشەوە خراپبوونێکی ئەوتۆ لەخێزاندا پێشدەخرێت کە دەرکەوتن لێی زەحمەتە. بە بەردێک چەند چۆلەکەیەک دەکوژێت. ژن و پیاوی چینی سەرەوە لە ڕێگای منداڵی (لوولەکان) دروستکراو، هەڵگرتنەوەی منداڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵەوە زاراوەی منداڵیشیان شێواندووە و بەمجۆرە هەوڵی قەرەبووکردنەوەی ناتەواویەکانیان دەدەن، هەوڵدەدەن تا دوایی بە سێکسی بمێننەوە، ئایینی نوێی سێکس دەکەن بە مەراسیم و لەهۆش خۆیان دەچن. ئەنجام، ژمارەیەکی ئێجگار زۆری بێ‌واتای دانیشتوان، بێکارییەک کە لەهیچ قۆناخێکی مێژوودا نەبینراوە، لەگەڵ قەیرانی ژینگە، بارێکی وەهای مرۆڤیان هێناوەتە کایەوە کە هەڵناگیرێت. زیاتر لەبەشی 'کۆمەڵناسی ئازادی'دا هەڵوەستە لەسەر چۆنییەتی بەرەنگابوونەوەی ئەم کێشەیە دەکەین.

بە پیشەسازیکردنی کلتوور، بەگووتەیەکی دیکە بەرهەمهێنانی بەرفراوانی بەشێوەی کالا دووەمین ئامرازی بەکاریگەری کۆیلایەتییە. کلتوور بەواتا تەسکەکەی گوزارشت لە جیهانی زهنییەتی کۆمەڵگاکان دەکات. بیرکردنەوە، زەوق و ئەخلاق سێ بابەتی سەرەکی کلتوورە. گەمارۆدانیان، کڕین و فرۆشتنیان لەلایەن دەسەڵاتی سیاسی و ئابووری ناو سیستەمەوە کاری سەدان ساڵە. لە تەواوی مێژووی شارستانیدا بەستنەوەی فاکتەرەکانی هونەر بەخۆیانەوە بۆ مەشروعییەت بەدەستهێنانی خۆیان ناچارییە. هێزی ئابووری و دەسەڵات هەر زوو

هەست بەم بابەتە دەکەن و هەرگیز لەوەرگرتنی تەگبیری پێویست درەنگ ناکەون. کلتوور لەلایەن دەسەڵاتەوە بۆ سەردەمی دەرکەوتنی پلەدارییەکان دەگەڕێتەوە. ئامرازە سەرەکییەکانی بەڕێوەبەرایەتین. ئەگەر هەیمەنەی کلتووری نەبێت، مۆنۆپۆلەکانی دەسەڵاتی سیاسی و ئابووری ناتوانن کۆمەڵگاکان بەڕێوەببەن. ئەو سیستەمانەی پشت بە چەوسانەوە و ستەمکاری دەبەستن هەبێت و نەبێت لەمیانەی تالانکارییەوە بۆ ماوەیەکی کورتخایەن دەتوانن لەسەر پێ بمێننەوە، کاتێک شتێک نەمێنێت تالانی بکەن، یان بەردەبنە گیانی یەکتری یاخود دەڕووخێن و پەرتەوازە دەبن.

لە شارستانی سەرمایەدارییدا ڕۆڵی کلتوور ژیانییە. کلتوور کە کۆی زهنییەتی تەواوی گۆڕەپانە کۆمەڵایەتییەکانە، سەرەتا دەیتوێنێتەوە (بەگوێرەی دەسەڵاتی سیاسی و ئابووری دەگونجێندرێت) دواتر بە ئامانجی گواستنەوەی بۆ تەواوی جڤاتەکانی دونیا (نەتەوەکان، گەلان، دەوڵەت ـ نەتەوە، کۆمەڵگای مەدەنی و کۆمپانیاکان) دەکرێت بە پیشەسازی. گۆڕەپانی لە جۆری ئەدەبیات، زانست، فەلسەفە، بوارەکانی دیکەی هونەر، مێژوو، ئایین و حقوق دەکرێن بە ئۆبژەیەک وەک کاڵا مامەڵەیان پێوە دەکرێت. ئامرازەکانی لەجۆری پەرتووک، فیلم، ڕۆژنامە، تەلەفزیۆن، ئەنتەرنێت و ڕادیۆ وەک کاڵاکانی ئەم پیشەسازییە ڕۆڵ دەبینن. لێرەدا شانبەشانی ئەوەی کاڵا کلتوورییەکان ڕێگا لەپێش قازانجێکی مەزنی ماددی دەکەنەوە، ڕۆڵی سەرەکی تێکدەرانەی خۆیان لەبواری بەندکردنی زهنی ئەنجامدەدەن، کە لە ئاستێکدایە لە مێژوودا هاوتاکەی نەبینراوە، لە ڕێگای نواندنەکانیانەوە لەناو هەموو جۆرە گروپ، خێڵ، نەتەوە و چینێکدا جەماوەرێک دروستدەکەن کە لە مانگا خراپترە، واتای خۆی لەدەستداوە، بێ بچمە و خاوەن ئیشتهایەکی مەیمونانەیە[1]. ئەندازیارە سەرەکییەکانیان دەوڵەت ـ نەتەوە، کۆمپانیا جیهانگیرییەکان و پاوانەکانی میدیایە. جگە لە بەدەستهێنان و خەرجکردنی پارە هیچ شتێکی دیکەی کۆمەڵگا ئەوان پەیوەندیدار ناکات. تەنانەت توێژە هەرە

---

١ـ مەیمون ئیشتهایەکی زۆری هەیە و زوو بەزوو تێر نابێت لەم ڕوانگەیەوە بەکارهاتووە.

هەژارەکانیش بە دۆخێک گەیەنراون تەنیا بیر لەوە دەکەنەوە رۆژێک پارەیەکی زۆر بەدەست بێنن و چۆنیان بوێت بەو جۆرە بژین.

دەبێت سەرنجی ئەو لایەنە بدەین کە هەژارکردن (نەدارکردن) وەک دیاردەیەکی کلتووری بەکاردەهێنرێت. تەنانەت چاخەکانی ناوینیش کە پەسەندی ناکەین کاتێک هەژاری بە هۆکاری یاخیبوون دادەنێت، لەژێر سایەی هەژموونی کلتووری فەرمیدا گەیشتن بە مووچە دەکاتە ئامانج، ئەوا سەرکەوتنی کلتووری سیستەم پیشاندەدات.

مەترسیدارترین لایەنی ئەو دیلێتییەی بەهۆی باڵادەستی تێکهەڵکێشی پیشەسازی کلتووری و پیشەسازی سێکسەوە بەدەست هاتووە، ئەوەیە کە دڵخوازانە بەدیدێت و تەنانەت بە تەقینەوەی ئازادی بەناو دەکرێت. هیچ گومانی تێدا نییە کە ئەم بەهێزترین پاڵپشتی بەڕێوەبەرایەتی و ئامرازی مەشروعییەتیەتی. قۆناخی ئیمپراتۆریەتی سەرمایەداری تەنیا لەمیانەی پیشەسازی کلتووریەوە بەدیدێت. هەربۆیە تێکۆشان بەرامبەر هەژموونگەرایی کلتووری پێویستی بە زەحمەتترین تێکۆشانی زهنی هەیە. بۆ تێکۆشان بەرامبەر شەڕی کلتووری ئەم سیستەمە کە کلتووری فەتحکردووە، تواندوێتیەوە و کردوویەتی بە پیشەسازی، تا چ لە رووی ناوەڕۆکەوە چ لە رووی فۆرمەوە تێکۆشان پێشنەخەین و بەڕێکخستنی نەگەیەنین، هیچ تێکۆشانێکی ئازادی، یەکسانی و دیموکراسی شانسی نییە. لە "کۆمەڵناسی ئازادی"دا بەشێوەیەکی بەرفراوان هەوڵی گفتوگۆکردنی ئەم جۆرە کێشانە دەدەین.

هەر لەسەرەتاوە وەرزش لەناو کۆمەڵگادا رۆڵی یاری ئامادەکاری بۆ بەشداریکردن دەبینێت. یارییە وەرزشییەکان بۆ بەشداریکردنێکی سەرکەوتووانە لە ژیاندا رێکدەخرێن. بەجۆرێک لە جۆرەکان رۆڵی راهێنان بۆ بەکۆمەڵگابوون دەبینێت. بە تایبەتیش لە قۆناخی پووکانەوەی ئیمپراتۆرییەتی رۆما بەدواوە وردە وردە وەرزش (سپۆر) دەکرێت بە پیشەسازی. دەزگای زۆرانبازی "گلادیاتۆر"بریتییە لەمە.

سەرمایەداری هەر لە سەرەتاوە وەرزش لەگەڵ دەسەلات دەکاتە یەک (پرۆفیشیۆناڵی دەکات) ناوەڕۆکە ئەماتۆرەکەی دەڕووخێنێت و بە

پیشەسازیکردنی دەسەپێنێت. گۆڕەپانێکی دیکەی گرنگی بێهۆشکردنە کە کراوە بەکالا. لەجیاتی بەشداریکردنی کۆمەڵگا لەسەر بنەمای مۆراڵی بەرز و جەستەیەکی تەندورست وخۆڕاگر، قازانجکردنی پارە بەبنەما دەگیرێت، لەم پێناوەشدا بەشێوەیەکی شێتانە هانی کێبڕکێ دەدات و کۆمەڵگاش دەکات بە بینەرێکی پاسیف. کلتووری ئارێنا[1] (بوون بە خواردنی شێرەکان و تاوانی گلادیاتۆری) لە تەواوی گۆڕەپانەکانی وەرزشدا بڵاوبۆتەوە. شکاندنی پێوانە و چەپڵەڕێزان دوو خەون و خەیاڵی زاڵن. بوون بە خاوەن یان لایەنگری تیپ، لە بوون بە خاوەن فەلسەفە و ئایین گرنگتر دەبینرێت. لایەنگیریکردنی تیپێک تەواو بووە بە نەخۆشییەک. بەمجۆرە بەڕێوەبەرەکان ئامرازێکی دیکەی ئاسانکردنی بەڕێوەبردنیان دەستکەوتووە. بۆ نموونە ئەو رۆڵەی تۆپی پێ بۆ بەڕێوەبەرایەتیەکانی دەبینێت کامە ئایین یاخود فەلسەفە دەتوانێت ئەم رۆڵە بگێڕێت؟

ئەگەر لەمیانەی نرخاندنێکی گشتی و قەبەوە جارێکی تر دووپاتی بکەینەوە ئەوا دەڵێین: لە ڕێی بەپیشەسازیکردنی سپۆر، سێکس و هونەر بە لووتکەی هونەری بەڕێوەبەرایەتی دەگەن. تا هەرسێکیان نەکرێن بە پیشەسازی، بەڕێوەبەرایەتی سەرمایەی جیهانگیری و دەسەڵاتی دەوڵەت ـ نەتەوە بەدینایەت. دیسان ئاماژەی پێدەکەم وەک دیاردە زایەند، کلتوور و سپۆر بەخراپی پیشانانادەم و رەخنەیان ناکەم، بەڵکو وەک ژیانیترین گۆڕەپانەکانی بەردەوامی و هەبوونی کۆمەڵگا خراپکردن و پیشەسازی کردنیان رەخنە دەکەم.

دونیای ناواقیعی (وەهمی) کە لە بنەمادا لەلایەن ئۆرگانەکانی میدیاوە بەڕێوە دەچێت ئامرازێکی دیکەی گرنگی زهنی هەژموونگەرایی زهنییەتی سەرمایەدارییە. گۆڕینی ژیان بۆ ژیانێکی وەهمی ـ شاشەیی، گەیشتنی ئەقڵی ئەنالیتیکە بە ترۆپکی سنوورەکانی خۆی. ڕووداوێکی هەرە مەترسیداری وەکو شەڕ کاتێک بەشێوەیەکی وەهمی ـ شاشەیی پێشکەش بکرێت، تەنیا سەربەخۆ زۆر بە ئاسانی دەتوانێت ئەخلاق

---

١ـ ئارێنا ناوی گۆڕەپانێکی گەورەیە کە لەسەردەمی رۆمادا لەشێوەی پاریگاکانی ئەمڕۆدا دروست کراون و وەک یارییەک لەبەردەم ئیمپراتۆردا تیایاندا مرۆڤ دەرخواردی شێردراون وگلادیا تۆرەکان (ئەو کەسانەی جەنگاوەری شەڕبوون) بەیەکتر بەکوشت دراون.

ویرانبکات. ژیانێک کە جەستە و زهنی مرۆڤ تاقی نەکردبێتەوە، هەر لە زووەوە ژیانی ساختەی پێکووتراوە. بەوەی ناوی وەهمی ـ شاشەیی (SANAL) لێنراوە لە ساختەیی رزگاری نابێت. ناکرێت تەنیا تەکنۆلۆژی دابڕاو لە هەموو هەستێکی تر بەوە تاوانبار بکەین کە دەرفەتی بۆ ژیانێکی وەها وەهمی ـ شاشەیی رەخساندووە. لەمیانەی ئەو خەسڵەتەوە هەڵدەسەنگێنرێت کە قۆستنەوەی لە بەرامبەرماندا قووت کردۆتەوە و زهنی تاکی ئیفلیج کردووە. تەکنۆلۆژیای بێ کۆنترۆڵ مەترسیدارترین چەکە. باڵادەستی سەرمایەداری لەسەر تەکنۆلۆژیا و پێویستی سەرمایەداری بۆ بەڕێوەبردنی بەملیاران کەس، هۆکاری سەرەکی سەپاندنی جیهانی وەهمی ـ شاشەییە. ئیتر لەناو خودی ژیان خۆیدا ناژین، بەردەوامکردنی ژیان بە ژیانێکی وەهمی ـ شاشەیی جێگای باسە. ئەمەش دەبێتە جۆرێک لە مردنی سەر پێیان. سیمیلارک (لێکچواندن) بەرجەستەترین دۆخی ژیانی وەهمی ـ شاشەییە. لەمیانەی لاساییکردنەوەی هەر رووداو، ـەندی و شاکارێک مرۆڤ هۆشیار نابێتەوە، بەڵکو دەکرێت بەگەمژە. ێگای لاساییکردنەوەی تەواوی شاکارەکانی شارستانی پێشکەوتن ێنایەت، بەڵکو هەژموونگەرایی کلتووری لاساییکردنەوە بەرقەرار بێت. ئەو جیاوازییەی لە ناوەڕۆکی ژیاندا شاراوەیە هەرگیز دووبارە ـنەوە پەسەند ناکات.لاساییکردنەوە دژی پێشکەوتنە. ژیانی وەهمی شاشەییش پشت بەلاسایی کردنەوەیەکی بێ سنوور دەبەستێت. رکەسە و لاسایی یەکتر دەکاتەوە، بەمجۆرە هەموویان لەیەکتر ـەچن. بەم چەشنە مێگەلی مەڕ دەخولقێندرێت. بەبێ ژیانی وەهمی ـ شاشەیی چاخی فینانس ناتوانێت بژی. تەنیا لە رێگای خولقاندنی گێلی و گەمژەییەکی بێ سنوورەوە دەتوانێت بەڕێوەبچێت، ئەویش لەمیانەی ژیانێکی ساخـ و وەهمییەوە بەدیدێت.

ئەو وەڵامەی لەبەرامبەریدا بدرێتەوە ئەرکی سەرەکی ژیانی ئازادە. پێناسەکردن و رێکخستنی ژیانی ئازاد بۆ لەسەرپێ مانەوەی کۆمەڵگاکان پێویستییەکی ژیانییە. ئەو پرسیارانەی پێویستە کۆمەڵناسی ئازادی وەڵامیان بداتەوە زۆربەیان لەم گۆڕەپانەدان.

لەچەند لایەنێکەوە دەتوانین ئەم سەرکەوتنەی سیستەم شرۆڤە بکەین.

یەکەم، خاوکردنەوەی پەیوەندی چالاکی کۆمەڵگا بە ئەخلاق و ئایینەوە، لە ڕێگای حقوقی عەلمانییەوە داخستنیان بۆ پلەی دووەم، بەستنەوەی کۆمەڵگا بەخۆیەوە. بەو ڕادەیەی خزمەت بە سیستەم بکات ڕێگا بە ئەخلاق و ئایین دەدرێت. حقوق و عەلمانییەت لە ناوەڕۆکی خۆیدا ئامرازی پەرینەوەی کۆنترۆڵی کۆمەڵگایە بۆ ژێر دەسەڵاتی سەرمایەداری. بەچەکی حقوق و عەلمانی توێژە ئەرستۆکرات و جووتیارەکانی کۆمەڵگای کۆن پاکتاو دەکات، تا دەرفەت بۆ سەرمایە و هێزی کار برەخسێنێت. بەتەواوی لەناویان نابات. لەبەرئەوەی ئامرازێکن بەڕادەیەکی زۆر لەلایەن شارستانییەوە بەکارهێنراون، بۆ خۆشی کە دوا گوتەبێژی شارستانییە زۆر پێویستن. بەڵام بەمەرجێک نەبێتە هاوبەشی دەسەڵاتە سیاسی و ئابوورییەکەی و کۆسپی بۆ نەنێتەوە. ریفۆرمی ئایین و دەوڵەتی حقوق بەم ڕۆڵە وەک دوو هێمای مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییان لێدێت. وەک دوو ئامرازی پەرینەوە بۆ دۆخی کۆمەڵگا و ئابووری سەرمایەداری ڕۆڵی ڕاستەقینەی خۆیان دەبینن. لە هەمانکاتدا ئامرازی چارەسەرکردنی گرفتەکانی زهنییەتی سیستەمن.

دووەمیان 'پەیڕەوی زانستی'یە. دوالیزمی سۆبژە ـ ئۆبژە کلیلی هەژموونگەرایی زهنییەتە. پرەنسیپی ئۆبژێکتیڤیتی[1] کە لە ڕووخساردا فاکتەرێکی دەست لێبەرنەدراوی پەیڕەوی زانستییە، لە ڕاستیدا قۆناخێکی ئامادەکارییە بۆ باڵادەستبوونی سۆبژێکتیڤیزم. بۆ بەڕێوەبردن پێویستە ببێت بە سۆبژە. بەشێوەیەکی سروشتی ئەو ڕۆڵەی دەکەوێتە سەر بەڕێوەبراوەکانیش بە ئۆبژە بوونە. بوون بە ئۆبژە، واتای بەشتومەک بوونە، وەک شتومەک بەڕێوەبراوییە. شتومەک و سروشت کە وەک ئۆبژە دەبینرێن، گوزارشتی ئەوە دەکەن کە سۆبژە چۆنی بوێت وەها بەڕێوەیان دەبات. بەجۆرێکیش کە مەرجی باوەڕهێنان بە زانستە. جیاوازی سۆبژە

---

١ـ بریتییە لە حوکمدان یان کارایی ئۆبژە بەجۆرێک کە دوور بێت لەهەموو جۆرە کاریگەرییەکی دەرەکی و سۆز و هزر و پێشداوەرییەکانی تایبەت بەخۆیشی. بەواتایەکی تر ڕەوشی بە ئۆبژە بوون و هەبوونی ئەو ڕاستییانەی تاک یان خودی ئۆبژە تێپەڕدەکەن.

- ئۆبژە رەگێکی هەیە کە بۆ سەردەمی ئەفلاتۆن دەگەڕێتەوە. دوالیزمی جیهانی "ئایدیا"کانی ئەفلاتۆن و رەنگدانەوە ساکارەکانیان بناخەی تەواوی جیاوازییە هاوشێوەکانن. بناخە میتۆلۆژییەکەشی، بەشێوەیەکی قەشەنگ لە کۆمەڵگاکانی سۆمەر و میسردا دەبینرێت. هەڵکشان و شکۆدارکردنی پلەدارییەکانی سەروو و بەکۆیلەکردنی ئەوانەی خوارەوە بنەچەی راستەقینەی ئەم دوالیزمەیە. گوزارشتی زهنی دوالیزمی خولقێنەر- خولقێنراو، بەڕێوەبەر- بەڕێوەبراو بەشێوەی خودا- بەندە، فەرموودە - شت و ئایدیا بەرکەماڵەکان - رەنگدانەوە ساکارەکان هێدی هێدی پێشدەکەوێت و تا دەگات بە جیاوازی ئۆبژە - سۆبژە. جیاوازی رۆح - جەستەش لەم چوارچێوەیەدایە. واتا سیاسیەکەی: نکۆڵیکردن لە دیموکراسی و رێکردنەوەیە لەپێش ئۆلیگارشی[1] و مۆنارشی[2].

پێویستە باش لەو راستییە تێبگەین کە لەمیانەی سەرمایەدارییەوە زهنی ئەنالیتیک بە تەڵەکەبازترین و پیلانگێڕترین شێوەکانی گەیشتووە. رسە[3] زەقترین گوزارشتی ئەم راستینەیە. گۆڕەپانێکی سەرسوڕهێنەری ەستهێنانی قازانجی ژیری گریمانەیی (قەبلاندن)ە. قەبلاندن و ژیری یمانەیی لەسیستەمدا وەکو دوو برای جمکیان لێدێت. لە گۆڕەپانی یاسی و سەربازیشدا بەم شێوەیە. شەڕ لەسەر بنەمای فێلبازی و ڵەکەبازی بونیادنراوە. لووتکەی کلتووری نێچیروانییە. ژیری ئەنالیتیک ریمانەیی) لە بوارەکانی بۆرسە، سیاسەت و سەربازی بەجۆرێک کراوە بە ئامرازی چەواشەکردن و پیلانگێڕی کە خەیاڵ ناکرێت. تۆزقاڵێک رێگا بە ویژدان و سۆز نادات. لەلایەکەوە لە ئان و ساتێکدا لە رێگای بۆمبا ترسناکە ناوکی و هەمە جۆرەکانەوە جەستەی مرۆڤ گڕدەگرێت و دەبرژێت، لە گۆڕەپانێکی دیکەشدا بەبێ هیچ ئارەق رژاندنێک بەچەند رۆژێک بەملـ ان دۆلار قازانج دەکرێت. دەکرێت بگووترێت لە بوارەکانی

---

١- ئەو جۆرە رژێمەیە کە هێزی سیاسی و دەسەڵاتی بەڕێوەبرن لەدەستی گروپێکی تەسکدا کۆ دەبێتەوە کە لە چەند کەسێک پێکهاتووە.

٢- واتا رژێمی پادشایەتی، کە دەسەڵاتی سیاسی دەوڵەت هەمووی لە دەستی تاکەکەسێکدایە و حوکمی وڵات بشتاوپشت بۆ وەچەکانی دەمێنێتەوە.

٣- شوێنی گۆڕینەوەی دراو و شتومەک

بۆرسە، سیاسەت و شەڕ بەهەموو رووتییەکەیەوە سەرمایەداری زهنییەتی خۆی ئاشکرا دەکات. هیچ سۆز و بەهایەکی مرۆڤایەتی نییە لەپێناو بەدەستهێنانی قازانج پێشێلی نەکات.

مەرجی ژیانی و دەست لێبەرنەدراوی ژیان ژیری سۆزدارییە. چەندەی دابڕان لەم جۆرە ژیرییە پێشبکەوێت، بەو رادەیە واتای ژیان نامێنێت. کارەساتە ژینگەی (ئیکۆلۆژی)یەکان کە بەوێنەی هەواڵی هاتنی رۆژی قیامەتن، مەترسییەکانی سەر ژیان دیاری دەکەن. بەرپرسیارەکەی بە خراپی بەکارهێنانی ژیری گریمانەییە، بە هێدی هێدی بەخێوکردنی لە رێگای زمان، دەسەڵات، شار، دەوڵەت، زانست و هونەرەوە بۆتە لێڤی ئەتهانێکی جیهانگیر (ئیمپراتۆریەتی جیهانی سەرمایەداری جیهانگیری). وەستاندنی ئەم درندەیە پێویستی بە هەوڵ و کۆششێکی بەرفروانی ژیری سۆزداری هەیە. بۆ ئەوەی بخرێتە دۆخێکی بێ زیانەوە پێویستە فشارەکانی بۆ سەر ژیانی ئازاد کپ بکرێت و بڕەوێنرێتەوە. بەرلەوەی هەسارەکەمان بخاتە رەوشێکەوە دەرفەتی ژیانی تێدا نەمێنێت، پێویستە بیخەینە دۆخێکەوە چیتر توانای ژیانی نەمێنێت. ئەرکی سەرەکی کۆمەڵناسی ئازادی، گەیاندنی ئەم چالاکییە ژیانییەیە بە تێڕوانینێکی تیۆری و ئاواکردنی پێکهاتەکەیەتی بەشێوەیەکی راست.

## ب ـ ئیکۆنۆمیزم (ئابووریخوازی)

ئەو بۆچوونانەی سەرهەڵدانی سەرمایەداری وەکو ئەنجامێکی سروشتی پێشکەوتنی ئابووری دەبینن دەکەونە ناو ئەم گروپەوە. بەتایبەتیش مارکسیزم بۆ جۆرێک لە ئیکۆنۆمیزم بچووک کراوەتەوە. هەروەکو بڵێی سەرمایەداری مۆدێلێکی ئابوورییە بەمجۆرە هەوڵی تێگەیشتنی دراوە. ئابووری ـ سیاسی ([illegible]) لەبناخەو گۆشەی سەرەکی زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا جێگیرکراوە. هەر لەسەر ناوەکەی خۆی، لە ئاواکردنی دەوڵەتی مۆدێرندا ئەو بڕیارانەی سەبارەت بە ژیانی ئابووری دەدرێن کراون بە لقێکی زانست.

لەمیانەی پشت بەستن بە بەکارهێنانی نرخی بازاڕەوە بەدەستهێنانی سەرمایەیەک کە قازانج و داهاتی هەیە، ڕۆڵێکی مەزنی لە پێشکەوتنی ئەم بۆچوونەدا بینیوە. مەیلێکی وەها دەرکەوتووە، هەروەکو بڵێی جیاواز لە پێشکەوتنێکی مێژوویی، کۆمەڵگا، دەسەڵات و تەواوی شارستانی دەشێت پێشکەوتنی سەرمایەداری بەدیبێت. هەربۆیە، ئەوانەی هەرە زێدە خۆیان بەدژی سەرمایەداری لەقەڵەمدەدەن لە پارادۆکسێکدان، چونکە سەرمایەداری بە پێگەیەک دەگەیەنن کە شایستەی نییە، پێشیان وایە کە شەڕیان لەبەرامبەر سەرمایەداری کردووە.

سیاسەتمەدار ـ ئابووریناسە بەڕیشە ئینگلتەراییەکان مایەی تێگەیشتنن. وەک وڵاتێک کە سەرمایەداری تێیدا بەسەرکەوتن گەیشتووە، چاوەڕوانی بەمۆدێلکردنی ئابووری نوێیان لێدەکرێت. قاڵبوونەوەی کارل مارکس لەسەر ئەم مۆدێلە، سەبارەت بە ڕەخنەکردنی سیاسەتمەدار ـ ئابووریناسە ئینگلیزەکان گرنگە و چەندەی بڵێی ڕۆشنکەرەوەیە. ئەوەی جێگای بێ شانسییە، شاکاری مارکس بە نیوەچڵی ماوەتەوە و مارکسیستەکانی دوای ئەویش تەواو ئەویان کاریکاتێریزە کردووە. دەشێت شیکار نەکردنی سیستەماتیکیانەی پەیوەندی سەرمایەداری بە دەسەڵات و دەوڵەتەوە وەک کەموکوڕی سەرەکی مارکس دەست

نیشانبکرێت. هەوڵی دەستنیشانکردنی ڕۆڵی ئایدیۆلۆژیای داوە. جێ جێ هەڵوێستەکانی بەرامبەر بە زهنییەتی سەرمایەداری بەهێزن.

بەڵام بەهەڵەداچوونە بنەڕەتییەکەی بەبنەماگرتنی پۆزێتیڤیزمە کە لەمێژ بوو مۆری خۆی لە ناوەندی ڕۆشنبیری دابوو و ئایدیۆلۆژیای بەرچاوی سەردەمی ڕۆشنگەری بوو. لەو بڕوایەدایە کە هەروەکو زانستی فیزیا مرۆڤ دەتوانێت زانستی کۆمەڵایەتیش پێکبێنێت. باوەڕی پێهێناوە. هیچ گومانێکی لێ نییە. ئەم هەڵوێستە وایکردووە کە کارە هەرە بەهادارەکەی (پەرتووکی سەرمایە) نەزۆک بمێنێت، لە لێتوێژینەوە زیاتر، وەکو پەرتووکێکی ئایینی شرۆڤە بکرێت. هەڵبەتە ئەو کارەی موریدەکانیش بیکەن دیارە. شرۆڤەکانی لینین دەرهەق بە ئیمپریالیزم، سەرمایەداری پاوانخواز و دەوڵەت ـ شۆڕش هەوڵێکن فەلسەفەی ڕۆشنگەرییان نەبەزاندووە. سەرباری ئەوەی چەندین بۆچوونی هەیە کە ڕۆڵ و کۆمەکی هەبووە، بەڵام پیشاننەدانی ئەو توانایەی تێگەیشتن کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری تێپەڕبکات، فاکتەری سەرەکی سەرنەکەوتنی ئەزموونی سۆڤیێتە.

شرۆڤەی ئەنارشیستەکان لەبارەی سەرمایەدارییەوە بە قورسی بواری ئابووری دەگرێتەوە. لەناو مەیلێکدان: پێیان وایە ئەگەر لە ڕووی ئابوورییەوە مەحکوم بکرێت، دەڕووخێت. ئەو چەمکانەی لەمیانەی پۆزێتیڤیزمەوە بە ناتەواوی ماونەتەوە: "زانست یاسای خۆی هەیە، ئابووریش زانستێکە، هەربۆیە ئەویش یاسای خۆی هەیە. بەگوێرەی ئەم یاسایانە، سەرمایەداری قەیرانی لێدەکەوێتەوە، هەربۆیە سیستەمێکە ناتوانێت بەردەوام بێت. ئەوەی پێویستە بکرێت خێراکردنی کاری ئەم یاسایانەیە. لە ئەنجامدا سەرمایەداری دەڕووخێت، کۆمۆنیزم ئاوادەکرێت". پێناسەکردنێکی چەوتی ڕاستینەی کۆمەڵگا لەژێر ئەم بۆچوونانەدا شاراوەیە. بەشێوەیەکی گشتی کۆمەڵگا خاوەن سیستەمێکە کە زۆر لە دەرەوەی ئایدیۆلۆژیاکانی ڕۆشنگەری کاردەکات، تەنانەت خاوەن کائیوسە. بەو چەندە لە ڕووی ناوەڕۆکەوە بە ئابووریشەوە هەموو پێکهاتە زهنی و دەزگاکانی لەو زانستانە جیاوازترە کە بە

پۆزێتیڤ ناودەبرێن، بەو ئەندازەیەش لەبەرئەوەی دۆخە کردارییەکەی زیاتر ناوەڕۆکی کائیۆسی هەیە، لە ڕێگای هەڵوێستی زۆر جیاوازەوە چارەسەری و چالاکی دەکات بە پێویستییەک.

لەژێر ڕۆشنایی ئەم ڕەخنانەدا دەتوانین پەیوەندییەکانی نێوان ئابووری و سەرمایە زیاتر ڕوونبکەینەوە. یەکەمین دەستنیشانکردن کە پێویستە بکرێت، هەرچەندە وەک پارادۆکسیش دیاربێت، نەژماردنی سەرمایەدارییە بە ئابووری. شیکارکردنی وەک ڕژێمێکی سیاسی زیاتر ئێمە لە تێگەیشتنی زاراوەی قازانج نزیکدەکاتەوە کە لەناواخنیدا هەیە. لێرەدا گرنگە کە نەکەوینە نێو میتۆدی بچووککردنەوە بۆ دەوڵەت و دەسەڵات. واتە نابێت لە ئیکۆنیزمەوە بەرەو دەسەڵاتپەرستی یان دەسەلاتخوازی بچین. ئەگەر کۆمەڵناس ماکس ویبەر لەجیاتی هەڵسەنگاندنی ئەخلاقی پرۆتستانتی و سەرمایەداری، سەرمایەداری وەکو تەریقەتێک شرۆڤە بکردایە، شانسی ڕوونکردنەوەی زیاتر دەبوو. فرناند براودل خوازیارە سەرهەڵدانی سەرمایەداری لەمیانەی دانانی پاوانخوازی لەسەر ئەو نرخانە ڕوونبکاتەوە کە لە بازاڕدا هەیە. بەمارکسیشەوە سەرباری ئەوەی هەموویان شیکردنەوەی گرنگن، بەلام کەموکوڕی سەرەکییان ئەو هەڵوێستەیانە کە ڕوونکردنەوەی ئابوورییانە وەکو ناچارییەک دەبینن.

بەبڕوای من هەر لەسەرەتاوە سەرمایەداری لە ڕووی سەربازی - سیاسی - کلتوورییەوە خۆی ڕێکخستووە، نەریتێکی کۆنە کە تەڵەکەبازی زەوتکردنی بەهاکانی کۆمەڵگا و لەسەرووی هەمووشیانەوە توانا مادد‌ییەکانی ڕێکخستووە، لەسەدەی شازدەهەم بەدواوە لە ئەورووپای ڕۆژئاوا بووە بە شێوەگرتنێکی زاڵی کۆمەڵگا. دەتوانین ئەم لە دایکبوونە وەک ئەڵقەی هاوچەرخی نەریتی زەوتکردنی بەها کۆمەلایەتییەکانی دەوروبەری دایک - ژن پێناسە بکەین کە لەلایەن یەکەمین پیاوی بەهێز و دەست و پێوەندەکانییەوە دەستی بەسەردا گیرا. کردەوەی ئەو گروپانەیە کە ژێری گریمانەییان لەپێش بووە و وەک سەرمایەدارە بەرایییەکان لە ئینگلتەرا، هۆڵەندا و پێشتریش لەشارەکانی جەنەوا، فلۆرانسا و ڤێنسیا کە سەرکێشی دەولەتشارەکانی ئیتاڵیایان دەکرد، لەگەڵ دەوڵەت لەناو

یەکتردا بوون و شێوەیەکی ژیانی لەجۆری تەریقەتیان هەبوو، لە ڕێگای ئەنجامدانی تازەگەرییەوە بوو بوون بەوەستای رووتاندنەوەی پارە، لە ڕێگای یاریکردن بەنرخی بازاڕەکانی جیهانەوە بەهایەکی سەرسوڕهێنەریان زەوتکردبوو و لە کاتی پێویستیشدا توندوتیژیان بەکاردەهێنا. لەهەندێک شوێن ئەمانە بەخانەدان، ئەرستۆکرات یاخود بۆرژواش بەناودەکرێن. تاکە جیاوازی گرنگی ئەمانە لەگەڵ دزەکانی چاخی ناوین ئەوەیە: زیاتر لەشارەکان جێگیربوون، لەگەڵ دەسەلاتی دەوڵەت تێکەڵن، لەکاتی پێویستدا بەشێوەیەکی پەردەپۆشکراو و بە پلەی دووەم توندوتیژی بەکاردێنن. لە رووخساردا رێساکانی ئابووری دەکەونە بەرچاو. ئەوانیش بەگوێرەی ئەم رێسایانە لە میانەی ژێری و ئەو پارانەی لەسەرەتاوە هەیانە قازانج دەکەن. کاتێک بەشێوەیەکی راست مێژووی سەرمایە تاوتوێ بکرێت، ئەو کاتە دەبینرێت کە ئەم هەڵوێستە تەواو وەک ئەفسانەیەکە.

لەشەڕەکانی داگیرکاریدا کە یەکەمین کەڵەکەبوونی سەرمایەی لێوە بەدەست دەهێنرێت هیچ رێسایەکی ئابووری بوونی نییە. پورتوگال، ئیسپانیا، هۆڵەندا، ئینگلتەرا، فەرەنسا، پێشتریش شارەکانی لە جۆری ڤێنسیا وجەنەوا راستە راست بە تەواوی لە رێگای پشتبەستن بە توندوتیژییەوە یەکەمین کەڵەکەبوونی سەرمایەیان لە کۆلۆنیەکانیان بەدەستهێناوە. دەستنیشانکردنی ئەم راستیانە هەم لەبازاڕی ولاتە نزیکەکان، هەم لە گۆڕەپانەکانی داگیرکاریدا زەحمەت نییە. چل جەردەکانیش دواتر ئەفەندیان لێکەوتۆتەوە، بوونەتە بەگ. ناوزەدکردنی چل حەرامییە هاوچەرخەکانیش بە بۆرژوا ئەفەندییەکان، جگە لە مۆدە، هیچ قورساییەکی دیکەی نییە. ئەو دسپلینانەی بە زانستی ئابووری ناودەبرێن، رۆڵی سەرەکییان درێژەدانە بەپەردەپۆشکردنی ناوەرۆک و راستی مەسەلەکە. کامە تیۆری لەم بارەیەوە سەرکێشییەکی سەرکەوتووانە بکات، وەک بەرهەمی سەرەکی دەبێتە بابەتی خوێندن و خەلات دەکرێت. هیچ زانستێک بە ئەندازەی زانستی دیاردەی ئابووری یاری بەراستییەکان نەکردووە، سەراوبنی نەکردووە. گەورەترین لە رێ

لادانی ئەقڵی گریمانەیی لە گۆڕەپانی سیاسەتی ـ ئابووری سەرمایەدارییدا دەبینرێت. مۆدێرنیتەی سەرمایەداری تاکە سیستەمە کە لەسەر بنەمای زانستی ساختەکاری خاوەنی کەشخەیی بەرزبوونەوەیە.

دابینکردنی ئابووری یان بابەتەکانی ژیانی ماددی سەرەکیترین گرفتی زیندەوەرانە. کەرەستەکانی بەڕێوەچوونی گەشەن. سیستەمی زیندەوەران لە ڕێگای زیندە چالاکییەوە لەو پێویستیانەی لە دەوروبەر بەدەستی دێنێت و بەگوێرەی سیستەمی هەرسکردنێتی، درێژە بە هەبوونی خۆی دەدات. ڕێسایەکی گەردوونییە. پەرەسەندن لە ڕێگای جیاوازییەکانەوە بەردەوامی ژیان بەرقەراردەکات. بۆ بەربەستکردنی زۆربوونی بێ سنووری جۆرێک و ئەو دەست بەسەرداگرتنانەی بەرامبەر جۆرەکانی دیکە بەڕێوەدەچێت، واتە بۆ بەربەستکردنی لەناوچوونیان، بەردەوام هاوسەنگییەکی ڕەچاوکردووە یان ڕەخساندووە. زۆربوونی بێ سنووری مشک کە دەبێتە مایەی لەناوچوونی تەواوی ڕووەکەکان بە بەربەستی مار هاوسەنگی کردووە، هەمان مەیلی مەڕ، بزن، چێڵ و مێگەلە هاوشێوەکانی بە ئاژەڵە گۆشت خۆرەکان هاوسەنگ کردووە، دەرفەتی بۆ ڕەخساندوون، ڕێگای بە گەشەی جۆرەکەیان داوە. تەنیا لەمیانەی تەماشاکردنی ئەنجامەکانییەوە دەکرێت وەڵامی پرسیاری 'پەرەسەندنی سروشتی بۆچی وادەکات؟' بدرێتەوە. بەگوێرەی من هۆی سەرەکی ئەمە: هەمیشەییکردنی سیستەمی زیندەوەرانە لە ڕێگای پێشکەوتنەوە. ئایا ئەمە بە هۆشێتی سروشت، یان دادوەرییەکەی ناو ببرێت؟ ئەمە بابەتێکی جیاوازی گفتوگۆکردنە. هەروەها ئایا بەرهەمی ژیرییەکی قووڵە، یان گرێدراوی ڕەوشی سەرەتایی بوونە؟ و ئایا دەکرێت ئەمانە بخرێنە چوارچێوەی بابەتی میتافیزیکەوە؟ بەگوێرەی من کۆمەڵە پرسیارێکی واتادارن دەرهەق بەگەردوون کە لەمیانەی ژیری ئەنالیتیکەوە بیریان لێبکرێتەوە. دەشێت بەبوونگەراییشەوە پەیوەندیدار بکرێت.

گرنگترین وەڵامی کە دەتوانرێت بدرێتەوە ئەوەیە: گەشە بەردەوام کامڵبوون ڕەچاو دەکات. بەجۆرێک لەجۆرەکان لەناو ڕەوتی کاتدا پەیڕەوی کامڵبوون و لێگەڕینی بەرکەماڵی گەردوون دەکات، هەروەکو

بلێی خۆزگەی بۆ دەخوازێت. لەرەوشێکی پێچەوانەدا ئەو گەشەیەی تا گەیشتن بە ئاستی مرۆڤ هاتووە، هەروەها پەرەسەندنی مرۆڤ بەشێوەی کۆمەڵگایەکی بەرتەسک چۆن ڕووندەکرێتەوە؟ ئەگەر تەنیا شێر و مانگا هەبوونایە، دەستیان بەسەر دەوروبەردا بگرتایە، بەردەوامکردنی ژیان ئاستی قەوزە سەرەتاییەکانی تێپەڕ نەدەکرد. گەشەی سەرسوڕهێنەر، لەمیانەی ئەو پەرەسەندنەوە تا ئاستی مرۆڤ هاتووە، ڕێگای بە دروستبوونی پێکهاتەیەکی وەک ویژدان و ئەخلاقیش داوە، واتای چییە؟ بەزەیی و دادوەری! پوختەی ئەم پرەنسیپەش بەمجۆرە گوزارشتی لێکراوە: "ئەگەر فکر یەک بوایە، گورگ و مەڕ بەیەکەوە دەژیان". لێرەشدا گەردوونیبوون شاراوەیە. ئایا دەشێت گورگ و مەڕ ببنە برا؟ کردەوەی مرۆڤ سەلماندوویەتی کە دەبێت. واتە بیرکردنەوە و پراکتیزەکردنی: مرۆڤ نابێتە گورگی مرۆڤ، ئامانجی هەرە ژیانی مرۆڤبوونە. خۆی لەخۆیدا سەردەمانێک مەڕ و گورگ یەک بنەچەیان هەبووە، دواتر جیابوونەوە پێشکەوت. بۆچی دیسان بەلانی کەم بەرەو برایەتی هەنگاو نەهاوێژن؟ بەلانی کەم لەبواری تیۆرییەوە دەرفەتی هەیە و زۆر لە نموونەکانیشمان بینیوە.

ئەم خاڵانە بۆ ئەوە ئاماژە پێدەکەم: چیتر وەک ئامرازێک لە لەدایکبوونی سەرمایەداریدا بەکارهێنانی ئەو نموونە سنووردارانەی پەرەسەندن کە دەکرێت بەدڕندە ناویان ببەین، هیچ واتایەکی نییە. پرسیاری هەرە زەق و بەرچاوتر ئەوەیە، پەرەسەندن لە قەوزەکانی سەرەتاوە تا قەوزە رەشەکان، لەوانەوە تا دەگاتە درەختە شکۆدارەکان، کە لەم نێوانەدا ڕێی بۆ دەرکەوتنی ملیۆنان سیستەمی ئاژەڵ خۆشکردووە کە گیاخۆرن (ئەو ئاژەڵانەی یەکتری ناخۆن) ئایا ئێمە ئەمانە بە نموونە وەرنەگرین و ئەوانە بۆ ژیانی مرۆڤ بە نموونە وەربگرین کە دەکرێت بە هەریەکەیان بڵێین شێرپەنجەیەکی پەرەسەندن؟ بەمەبەستی پیشاندانی ئەو ڕاستییەی کە: لە ڕێگای پەرەسەندنی سروشتیەوە جێگای تیۆرییەکانی سەرهەڵدانی سەرمایەداری نابێتەوە، وەک ڕوونکردنەوەیەکی سەرەتایی ئاماژەم بەم خاڵانەکرد. ئەمە بەو پرەنسیپە چەوت و دژەشەوە کە بریتییە لە بەردەوام

گەورەکردنی سوپای بێکاران بۆ بەزیندوویی هێشتنەوەی کەمی کرێ.

زانستی بایۆلۆژی دەستنیشانی کردووە کە جۆری مرۆڤ لەکاتێکدا لەسەر بنەمای کۆمەڵگابوون بەردەوامی بەهەبوونی خۆی دەدات، تەواوی قۆناخەکانی پەرەسەندنی لەخۆیدا هەڵگرتووە و پراکتیزەی دەکات. ئەگەر زانست بەبێ تێکەڵکردنی بە ئایینی پۆزێتیڤیزم شرۆڤە بکەین، دەبێت باش دەستنیشانی بکەین کە یەکێک لە جوانترین چەسپاندنەکانیشی ئەمەیە. چ ئەم تایبەتمەندییەی جۆری مرۆڤ، چ تایبەتمەندی بژاری ئەخلاقی و دادوەری (دەرفەتی بژاری ئازاد)یانەی لە کۆمەڵناسی ئازادیدا تاوتوێیان دەکەم، کاتێک پوختەی ئەوە دادەنێم کە گەشەکردنی ئاوازییانەی پێشکەوتنی کۆمەڵگا پێچەوانەی پەرەسەندنی سروشتی نییە، هەوڵدەدەم ئەوەش روون بکەمەوە کە بۆچی پێویستە زێدەڕۆیی شارنشینی و ژیانی شارستانی پشتبەستوو بە دەوڵەت و ناوەندەکانی دەسەلات کە لەگەڵ پلەداری و جیابوونەوەی چینایەتیدا بەشێوەی لوویەکی ناو مێشک گەورەبووە، پێویستە بخرێتە ناو پۆلێنبەندی "ئەوپەڕی بە شێر بوون" یان پێچەوانەکەی "ئەوپەڕی بەچێل بوون".

پێش هەمووشتێک دەبێت ئاماژە بەوە بکەم: ئەگەر بەشێوەیەکی سنووورداریش بێت دەشێت رەگی ئەم جۆرە پێشکەوتنانە لە گەشەدا بدۆزینەوە، و هەبوونیان لە پەرەسەندنی جۆری مرۆڤیشدا وەک پاشماوە، لادان، چەشنە نەخۆشییەک شرۆڤە بکەین. دەبێت بەڕوونی دەرکی پێبکەین کە ئەم شێوازە ئاوازی سروشتییانەی پەرەسەندن نییە. هەر پەیوەست بەمەوە بەشێوەیەکی گشتی لە شارستانی و بە تایبەتیش لە قۆناخی سەرمایەداریدا سیستەمی کۆمەڵگا بە واتایەکی تر سروشتی دووەم بەسوود وەرگرتن لە تایبەتمەندییەکی وەک پاشماوە ئاواناکرێت، ئەمەش تەنیا وەک دەستنیشانکردنێکی روون نا، بەڵکو مەرجە کە وەکو پرەنسیپێکی بنەڕەتی ژیان شرۆڤە بکرێت. لە رەوشێکی پێچەوانەدا هەر لەسەرەتاوە شرۆڤەکانمان دەرهەق بە کۆمەڵگا دەشێوێنن.

فرناند براودل کاتێک دەرکەوتنی سەرمایەداری شرۆڤە دەکات، دەڵێت پشت بە هێزێکی بەرفراوانی چاودێری و دەرفەتی بەراوردکاری

ئەنجامدراوە. هەروەها لە کاتێکدا مێژوو، کۆمەڵگا، دەسەڵات، شارستانی ـ کلتوور لەناو یەکپارچەیی پێشکەوتنی شوێن (جوگرافیا)دا شرۆڤە دەکات، کێشەی پەیڕەویش ڕووندەکاتەوە. بەرامبەر هەڵوێستە پۆزیتیڤیستەکان بەمەودایە. کارل مارکس لەژێر کاریگەری قووڵی ڕۆشنگەریدا لە ڕێگای بەبنەماگرتنی پۆزیتیڤیزمەوە سووره لەسەر کردنی ئابووری بە زانستێک. پێویستە بەشی ئەوەش ڕەچاو بکەین کە ئەو کاتە کۆمەڵناسی لە قۆناخی گاڵگۆڵکێ کردندا بووە. مسۆگەرییە زانستییەکان و پێشەوەچوونە ڕاستەهێڵ ئاساکان لەمێژ بووە وەک باوەڕییەک لە زهندا جێگیر بوون. لەکاتێکدا ڕۆمانتیزم هەوڵی ڕووخاندنی ئەم ڕێبازەیدەدا، بە پێچەوانەوە کەوتە ناو لادانی ئیرادەگەرایی و کێشە زهنییەکانی قورسترکرد. هەڵوێستی ڕێژەیی و خولگەییانەی نیچە کە لایەنی ژێری سۆزدارییان قورسە هێندە پێشناخرێن، لەناو ئەم ئاڵۆزییە زهنییەدا لیبڕالیزم تەراتێن دەکات. لەکاتێکدا سەرمایەداری زانستی فیزیۆلۆژی (کیمیا و بیرکاری و بە زیندوەرزانیشەوە) لە ڕێگای پۆزیتیڤیزمەوە دەیکات بە فەلسەفە، ڕاستتر بڵێین دەکات بە ئایین، لەسەر هەمان ئاراستە ڕاستینەی کۆمەلایەتیش لە ڕێگای لیبڕالیزمەوە دەکات بەفەلسەفە یان ئایین. لەسەر ئەم بنەمایە لەشەڕی ئایدیۆلۆژیدا سەرکەوتن بەدەست دێنێت، ئیتر لە سەدەی نۆزدەهەمیشدا جیهانگیری سیستەم ڕوون دەبێتەوە. هەرچی شەڕی ئابووریشە پێشتر سەرکەوتنی تێدا بەدەست هێنابوو. کەمێکیتر ئەم ڕەخنە و شرۆڤانە ڕوون دەکەینەوە.

جڤاتەکان لەناواخنی زهندا بەردەوام بەدوای ئۆبژەی پێداویستییە مادییەکاندا گەڕاون و خواستوویانە پێشی بخەن: خواردن، حەوانەوە، زۆربوون و پاراستن نیگەرانییە سەرەکییەکانیان بووە. لەسەرەتادا بەهۆی ئەم پێداویستیانەوە ڕازیبوون بەو خواردنەی دۆزیویانەتەوە، لە ئەشکەوتەکاندا حەوانەتەوە، لە کەنارئاو و ناو دارستانەکاندا باشتر خۆیان پاراستووە و لەپێشینەییان بەدایک داوە کە وەچەی خستۆتەوە. پێبەپێ نێچیروانیش دەکەوێتە گەڕ. هەم پاراستن، هەم گۆشتخواردن پەرە بەم کلتوورە دەدات. بەڵام هەر لەسەرەتای بە کۆمەڵگابوونەوە

ئەو گرژییەی لەنێوان خواردەمەنی کۆکردنەوەی ژن و نێچیروانێتی پیاودا هەیە، نیشاناندەدات کە پەرەسەندنی کلتووری جیاوازیان جێگای باس بووە. لە هەردوو لایەنیشەوە پێشکەوتنێکی یەک لایەنە بەدیدێت، یەکێکیان "شێرە پیاو" ئەوی دیکەشیان "چێڵە ژن" وەکو کلتوور هەنگاو هەنگاو بەرەو پێشەوە دەچن. بەمجۆرە بناخەی یەکەمین چەمکی ئابووری جیاواز دادەنرێت. لەچاخی نیولیتیکدا کلتووری ژن دەگاتە لووتکە. پاش دوا قۆناخی سەهۆڵبەندان، لە ساڵانی ١٥٠٠٠پ.زبەدواوە، بەتایبەتیش لە بنارەکانی زاگرۆس ـ تورۆسدا، جۆرە دەوڵەمەندەکانی رووەک و ئاژەڵ کە بەهۆی ئەم کلتوورەوە کۆکراوەتەوە، رێگا لەپێش گریمانەی ژیانێکی هاوشێوەی بەهەشت دەکاتەوە.

ئەم قۆناخە وەک رووباری دایکی پێشکەوتنی کۆمەڵگا کە تا رۆژی ئەمرۆمان بەردەوام بووە، لەمیانەی شارستانی و مێژووی نووسراوەوە دەگۆرێت و بەمجۆرە مۆرکی خۆی لە جیهانگیری دەدات. ئەو پێشکەوتنانەی تا رۆژگاری ئەمرۆمان پشت بە گروپەکانی زمان بەدیدێت بەرهەمی ئەم قۆناخەیە. تاکە خاڵێکی گرنگ کە لەم مێژووە درێژخایەنەی مرۆڤایەتیدا دەتوانرێت بۆ سەرمایەداری بگووترێت ئەوەیە کە، کلتووری نێچیروانی پێبەپێ پیاوی کرد بە هەژموونگەرا. هێندەی دەستنیشانکراوە لە ساڵانی ١٠٠٠٠پ.زدا کلتووری نیولیتیک کە قورسایی ژنی پێوە دیاربووە بۆتە هەمیشەیی. لە قۆناخی کۆکردنەوەی خواردەمەنیدا لە ئەشکەوتەکان دەردەکەون و دەربازی جۆرێک لە سابات (نزیکی ئەشکەوت)دەبن، تووی رووەک و دانەوێڵەکان دەچێنن، زۆربوونی دانەوێڵە هەنگاو بەهەنگاو رێگا لەپێش شۆرشی کشتوکاڵ و گوند دەکاتەوە. لەمیانەی ئەو هەڵکۆڵینە شوێنەوارناسیانەوە کە لە رۆژگاری ئەمرۆماندا ئەنجامدراون، دەرکەوتووە کە ئەم کلتوورە لە تەواوی میزۆپۆتامیای سەروو، بەتایبەتیش لە کەوانەی ناوەوەی زنجیرە چیاکانی زاگرۆس ـ تورۆس (برادۆست، گارزان، ئەمانۆس و بنارەکانی ناوەوەی چیای تورۆس، ئەوالی چۆری، چایۆنۆ، کلتووری چەمێ خەلان) پێشکەوتووە. ئەگەر بەشێوەیەکی زۆر سنووردراریش بێت زێدە بەرهەم

کەڵەکە دەبێت.

ئەگەر وەک زاراوەش نەبێت، بەڵام وەک ناوەڕۆک دەشێت یەکەمین ئابووری بۆ ئەم شێوازەی کۆکردنەوە بگەڕێنرێتەوە. هەروەکو دەزانرێت وشەی ئیکۆ- نۆمۆس بەزمانی لاتینی واتای یاسای خێزان و خانە دەبەخشێت. لەگەڵ پەیدابوونی یەکەمین خێزانە کشتوکاڵییە جێنشینەکانی دەوروبەری ژن و ئەگەر بەشێوەیەکی کەمیش بێت بە شاردنەوە و عەمبارکردنی خۆراکە خۆراگرەکان، ئابووری لەدایک بوو. بەڵام ئەم کۆکردنەوەیە بۆماڵەوەیە، نەک بۆ بازاڕ و بازرگانان. ئەوەی مرۆییە و ئابووری راستەقینەیە، دەبێت ئەمەیان بێت. لە رێگای کلتوورێکی بەربڵاوی بەخشینی دیارییەوە ئەم کەڵەکەبوونە لەرەوشی مەترسی چاوتێبڕین دەردەخرێت. لەوانەیە پرەنسیپی "موڵک تەماع دێنێت" لەم قۆناخەوە مابێتەوە. کلتووری دیاری شێوەیەکی گرنگی ئابوورییە. تا دوارادە لەگەڵ ئیقاع و ئاوازی پەرەسەندنی مرۆڤیشدا دەگونجێت.

دەشێت کلتووری قوربانیش لەم قۆناخەوە دەستی پێکردبێت. بابەتێکی دەرکی پێدەکرێت ئەوەیە: ئەو زاراوەی بە خوداوەند بەناو دەکرێت لە راستیدا یەکەمین شێوازی گوزارەی رێزگرتنی جڤاتەکانە بۆ ناسنامەی خۆیان بەرامبەر ئەو بەروبوومەی زیادیکردووە. بەپێتی بەرهەمداری شوکرانەکردن لەگەڵ خۆیدا دێنێت. بەگوێرەی ئەوەی سەرچاوەکەی بۆ گەشەکردنی شێوازی جڤات دەگەڕێتەوە، بوون بە خاوەن ناسنامە، شکۆدارکردن، نزاکردن، عیبادەت و پێشکەشکردنی وەک زیادبوونی پێشکەوتنەکانی دونیای زهنی، ئەو فاکتەرە کلتوورییانەن کە بە قووڵی گرێدراوی شۆڕشی کشتوکاڵین. دۆزینەوە شوێنەوارناسییەکان بەشێوەیەکی زەق ئەم بۆچوونە دەسەلمێنن. بەشێوەیەکی کۆنکریتی زاراوەکانی دایکە - خوداوەند و دایکی پیرۆز فاکتەری سەلمێنەرن. بەربڵاوی وێنە و پەیکەری بچووکی ژنان لەسەرووی فاکتەر و بەڵگە سەلمێنەرەکانەوە دێن.

بەڵام ئەو هەڕەشەیەی لێی دەترسن، دواتر بەسەریاندا دەتەقێتەوە. کاتێک ئەو کەڵەکەبوونەی زێدە - بەرهەم کە لەمیانەی ئەزموون و

پێشکەوتنی زهنەوە زیاد دەکات لە ڕێگای بەخشینی دیاری کۆتایی نایەت، دیسان شیمانەی لەپێش ئەوەیە، پیاوی نێچیروان کە لە بۆسەدایە، جگە لە پیشەی خۆی بازرگانیکردن بەو کەڵەکەبوونەوە لەمێشک و کلتووری خۆیدا دەچەسپێت. کەڵەکەبوونی بەرهەمی جیاواز لەناوچە جیاوازەکاندا، ئەو دیاردەیە دەخاتەگەڕ کە بازرگانی پێدەگووترێت. ماهییەتی دابینکردنی دوولایەنەی پێویستی بە بەروبوومەکان، وەک پیشە یاخود دووەمین دابەشکردنی کاری کۆمەڵگا بازرگانی و بازرگان دەئافرێنێت. هەرچەندە پڕ لە شەرمەندەییش بێت هەنگاوبەهەنگاو مەشروع دەکرێت. چونکە بەرهەمی هەڵگیراو دابەشکردنی کار بەرەو پێشەوە دەبات. ئەویش دەرفەت بەژیان و بەرهەمهێنانێکی بەپیتر دەدات. کاتێک لەلایەکەوە خۆراک و بەرهەمەکانی رستن، لەلایەکی دیکەشەوە کانە کانزاییەکان زۆر دەبن، بازرگانی واتادارە.

مێژوو پیشانیدەدات کە لەسالانی ٤٠٠٠پ.ز بەولاوە بازرگانی بلاوبۆتەوە. گرێدراو بەو شارستانییەی لە سالانی (٤٠٠٠ ـ ٣٠٠٠پ.ز) لە دەوروبەری یەکەمین دەوڵەتشاری میزۆپۆتامیای خواروو کە لە ئوروک پێشکەوت، لە ناوچەی ئیلامی باشووری ڕۆژئاوای ئێران تا دەگاتە ناوچەکانی ئەلازخ و مەلاتیای میزۆپۆتامیای سەروو کۆلۆنیە (مۆلگە)کانی بازرگانان دەبینین. بەمشێوەیە یەکەمین دەرگای داگیرکاری دەکرێتەوە. پێشتریش لە سالانی٥٠٠٠ ـ ٤٠٠٠پ.ز بەر لە ئوروک دەبینە شاهیدی کۆلۆنیەکانی بالادەستی کلتووری ئەلعوبێد. بازرگانی و کۆلۆنی لەناو یەکتردان. بەرامبەر بە دەفر و دییزە و بەرهەمەکانی رستن، بەزۆری کانزا و تەختەدار دەگوازرێتەوە. لەگەڵ پەیدابوونی بازرگان، بازارپیش [illegible]ێوە دەگرێت. ناوەندە کۆنەکانی بەخشینی دیاری و قوربانی پەیتا پە[illegible] بۆ بازاڕ دەگۆڕێن. ئەو بازرگانانەی لەکاتی ئاڵوگۆڕکردنی بەرهەمی ناوچە جیاوازەکاندا، جیاوازییەکی وەک دانانی نرخی بەرایی بەدەستدێنن، دەشێت بەسەرمایەداری بەرایی بەناوبکرێت. چونکە لە ڕێگای دەرفەتی دەستنیشانکردن و دانانی نرخەوە بەجۆرێک توانای کۆکردنەوەی سامانیان هەیە کە تا ئەو کاتە هیچ کەسێک سەرکەوتنێکی

وەهای نەبووە.

هەرلێرەدا دەبێت ئاماژە بەو خاڵەش بکەم کە بۆ یەکەمین جار لە رێگای ئاڵوگۆڕکردنی موڵک و چالاکی بازرگانییەوە رێگا لەپێش قۆناخی بەکالاکردن دەکرێتەوە. لە ئابووری دیاری پێشکەشکردنەوە هێشتا بۆ بەهای گۆڕینەوە (ئالوگۆڕکردن) نەپەڕیونەتەوە. ئەوەی بۆ کۆمەڵگاکان گرنگە بەهای بەکارهێنانی موڵکە. بەهای بەکارهێنانی موڵکەکە ئەو تایبەتمەندیەی پیشاندەدات کە چ پێویستییەک پڕ دەکاتەوە. ئەوەی بۆ مرۆڤیش بنەڕەتییە ئەم بەهایەیە. بەهای ئاڵوگۆڕکردن زاراوەیەکە گفتوگۆیەکی زۆر هەڵدەگرێت. بێگومان بەشێوەیەکی راست پێناسەکردنیش زۆر گرنگە، بەگوێرەی من تەنانەت لەلایەن مارکسیشەوە جێگیرکردنی رەنج لە بناخەی بەهای گۆڕینەوەدا بابەتێکی پڕ بە گفتوگۆیە. ئینجا چ ئەبستراکتانە، چ کۆنکریتیانە لە رێگای رەنجەوە پێناسە بکرێت، بەهای گۆڕینەوە بەردەوام لایەنێکی قەبڵاندن و سوود وەرگرتن لەخۆوە دەگرێت. با وای دابنێین کە یەکەمین بازرگانەکانی ئوروک لە یەکێک لە کۆڵۆنیەکانی کەناری رووباری فوراتدا هەستان دەفر و دیزەکانی خۆیان بە پارچەکانزایی و بەردینەکان گۆڕییەوە، کاتێک بپرسین: **"کێ سەرەتا بەهای گۆڕینەوە دەستنیشاندەکات؟"** لە وەڵامدا دەتوانین بڵێین یەکەمیان ئاستی پێداویستی دوولایەنەیە، دووەمیان دەستپێشخەری بازرگان خۆیەتی. ئەگەر وەک پێویستی خواستی زۆری لەسەر بێت، بازرگان، چۆنی بوێت دەتوانێت وەها نرخی بۆ دابنێت. لەجیاتی دوو بەرامبەر بەیەک، بە ئاسانی دەتوانێت چوار بەرامبەر بە یەک دابنێت. هیچ فاکتەرێک جێگای باس نییە کە لەم بوارەوە بەربەستی بکات جگە لە ویژدانی خۆی، راستتر بڵێین جگە لە هێزی خۆی. ئەوکاتە رۆڵی رەنج لە کوێیە؟

لێرەدا بە تەواوی فاکتەری رەنج لەدەرەوە ناهێڵمەوە. بەڵام لەو بڕوایەدام کە فاکتەری دیاریکەری سەرەکی نییە. لە تەواوی ئاڵوگۆڕیەکانی موڵک لە مێژوودا دەشێت ئەم خاڵە رەچاو بکرێت. گرێدراو بەو پێشبڕکێ ئازادانەی لە ئاڵوگۆڕکردنی موڵکدایە، ناوە بەناوە دەشێت هەندێک

گۆڕینەوەی نزیک بە یەکسانی بەهای رەنج پێشبکەوێت. بەڵام ئەمە زیاتر ئاڵوگۆڕێکی تیۆری رەنج ـ بەهایە. ئەوەی لەبواری کرداریدا یەکلاکەرەوەیە قەبڵاندنە. لەهەندێک حاڵەتیشدا کەڵەکەبوونێکی زێدەی موڵک جێگای باسە. ئەوکاتە بەهاکەشی دەکەوێتە ژێر سفرەوە. لەو رەوشانەدا بۆ لەناوبردنی کاڵاکان پێویستی بەرەنجی زیادە هەیە، بەگوێرەی ئەوەی ناتوانین بڵێین بەهای رەنج لەناوچووە، ئەوکاتە ئەوە دەمێنێتەوە کە بڵێین رەنج پێوانەیەکی بنەڕەتی نییە. دووبارە هێزی بازرگان کە شانسی رەخساندنی هەرزانی و گرانی هەیە خۆی دەستنیشانکەرە. خۆی لەخۆیدا موڵکیش بە موڵک بەرهەم دەهێنرێت. بەدرێژایی مێژوو بەهێزی بازووی هەزاران رەنجدەری بێ ناوو نیشان سامان بەرهەم هێنراوە. کەواتە کامە میکانیزم مافی شایستەی ئەم سەهۆڵ گرتووانەی رەنجی پێدەدرێت؟!

کاتێک پیشەکارە داهێنەرەکان، تەنانەت تەواوی چالاکییە کۆمەڵایەتییە پێویستەکانیش دەخەینە سەر ئەمە، ئەو کاتە بیر لەوە ناکرێتەوە کە ئەم جۆرە رەنجەی بە رەنجی زیندوو ناو دەبرێت نرخێکی واتادار یان کرێیەکی هەبێت.

ناتەواوی یان ساختەکاری ئابووری ـ سیاسی ئینگلیزەکان لێرەدا خۆی بەدەستەوە دەدات. هەروەکو دەزانرێت یەکەمین شوێن کە سەرمایەداری سەرکەوتنی خۆی تێدا بەدەست هێنا نیمچە دوورگەی ئینگلتەرا و هۆڵەندا بوو. بۆ بەدەستهێنانی مەشروعییەتی سەرمایەداری بیانوویەکی تیۆری مەرجە. بەتایبەتیش بۆ شاردنەوەی راستینەی قازانجی قەبڵاندن، تیۆرییەک کە جێگای رەزامەندی و پەسەندکردن بێت، گرنگییەکی مەزنی هەیە. هاوشێوەی یەکەمین ئایینی بازرگانەکانی ئوروک، پێشکەشکردنی ڤێرسیۆنی[1] نوێی چیرۆک و باسی میتۆلۆژی، کەوتە سەرشانی بەناو بیرمەندە ئابووری ـ سیاسییەکان کە لە کرۆکدا داهێنەری ئایینی نوێی سەرمایەدارین. ئەوەی ئاواکراوە ئابووری ـ سیاسی نییە، ئایینێکی نوێیە. هەروەکو لە هەر ئایینێکدا بینراوە، ئەویش پەرتووکی پیرۆز و چەندین (لق) مەزهەبی هەیە. ئابووری ـ سیاسی ناقۆڵاترین شاکاری

١ـ لە ئینگلیزیدا بە واتای وەرگێڕان یان چاپ دێت، بەڵام لە تورکیدا بە واتای وەرگرتنی نموونە لەشتێک بەدەستکارییەوە دێت.

ساختەکاری و تالانکاری ژیری گریمانەییە و بۆ شاردنەوەی کارەکتەری سوود ـ قەبلاندن (کۆکردنەوەی موڵک لەپێناو یاریکردن بە نرخەکان، بە بەکارهێنانی جیاوازی ناوچەکان)ی سەرمایەداریدا پێشخراوە، کە تالانی چل جەردەکانیشی تێپەڕکردووە. سەبارەت بەم بابەتە تیۆری رەنج ـ بەها تەواو ئامرازێکی راوکردنە. بەڕاستیش مەراق دەکەم چۆن هەڵبژێردراوە. لەو بڕوایەدام کە سەرەکیترین هۆکارەکانی خەریککردنی رەنجدەرانە. تەنانەت یەکێکی وەکو کارل مارکسیش نەیتوانیوە بەشداری خۆی وەک هەڵگری ئالف بۆ ئەم نێچیرە بەربەست بکات. کاتێک ئەم رەخنەیە دەکەم هەست بە ئازارێکی زۆر دەکەم. بەڵام بەلانی کەمەوە ئاماژەکردن بە گومانەکانمان پێویستییەکی هەرە بچووکی رێزگرتنمانە لە زانست.

ئەگەر تۆزێکی تر ئەم بابەتانە روون بکەمەوە:

لەسالانی ۲۰۰۰پ.ز بەولاوە لەکۆلۆنی ئاشوورییەکاندا دەتوانین دووەمین قەڵەمبازی بازرگانان لە مێژوودا ببینین. دەتوانرێت بگووترێت هیچ دەسپۆتیزمێک (لە بەشەکانی دیکەدا پەیوەندی سەرمایەداری بەدەسەڵاتەوە گفتوگۆ دەکەین) هێندەی ئاشوورییەکان لەمیانەی پشت بەستنەوە بە بازرگانی و کۆلۆنیەکانی سەردەمی خۆیان (۲۰۰۰ ـ ٦۰۰پ.ز) ەوە شارستانییان لە ئاستی جیهانگیری (جیهانگیری ئەو سەردەمە)دا ئاوانەکردووە. هەرچەندە بازرگانە فینیقییەکانیش کە لەهەمان سەردەمدا بوون و بە شارستانی میسر پشت ئەستوور بوون لەبواری بازرگانی و کۆلۆنیدا تادواڕادە لێهاتوو بوون، بەڵام دیسان لەپلەی دووەمدا ماونەتەوە. ئینگلتەراش کە هۆلەندا یان پورتوگالی لەپاڵدا بووە، بەجووتە لە رێگای ئەو بازرگانییەی شانبەشانی دژوارترین زۆرداری بەڕێوەدەچوو، بەرادەیەکی خەیالاوی بەهایان زەوتکردووە. کاتێک لێکۆڵینەوە لەبارەی مێژووی دەولەمەندێتی ئاشووری و فینیقییەکان بکرێت کە بەشێوەیەکی تێکەڵ لە رێگای بازرگانی و ستەمکارییەوە بەدییانهێناوە، پێموایە بەباشترین شێوە جۆری سەرەتای کۆلۆنیەکانی ئەورووپا (ئیسپانیا، پورتوگال، هۆلەندا، ئینگلتەرا، فەرەنسا، بەلجیکا.. هتد)یان تێدا دەبینرێت. بەشانازییەوە باسی ئەوە دەکەن کە قەڵاو شورایان لە کەللەسەری

مرۆڤ دروستکردووە. ئەم کلتوور و ئەخلاقەی ژیان کە لەسەر بنەمای زەوتکردن و دەستبەسەرداگرتن بونیادیان ناوە تا ئێستاش یەخەی ئێراق و لوبنانی بەرنەداوە، هێشتا بابەتی دژوارترین و بەئازارترین شەڕن. کۆماری رۆما لەخۆڕا قەرتاجە (کۆلۆنی بازرگانی فینیقییەکان)ی تەخت نەکرد. هەروەها مادەکان (میدییەکان) لەخۆڕا نەینەوایان تەخت نەکرد و نەیانکرد بە وێرانە.

پێویستە بەوریاییەوە ئاگاداری شارستانییە بازرگانەکان بین. لەمێژوودا لەپێشینەترین هۆکارە سەرەکییەکانی شەڕ و بەدەزگابوونی دەوڵەت بۆ ئاسایشی بازرگان و کۆلۆنیەکان، راستتر بڵێین بۆ پاراستنی بەرژەوەندی و داهاتەکانیان دەگەڕێتەوە. باش دەزانرێت کە هۆکاری سەرەکی شەڕەکانی ئەمڕۆی رۆژهەلاتی ناوین (چەندە بە ئازارە یەکەمین شەڕەکانی بازرگانی تێدا بەرپابووە، ـ ئێراق لە ئوروکەوە دێت ـ دوا شەڕیشی بە دژوارترین شێوە بەردەوامە) لەناوەڕۆکی خۆیدا بازرگانی نەوتە. دەتوانرێت چەندین نموونەی دیکە باس بکرێت، بەلام پێویست نییە.

لەسەردەمێکدا کە بەرەو سەرمایەداری هەنگاو دەهاوێژرا و ناوەندی شارستانی بۆ ئەوروپا گوازرایەوە، دیسان سەرکێشی هی بازرگانی بوو. شارستانی بازرگان و بازرگانی کە ناوەندەکەی رۆژهەلاتی ناوینە، لە چاخی ناویندا لە رێگای ئیسلامەوە هەڵمەتێکی نوێ ئەنجامدەدات. بەتایبەتی خەدیجە و حەزرەتی محەمەد لە ئەنجامی ئەو کێبڕکێیەی لەگەڵ بازرگان و ماڵداریکارە بەڕیشە سریانی، ئاشووری و یەهودییەکانەوە تێی کەوت، دیسان لەسەر بنەمای توندوتیژی و بەپشت بەستن بە هەردوو شاری مەککە و مەدینە بناخەی شارستانی بازرگانیان دانا. لەژێر پەردەی ئایینی ئیسلامدا، شارە کۆنەکانی رۆژهەلاتی ناوین لە دەوروبەری بازرگانی زیندووبوونەوەیەکی نوێیان بەخۆیانەوە بینی. لەگەڵ ژێرکەوتنی بێزەنت و ساسانییەکان لەسەرووی هەموویانەوە حەلەب، بەغداد، قاهیرە و شام بە تۆڕێکی مەزنی شار و بازاڕ دەگات. لەچینەوە تا زەریای ئەتڵەسی، تا دەگاتە ئەندەنوسیا و ناوەوەی ئەفریقیا تۆڕەکانی بازرگانی

تەواو بە ئاستێکی جیهانگیری دەگات. بازاڕێکی بەربڵاوی کاڵا و دراو پێکدێت. پارەیەکی زۆر لەژێر دەستی یەهودی، ئەرمەنی و سریانییەکان کۆدەبێتەوە.

ئەورووپا بە تەواوی پشت بەو میراسە دەبەستێت. مێژوو شاهیدە کلتووری بازرگانی کە بەدەستی بازرگانە موسڵمانەکانی رۆژهەڵاتی ناوین هەڵمەتێکی دیکەی بەخۆیەوە بینیوە، لەسەدەی سێزدەهەم بەولاوە بە پێشەنگایەتی شارەکانی جەنەوا و فلۆرەنسای ئیتاڵیا بۆ ئەورووپا گواستراوەتەوە. پارە و بازرگانی هۆکاری سەرەکی دەوڵەمەندێتی ئەم شارانەن. تا سالانی سەدەی شازدەهەم پێشەنگایەتی بازرگانی نێوان ئەورووپا و رۆژهەلاتی ناوینیان کردووە. لەوانەیە بۆ یەکەمجار بێت لە مێژوودا هەم لە رووی زاراوە، هەم کردارەوە لە ئاستی شاردا سەرکەوتنە بچووکەکانی سەرمایەداری بەدی دێنن. چەتەکانی دەریای سپی ناوەڕاست و کێبڕکێی پاوانکردنی نرخ لەنێوان کەنارەکانی رۆژهەلات ـ رۆژئاوای دەریای سپیدا رۆڵی سەرەکی لەمەدا دەبینن. هەروەها قەبلاندنیش شانبەشانی و لەژێر سێبەری زۆرداریدا بەڕێوەدەچێت. بازرگانی رێگا لەپێش سەرمایە دەکاتەوە، سەرمایەش رێگا لەپێش شاردەکاتەوە، شاریش بازاڕ لەگەڵ خۆیدا دێنێت، بازاڕیش رێگا لەپێش بەرفراوانبوونی قەبلاندن و سوود دەکاتەوە، بەمجۆرەش بەرەبەیانی سەرمایەداری هەڵدێت. جۆرێکی بەرایی ئەم قۆناخەش لەسەردەمی رۆما ـ ئەسینای کۆن (٥٠٠ پ.ز- ٥٠٠ زایینی) روویداوە. بەلام لەو قۆناخەدا سەرنەکەوتنی سەرمایە، بۆ قورساییە گەورەکەی کشتوکاڵ و ژێرکەوتنیان لەشەڕە ئایینییەکاندا دەگەڕێتەوە. ئەزموونی سەرکەوتووانەی سەرمایەداری دەوڵەتشارەکانی ئیتاڵیا لە سالانی ١٣٠٠ ـ ١٦٠٠ زایینی لە بلاوبوونەوەدا بەرەو باکووری رۆژئاوا و باکووری ئەورووپا درەنگ نەکەوت. ئیسپانیا هەر پێشتر فەتحکرابوو. لەسەدەی شازدەهەم بەولاوە بۆ یەکەمین جار چیرۆکی رێگا درێژەکەی بازرگانان سنووری شارەکانی دەربازکرد و لەئاستی ولاتاندا سەرکەوتنی خۆیان کرد بە ناچاری.

لە ئاستی جیهاندا بازاڕێک پێکهاتووە. ئەفریقیا و ئەمریکا خراوەتە ژێر

چەپۆکی داگیرکەرییەوە. ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی پەراوێز دەکەن، لە ڕێگای زەریای ئەتڵەسی و باشووری ئەفریقیاوە گەیشتوونەتە هیندستان و چین. ئەورووپا خراوەتە ژێر کاریگەرییەکی خەستی ئاواکردنی شارەوە. بۆ یەکەمین جارە شارەکانی لە کشتوکاڵ باڵاتر دەبن. پادشایەتییە دەرەبەگەکان بۆ دەوڵەتی هاوچەرخی مۆنارشی گۆڕاون. دوا ئیمپراتۆرییەتی ئیسلامی عوسمانییەکان دووچاری شکست بەدوای شکست دێت. هەروەها ڕێنسانسیش کە لەسەدەی چواردەهەم لە ئیتاڵیا دەستی پێکرد، لە تەواوی ئەورووپا بڵاوبۆتەوە. بزووتنەوەی ریفۆرمی ئایین لە وڵاتەکانی باکووری ئەورووپا بە سەرکەوتن گەیشتووە. بۆ یەکەمین جار شەڕە ئایینیەکان سەردەمی خۆیان تەواوکردووە. گرنگتریش ئەوەیە کە تەواوی بەها شارستانی و کلتوورییەکانی چین، هیند، ئیسلامی و تەنانەت ئەفریقیا و ئەمریکاش بۆ ئەورووپا براون. لەلایەکەوە دەوڵەتی مۆدێرن، لەلایەکی دیکەشەوە نەتەوەکان سەریانهەڵداوە.

کاتێک سەرمایەداری بەرەو سەرکەوتن دەچێت پشتی خۆی بەم مێژووە دێرینە، کلتوورە، توانا بازرگانییە، شارستانییە، هێزە سیاسییە و یەکپارچەیی دونیای هەراجکراو قایمە. ئایا تاوەکو ئەم هەلومەرجە لەپێشینانە بۆ ئابووری سەرمایەداری پێکنەیەت و پشت بەم هەلومەرجانەوە نەبەستێت دەشێت قەڵەمباز ئەنجامبدات؟ لە ڕەخساندنی دەرفەتیش بەولاوەتر، ئایا دەتوانرێت بیر لەخودی سەرمایە خۆیشی بکرێتەوە؟ مێژوو هەروەکو چۆن لە میزۆپۆتامیای خوارووودا یەکەمین هەنگاوی شارگەرایی، چینایەتی و بە دەوڵەتبوونی لە ڕێگای شاری ئوروکەوە دەستپێکرد، دووەمین هەنگاوی مەزنی لەمیانەی شارگەرایی و بازرگانییەوە لە ڕێگای ئیۆنا و فینیقیاوە هاوێشت، ئەمجارە سێیەمین هەنگاوی گەورەی خۆی لەشوێنی جوگرافی ئیتاڵیا و هۆڵەندا و ئینگلتەرادا هاوێشت کە لەدەرئەنجامی تەواوی هەلومەرجە ئاماژە پێکراوەکان بە ڕەوشێکی نموونەیی گەیشتبوون، و لەسەر بنەمای بازرگانییەکی مەزن، شارگەرایی، و ئەو بازاڕەی لەسەر ئاستی دونیا فراوانبووە سەرکەوتنی جێگیری بۆ دژبەرەکەی کە ئابووری سەرمایەدارییە بەدەست هێناوە.

ئەوەی تا ئێستا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕێبەرایەتی بۆ دەکات ئەم ڕاستینەیە.

فرناند براودل کاتێک بەسووربوونەوە دەڵێت: "ئابووری سەرمایەداری دژی بازاڕە و شێوەیەکی ئابوورییە کە پشت بە یاریکردن بەنرخی بازاڕ و قەبلاندنی پاوانخوازەکانی گۆرەپانی بازرگانە مەزنەکان دەبەستێت" سەبارەت بەو بابەتەی بە ئابووری ناودەبرێت لە کارل مارکس زیاتر نزیکی ڕاستی بۆتەوە.

لەناوەند و زەمینەی پێشکەوتنێکی کۆمەڵایەتیدا کە لە ئاوێنەی مێژوودا بووە بە دەسەڵات، لەژێر بونیادی خۆیدا چەندەی بڵێی بازاڕی پەرەپێداوە، لە شارەوە بەسەر لادێدا زاڵبووە و پەیوەندی خۆی بە ئایین و ئەخلاقەوە خستۆتە پلەی دووەمەوە، شێوەیەک یان جۆرێک لە کرداری ئابووری دەبینین کە پشت بە دەست بەسەرداگرتنی کاڵا کەڵەکەبووەکان و تالانێک دەبەستێت کە بە پەردەیەکی وردەکارانە و دەمامکێکی ئایدیۆلۆژی داپۆشراوە. بێگومان لەم شێوە نوێیەی دەست بەسەرداگرتندا بەوپێیەی کە نرخ لەلایەن خواست ـ خستنەڕووی بازاڕەوە شێوەی پێدەدرێت و لەڕێگای دراوەوە ڕەنگدەداتەوە، لەچاو قۆناخەکانی پێشتردا پێشکەوتنێکی مەزن یاخود بەهرەی یاریکردنی بەدەست هێناوە. لەجیاتی یەکەمین سلفەکاری و پارەگۆڕینەوە(صیرفة)، یەکەم بانک، دەستاوێز، دراوی کاغەز، بیمە، ژمێریاری و کۆمپانیا چەندەی بڵێی پێشکەوتووە. ئەمانە ئەو بابەتە سەرەکیانەن کە ڕەوشی زانستی ئابووری سەردەمی مۆدێرنیان پێکهێناوە. ئەوەی ناتەواوە ڕوونکردنەوەی زانستییە. ئەمەشیان لەلایەن ئابووریناسە ـ سیاسییە ئینگلیزەکانەوە و هەرچەندە وەک پارادۆکسێکیش بێت لەلایەن سۆسیالیستەکان و لەسەرووی هەموویشیانەوە کارل مارکس ئەنجامدراوە، کە دواتر ئەوان بەرەو خۆیان کەمەندکێشیان کردن.

سیستەمی تالان کە بە ئابووری سەرمایەداری ناودەبرێت لە کاتێکدا لە تەواوی دونیای کۆن ونوێ کۆمەڵگاوجوگرافیاکان داگیردەکەن و سەرلەنوێ دەیانکەن بە کۆیلە، تەواوی دەسەڵاتەکانی هێز (لەدەوڵەتەکانی سەردەم لە ڕێگای قەرزدارکرنەوە دەخەنە ژێر دەستی خۆیان)

بەخۆیانەوە دەبەستنەوە، خوێناویترین شەڕەكانی مێژوو بەڕێوەدەبەن، یاری بەهەموو شتێكی بونیادی كۆمەڵگا دەكەن و بەمجۆرە هەیمەنەی خۆیان ئەرێ دەكەن، بە گوێرەی من ئەوانەی سەرمایەداری بەرامبەر بە كۆمەڵگای كۆن وەك شۆڕشگێڕ رادەگەیەنن، واتە كارل ماركس و شوێنكەوتووەكانی و قوتابخانە هزرییە هاوشێوەكانی، زانست ئاوا ناكەن. (DOS COPITAL) پەرتووكێكی هەرە ناتەواوە كە بەرامبەر سەرمایە نووسراوە، لەم سۆنگەوە بۆ شرۆڤەی چەوت كراوەیە. لێرەدا ماركس تاوانبار ناكەم. تەنیا ئاماژە بەوە دەكەم كە شاكارەكەی رەهەندی مێژوو، دەوڵەت، شۆڕش و دیموكراسی تێدا نییە. رۆشنبیرانی ئەورووپا وەك سروشتی پێكهاتەیان كە خۆیان بە "زانستی" دادەنێن، ئەگەر بەشێوەیەكی سۆبژەكتیڤ و ئەنقەستیش نەبێت، وەك پێویستییەكی پێگە بابەتییەكەیان، لەمیانەی لێكۆلینەوەو لێتوێژینەوەی سەرمایەوە بۆ دژە سەرمایەداری و ئەو توێژانەی (زەحمەتكێشان)یان پێدەڵێن زانست و ئایدیۆلۆژیایان نە ئافراند. هەروەكو لیبرالیزمیش زۆر بەباشی دەركی بەمەكرد و شیكردنەوەكانیانی سەبارەت بەسەرمایە كە هەر لەدایك بوونییەوە بەشۆڕشگێڕیان لە قەڵەمدەدا، بەشێوەیەكی بەركەماڵ بۆخۆی بەكاری هێنا. هەربۆیە دواتر سەرەتا سۆسیال دیموكراتەكانی ئەڵمانیا، دوای ئەوانیش سیستەمی سۆسیالیزمی بونیادنراو ـ بە روسیا و چینیشەوە- هەرە دواییش سیستەمەكانی رزگاری نیشتمانی تواندەوە ـ لە رێگای هێزی مۆدێرنی ئایدیۆلۆژیانەی دەوڵەت ـ نەتەوە و پیشەسازیەوە شەڕی چینایەتیشی بردەوە كە لەپێناویدا شەڕێكی زۆر كرا. دۆڕاندنێكی ئاشكرا جێگای باسە، بەڵام بە داخەوە تاكو ئێستا رەخنەدانێكی روون پێشنەخراوە.

گووتەیەكی بەمجۆرە هەیە: زوو یان درەنگ زانست قسەی خۆی بەسەردەخات. ئەگەر بەراستی دەقە نووسراوەكانی رۆشنبیران سەبارەت بە سەرمایەداری (لە راستیدا سەرمایەداری شەڕێكە بەرامبەر بە كۆمەڵگا و مێژووەكەی، لەسەرووی هەمووشیانەوە بەرامبەر چینی كاركەر جاڕدراوە) ناوەڕۆكێكی زانستییان هەبوایە بەمجۆرە بەرامبەر

سیستەمی دژ تێکنەدەشکان. خراپتریش، میراسەکەیان بەم هەرزانییە بەفیڕۆ نەدەچوو و بەکار نەدەهێنرا. لە کۆمەڵناسی ئازادیدا ئەم گفتوگۆیانە فرە ڕەهەندتر دەکەین، ئەو ڕاستیانەی بە **"ئابووری سەرمایەداری"** بەناودەکرێت باشتر پێناسە دەکەم و لەناو ڕۆڵ و کارابوونەکەی خۆیدا هەوڵی شیکارکردنی دەدەم. پێویستی ڕوونکردنەوەی زمانی ئابووری نابینم کە سەبارەت بە کۆکردنەوەی سەرمایە بەشێوەی بەرهەمی - زێدە، زێدە - بەها، ڕەنج - بەها، کرێ، قازانج، نرخ، پاوان، بازاڕ و دراو بەکارهاتووە. ئەم بابەتانە کە لێتوێژینەوەیەکی زۆریان لەبارەوەکراوە، وەک پێویستییەکی هەڵوێستە ئەخلاقییەکانم لەناو سادەیی خۆیدا بەجێی دێڵم، لەگەڵ ئەو فاکتەرانە درێژە بە بابەتەکەمان دەدەین کە بەڕاستی پێویستییان بەڕوونکردنەوە هەیە. بەڵام ئەمەش پشتگوێ ناخەم کە بەپێی پێویست دەستیان بۆ ببەم.

لەبواری ئابووریدا دەرکەوتنی زاراوەی قازانج - کرێ، بواری کۆمەڵایەتیش بەشێوەی بۆرژوا- پرۆلیتار یەکەمین هەنگاوەکانی بەزانستیکردنی سیستەمێکە بەشێوازی پۆزێتیڤیستانەوە: کە لەلایەن سەرمایەدارییەوە تەواوی توانا مێژووییەکانی مرۆڤایەتی پێ پارچەپارچە دەکرێت و بەپەیڕەوە ورد و بیڕەحمەکانی دەتوێنرێنەوە، تا دواجار لە ڕێگای کۆمەڵکوژی و مەترسی چەکە ناوەکییەکانەوە تەنگ بەهەسارەکەمان هەڵدەچنرێت. دەستنیشانکردنێکی وەک: **"ئەو فاکتەرەی بە پرۆلیتاریا بەناودەکرێت بەرەنجی تەنیای خۆی بەها دەئافرێنێت، دواتر ئەو سەرمایەدارەی بە جۆرێک لەجۆرەکان خاوەنێتی پارەو ئامرازەکانی دیکە وەک قازانجێک لەم بەهایە بۆخۆی دادەبڕێت"** وەک دەستنیشانکردنێکی زانستیانە پێشکەشدەکرێت. هەر ئەمەش بناخەی هەڵوێستی ئۆکۆنۆمیزمە. ئەمەیە ئەو چەمکەی بە میتۆدی بچووککردنەوە بۆ ئابووری بەناو دەکرێت. تەنانەت بیرکردنەوە لە پێناسەی بەهایەک کە هێندە لە مێژوو، کۆمەڵگا و دەسەڵاتی سیاسی دابڕاوبێت بۆخۆی زۆر بە کێشەیە. ئەگەر تاک بەشێوەی سەرمایەدار و کرێکار بکەین بە ئیلاهیش، لە میانەی ئەم چەمکەوە ناتوانن بەها بئافرێنن. ناوەڕۆکی مێژوویی

- کۆمەڵایەتی بەها ئابوورییەکان زۆر روون و ئاشکرایە. هەڵبەتە لە سەرەتای دەرکەوتنی ئاڵوگۆڕکردندا تەماشاکرنی وەک عەیبێک، و وەک دیاری پێشکەشکردنی بەرهەمە زیادەکان، واتایەکی پیرۆزە کە بە بەها دراوە. تا ئێستاش هیچ جووتیارێک ناڵێت: "من بەرهەم دێنم" دەڵێت: "موڵکی باپیرانم دەکێڵم و بەشی خۆم وەردەگرم". تەنانەت دەڵێت: "سوپاس بۆ نیعمەتی خودا"، بەشێوەیەکی سادە دەیخاتەڕوو، لەسەرچاوە تێگەیشتووە، لە بەناو "زانست"ەکە زۆر واتادارترە.

لێرەدا چۆن رەنجی ئەو دایکەمان پێ پێناسە دەکرێت کە نۆمانگ پرۆلیتارەکە لەسکی خۆیدا هەڵدەگرێت، بەهەزار و یەک زەحمەتیەوە گەورەی دەکات تا دەبێت بەکارکەر (هێزی کار)؟ چۆن بەشی خاوەنی ئەو ئامرازانەی بەرهەمهێنانمان پێ دەستنیشان دەکرێت کە ئەنجامی توانای کەڵەکەبووی هەزاران ساڵە و سەرمایەدار هاتووە دزیویەتی و دەستی بەسەردا گرتووە؟ نابێت لەبیر بکەین کە بەهای هیچ ئامرازێکی بەرهەمهێنان ئەو نرخە نییە کە لە بازاڕدا پێی دەفرۆشرێت. تەنیا دۆزینەوەی تەکنیکی کارگەیەک بەرهەمی توانای دۆزینەوەی بە هەزاران مرۆڤی داهێنەرە. چۆن بەهای ئەمانەمان پێ دەستنیشان دەکرێت و بەکێیان بدەین؟ تا نکۆڵیکردن لە ئەخلاق لە ئارادا نەبێت، دەشێت بیر لەبەشی کۆمەڵایەتی ئەمانە نەکرێتەوە؟ دابەشکردنی ئەم بەها مێژوویی - کۆمەڵایەتییانە تەنیا لەنێوان دووکەسدا لەگەڵ دادوەریدا دەگونجێت؟ خۆی لەخۆیدا ئەم دوو کەسەش خێزان و دەوروبەری کۆمەڵایەتی خۆیان هەیە. ئایا ئەم بەهایانە کە لە سایەیدا پارێزراون و ئامێزی بۆ کردوونەتەوە، هیچ مافێکیان بەسەر ئەم دوو کەسەوە نییە؟ دەتوانین پرسیارەکان زیاد و قووڵتریش بکەین. بەڵام ئەمە بەسە بۆ پیشاندانی ئەو راستییەی کە ماهییەتی دوالیزمی قازانج - کرێ چەندە بەکێشەیە.

با ئەمجارە خاوەنەکانی قازانج و کرێ وەکو بۆرژوا - پرۆلیتار بەیەکترەوە پەیوەندیدار بکەین. ئەو بانگەشەیە چەندە لەگەڵ راستییەکان دەگونجێت کە دەڵێت: ئەم دوو چینە لە قۆناخی پەیدابوونیاندا وەک دوو چینی شۆڕشگێڕ بەرامبەر بە کۆمەڵگای کۆن کۆمەڵگای نوێیان

ئافراند؟ ئەم جۆرە ڕێککەوتنە بەرامبەرەکەی لە مێژوودا نییە. نموونەی سەلمێنەری ئەوەش زۆر دەگمەنە کە دواتر وەک پێویستییەکی ناکۆکی سەرەکی ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوە و قۆناخێکی بنچینەیی پێکدادان ڕوودەدات. ئەوەی ئەمانیش هەر بەردەوامی نەریتی پێکدادانی کۆنە. ئەوەی زەقە و لەناو ژیانی بەرجەستەدا دەبینرێت، هەروەکو چۆن کۆیلە پارچەیەکی زیادی جەستەی فیرعەونە، ڕەوشی کرێکار بەرامبەر بە بۆرژواش هاوشێوەیە. لە مێژوودا کۆیلەکان بەرامبەر بە خاوەنەکانیان، هیچ چالاکییەکی سەرکەوتووانەیان نییە. تەنانەت سپارتاکۆسیش کە زۆر جار ناوی دەهێنرێت، یاخیبوونێک بوو دەیخواست ببێت بەکۆیلەدارێک. چاک دەزانین کە پرۆگرامێکی لەوە جیاوازتریان نەبوو.

نابێت لەبیری بکەین پەیوەندی خاوەنکار ـ کارکەر کە میراسی هەزاران ساڵەی پەیوەندی کۆیلە ـ کۆیلەداری وەرگرتووە بە هەزار و یەک گرێ بەیەکترەوە بەستراونەتەوە، جگە لە دانەیەکی ناوازە، یاخیبوون و بە دەستهێنانی سەرکەوتن جێگای باس نییە. تا ڕادەیەکی مەزن پەیوەندییەکان لەسەر بنەمای وابەستەبوون بە خاوەنکارەوە درێژەی پێدراوە. هەروەکو دەزانین و ئاگادارین ئەو ڕووداوانەی بە سەرهەڵدانی کرێکارانیش بەناو دەکرێت زیاتر لەلایەن نیو لادێییەکان و ئەو کەسانەوە ئەنجامدراوە کە دژی بێکارین. سەرهەڵدانەکان پەیوەندی بەکاریگەرییە گشتییەکانی کۆمەڵگاوە هەیە. ئەوەی لە پەیوەندی نێوان کارکەر ـ خاوەن کاردا ڕەنگدەداتەوە ئەم کاریگەرییە. ئەوەی گرنگترە تێکۆشانی مافی بەرامبەر بە خاوەنکار نییە، تێکۆشانێکە لەبەرامبەر بوون بە پرۆلیتار و دۆخی کرێکاری و بێکاری. نەبوون بە پرۆلیتاریا و پەسەند نەکردنی کرێکاری و بێکاری تێکۆشانێکی واتادار و ئەخلاقی کۆمەڵایەتییە. کۆیلە و جووتیار و کرێکار هەریەکەیان وەک چەوساوەیەکە هەرگیز نابێت شکۆداریان بکەین. بەپێچەوانەوە ئەو کردار و پەیوەندییەی کە دەبێت شکۆدار بکرێت، پێویستە بەشێوەی نەبوون بەکۆیلە، نەبوون بەجووتیار و کرێکار فۆرمێلە بکرێت. سەرەتا ئەفەندییەکان دەناسێنێ و پێناسەیان دەکەیت، دواتر پێشنیازی تێکۆشان بۆ خزمەتکارەکانیان دەکەیت، ئەمە مەیلی هاوبەشی

تەواوی هەلپەرستەکانە. بەدرێژایی مێژوو ئەم جۆرە زهنییەتانە تێکۆشانی ماف و رەنجیان مایە پووچ کردووە. بەکورتی لەمیانەی ئەو زاراوانەی سەرەتای 'زانست'ەوە نەدەتوانرێت کۆمەڵناسییەکی واتادار پێشبخرێت، نە تێکۆشانێکی کۆمەڵایەتی سەرکەوتووانە پێشدەخرێت! کاتێک ئاماژە بەم خاڵانە دەکەین نکوڵیمان لە رەنج، بەها، قازانج و چین نەکردووە، بەڵکو دەڵێین شێوازی بەکارهێنانیان لە ئاواکردنی زانستدا راست نییە. خوازیارم ئاماژە بەوە بکەم کە کۆمەڵناسییەکی چەوت ئاواکراوە.

لە ژیانی ئابووری کۆمەڵگادا شوێنی سەرمایەداری لە نهۆمی هەرە سەروو دانراوە. هەر لەسەرەتاوە پشت بە کۆکردنەوەی سەرمایەی بازرگان دەبەستێت کە لەسەر بنەمای پاوانکردنی نرخەکانی بازاڕ بەدیهێناوە. وەک پێویستییەکی پێناسەکەی، سەرمایە ئەو بەهایەی پارەیە کە بەردەوام خۆی گەورە دەکات. بەتایبەتیش بەرامبەر بەو بازاڕە دوورانەی جیاوازییەکی زۆری نرخ لەنێوانیاندا هەیە کۆکردنەوەی بەهایەکی ئێجگار گەورەیە. رێگای دووەم گەورەبوون لەمیانەی ئەو سوودەیە کە دەخرێتە سەر ئەو بیمانەی بەشێوەی فینانس بە دەوڵەت دەدرێت. دەرخستنی کانزا، قۆناخەکانی قات و قڕی و شەڕ ئەو سەردەم و گۆڕەپانەکانی ترە کە سەرمایەداری تێیدا درەوشاوەتەوە. جگە لە بازرگانی، کاتێک قازانج لە کشتوکاڵ، پیشەسازی و گەیاندندا ببینێت جێگای خۆی تێدا دەکاتەوە. لەگەڵ سەرهەڵدانی شۆڕشی پیشەسازی گۆڕەپانی قازانجی سەرەکییان دەبێتە کەرتی پیشەسازی. لەهەردوو قۆناخیشدا لە رێگای یاریکردن بە خواست ـ خستنەڕووەوە، هەوڵی دەستبەسەرداگرتنی بەرهەمهێنان و بەکاربردن (استهلاك) دەدات. بەرزبوونەوەی قازانجی بەستراوەتەوە بەڕادەی یەکلایی کەرەوەییەوە. لەکاتێکدا لەسەردەمی سەرەتا و پێگەیشتنی سەرمایەداریدا پیشەسازی و بازرگانی مەزن گۆڕەپانی قازانجی سەرمایەداری بوو، بەڵام ئەوەی لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا دەرکەوتۆتە پێش کەرتی فینانسە. پارە، دەستاوێز، بانک، بیمە کە ئامرازە سەرەکییەکانی فینانسن ئابووری سەرمایەداری خێرا دەکات، سووڕی قازانج کورت دەکاتەوە، چڕ و بەرفراوانی دەکات.

بەمجۆرە لە ڕادەی قازانجدا هەڵاوسانی قەبڵاندن (سوود)ی مەزن دێتەکایەوە. بەمجۆرە قۆناخەکانی قەیران دەبێتە پارچەیەکی دانەبڕاوی ئەم ئابوورییە.

داخستنی کرێ لە ڕێگای زیادکردنی ژمارەی کرێکاران و گواستنەوەی وەبەرهێنان بۆ ئەو وڵاتانەی هێزی کاری هەرزانە، یەکێکی ترە لەو ڕێبازانەی کە قازانج دەئاوسێنێت. ئەم شێوە ئابوورییە کە سەرچاوەکەی لە کۆنترین کلتووری ڕاو و بازرگانیدا دەدۆزێتەوە، لە ڕێگای بەدەستهێنانی هێزی یاریکردن بە نرخ شانسی پێشکەوتنی بۆ خۆی فەراهەم کردووە، لە ڕێگای خاوکردنەوەی ئایین و ئەخلاق لە کۆنترۆڵی کۆمەڵگا ڕزگاری بووە، لە ڕێگای بیمەوە دەسەڵاتی بەخۆیەوە گرێداوە و لەمیانەی قۆرخکردنی بازاڕەوە پێشکەوتووە، لە ئەنجامدا لە بوون بە ئابووری تاڵان ڕزگاری نابێت. لەبەرئەوەی بە ئامانجی قازانج دەستی بەسەر پیشەسازیدا گرتووە، بەگوێرەی ئاستەکانی قازانج بەرهەمهێنان و بەکاربردن بەبنەما دەگرێت، کۆمەڵگا و ژینگە بەباری ئێجگار قورس باردەکات کە هەڵگرتنیان زەحمەتە: هەر لەسەردەمی لەدایکبوونییەوە قەیران، هەرەس و پووکانەوە لەگەڵ خۆی دێنێت. بێگومان تەواوی ئابووری بریتی نییە لەمە. نەبازرگانی، نەکشتوکاڵ و پیشەسازی، نەهەڵسوڕان، نە ئامراز و بازاڕ داهێنانی سەرمایەدارین، بەپێچەوانەوە ئەو دەزگا ئابوورییە سەرەکییانەی کۆمەڵگان کە دووچاری تاڵانکاری و قۆستنەوەی قورسی سەرمایەداری هاتوون. ئەم دەزگایانە خاوەن ژیانێکن کە لەمیانەی مێژوو و شارستانییەوە چەسپێنراون و لەگەڵ سیاسەتدا تێکهەڵکشێن.

بەمجۆرە هەوڵمدا ڕوونی بکەمەوە کە ئیکۆنۆمیزم سەبارەت بە پێناسەکردنی ئابووری سەرمایەداری مەیلێکی هزری و چەمکێکە تارادەیەکی مەزن ڕاستییەکان دەشارێتەوە و چەواشەیان دەکات. لەو بڕوایەدام کەمێکیش بێت لەسەر بنەمای ئەم ڕەخنانە هەوڵمدا گرێدراو بە مێژوو - کۆمەڵگا، سیاسەت و شارستانی - کلتوور لەمیانەی هێڵە گشتییەکانەوە پێناسەیەکی ڕاست پێشبخەم.

## ج ـ دەسەڵاتی سیاسی و پەیوەندیەکەی بە حقوقەوە

سەرجەم تێڕوانینەکان ئەو راستییە دەسەلمێنن: کاتێک سەرمایەداری هێشتا لە دۆخی ناوکدا بوو لەلایەن دەسەڵات وحقوقەوە وەک نەمامێک پێگەیەنرا. هەروەکو چۆن سوودی لەهەموو دەسەڵات و حقوقێک بینیوە، کاتێک لە خزمەتیدا بووە بەشێوەیەکی هەرە مەحافەزەکارانە بەرگری لێکردووە: کاتێک زیانی بە بەرژەوەندییەکانیشی گەیاندووە، لەمیانەی هەموو جۆرە پەیڕەوێکی پیلانگێڕییەوە ـ تەنانەت کە پێویستی بینیوە بەشداری چالاکییە شۆڕشگێڕییەکانیش بووە ـ لە رووخاندنیدا دوودڵ نەبووە، هەندێک جار بەشداری لە دژوارترین یاری شۆڕشگێڕیشدا کردووە. لە کودەتای فاشیستییەوە تا دەگاتە کودەتای کۆمۆنیزمی دروستکراو ـ بەتایبەتی لە قۆناخەکانی کائیوس و قەیراندا ـ هەموو جۆرە شەڕێکی دەسەڵاتی کردووە. گەورەترین و بەرفراوانترین شەڕەکانی داگیرکاری، ئیمپریالیزم و ئمپراتۆریەتی مێژوویی بەڕێوەبردووە.

بەبایەخەوە ئاماژەی پێدەکەین کە هیچ شێوەیەکی ئابووری هێندەی سەرمایەداری پێویستی بە قەڵغانی دەسەڵات نەبینیوە، بەبێ دەسەڵات ئاوانابێت. کەچی ئابووریناسە ـ سیاسیەکانیش بانگەشەی ئەوە دەکەن کە سەرەکیترین تایبەتمەندیتی سەرمایەداری ئەوەیە: بۆ یەکەمین جارە لە مێژوودا لە دەرەوەی دەسەڵات، لەمیانەی پەیڕەوی ئابووری و یەکێتی ئارەزوومەندانەی سەرمایە ـ رەنج، قازانج و زێدە ـ بەرهەم و زێدە ـ بەها پێکهاتووە. هەم وەک ئەگەرێکی سەرەکیش ئەمە دەڵێن. رووبەڕووی گووتەیەکین بەلانی کەم هێندەی تیۆری رەنج شێوێنراوە. کەم و زێدە چیرۆکەکە بەمشێوەیە دەنووسرێت: لە شوێنێک بەشێوازێکی ئاشتیخوازانە سەرمایە کۆکراوەتەوە، هەروەها لە ئەنجامی پەیوەندییە ئاشتیخوازییەکانەوە لادێیی، جووتیار و پیشەکاران لە ئامرازەکانی بەرهەمهێنان دابڕاون و هاتوونەتە لای یەکتر، هاوشێوەی جۆرێکی هاوسەرگیری بەختەوەر و شۆڕشگێڕانە، وەک فاکتەرەکانی بەها

سەنتێزێکیان پێکهێناوە و شێوەی نوێی ئابوورییان هێناوەتە سەر شانۆی مێژوو. ئەمە بانگەشەیەکە لە دەقە نووسراوەکانی برپارگا راستڕەو-چەپڕەوەکانی تەواوی سیاسەتمەدارە ئابووریناسە زەبەلاحەکاندا دەبینرێت، بە واتای "ئەشهەدو پێهێنان" دێت. ئەم بانگەشەیە نەبێت ئابووری ـ سیاسیش نابێت. کاتێک کێبڕکێی بازاڕیشی بخەیتە سەر، واتە پەرتووکێکی بەرکەماڵت دەرهەق بە بنەما سەرەکییەکانی سیاسەتی ـ ئابووری نووسیوە.

من بۆخۆم پێویستی بانگەشەکردنی شتێک نابینم. پەرتووکی "شارستانی ماددی" کۆمەڵناس و مێژووناس فرناند براودل (کە شاکارێکی سێ بەرگییە و رەنجی سی ساڵییەتی) تێبینییە بەرفراوان و هەڵوێستە بەراوردکارییەکانی بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا ئەمە بەدرۆ دەخاتەوە. یەکەمین بانگەشەشی ئەوەیە کە سەرمایەداری دژی بازاڕە. دووەمیان، تا قوڕگ گرێدراوی هێز ـ دەسەڵاتە. سێیەمیان، هەر لە سەرەتاوە، پێش لە پیشەسازی و دوای ئەویش پاوانکارە. چوارەمیان، سەرمایەداری لەژێرەوەو ناوەوە لەرێگای پێشبڕکێوە نەهاتووە، لە دەرەوەو لەسەرەوە لەمیانەی تالان و پاوانکارییەوە سەپێنراوە. واتا بۆچوونی بنەڕەتی پەرتووکەکە بەمجۆرەیە. هەرچەندە هەندێک لایەنی ناتەواوەو لەگەڵ هەندێک بواریدا هاوڕا نیم، بەڵام لایەنی باسکردن و ناوەڕۆکەکەی واتادارترین شرۆڤەی مێژوو ـ کۆمەڵناسییە. ئەگەر سنووردارێش بێت، سەرەتایەکی باشە بۆ راستکردنەوەی ئەو لادان و شێواندنانەی سیاسەتمەدار ـ ئابووریناسە ئینگلیزەکان، سۆسیالیستە فەرەنسایی و مێژووناس و فەیلەسوفە ئەڵمانییەکان دەرهەق بە زانستی کۆمەڵایەتی ئەنجامیانداوە.

لە ناوەندێکدا کە پێشبڕکێیەکی سەربەست و ئارەزوومەندانە لە ئارادا بێت، سیستەمێکی ئابووری جێگای باس نییە کە بەیەکخستنی هێز و تواناکانی رەنج لەلایەن سەرمایەدار و کرێکارەوە بونیادنرابێت. تەنانەت داستان و چیرۆکەکانیش تا ئەو رادەیە لە راستییەکان دوور نەکەوتوونەتەوە. دانە دانە یان وەک گرووپ و چین، تەواوی ئەو فاکتەرانەی

دەتوانین بە سەرمایەدارییان لە قەڵەمبدەین و ئەو هێزە ئابوورییانەی خاوەندارێتی دەکەن، بۆ ساتێکیش پاراستنی دەسەڵات نەبێت لەسەرپێ نامێنن و دەسەڵاتیان بەدەستەوە نامێنێت. دیسان ئەگەر گەمارۆی بەرفراوانی دەسەڵات نەبێت، لە بازاڕی هیچ شارێکدا، لەمیانەی کێبڕکێی سەربەستەوە نەکڕین و فرۆشتنی موڵک، نەکڕینی هێزی کار جێگای باس دەبێت. لەمەش گرنگتر: تا ناوەندێکی بێدادی و بێ بەزەییانەی توندوتیژی نەڕەخسێت دابڕانی جووتیار، لادێی و پیشەکاران لە زەوی و دەزگاکانیان پێشناخرێت، ئەنجامگیر نابێت. هەوڵەکانی دابڕانی زەحمەتکێشان لە زەوی و وەرشەکانیان کە وەک دایکیان پێیانەوە گرێدراو بوون لە ئەوروپا بەدرێژایی سەدەی چواردەهەم تا دەگاتە سەدەی نۆزدەهەم لەمیانەی راپەڕین و یاخیبوونەوە وەڵامدراوەتەوە. بە هەزاران مرۆڤ لە سێدارە دراون، بە ملیۆنانیان لە شەڕە ناوخۆییەکاندا کوژراون، لە زیندان و نەخۆشخانەکاندا رزیون. ئەمانەش بەس نەبووە، لە ئاکامی شەڕە مەزهەبی و نەتەوەییەکانی نێوانیانەوە دەریای خوێن هەستاوە. شەڕە داگیرکاری و ئیمپریالیستییەکان خشتەی ئامارەکەیان دژوارتر کردووە.

زۆر بەروونی پەیوەندی ئەم فاکتەرانەی توندوتیژی لەگەڵ کارەکتەری پاوانکاری و تاڵانکاری داسەپاندنە دەرەکییەکانی سەردەمی سەرهەڵدانی سەرمایەداری دەبینرێت. کامە رەوانبێژی ئابووری ـ سیاسی دەتوانێت ئەم راستیانە سەراوبن بکات؟

بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی بەرجەستەتر راستییەکان ببینین، پێویستە لەنزیکەوە بڕوانینە شەڕەکانی سەدەی شازدەهەم کە سەرمایەداری بەرەو سەرکەوتن برد. فاکتەرە سەرەکییەکانی شەڕ و دەسەڵاتی سەدە: ئیمپراتۆرەکانی لقی سولالەی هابسبۆرگ لە ئیسپانیا، پادشاکانی بنەماڵەی ڤالیۆس لە فەرەنسا، بنەماڵەی شتوارتی ئەنگلۆ ـ ساکسۆن لە ئینگلتەرا کە جێگای پادشا بە بنەچە نۆرمانەکانیان گرتەوە، هەروە سەیریش میرنشینی (ئورانج)ە لە هۆڵەندا کە تەنانەت هێشتا ناوی بۆ دانەنراوە و تازە پێدەگات، دەست بە کاردانەوەی یەک لەدوای یەک دەکەن.

پادشا و ئیمپراتۆرە هابسبورگەکان کە بە بنەچە ئەڵمانن و

لەگەڵ دەرکردنی موسڵمانەکان لە ئیسپانیا (لەساڵانی بەرەو ١٥٠٠دا) بەهێزبوون و بە خێرایی بەرەو ئیمپراتۆرییەت بەرز بوونەتەوە خۆیان وەک میراتگری رۆما بینیوە. بە تایبەتیش کاتێک لەساڵی ١٤٥٣دا دوای ئەوەی کۆستانتۆپۆلیس (ئەستەنبوڵ) دەکەوێتە ژێردەستی بنەماڵەی عوسمانی سەرکێشی کردنی هابسبورگەکانی نەمسا لە شەڕی دژ بە عوسمانییەکان، وەک بیانوویەکی ئەم بانگەشەیە بەکاردەهێنرێت. بنەماڵەی ڤالیۆسی پادشای فەرەنساش تووشی خەیاڵی ئیمپراتۆرییەت هاتووە. خۆیان وەک میراتگری راستەقینەی رۆما بینیوە. پادشایەتی ئینگلتەرا و میرنشینی هۆڵەندا بۆ ئەوەی لەلایەن ئەم دوو ئیمپراتۆرییەتەوە قووتنەدرێن جۆرێک لەشەڕی سەرەتایی رزگاری نیشتمانییان بەڕێوە بردووە. یەک لەدوای یەک پادشایەتی سوید، میرنشینی بروسیا[1] و تەنانەت میرنشینی مۆسکۆش کە بەشێوەی هەڵکشانی قەیسەر بووە، ئەوانیش خۆیان بەمجۆرە راگەیاندووە. پادشایەتی ئینگلتەرا و میرنشینی ئۆرەنج لەسەرەتاکانی سەدەی شازدەهەمدا لەلایەن پادشایەتی ئیسپانیا و فەرەنساوە رووبەڕووی مەترسییەکی راستەقینەی قووتدان بوونەوە. ئەگەر ئەمە سەری بگرتایە شیمانەیەکی لەپێش بوو کە پێشکەوتنی سەرمایەداری باکووری رۆژئاوای ئەوروپا لەسەرووی هەمووشیانەوە ئینگلتەرا و هۆڵەندا، بکەوێتە هەمان دۆخی شارەکانی ڤێنسیا، جەنەوا و فلۆرەنسای ئیتاڵیا.

هۆکاری سەرەکی سەرنەکەوتنی ئەم شارە سەرمایەدارییە بەهێزانەی ئیتاڵیا لە جێگیرکردنی سەرمایەداری لەسەرانسەری ئیتاڵیا بۆ لاوازی سیاسییان دەگەڕێتەوە. راستتر شەڕی فەتحکاری و باڵادەستی کە پادشا و ئیمپراتۆرەکانی نەمسا و فەرەنسا بەڕێوەیان دەبرد، بە ملکەچکردنی ئەم شارانە ئەنجامگیربوو. ناچاربوون لەئاستێکی سنوورداری هێزی سیاسی و ئابووریدا بمێننەوە. هەربۆیە هەم یەکێتی وڵاتی ئیتاڵیا درەنگ کەوتووە، هەم ئەزموونی سەرمایەداری ئیتاڵیا نیوەچڵ ماوەتەوە و لە تەواوی وڵاتدا بڵاونەبۆتەوە. ئەگەر بەشێوەیەکی کاتیش بێت، لێرەدا توندوتیژی

---

١ـ ئەو ناوەیە کە جاران بە ناوچەکانی باکور و رۆژئاوای ئەلمانیا دەگوترا. بەهێزترین هەرێمی بەر لە یەکگرتن بوو.

رۆڵی یەكلاكەرەوەی بینیوە. هەروەكو تەواوی فاكتەرە سەرمایەدارییەكان كە تێی كەوتوون، سەرمایەدارەكانی شارەكانی ئیتاڵیاش بەرامبەر دەستبەردانیان لەسەروەری سیاسییان، ئەم دەوڵەتانەیان لەڕێگای فینانسەوە بەخۆیانەوە گرێداوە، بوونەتە ئامرازی سیاسەتی بەرژوەندیی خوازانەی "بارت بگرە و باجت بدە". چونكە ئایینی نوێی سەرمایەداری لەدەوروبەری پارە > پارە شێوەی گرتووە.

پادشایەتی ئینگلتەرا و میرنشینی ئۆرەنج تێكنەشكان. هەم قەرزدان بە دەوڵەت لەلایەن فاكتەرەكانی سەرمایەدارییەوە ، هەم پێشخستنی پیشەسازی كەشتیوانی كە لەگەڵ دەوڵەت بەیەكەوە پێكیان هێنا لەم تێكنەشكاندنەیاندا رۆڵی سەرەكییان بینی. لەجیاتی هێزی زەمینی قاڵبوونەوەیان لەسەر هێزی دەریایی دەرفەتی سەركەوتنی رەخساند. لەم قۆناخەدا دوو پێشكەوتنی ستراتیژی گرنگ روویاندا.

۱- پادشایەتی ئینگلتەرا و ئەیالەتەكانی هۆڵەندا قورساییاندایە سەر مۆدێلێكی دەوڵەت كە بەشێوازێكی سەرمایەداریانە سەر لەنوێ رێكدەخرایەوە و دەكرایە خاوەن چالاكی. بوونە یەكەمین نموونەی ئەو دەوڵەتەی لەمیانەی باجی سیستەماتیک بەڕێوەدەچێت و بودجەی خۆی هاوسەنگ دەكات، پشت بەبیروكراسییەكی عەقڵانی و سوپایەكی پرۆفیشناڵ دەبەستێت. لە رێگای هێزە دەریاوانییە پێشكەوتووەكەیانەوە هێزی دەریایی ئیسپانیا و فەرەنسایان تێكشكاند. باڵادەستیان بەسەر زەریای ئەتڵەسی و دواتریش دەریای سپیدا چارەنووسی شەڕەكانی داگیركاریشی دیاركرد. كەوتنی ئیسپانیا و فەرەنسا بەمجۆرە دەست پێدەكات. سەركەوتنەكانی ئیسپانیا و فەرەنسا لە شەڕی زەمینیدا، بەهۆی قەرزە زۆرەكانیانەوە، بوو بەسەركەوتنی پیروس. ئەو شرۆڤەیەی بەگشتی پەسەنددەكرێت: ئەوەی چارەنووسی ئابووری سەرمایەداری دەستنیشانكرد، ئەو نوژەنییە بوو كە لە پێكهاتەی دەسەڵاتی ئینگلتەرا و هۆڵەندا دا روویدا. جارێكی دیكەش بۆمان دەردەكەوێت كە لە خاڵێكی هەستیاری وەرچەرخاندا توندوتیژی سیاسی رۆڵی یەكلاكەرەوە لە شێوەگرتنی ئابووریدا دەبینێت. ئەوەی شارەكانی ئیتاڵیا تێیدا سەرنەكەوتن،

لەندەن و ئەمستردام تێیدا سەردەکەون.

٢ـ پێشکەوتنی دژ بە دەسەڵاتی سیاسی ئینگلتەرا و هۆڵەندا، لە دەوڵەتە ئیمپراتۆرییەکانی نەمسا، فەرەنسا و ئیسپانیای ئەم سەردەمەدا روودەدات. ئەم سێ دەوڵەتە زیاتر بەدوای ئارەزووی ئاواکردنی ئیمپراتۆریەتێکی وەک هی رۆماوە بوون. هەم خزمایەتییەکی بەهێز لەنێوانیاندا هەبوو، هەم ناکۆکی. پادشایەتی ئینگلتەرا زوو لەم ئەشقە رزگاری بوو. لەجیاتی ئیمپراتۆرییەتی ئەورووپا چاوی خۆی بڕییە ئیمپراتۆرییەتی جیهان. بە پشتبەستن بەسەرکەوتنی سیستەمی سەرمایەداری، هەرچەندە رژێمەکانی دەوڵەتی ئیسپانیا، فەرەنسا و نەمسا بەرەو مۆنارشی هاوچەرخ چەندین ریفۆرمیان بەخۆیانەوە بینیوە، بەڵام لەناوەڕۆکدا ئەو ئامرازە سیاسیانە بوون کە بەگوێرەی کۆمەڵگا کۆنەکان شێوەیان گرتووە. دووربوون لەپێکهێنانی سوپایەکی پرۆفیشناڵ، بیرۆکراسی و باجێکی مۆدێرن. بودجەکەیان هاوسەنگ نەبوو، بەردەوام قەرزیان دەکرد. لە چارەسەرکردنی ئەو نیگەرانیانەدا کورتیان هێنا کە پێشکەوتنی شارستانی رێگای لەپێش کردبۆوە. ئەوە لەولاوە بمێنێت کە سەرمایەدارەکانیان پشتگیریان لێبکەن، بەهۆی قەرز و گرێدانەوە ناکۆکییەکی زۆر لەنێوانیاندا دروستبوو. بەهۆی هەڵمەتی پادشایەتی مۆنارشی، ناکۆکی نێوان ئەرستۆکراسی دەرەبەگایەتی و ناوەندیبوون زیاتر بوو. بەهۆی ناکۆکی شار ـ لادێش تەواوی کۆمەڵگا هەستابووە سەرپێیان. تەنانەت یاخیبوونەکانیش بەسبوون بۆ ئەوەی هەناسە لەبەر ئەم مۆنارشیانە ببڕن. بەشێوەیەکی نهێنی پشتگیریکردنی ئینگلتەرا و هۆڵەندا بۆ رکابەرەکان رێگای لەپێش تەقینەوەی چەندین شۆڕش دەکردەوە. هەڵبەتە ئامانج و ئەنجامەکان هەندێک جار زۆرجیاواز دەبوون. هەروەکو لە شۆڕشی گەورەی فەرەنساشدا روویدا.

هەمان ئەو هێزانەی سەرکەوتنی کۆمەڵایەتی ـ سیاسی ئابووری سەرمایەدارییان لە ئیتاڵیا بەربەستکرد، مۆنارشییەکانی نەمسا، ئیسپانیا و فەرەنسا: بەرامبەر بەو مۆدێلەی دەوڵەت کە لەلایەن سەرمایەدارەکانی شارەکانی ئینگلتەرا و هۆڵەندا فینانس دەکران چەندین جار تووشی

شکست بوون. جارێکی دیکە بەشێوەیەکی روون دەبینین کە ئەنجامە ستراتیژییەکان پەیوەندی نێوان شێوەی ئابووری و سیستەمەکانی توندوتیژی رۆڵێکی یەکلاکەرەوە لەسەرهەڵدانی سەرمایەداریدا دەبینن. بۆ تێگەیشتنی پەیوەندی نێوان توندوتیژی، دەسەڵات و ئابووری، ئەوروپای سەدەی شازدەهەم تەواو رۆڵی تاقیگەیەک دەبینێت. هەروەکو بلێی تەواوی مێژووی شارستانی لە گۆڕی خۆی هەڵدەستێتەوە و باسی چیرۆکی خۆی دەکات. هەروەکو بڵێی دەڵێت: چەندە لەخۆت (ئەوروپای سەدەی ١٦) تێبگەیت ئەوەندە لەمنیش تێدەگەیت!

پوختەیەکی پێشکەوتنی مێژوویی - کۆمەڵایەتی پەیوەندی نێوان توندوتیژی و ئابووری بابەتەکە باشتر روون دەکاتەوە.

ا- لە چاخەکانی کۆمەڵگای بەر لە شارستانیدا یەکەمین رێکخستنی توندوتیژی "پیاوی بەهێز" تەنیا ئاژەڵەکانی نەخستە تەڵەزگەوە. هەمان رێکخستن بوو کە چاوی خۆی بڕیە تواناکانی خێزان - کلان کە بەرهەمی رەنجی ژێری سۆزداری (رووناکی چاوی) ژن بوون. یەکەمین رێکخستنی جددی توندوتیژییە. ئەوەی دەستی بەسەردا گیرا خودی ژن، منداڵەکانی و خزمەکانی دیکەی خوێنی بوون. کۆی توانای کلتووری ماددی و مەعنەوی هەمووان بوو. تالانکردنی یەکەمین ئابووری ماڵ بوو. لە تەواوی کۆمەڵگاکانی هەمان قۆناخدا دەبینین کە لەسەر ئەم بنەمایە شامانی شێوەی سەرەتایی راهیب، ریش سپی (شێخ) خاوەن ئەزموون و رێکخستنی توندوتیژی پیاوی بەهێز دەست دەخەنە ناو دەستی یەک. یەکەمین و درێژخایەنترین هێزی پلەداری (بەرێوەبەرایەتی پیرۆز) باوکسالاری پێکدێنن. ئاشکرایە تا قۆناخی جیابوونەوەی چینایەتی، ئاواکردنی شار و دەوڵەت ئەم پلەدارییە رۆڵێکی دیاری لە.ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتیدا بینیوە.

ب - ئەو شێوەگرتنە ئابوورییەی کە لە قۆناخی شارستانیدا لەگەڵ ئاوابوونی چین - شار - دەوڵەتدا دەستی پێکرد، ئەو هێزەی دەتوانین بەشێوەی راهیب - پادشا - فەرماندە لە کەسێتییەکاندا بەرجەستەی بکەین دەوڵەتی پێدەگووترێت. وەکو دەزگاش کاتێک بەشێوەی ئایین م

سیاسەت ـ سەربازی بەناویەکتردا دەچن دەسەلات پێکدێنن. سەرەکیترین خەسلەتی ئەم سیستەمەی هێز: ئابووری خۆی بەشێوەی کۆمۆنیزمی دەوڵەت ڕێکدەخات. بەرلەوەی ئاگاداری بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە بم لەلایەن ماکس وێبەرەوە، منیش ئەم ئابوورییەم بە "سۆسیالیزمی فیرعەون" بەناوکردبوو. وەک پاشماوەیەکیش بێت ئابووری دایکانە لەناو ئابووری خێڵەکی باوکسالاری ـ دەرەبەگایەتیدا درێژە بەهەبوونی خۆی دەدات. لە سۆسیالیزمی فیرعەونیدا مرۆڤ وەک چینێکی کۆیلەی پەتی بەکاردەهێنرێن. مافەکەیان تەنیا قاپێک شۆربایە، هێندەیە کە تەنیا نەمرن. دۆزینەوەی هەزاران کەللەسەری کۆیلەکان لەژێر ئاسەواری کۆشک و پەرستگا دێرینەکاندا بەڵگەی سەلمێنەری ئەم ڕاستییەن.

ئەو توندوتیژییەی لەشێوەی دەوڵەتدایە، تالانکردنی هەرشتێکی ئابووری لەو گۆڕەپانانەدا کە دەچێتە ناویان، وەک مافێکی خۆی دەبینێت. بەجۆرە قەرەبووکردنەوەیەکی توندوتیژی دەزانرێت. توندوتیژی ئیلاهی و پیرۆزە، هەرچییەک بکات هەقی خۆیەتی وحەلاڵە. بەتایبەتیش لە شارستانیەکانی ڕۆژهەلاتی ناوین، چین و هیندستان کە ناوەندی شێوەگرتنی بنەڕەتین، سەرخانی سیاسی یاخود چین ژێرخان وەک ئابووری هەڵدەسەنگێنن و هەموو جۆرە هێزێکی بەڕێوەبەرایەتی لە خۆیاندا دەبینن. هەروەکو چۆن هێشتا بازاڕ و پێشبڕکێ سەریانهەڵنەداوە، زاراوەیەکی لەشێوەی کەرتی ئابووری بە واتای ڕۆژی ئەمڕۆشمان جێگای باس نییە. هەرچەندە بازرگانی جێگای باس بێت، بەلام ئەم چالاکییە تەنیا یەکێک لە ڕۆڵ و کارە سەرەکییەکانی نێوان دەوڵەتەکانە. بازرگانی لە تایبەتیبوون دوورە. پاوانی دەوڵەت لە هەمان کاتدا پاوانی بازرگانییە. ئەو شارانەی ڕۆڵی بازاڕ دەبینن بەشێوەیەکی شاز تەنیا جاربەجار لەناوچە سنوورییەکان (تامپۆن)ی دەوڵەتاندا سەرهەڵدەدەن. ئەوانیش لەناو ماوەیەکی کورتدا دەبن بە دەوڵەتشار. لەبەرئەوەی لەو قۆناخەدا بازرگانی بەکاروان ئەنجامدەدرا، دزی و تالانی "پیاوی بەهێز" دواتریش "چل جەردە"، "چەتەکانی دەریا" و "ڕێگرەکان" بەلانی کەم هێندەی تالانکارییەکانی دەوڵەت جێگای باسە.

ج ـ لە شارستانی گریک ـ رۆمادا بازرگانی، بازاڕ و شاری ئۆتۆنۆم رەوشێكی چڕ و بەربڵاوی بەخۆیەوە بینی. دەسپۆتیزمی بابل و ئاشوور كە میراسی ئوروک و ئوریان وەرگرتبوو، بۆ یەكەمین جار نوێنەرایەتی (بەناویەكدا چوونی زاراوەكانی بازاڕ ـ قازانج جێگای باسە) ئابووری و بازرگانییان كردۆتەوە، بەمجۆرە كۆمەكێكی نوێیان پێشكەش بە شارستانی كرد. هەڵبەتە كۆلۆنیە بازرگانییەكان بۆ سەردەمی ئوروک و پێشتریش درێژ دەبێتەوە. زیادبوونی ئاڵوگۆڕ و دروستبوونی بازاڕ، ئامادەكاری ئەوە دەكات كە دەوڵەتی ئاشوور وەک یەكەمین ئیمپراتۆرییەتی شكۆدار دەركەوێتە سەر شانۆی مێژوو، بەشێوەیەكی سەرەكی ئیمپراتۆرییەتەكان وەڵامی پێویستی ئارامی و ئاسایشی ژیانی ئابوورییە. لەبەرئەوەی بڕبڕەی پشتی ئابووری ئاشوورییەكان بازرگانی بوو، بازرگانی و نوێنەرایەتییەكانیان رێكخستنێكی سیاسی بەشێوازی ئیمپراتۆرییەتی كردووە بە پێویستییەک. مێژوو ئیمپراتۆرییەتی ئاشوور وەک زۆردارترین و سەرەڕۆترین نموونەی ئیمپراتۆرییەت هەڵدەسەنگێنێت، هەربۆیە وەک گەڵاڵەنامەی ئەو سەرمایەدارییەی ئەمڕۆیە كە بە پاوانكاری سەرەكی بازرگانی بەناوی دەكەین. سەرمایەداری بازرگانی پاوانخوازی ئاشوور لەسەرخاندا زۆردارترین بەڕێوەبەرایەتی ئیمپراتۆرییەتی لەگەڵ خۆیدا هێناوە.

دەسەڵاتی سیاسی گریک ـ رۆما، كاتێک میراسی كۆلۆنی شارە بازرگانییەكانی فینیقییەكانیشیان خستە سەر میراسی ئاشوورییەكان، توانییان ژێرخانێكی ئابووری و سەرخانێكی سیاسی بەهێزتر ئاوابكەن. ئاڵوگۆڕكردن بەرفراوان بووە، بەشێوەیەكی سنوورداریش بێت بازرگانی، بازاڕ و شاری ئۆتۆنۆم و پێشبڕكێ كەوتوونەتە گەڕ. ئیترشاهێدی ئاواكردنی شارین بەجۆرێک كە لادێ هاوسەنگ دەكات. ئیتر لادێكان بە ئامانجی ئاڵوگۆڕكردن بەروبوومێكی زیاتر بۆ شارەكان بەرهەمدێنن. بازرگانی كانزاكان، خۆراک و بەرهەمەكانی رستن و چنین پێشكەوتووە. بەتایبەتیش تۆڕەكانی رێگا لە چینەوە تا دەگاتە زەریایی ئەتڵەسی ئامادەكراوە. دەسەڵاتی سیاسی ئێران بەهۆی بازرگانی رۆژهەلات و

رۆژئاوا، بووە بە ئیمپراتۆرییەتێکی هەمیشەیی بازرگانی. گریک و رۆمای تا ئەو ئاستە تەنگەتاوکردووە کە بیانخاتە ژێر هەیمەنەی خۆیەوە. ئێران لەمپەرێکی سەرەکییە لەپێش پەلامار و بزاوتە داگیرکارییەکانی چین، هیندستان و قەومەکانی ئاسیای ناوین و دەسەڵاتە سیاسییەکانیان بەرەو رۆژئاوا. بەرامبەر بە داگیرکاری رۆژئاواش سەبارەت بە رۆژهەڵات هەمان رۆڵی لەمپەر دەبینێت. بەڵام ئەسکەندەر و شوێنکەوتووەکانی لەماوەیەکی کورتدا (٣٣٠ ـ ٢٥٠پ.ز) دەتوانن ئەم لەمپەرە بڕووخێنن و دەرگای بەندەرەکان بکەنەوە.

شارستانی گریک ـ رۆما لە هەمان کاتدا نوێنەرایەتی ئەو شوێنە دەکات کە هەرە زێدە یەکەمین نموونەکانی ئابووری سەرمایەداری تێدا دەبینین. ئاستی ئۆتۆنۆمی شارەکان، ئاڵوگۆڕکردن و دەستنیشانکردنی نرخ لەبازاڕدا و دەرکەوتنی بازرگانە گەورەکان پیشانیدەدات کە سەرمایەداری گەیشتۆتە بەر دەرگا. چ هێزی ناوچەکانی دەرەوەی شار (لادێ) بەرامبەر بە شار، چ رێکخستنی شێوەی ئیمپراتۆرییەت (لە ریشەدا پشت بە ئابووری لادێ دەبەستن) دەبنە کۆسپ لەبەردەم ئەوەی سەرمایەدارەکان ببن بە سیستەمێکی کۆمەڵایەتی باڵادەست. لە ئاستی بازرگانە هەرە گەورەکاندا دەمێننەوە. دەستوەردانیان بۆ بەرهەمهێنان و پیشەسازی زۆر سنووردارە. هەروەها رووبەڕووی کۆسپە بەردەوامەکانی دەسەڵاتی سیاسی دەبنەوە. کۆیلایەتی گرێدراو بە کۆیلەدارەوە هێشتا درێژە بە پێگەی بەهێزی خۆی دەدات، شانسی ژیانی سەربەستانەی هێزی کار هێندە کەمە کە دەتوانین بڵێین نییە. ژنان وەک کەنیزەک، پیاوانیش وەک کۆیلە بەتەواوی جەستەیانەوە دەکڕدرێن و دەفرۆشرێن. راستییەکی حاشا هەڵنەگرە کە تاکە هێزی یەکلاکەرەوەی ئابووری کۆیلە توندوتیژییە. هەبوونی کۆیلەکان تەنیا وەک بەهایەکی ئابووری، هێندە ئاشکرایە کە رێگای گفتوگۆکردن بە پەیوەندی نێوان ئابووری ـ توندوتیژی (ئابوورییەک کە پشت بە پاوانکردنی بەرهەمی زیادە دەبەستێت) نادات. لە دەزگای چینە سەربازی و سیاسیەکانی سیستەمەکانی چین و هیندستانی سەردەمی کۆنەوە تا دەگاتە داگیرکاری

سەرمایەداری تەواویان کۆمەڵگاکانی ژێرەوەیان وەک کەرتی ئابووری بینیوە، بەکارهێنانیان و بەڕێوەبردنی ئەو کۆمەڵگایەیان وەک ئەرکی سەرەکی و مافی سروشتی خۆیان بینیوە. ڕاستتر تەنانەت بە مافێکی ئیلاهی خۆیان زانیوە.

وەک وشە ئابووری (ئۆکۆنۆمی) تایبەت بە دونیای گریک ـ هێلین ی چاخی کلاسیکە. پێناسەکردنی وەک یاسای خێزان، لەلایەکەوە ئاماژە بە پەیوەندییەکەی لەگەڵ ژندا دەکات، لەلایەکی دیکەشەوە پێگەی دەسەڵاتی سیاسی باو ئاشکرا دەکات. ئەوانیش هەروەکو ئەو ڕۆڵەی پاوانکارییەکان لەسەردەمی سەرمایەداریدا دەیبینن، وەک پاوانی سیاسی هەمان ڕۆڵ لەسەر ئابووری دەبینن. بە بایەخەوە ئاماژە بەم خاڵە دەکەم، گرێدانێکی بەهێز لەنێوان پاوانکاری سیاسی و پاوانخوازی ئابووریدا هەیە و یەکتری دەکەن بە پێویستییەک. بەشێوەیەکی پارادۆکس لەبەرئەوەی هێزی سیاسی ئەسینا و ڕۆما لە واتایەکدا زۆر گەورەیە، بەرامبەر سەرمایەداری داخراوە. لەلایەکی دیکەشەوە لەبەرئەوەی بەرامبەر لادێ (ئابووری کشتوکاڵ) زۆر بچووکە، دەرەقەتی پێکەوەنانی ئابوورییەک نایەت کە بناخەکەی شارە. هەرچەندە ئەم سەردەمەی شارستانی دان بە سەرمایەداران دادەنێت، بەڵام هێشتا بۆ پێشکەوتنی سیستەمەکەیان لەبار نییە.

د- لە شارستانی ئیسلامی چاخی ناویندا بازرگانی ڕۆڵێکی لەپێش و قورسی هەیە. حەزرەتی محەمەد و ئایینی ئیسلام لە ڕووی ئابوورییەوە چەندەی بڵێی گرێدراوی بازرگانیین. پێشکەوتنی ئەرستۆکراتە عەرەبە بە ڕیشە بازرگانەکان کە کەوتبوونە نێوان بەرداشی بێزەنتی و ساسانییەکانەوە فاکتەرێکی سەرەکی ئابووری و کۆمەڵایەتی سەرهەڵدانی ئیسلامییەتە. لای هەمووان دەزانرێت کە هەر لەسەردەمی پەیدابوونیەوە ئیسلام شمشێری بە بنەماگرتووە. دەسەڵاتی سریانییەکان بەسەر پارە و بازرگانی کە لە یەهودی و ئاشوورییەکانەوە بۆیان مابۆوە، بە شێوەیەکی ئاشکرا هۆکاری ناکۆکیەکانیان لەگەڵ ئەواندا دەخاتەڕوو. ناهێڵێت بێزەنتی و ساسانییەکان هەناسە بدەن کە دوو پاوانکاری سیاسین. لەم قۆناخەی

مێژوو و شوێنە دێرینەیدا پەیوەندی نێوان ئابووری و توندوتیژی بەزەقی دەخاتەڕوو. چاخی ناوین بە جۆرێک لەجۆرەکان سەردەمی ئیسلامە. ئاگاداری ئەو ڕاستییەیە کە چەندە پاراستنی ئاسایشی بازرگانی شێوازی ئیمپراتۆرییەت دەکاتە پێویستییەک، لەبەر هەمان هۆکاریش ڕێگاکەی بەربەست دەکات. بەردەوام وەرچەرخانی سەرمایەی بازرگانی بۆ شێوە بەرهەمهێنانی سەرمایەداری بەربەست دەکات. پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکانی ناوچە لادێییەکان لەژێر کۆنترۆڵی توندی ئایین و ئەخلاقدا بووە. ئەو سەربەستییە سنووردارەی لە شارەکان بەدەستی هێناوە، ناتوانێت بۆ هێزی سیاسی بگۆڕێت. سەرەڕای ئەوەی تۆڕێکی بەرفراوانی شار-بازاڕ پێکهاتووە و شارەکانیش زۆر گەورە بوون، هێزێکی ئەوتۆیان نییە شارەکانی ئیتاڵیا ئەم ڕەوشە تێپەڕبکەن. مسۆگەر کێشەکە مەسەلەی تەکنۆلۆژی نییە، سەرچاوەکەی بۆ پاوانی سیاسی و ئایینی دەگەڕێتەوە. بەردەوام دەست بەسەرداگرتنی سامانی بازرگان پێویستییەکی سیستەمە. نەئافراندنی سەرمایەداری لەلایەن ئیسلامەوە، خاڵێکە لەبەرژەوەندی ئیسلامدایە. تا ئێستاش ڕۆڵی جددیترین کۆسپی بەردەمی سەرمایەداری دەبینێت، ئەگەر لەلایەنە ئەرێنییەکەیەوە هەڵسەنگێنرێت (لایەنی لەجۆری: چەمکی ئوممەتی ئیسلام - ئەنتەرناسیۆنالیزمی قەومەکان، دژایەتیکردنی سوود، هاوکاریکردنی هەژاران..هتد) دەشێت کۆمەکێکی گرنگ پێشکەش بەپرۆژەکانی ئازادی کۆمەڵگا بکات. بەڵام دەبێت زۆرباش ببینرێت کە ئەو ڕادیکالیزمە ئیسلامییەی لەئارادایە سەرمایەدارییەکی ئیسلامی نوێ لە ناواخنی خۆی دەگرێت کە بە میللیگەراییەکی ئابووری و ڕاستڕەو بارگاوی کراوە.

ئەوانەی بەشێوەیەکی کلتووری ئیسلامیان بۆ ئەورووپا گواستەوە بەربەرەکان و عەرەبەکانی ئەندەلوس بوون کە ئەمەوییەکان ڕێبەرایەتی دەکردن. ئەوانەی بەشێوەی ئابووری - بازرگانی گواستیانەوە بازرگانەکانی شارەکانی ئیتاڵیا بوون. هەرچی عوسمانییەکانن تەنیا لە ڕووی پاوانی سیاسییەوە بەشێوەیەکی سنووردار گواستوویانەتەوە. هەرچی کاریگەری عوسمانییەکانە، بەشێوەیەک بووە: پاڵی بەهێزە

سیاسی و ئابوورییەکانی ئەورووپاوە ناوە بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتن بەرامبەر بە عوسمانییەکان، خۆیان زیاتر لە سەرمایەداری بئاڵێنن. گەر عوسمانییەکان نەبوونایە لەوانەیە پاوانە ئایینی و سیاسییەکانی ئەورووپا هێندە ناچاری رێکخستنی ئابووری، سیاسی و سەربازی سەرمایەداری نەبوونایە. جارێکی دیکە دەبینین کە هێز هێز دەئافرێنێت، ئەویش گەڕان بەدوای شێوەی ئابووریدا خێرا دەکات.

رۆڵی دیاریکەری رۆژهەڵاتی ناوین لە ئافراندنی سەرمایەداری ئەورووپادا پەیوەندی بە ئایینی کرستیانییەوە هەیە. ئومێدەوارم لە کۆمەڵناسی ئازادیدا بەشێوەیەکی بەرفراوان تاوتوێی بکەین، هەربۆیە لێرەدا تەنیا بە ئاماژەکردن بۆ شاکاری "ئەخلاقی پرۆتستانتی و سەرمایەداری" ماکس ڤێبەر بەبیر خۆمانی دێنینەوە. جگە لەمەش دەتوانرێت بگووترێت تا سەدەی دەیەم رۆژهەڵاتی ناوین دەستنیشانکردنی ئەخلاقی ئەورووپای تەواوکرد، رۆڵێکی سەرەکی (هەم سیاسی، هەم ئایینی) لە لەدایکبوونی ئەورووپای دەرەبەگایەتیدا بینی، لە ئاکامی شەڕەکانی کرستیانی (خاچپەرستی)ش جارێکی دیکە رۆژهەڵاتی ناوین بۆ ئەورووپا گواسترایەوە. تەواوی ئەم خاڵانە تایبەتمەندییەکن بەبێ ئەو نابێت.

ئەگەر پوختەی ئەم کورتە مێژووەی - کۆمەڵگا لەگەڵ هەڵسەنگاندنەکانمان دەرهەق بەسەدەی شازدەهەم بکرێت بەیەک، ئەو کاتە باشتر دەرک بە کاریگەرییەکەی دەکرێت لەسەر لەدایکبوونی سەرمایەداری و دەسەڵاتی سیاسی. راشکاوانە دەتوانرێت بگووترێت هەندێک جار رۆڵی درەنگخستن و کۆسپنانەوە، هەندێک جاریش رۆڵی خێراکردن تەنانەت رۆڵی پێتاندنیشیان دەبینێت. هەرە زێدە لەسیستەمی سەرمایداریدا لەفۆرمێلی "پاوانخوازی دەوڵەت= پاوانخوازی سەرمایەداری" نزیک دەبێتەوە.

بەکورتی لەچەند لایەنێکەوە باسکردنی پەیوەندی حقوق لەگەڵ سیستەمی نوێ سوودبەخش دەبێت. حقوق دەزگایەکە چەندە بەگشتی پەیوەندییەکانی بازرگانی، بازاڕ و شار پێشبکەوێت خۆی دەسەپێنێت. ئەو کۆمەڵگایانەی حقوقی تێدا کەوتۆتەگەڕ، کۆمەڵگایەکن ئەخلاقی تێدا

بەلاوە نراوە، رۆڵی توندوتیژی تێیدا زیادبووە و ڕێگای لەپێش کائیوس کردۆتەوە، و بەشێوەیەکی بەرفراوان وبەهێز هەست بە کێشەکانی نەبوونی یەکسانی دەکرێت. لەبەرئەوەی گەورەترین کێشە ئەخلاقی و کێشەکانی تایبەت بە یەکسانی لە دەوروبەری بازاڕ و جیابوونەوەی چینایەتیدا پێکدێت کە لە شار ئاوادەبن، لە رێکخستنی دەوڵەتدا حقوق دەبێت بە ناچاری. بەبێ حقوق ئەگەر بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەت مەحاڵیش نەبێت، تا دواڕادە دەکەوێتە ناو زەحمەتییەوە. وەکو پێناسە، دەشێت وەک ئەو هێزە سیاسیەی دەوڵەت شرۆڤە بکرێت کە چالاکییەکەی شێوەی دەزگایی و رێسایی و هەمیشەیی وەرگرتووە. جۆرێک لەو دەوڵەتەیە کە وەستاوە، ئارامە و جێگیری بەدەستهێناوە. دەزگایەکە هەرە زێدە پەیوەندی بە دەوڵەتەوە هەیە. وابەستەبوونی بازرگانی - دەوڵەت هەر لە سەردەمی سەرهەڵدانییەوە تا سەردەمی سەرمایەداری، بەردەوام پێشکەوتووە و ئاڵۆزتربووە. لە کۆمەڵگای بابلییەوە تا رۆما چەندین دەقی یاسایی نووسراون کە دەشێت بەحقوق ناوببرێن. بەشێوەیەکی زیاتر زیانە ماددی و گیانییەکان رێکدەخات. حقوق هەم خزمەت بە سووککردنی کێشەکانی سیاسەت دەکات، هەندێک جاریش بەپێچەوانەوە خزمەت بەزیادکردنی دەکات. ئەرکەکەی، پێچەوانەی مەزندەکان لەهەڵوێستێکی یەکسانیخواز بەرامبەر بەهەر هاووڵاتییەک زیاتر، نایەکسانیيە کرداریيەکان مەشروع دەکات، لە ئاستێکدا مسۆگەر و دەستلێبەرنەدراوی دەکات کە پەسەندبکرێت. بە پوختی پێناسەکردنی حقوق وەک رێکخستنی هەمیشەیی پاوانی دەسەڵاتی سیاسی، شرۆڤەیەکە زیاتر نزیک بەڕاستییە.

پەیوەندییەکەی بە ئەخلاقەوە گرنگی و بایەخێکی زیاتری هەیە. ئەخلاق وەک چیمەنتۆی کۆمەڵگایە. هیچ کۆمەڵگایەک لە ئارادا نییە ئەخلاقی نەبێت. ئەخلاق یەکەمین پرەنسیپی رێکخستنی کۆمەڵگای مرۆڤە. رۆڵی سەرەکی پەیوەندی بەم پرۆسەیەوە هەیە کە: ژیری سۆزداری و ژیری ئەنالیتیکی چۆن لەپێناو خێری کۆمەڵگا رێکبخرێت، و بکرێت بە پرەنسیپ و هەڵوێست. لە ئاستێکی یەکساندا رەفتار لەگەڵ تەواوی کۆمەڵگا دەکات،

بەڵام رۆڵ و مافی جیاوازییەکان رەچاو دەکات. لەسەرەتادا نوێنەرایەتی ویژدانی کۆمەڵکاری کۆمەڵگا دەکات. بەدەزگابوونی پلەداری و دەسەڵاتی سیاسی بەشێوەی دەوڵەت، یەکەمین زەبر لەکۆمەڵگای ئەخلاقی دەدات. پارچەبوونی چینایەتی بناخەی پارچەبوونی ئەخلاقیش دادەنێت. کێشەی ئەخلاقی بەمجۆرە دەست پێدەکات. لەکاتێکدا دەستەبژێری سیاسی لە رێگای حقوقەوە هەوڵی چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە دەدات، راهیبەکانیش دەیکەن بەئایین و بەمجۆرە لە وەڵامێک دەگەرێن بۆی، لەم سۆنگەیەوە چ حقوق و چ ئایین ئەخلاق وەکو سەرچاوەیەک دەبینن. هەروەکو چۆن میکانیزمە هەمیشەیی و دەزگاو رێساکانی سیاسەتی هێزی سیاسی حقوق پێکدێنێت، داهێنەرانی ئایینیش لەمیانەی پێکهاتەیەکی دیکەی خاوەن دەزگا و رێسای هەمیشەیی کە سەرچاوەکەی ئەخلاقە، واتە لە رێگای ئایینەوە خوازیارن قەیرانی ئەخلاقی چارەسەر بکەن. جیاوازییەکەی نێوانیان، حقوق هێزی جێبەجێکردن (سزادان)ی هەیە، هەرچی ئایینە ئەم خەسڵەتەی نییە، ویژدان و ترس لە خوداوەند بە بنەما دەگرێت.

لەبەرئەوەی ئەخلاق پەیوەندی بە توانای بژاری مرۆڤەوە هەیە لە نزیکەوە گرێدراوی ئازادییە. ئەخلاق پێویستی بە ئازادی هەیە. لە بنەڕەتدا کۆمەڵگایەک لە رێگای ئەخلاقی خۆیەوە ئازادی دەستنیشاندەکات. لەم سۆنگەیەوە ئەوەی ئازادی نەبێت، ئەخلاقیشی نابێت. بەکاریگەرترین رێگای داڕووخاندنی کۆمەڵگایەک، دابڕانی پەیوەندییەکەیەتی بە ئەخلاقەوە. لاوازکردنی کاریگەری ئایین، هێندەی ئەخلاق رێگا لەپێش داڕووخان ناکاتەوە. شێوەی ژیانە ئابوورییەکان، فەلسەفە سیاسی و ئایدیۆلۆژیا هەمەجۆرەکانی کە وەک جۆرێک لە ئایینیان لێهاتووە، دەتوانن بۆشایی ئایین پڕبکەنەوە. هەرچی ئەو بۆشاییەیە کە ئەخلاق جێی هێشتووە، تەنیا مەحکومبوون و نەبوونی ئازادی دەتوانێت پڕی بکاتەوە. وەک تیۆری ئەخلاق، ئاکار (ئەتیک) یان ئەخلاقیات، ئەرکەکەی لێتوێژینەوەی هەبوونی ئەخلاق و سەرلەنوێ گەڕانەوەیەتی بۆ رۆڵی بنچینەیی خۆی کە وەک کێشەیەکی سەرەکی فەلسەفی ئەمڕۆ ژیانییە. تا بەشێوەیەکی راست رۆڵەکەی دەستنیشان نەکرێت و نەکرێت بە بناخەی

ژیان، بەبێ ئەوەی بایەخی خۆی لەدەست بدات وەک کێشەیەک پێگەی خۆی لەناو کۆمەڵگادا دەپارێزێت.

گرێدراو بە دەسەلاتی سیاسی ئەم پێناسە کورتەی سەبارەت بەحقوق و ئەخلاق پێشخران، کاتێک لەدایکبوونی ئابووری سەرمایەداری جێگای باس بێت بایەخێکی زۆریان دەبێت. چونکە تا ئایین و ئەخلاق تەنانەت حقوقی درەبەگایەتیش لاواز نەکرێن و لەهەندێ شوێندا تێک نەشکێندرێن، ئاستەمە ئابووری سەرمایەدری بتوانێت لەناو کۆمەڵگادا جێگیر بێت. لێرەدا وەها شرۆڤە نەکرێت کە بەرگری لە ئەخلاق و ئایینی کۆنی چینی سەردەست دەکەم. ئەوەی بانگەشەی دەکەین: زۆر ئاستەمە سیستەم و رژێمێکی وەکو سەرمایەداری لەگەڵ پرەنسیپ و بنەماکانی ئایینە مەزنەکان، باوەڕییە ئەخلاقییە گەورەکان و نەریتەکان کۆک و گونجاو ببینرێت. لەم بابەتانەدا تەنانەت هێزی سیاسیش کاریگەرییەکی سنووورداری هەیە. رووخانی ئایین و ئەخلاق کۆتایی بە دەسەلات (هێز) ی سیاسیش دێنێت.

ئاشکرایە ئەو گفتوگۆیانەی لەسەدەی شازدەهەمدا سەبارەت بە ریفۆرم، حقوق و فەلسەفەی ئەخلاق کراون، پەیوەندی بەدەرکەوتنی سەرمایەدارییەوە هەیە. لەبەرئەوەی بەکورتی پێناسەی ململانێی سیاسی و پێگەی هێزمان کرد، دووبارەی ناکەمەوە.

ریفۆرمی پرۆتستانی و ئەنجامی ئەو گفتوگۆ و پێکدادانە گەورانەی لەگەڵ خۆی هێنای، لەپێشەوەی ئەو هۆکارە سەرەکیانە دێت کە چارەنووسی ئەورووپای چاخی نوێی دەستنیشانکرد. کاتێک ماکس ڤێبەر ئەخلاقی پرۆتستانی هەڵسەنگاندووە لەوبڕوایەدام کە گرنگترین خاڵی پشتگوێ خستووە. لەدایکبوونی سەرمایەداری ئاسانکردووە. بەڵام گورزێکی بەکاریگەری بەگشتی لە ئایین و ئەخلاق، بەتایبەتیش لە مەزهەبی کاسۆلیک سرەواندووە. پرۆتستانییش بەرامبەر بە تەواوی گوناح و خەتاکانی سەرمایەداری بەرپرسیارە. بەمەبەستی پاراستنی ئایین و مەزهەبی کاسۆلیکی ئاماژە بەم خاڵە ناکەم. لەبەرئەوە دەڵێم کە کۆمەڵگای بێ بەرگری (پاراستن) هێشتۆتەوە. لەکوێ پرۆتستانی

پێشکەوتووە، لەوێدا سەرمایەداری قەڵەمبازی هاوێشتووە. بەجۆرێک لە جۆرەکان رۆڵی ئەسپی تەروادەی سەرمایەداری بینیوە.

هەندێک لەبیرمەندەکانی ئەو سەردەمە بەرامبەر بەوخراپەکارییانە و لیڤی ئەتهانە نوێکەی ریفۆرمی پرۆتستانی رێگای لەپێش کردۆتەوە، یەکەمین ئاگاداری جددی خۆیان دەدەن. لەناو ئەم بیرمەندانەدا هەڵسەنگاندنی نیچە وەک یەکەم کەس کە بەرامبەر مۆدێرنیتەی سەرمایەداری هەڵوێستی نیشانداوە واقیعی و بابەتی دەبێت. وەک کەسانێکی دژە ـ سەرمایەدار کە بەدوای کۆمەڵگاو تاکی ئازاددا وێڵن، تا رۆژگاری ئەمڕۆشمان گرنگی و بایەخەکەیان بەردەوامە.

لە گفتوگۆکانی سەبارەت بە حقوق کە تۆماس هۆبز[1] و گرۆتیوس[2] سەرکێشیان دەکرد، بۆ ئەوەی رێگا بۆ لیڤی ئەتهانی نوێ (دەوڵەتی سەرمایەداری) بکەنەوە سەرلەنوێ تیۆری حقوقیان نووسیوەتەوە. پێشکەشکردنی سەرجەم پاوانی توندوتیژی بە دەوڵەت، واتای بێ چەککردنی کۆمەڵگایە. ئەنجام گەیشتنی هێزی نەتەوە ـ دەوڵەتی ناوەندییە بە ئاستی فاشیزم کە ناتوانرێت لەگەڵ هیچ قۆناخێکی مێژووییدا بەراورد بکرێت. ئەو رێسایەی کە دەڵێت: سەروەری پارچەناکرێت، تیۆری بێکاریگەرکردنی تەواوی هێزە کۆمەڵایەتییەکانی دەرەوەی دەوڵەتە. بەشێوەیەک نموونەکەی لەمێژوودا نەبینراوە، بەرامبەر بە سەرمایەداریی درندە، بێبەشکردنی کۆمەڵگایە لە ئامرازەکانی بەرگری رەوا. بەکورتی ئەم دوو بیرمەندە مرۆڤ وەک گورگی مرۆڤ رادەگەیەنن، لەگەڵ ئەوەشدا بەشێنەوەی مژدەی پێگەی هێزی پاوانکاری مۆنارشی، لەهەموو

---

١ـ فەیلەسوفێکی ئینگلیزە لەنێوان ساڵانی (١٥٨٨ ـ ١٦٧٩)دا ژیاوە بە پەرتووکەکەی بەناوی "لیڤی ئەتهان١٦٥١" رێگای سیاسەتی ئەورووپای دەخشاندووە. هەرچەندە ئەمڕۆ وەک فەیلەسوفێکی سیاسی دەناسرێت، بەڵام بەزۆر بواری تری وەک مێژوو، پێوان، ئەخلاق و فەلسەفەی گشتییەوە سەرقاڵ بووە. هەمووشتێکی هەبی بەماددەوە و جووڵەی ماددەوە بەستۆتەوە. جیهانی وەک کوتلەیەکی ئەو ماددانە وەسف کردووە کەلەلایەن یاساکانی جووڵەوە بەڕێوەدەبرێن. مرۆڤ و زیندەوەرانی تریش بە پارچەیەکی ئەم کوتلەیە دادەنێت کە ژیانی رۆحی و فیزیۆلۆژییان لەلایەن یاسا میکانیکەکانەوە بەرێوەدەبرێت، بۆیە گوتوویەتی: شتێک بەناوی رۆح و فریشتە و خوداوە لەم جیهانەدا بوونیان نییە و هەموویان بەرهەمی سیمبۆلیزەکردنن. بەپێی هۆبز جەوهەری گەردوون کە بەتۆز دەژمێردرێت تەنها و تەنها ماددەیە، ئەوەی لەم ماددەیەوە شێوە دەگرێت تەنێکە و بەرچاو دەبینرێت و دەکرێت تاقیکردنەوەی لەسەر بکرێت. رۆح و خوداش بەشتێکی لەدەرەوەی ماددە دەژمێردرێت کە تایبەت بە تیۆلۆژین.

٢ـ بیرمەند و فەیلەسوفێکی هۆڵەندی بەناوبانگە (١٥٨٣-١٦٤٥)، نووسینەکانی لەبواری سیاسەت و فەلسەفەی حقوقە. لە دامەزرێنەرانی قوتابخانەی یاسای سروشتییە.

لایەنێکەوە رۆڵی رێخۆشکردن بۆ پاوانکاری سەرمایەداری دەبینێت. ئەگەر دووبارەی بکەینەوە پاوانی سیاسی یەکسانە بە پاوانی ئابووری. "ماکیافیللی"[١]ش بیرمەندێکی دیکەی گرنگی سەدەی شازدەهەمە بەبێ ئەوەی پێویستی بەپۆشینی پەردە و دەمامک ببینێت، بۆ گەیشتن بە سەرکەوتنی سیاسی مۆڵەت دەدات لەکاتی پێویستیدا وابەستەی هیچ رێسایەکی ئەخلاقی نەمێنێت. بەمجۆرەش سەدان ساڵ پێشتر ئاماژە بەو پرەنسیپە دەکات کە بە فاشیزم دەگات.

بۆ ئەوەی نەبێتە مایەی هەڵە تێگەیشتن بەپێویستی دەزانم بڵێم: نابێت بانگەشەی ئەوە بکرێت کە تەواوی هەوڵەکانی ریفۆرم تاوانبار و رەخنە دەکەم. لایەنگری ئەوەم نەک تەنیا یەکجار ریفۆرمی ئایین ئەنجامبدرێت بەڵکو بەردەوام بێت. بەتایبەتیش ساڵانێکە پێداگری لەسەر ئەو خاڵە دەکەم لە ریفۆرمی ئایینی کرستیانی زیاتر، پێویستی بە ریفۆرمێکی قووڵ و هەمیشەیی ئایینی ئیسلام هەیە. ئاشکرایە ئەم هەوڵە پێویستی بە توانای تێگەیشتن و کەسایەتی هەیە. بەڵام سەبارەت بە تێپەراندنی ستەمکاری لە رۆژهەڵاتی ناویندا ئەرکێکی حەتمییە. لەبەشی "کۆنفیدرالیزمی دیموکراتیانەی رۆژهەڵاتی ناوین" کە وەک بەرگێکی جیاوازی ئەم بەرگرینامەیە بیری لێدەکەمەوە، ئەم بابەتە و چەندین بواری دیکەی هاوشێوەی تێدا گفتوگۆ دەکەین.

روونکردنەوەی بزووتنەوەکانی رێنسانس و رۆشنگەری ئەرکێک نییە ئەم دێرانە پێیەوە پەیوەندیدار بێت. چونکە بزاڤی سەدەی جیاوازن. هەروەها ئەگەر پەیوەندییەکیشی بە سەرمایەدارییەوە هەبێت، دەشێت پەیوەندییەکی ناراستەوخۆ بێت. هەروەها گشتگیرکردنی بابەتەکەش راست نابێت. بە ئەندازەی ئەوانەی خوازیارن رێگای سەرمایەداری بکرێتەوە، ئەوانەش هەن کە دەخوازن رێگاکە دابخەن. لە رێگای هێزی پارەی سەرمایەدارییەوە پەیرەوکردنی سیاسەتی تواندنەوە لەسەریان

١ـ نیکۆلا ماکیافیلی بیرمەند، پیاوی دەوڵەت، ستراتیژگەری شەڕ، شاعیر و شانۆنووسێکی ئیتاڵییە. بەیەکێک لە دامەزرێنەرانی زانستی سیاسی و مێژوویی، ئەندامی بەرچاوی رێنسانسی ئیتاڵی دەژمێردرێت. لەنێوان ساڵانی (١٤٦٩-١٥٢٧)دا ژیاوە. بۆ یەکخستنی ئیتاڵیا و گەیاندنی بە دەوڵەتێکی یەکپارچە تێکۆشاوە. هەرلێرەشەوە لە شاکارە بەناوبانگەکەیدا بەناوی "پرێنس= میر"ەوە لێکۆڵینەوەکانی لەسەر گرتنە دەستی دەسەڵات و پاراستنی هیچ سنوورێکی ئایینی و ئەخلاقی ناناسێت. هەر لێرەشەوە گەیشتۆتە گوتە بەناوبانگەکەی کە دەڵێت: "ئامانج ئامراز پاساو دەدات.

بابەتێکە دەرکی پێدەکرێت.

بەهەمان شێوە داخوازی دەسەڵاتە کە دەیەوێت بەخۆیەوە بیبەستێتەوە. بەڵام تەواوی فەیلەسوف، ریفۆرمخوازەکان (برۆنۆ[١]، ئاراسمۆس) یۆتۆپیاگەرەکان، کۆمۆنخوازە گەورەکانی ئەم قۆناخە بەرادەیەک کە ئامادەبوون بشسووتێنرێن لەخزمەتی تەواوی مرۆڤایەتیدا بوون. پێویستە دیسان دووبارەی بکەمەوە: لەچاخی رێنسانس، ریفۆرم و رۆشنگەریدا تەواوی شارستانییەکان هەستانە سەرپێ، سەرلەنوێ زیندوو بوونەوە، خۆیان کرد بە گۆرانی، تابلۆ و ئاواز. بوون بە خوداوەند، بوون بە بەندە، شەڕیانکرد، ئاشتبوونەوە. سەرکەوتن، ژێرکەوتن. بەڵام لە دەرئەنجامدا ئەو ئەندامانەی سەرمایەداری کە سەدان ساڵە لە کەلێن و گۆشە بێکاریگەرەکانی کۆمەڵگا لە بۆسەدان، وەکو ئامادەترین رێکخستن و هێزی ماددی لەناو ئاڵۆزی ئەم سەدانەی مەحشەردا، لە رێگای پارە، کارە زیهنییەکان و توندوتیژییەوە رەوشیان قۆستەوەو وەک خۆیان لێکرد، کاتێک پێویستی بینیوە بە زەبر خستویەتییە ژێر دەسەڵاتی خۆی و سیستەمەکەی خۆی بەسەرکەوتن تاجدار کردووە. تا رۆژگاری ئەمڕۆشمان کاروانی ئەم سەرکەوتنە بەردەوامە.

---

١ـ فەیلەسوف، ئەستێرە ناس، راهیبێکی ئیتاڵییە، لەنیوان ساڵانی (١٥٤٨ ـ ١٦٠٠)دا ژیاوە. یەکێکە لە فەیلەسوفە دامەزرێنەرە گرنگەکانی فەلسەفەی رێنسانس و بەهۆی شاعیرییەوە بەنزیکترین فەیلەسوف دەژمێردرێت [illegible]. وەک هزرمەندێکی جۆشی سروشت پەروەریش بەناودەکرێت. یەکەم کەس بووە کە گوتوویەتی گەردوون بێ سنوورە، چونیەکە و زۆر هەسارەی تر لە شێوەی زەویدا هەن. هەرلەبەرئەوەش لە ئەنگیزاسیۆنی کەنیسەی کاتۆلیکی [illegible] دادگایی دەکرێت و بە لارێ دەرچوویەک رادەگەیەنرێت و بە زیندوویی دەسووتێنرێت. کاتێک حوکمەکەی رادەگەیەنن [illegible] کاتێک ئێوە حوکمەکەم رادەگەیەنن لەمن زیاتر ترس لەدڵتاندایە".

## د ـ شوێنی سەرمایەداری

کێشەی شوێنی کۆمەڵگا بابەتێکە شایەنی لێتوێژینەوەیە. هەوڵی تێگەیشتنی پەیوەندی کۆمەڵگای مرۆڤ بە شوێنی جوگرافی و چۆنییەتی پەرەسەندنییەوە دەدات. بابەتەکە بەرفراوانە. دەتوانین لە پێکهاتنی سیستەمی خۆرەوە دەستی پێبکەین. دەشێت لیستەیەکی درێژی پرسیار و وەڵام بخرێتە ناو بابەتی جوگرافیاوە: ئەویش لەجۆری لەکامە ئەڵقەی زنجیرەکانی پەرەسەندن: پریماتەکانی جۆری مرۆڤ شێوەیان گرت کە دواتر بوون بە مرۆڤ، لە قۆناخەکانی پێکهاتنی هەسارەی زەمیندا کە سێیەمین ئەڵقەی دەوری خۆرە: یان لەکاتی پێکهاتنی چینەکانی ئاتمۆسفەر، دەریا، زەریا، پێکهاتەی باران و ئاوە بەتەوژمەکان، دەرکەوتنی چینە بەردینەکان، چینەکانی زەوی، ناوەندی زیندوو و یەکەمین خانە زیندووەکانی زەریاکان، یان لەسەردەمی پێکهاتنی جیهانی رووەکەکان کە بەقەوزە دەستی پێکردووە، یاخود لەسەردەمی پێکهاتنی جیهانی ئاژەڵان کە بەیەکەمین بەکتریا دەستی پێکردووە، لەسایەی پەیوەندی نێوان ئاژەڵ ـ رووەک، یاخود بەشێوەیەکی گشتی لەمیانەی پەرەسەندنی جیهانی رووەک و ئاژەڵان و زنجیرەی گەشەوە بووە.

ئاشکرایە کە پەیوەستبوونێکی توند ‹یە لەنێوان هێڵە پان و ئەڵقە پێچاوپێچەکانی ئەو شێوە پەیوەندییەی لەنێوان مرۆڤ ـ جوگرافیادایە. بۆ نموونە رۆژێک لە رۆژان ئاتمۆسفەر، رووەک، ئاژەڵ، خاک و سەرچاوەکانی ئاوی خواردنەوە وشک بکات و نەمێنن شتێک بەناوی جۆری مرۆڤ نامێنێت. هەروەکو بڵێی شاکاری ژیرییەکی ورد و سەرسوڕهێنەرانەیە، تەنانەت تێکچوونێکی لەناکاوی ئەم کەش و زەمینانە لەوانەیە کۆتایی بەژیانی مرۆڤ بێنێت. هەربۆیە بەشێوەیەکی گشتی پێویستە بەردەوام پەیوەندی نێوان مرۆڤ ـ جوگرافیا رەچاو بکرێت. بەبێ ئەمە، لێکۆڵینەوەو لێتوێژینەوە لەبارەی زانستی کۆمەڵگاوە ناکرێت. کەچی تا ئەم قۆناخانەی

دواییش بۆ جەختكردنەوە لەسەرئەوەی كە بەرۆژەڤكردنی ئەم پەیوەندییە پێویست ناكات: زانست، فەلسەفە و ئایین پێشخران و بە هەزاران شاكار نووسران. سەیرە ئەو میتۆلۆژییانەی هەرە زێدە بە ناواقیعی و دوور لە راستی دادەنرێن زیاتر پەیوەندییان بەرامبەر ئەو بابەتانە پیشانداوە كە بە پەیوەندی جوگرافیا ـ مرۆڤ ناوی دەبەین. دەبێت ئەمە ئەنجامێكی دابرانی ژیری ئەنالیتیكی بێت لەژێری سۆزداری.

بۆ "ماوەیەكی درێژخایەن" لە تێپەڕنەكردنی ئاستی یەكەمین كلاندا[1] لەلایەن جڤاتەكانی مرۆڤەوە، كاریگەری شوێن، واتە كاریگەری هەلومەرجە جوگرافییەكان زەقترە. تا چوارەمین قۆناخی سەهۆلبەندان ئەنجامنەدانی قەڵەمبازێك لەلایەن كۆمەڵگای كلانەوە، لەناتەواوی گەشەی ناوخۆ زیاتر، بەستنەوەی بەناڵەباری زەمینەی جوگرافییەوە شرۆڤەیەكی راستە. ئەوچەند ملیۆن ساڵەی شیمانە دەكرێت تەمەنی كۆمەڵگای كلانە، ماوەیەكە بۆ پەرەسەندنەكانی ناوخۆ بەسە و تێردەكات. كەواتە هەلومەرجی زەمینەی دەرەوە دەرفەتی بەپێشكەوتن نەداوە. جوگرافیاناسەكان هاوڕان لەسەر ئەوەی لە كۆتاییەكانی قۆناخی سەهۆلبەندانی چوارەم (لەسالانی ۲۰۰۰۰پ.ز بەدواوە)ەوە زەمینەیەكی جوگرافی رەخسا كە بەهێڵە گشتییەكانی لە هەلومەرجەكانی رۆژگاری ئەمڕۆمان دەچوو. لەم قۆناخەدا جۆری مرۆڤ دوای ئەوەی لەم جوگرافیایەدا (لە دەرەوەی بەشێكی زۆری ئەمریكا و دوورگەكانی ناو ئۆقیانوس و دەریاكان) كە دواتر بە ئاسیا، ئەوروپا و ئەفریقیا بەناوكرا، بەچەندین قۆناخی جیاوازدا تێپەڕی، لە كۆتایی قۆناخی چوارەمین سەهۆلبەندان لەمیانەی بزاوتەكانی جۆری هۆمۆساپیانس (ئەو مرۆڤەی ئێتر بیردەكاتەوە) هەنگاوی بۆ قۆناخی نوێ هاوێشتووە.

بەگوێرەی بەراوردكاری مرۆڤناسی و شوێنەوارناسی دەبینین كە: دوای سالانی ۲۰۰۰۰پ.ز سێ گرووپی كلتووری بەرچاو كەوتوون. گرووپی یەكەم: سامییەكانن، كە دوا ئەڵقەی شەپۆلە بەردەوامەكانی دابڕانن لە

---

۱ـ یان ڤلان: یەكەمین مۆڵبوون و بەكۆمەڵ ژیانی مرۆڤە كە ژمارەیان ۲۰ ـ ۳۰ كەسی تێپەڕ نەكردووە؛ تیرەی بەراییشی پێدەڵێن.

کیشوەری ئەفریقیا کە رەنگی پێستیان نزیک بە رەشە (ئەسمەرن). ئەمانە توانای پەلهاوێشتنیان بۆ باکووری ئەفریقیا، عەرەبستان، ناوەناوەش بۆ بنارەکانی چیای زاگرۆس - تورۆس پیشانداوە. تا قۆناخی شارستانی ئەم پەلهاوێشتنەیان بەربڵاوە، بەڵام دواتر بەڕادەی هێزەکەیانەوە سنووردار دەبێت. گرووپی دووەم: لەبنارەکانی سیبریا دابڕاون، لە ڕێگای گەرووی بێرینگەوە بەرەو کیشوەری ئەمریکا رۆیشتوون، دووەمین لقی بنەڕەتیشی لە کەنارەکانی رۆژئاوای زەریای مەزنەوە، بەرەو دوورگەکانی و ئاسیای ناوین و ناوەناوەش بەرەو رۆژهەڵاتی ئەورووپا (فین - ئویگور) توانای پەلهاوێشتنیان هەبووە. بە نەژادی زەرد و سوور پێستەکان (هیندە سوورەکان)یش ناودەبرێن. چین، ژاپۆن و تورکەکانی ئەمرۆ گەورەترین گرووپەکانی پێکدێنن. ئەوەی لەنێوان هەردووکیاندایە، گرووپی هیندۆ - ئەورووپییە کە جۆری سپییشیان پێدەگووترێت و دەکەونە گۆرەپانێکی بەپیت و فراوانترەوە. ئەمانە ئەو گرووپە سەرەکییەن کە ژیار و چاخی کشتوکاڵی بەردینی نوێیان دەست پێکرد کە قۆناخی بەر لە شارستانی بوو. هەرچەندە زەرد پێست و رەش پێستەکان جۆری باکوور و باشوور بە درەنگی وەختەوە تێپەڕی نیولیتیک و شارستانی بووبن، بەگوێرەی شرۆڤەی من، تا کاریگەری سپی پێستەکان نەبێت کە جێگای خۆیان لە ناوەڕاستدا گرتووە ئەم پەڕینەوەیان ئاستەمە.

بۆچوونی هاوبەشی تەواوی مرۆڤناس، شوێنەوارناس، زەویناس و زیندەوەرناسە لەپێشینەکان ئەوەیە بنارەکانی چیاکانی زاگرۆس - تورۆس وەک شوێنی دەستپێکردنی نیولیتیک لەبارترین هەلومەرجی پەڕینەوەی بۆ شۆڕشی نیولیتیک و شارستانێتی هیندۆ - ئەورووپی پێشکەش کردووە. شانبەشانی رۆڵی دیاریکەری بەرگی رووەک و دەوڵەمەندێتی جیهانی ئاژەڵان، رەوشی باران و رووبارەکان، کەش و زەوی، ئەم شوێنە (بنارەکانی زاگرۆس - تورۆس) جێکەوتەکەشی کە لەنێوان ئەفریقیا، ئاسیا و ئەورووپادا وەکو جێگای پەڕینەوە و کاروانسەرای سەرەکییە، پێگەیەکی نموونەیی داوەتێ. ئەو گرووپەی تۆوی گرووپی هیندۆ- ئەورووپی پێکدێنن و لەلایەن یەکەمین دەستپێکەرانی شارستانییەتەوە بە گرووپی

ئاریان ناو دەبرێن (شیمانە دەکرێت کلتووری سۆمەرییەکان یەکەمین کەسن کە وشەی ئاریان ـ ئێرانی رۆژی ئەمڕۆمان ـ یان بۆ ئەو کەسانە بەکارهێنابێت کە کلتووری کشتوکاڵیان پەیڕەوکردووە و لە بەرزاییەکاندا بوون) سەرەتا رۆڵێکی سەرەکییان لە دەستپێکردنی نیولیتیک ـ کشتوکاڵ، دواتریش لەچاخی شار ـ دەوڵەت ـ شارستانی لەم شوێنەدا هەبووە و لە جیهاندا بڵاویان کردۆتەوە. دووبارەی ناکەمەوە چونکە یەکەمین بەرتووکی بەرگرینامەکەم بۆ ئەم بابەتە تەرخان کراوە.

رۆژەڤی سەرەکیمان لێکۆڵینەوەیە لەسەر رۆڵی ئەو جوگرافیایەی رۆڵی لە سەرکەوتنی ئابووری سەرمایەداریدا هەیە، واتە دوورگەی ئینگلتەرا و هۆڵەندایە کە هێندە ناویان لە دیرۆکیشدا ناخوێندرێتەوە.

زانا کۆمەڵایەتییەکانی رۆژگاری ئەمڕۆمان رۆڵی جوگرافیا لەژێر ناوی جیۆپۆلیتیک و جیۆستراتیژیدا تەسک دەکەنەوە و لەمیانەی پشتگوێ خستنی ناوەڕۆکە سەرەکییەکەیەوە هەوڵی شرۆڤەکردنی دەدەن. ئەمە لەکاتێکدایە کە پەیوەندی نێوان کۆمەڵگابوونی مێژوویی و جوگرافیا پێویستە بەشێوەیەکی بنەڕەتی و بەر لەلایەنەکانی دیکە تاوتوێ بکرێت. بەهەرحاڵ لەجیاتی لقەکان خەریکبوون بە رەگەوە واتادارترە. بەشێوەیەکی گشتی لێتوێژینەوەی جوگرافیای سەردەم و شارستانییەکان بۆ زانیاری مێژوو و مرۆڤناسییەکی واتادار مەرجە. مێژوو بێ شوێن نابێت. هەر وەک ئەوەی کە دوالیزمی کات ـ شوێنی گەردوونیش وەک سەرەکیترین رەهەند بەردەوام خۆی دەکاتە جێگای سەرنج. کاریگەرییان لەسەر یەکتر، تەنانەت توانای وەرچەرخان و یەکبوونیان، بەردەوام لەلایەن زانستەکانەوە گفتوگۆ و نرخاندنی لەبارەوە دەکرێت.

دیسان بگەڕێینەوە سەر چیرۆکی "پیاوی بەهێز و فێڵباز". کاتێک باسی ئەم بابەتە دەکەین خوازیارم سەرنج بخرێتە سەر ئەم خاڵە: باوەڕیم بە پێویستی پەیوەندی چیرۆک لەگەڵ زانیاری ـ زانستدا هەیە. لەوبڕوایەدانیم کە بەبێ چیرۆک (ئەفسانە) زانست واتای تەواوی خۆی بەدەست بێنێت. هەربۆیە چیرۆکی "پیاوی بەهێز و فێڵباز" یەکێک لەو زاراوە سەرەکییانەیە کە پێویستە بکرێتە بەردی گۆشەی (بناغەی) زانستە کۆمەڵایەتییەکان.

بۆ باشتر شرۆڤەکردنی چەندین پەیوەندی کۆمەلایەتی پێویستە. خۆی لەخۆیدا لەو بوار و گۆڕەپانانەدا کەچەندین رووداو و پەیوەندی لەژمار نەهاتوو جێگای باسن، شێوازی چیرۆک بەهادارترین ئامرازی کۆمەک پێشکەش بە زانست دەکات. بەگوێرەی ئەوەی ئەو ئایینەی پۆزیتیڤیزمی پێدەگووترێت، ناتوانێت لەژێر ناوی دیاردەگەراییدا ئەو هەموو پەیوەندی و رووداوە دەست نیشان نەکراوە و لە ژمار نەهاتووە دەست نیشان بکات، تەنها رێگایەک کە دەمێنێتەوە پەنا بردنەبەر ئایین، ئەخلاق و جۆرەکانی دیکەی هونەرە کە لەشێوازی چیرۆک دەچن، بەمجۆرە پێشخستنی زانست دەشێت رێگایەکی راستتر بێت. پیاوی بەهێز و فێلباز، لە هەنگاونان بۆ پیاوی بالادەستەوە دەست پێدەکات، تا دەگاتە ئەوانەی ئەمڕۆ لەناو ناوەندەکانی هێزی سوپەردا جێگیربوون رێگایەکی درێژ، پڕ پێچوپەن و پیلانگێڕی دەگرێتە بەر. پشکنینی ئەو شوێنانە گرنگە کە ئەم پیاوانە هەندێک جار بەئاشکرا جارانێکیش بە نهێنی خۆیان تێدا حەشارداوە. بەردەوام بەشێوەی هێزێکی ستراتیژی وێناکردنیان لەناو تەکنیک و هەلمەتەکانی کۆمەلگا (ئابووری، سیاسی، سەربازی)دا ئێمە زیاتر لە زانیارییەکانیان نزیک دەکاتەوە.

پیاوی فێلباز و بەهێز وەک دزێک کەوتە ناو ئابووری مالەوەی ژن. تەنیا بەتالانەوە نەوەستا. لەوەش مەترسیدارتر، ژنی خستە ژێر لاقەکردنی بەردەوامی خۆیەوە، لانەی پیرۆزی خێزانی کرد بە پێخەفی چل جەردەکان. هیچ کاتێک دەستبەرداری رەوشی رۆحی ئەو خائینە نەبوو کە دەزانێت چیدەکات. بۆ یەکەمین جار تۆوی کەلەکەکردنی سەرمایە لەم دوو شوێنە چێندرا. یەکەمیان، لەنزیکی ئابووری مال، بەتایبەتیش داگیرکردنی مال. دووەمیان، لەناوەند یان نزیک بارەگاکانی ئەو چل جەردانەی بەشێوەی پاوانی تایبەت بەرامبەر بە پاوانی مەشروع و فەرمی دەولەت شوێنیان گرت. لەبەرئەوەی لەژێر چاودێری کۆمەلگا و دەولەت رایدەکرد، هەر لە زووەوە بەشێوەیەکی شاراوە و دەمامکدار لەم شوێنانەدا گەڕا. بۆسەی دانا، کاتێک هەلی بۆ رەخسا وەک شێر خۆی بۆ نێچیرەکەی فڕێدا. هەندێک جاریش بە فێلبازی رێویانە نێچیرەکەی خۆی

دەستگیرکرد. هەروەکو بوقەلەموون بەگوێرەی هەرزەمینەیەک ڕەنگ و شێوەی خۆی گۆڕی. لە خاڵە مارژیناڵەکاندا خۆی کرد بەپسپۆڕی بازرگانی. گۆڕەپانی ئەو شار و لادێیانەی شارستانی پێی نەگەیشت، لەژێر چاودێری توندی ئەودایە. لە جێگیربوون لەناو درزەکانی کۆمەڵگادا وەستایە. ڕۆڵی هاوسەنگی دەبینێت و دەزانێت چۆن هەردوو لایەنیش رووت بکاتەوە. زۆرباش ئاگادارە کە لە بازرگانی نزیک قازانجێکی کەم، هەرچی لە بازرگانی ڕێگا دوورەکانە قازانجی هێندە زۆر بەدەست دێنێت. هەروەکو بڵێی بۆن دەکات، ناسینی گۆڕەپان و بوارەکانی قازانج و چوونە ناویان، یەکێک لە ڕێسا سەرەکییەکانی پیشەکەیەتی. هەڵسەنگاندنیان وەک جەردەی ستراتیژی سەر ئەم ڕێگایانە ئەزموونبەخشترە. کاتێک دەڵێن سەرمایە وڵاتی نییە، دەخوازن ئاماژە بەم راستییە بکەن.

لەوانەیە بگوترێت مادام شار- بازاڕ- بازرگانی مەرجی لەپێشینەی سەرمادارین ئەی بۆچی هەرزوو سەرکەوتنی خۆی لەم شوێنانە ڕانەگەیاند؟ لەم خاڵەدا بە بایەخەوە پێویستە ئاماژەی پێبکەم، وەک سیستەم سەرمایەداری پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە تەکنۆلۆژیا و زانستی پێشکەوتووەوە نییە. هەروەکو چۆن گرێدراو بە شاری ئەمستردام لەدایکبوونێکی سەرکەوتووانەی ئەنجامدا، دەبوو لەشاری ئوروکیش سەرهەڵبدات. لەجیاتی ئەوەی ڕۆڵی دەسەڵاتی تەواوی سیستەم ببینێت، دەشێت مانەوەی بەشێوەی بازرگانێکی نۆکەر یان سەرۆکی وەرشەیەک، یاخود خاوەن کێڵگەیەک زیاتر بەکەڵکی هاتبێت. بەڵام هۆکاری سەرەکی لەوانەیە ئەوە بێت کە ڕاهیب و پاوانی سەربازی و سیاسی جێگایەکی وەهای پێنەبێت کە بتوانێت باڵادەست بێت. ئەم ناوەندانەی هێز کە تاقیکراوەتەوە و مەشروعییەتیان بەدەست هێناوە، لەوانەیە چوارەمین ناوەندیان بەزیاد بینیبێت، یاخود بەهۆی پێکهاتەکەیان وەکو مەترسییەک بۆسەر هەبوونی خۆیان لەقەڵەمیان دابێت.

وەک چوارەمین پاوان، جێبەجێ دەبینین خوازیارە ڕۆڵی سیستەم

---

١- بوقەلەموون: عەرەبییەکەی (حربا)یە. جۆرە ئاژەڵێکە دەتوانێت بەحەوت جۆر ڕەنگی خۆی بگۆڕێت و چووە سەر هەر شتێک ڕەنگی ئەو وەردەگرێت.

ببینێت. بەڵام بەردەوام تێکدەشکێت. مەزەندە دەکەم لەو جوگرافیانەدا کە چاوەڕوانی ناکرێت وێرانبوونی چەندین شار، تەنیا لەمیانەی ئەم جۆرە پێشکەوتنانەوە روویداوە. لە چاخەکانی یەکەم و ناویندا لەناکاو گۆڕانی شارە دەوڵەمەندەکانی بازرگانی و بوونیان بە وێرانەیەک دەشێت گرێدراوی بەرخۆدانی سیاسی و سەربازی چوارەمین پاوانکاری (سەرمایەداری سەرەتایی) بێت. هەر زوو سڕینەوەی شاری هاراپای جوگرافیای هیندستان ـ پاکستان لەمێژوودا (شارێکی دەوڵەمەند و پێشکەوتوو بووە، بیناسازییەکەی رێکوپێک بووە، تەنانەت نووسینیشی بەکارهێناوە)، دەشێت بەهۆی کێبڕکێ و سەرهەڵدانی ئەمەوە بێت بەرامبەر پاوانکاری سێیانەی راهیب ـ سیاسەت ـ سەربازی جوگرافیای دراوسێ. شیمانەیەکی بەمجۆرە بەهێزە: سەرەتا کۆلۆنیەکی بازرگانی شارستانی بەڕیشە سۆمەری بووبێت، دواتر بەدوای سەربەخۆیی خۆیدا چووبێت، لەم پێناوەشدا سەرهەڵدانی کردبێت. ئەگەر سەربکەوتایە، لەبەرئەوەی رەقیبەکانی هەمان هەلومەرجیان نەبووە، وەک ئەمستردامی یەکەم دەیتوانی سیستەمێک (یەکەمین ئەزموونی سەرمایەداری) ئاوابکات.

نموونەیەکی دیکەی بەکاریگەر چیرۆکی قەرتاجەیە. ئەم شارەی لەسەدەی هەشتەمینی پێش زایین لەلایەن فینیقییەکانەوە لە خاڵەکانی ئەوپەڕی دەریای سپیدا ئاواکراوە، شارێک بوو تەواو لایەنی بازرگانی قورس بوو. هەروەکو بڵێی نوێنەرایەتی رۆژئاوای دەریای سپی و ئەفریقیای باکووری دەکرد و لە رەوشێکدابوو کە وەکو ناوچەیەکی ئەوبەری دەریا بەکاردەهێنرا. ئاشکرایە کە زۆر پێشکەوتبوو، بەڵام وەک پێویستییەکی هەلومەرجەکان لاوازییەکی لەجۆری ئاوانەکردنی ئیمپراتۆرییەتی هەبوو. دەبووە کۆسپ لەبەردەم ئەوانەی خوازیاری ئاواکردنی ئیمپراتۆرییەتیش بوون. لەوانەیە هۆکاری ناکۆکییەکانی لەگەڵ رۆما بۆ ئەم خاڵە بگەڕێتەوە. بەهۆی نیمچە دوورگەی ئیتاڵیاوە، رۆما توانای تێپەڕکردنی دەوڵەتشار و ئاواکردنی کۆمار یان ئیمپراتۆرییەتی لەسەر گۆڕەپانێکی فراوان هەبوو. تاکە مەرجی رزگاربوونی قەرتاجە، هاوێشتنی ئەو هەنگاوە بوو کە ئەمستردام بەرامبەر ئیمپراتۆرییەتی فەرەنسا و ئیسپانیا ئەنجامیدابوو.

واتە لە جوگرافیایەکی بەرفراواندا یەکگرتن و بەهێزکردنی کارەکتەری پاوانکاری بەهێزی بازرگانی شار لەگەڵ ئامێرێکی سەرمایەداریانەی دەوڵەت (بۆ نموونە تەواوی باکووری ئەفریقیا، یان هاوشێوەی ئەوەی کە بنەماڵەی ئەمەوییەکانَ لە ئیسپانیا ئاوایانکردبوو، ئاواکردنی پاوانێکی دەوڵەت) جگە لەمە شانسی دیکەی رزگاربوونی لە کۆماری رۆما نەبوو. رۆماش جگە لە تێکشکاندنی قەرتاجە هیچ شانسێکی دیکەی نەبوو. چونکە لەتەنیشتیەوە ئەلتەرناتیفێک دروست دەبوو کە دەتوانێت کۆتایی پێبێنێت. چەندە لە پەیوەندی کوبا ـ ئەمریکا دەچێت! تا ئێستاش وەک گووتەیەکی بەناوبانگ دەگووترێتەوە: سەناتۆرەکانی رۆما لە سەرەتای هەر کۆبوونەوەیەکدا هەڵدەستانە سەرپێ و یەکەمین قسەی دەیانکرد ئەوەبوو"ئەم قەرتاجەیە چی لێبکەین؟".

قوربانییەکی دیکەی رۆما لەنیوەی دووەمی سێیەمین سەدەی زایینی کە ئیمپراتۆریەت دووچاری یەکەمین قەیرانەکانی هەرەس هاتبوو، ئەوە بوو کە بەسەر شاری پالمێرا (تەدمور)ی بەناوبانگی رۆژهەڵاتی سوریادا هات. کاتێک لە سوریا بووم زوو بەزوو سەردانی پاشماوەی ئەم شارە ئەفسووناوییەم دەکرد. شارێکی سەرسوڕهێنەرە کە سەرچاوەی ئاوەکەی لەچۆڵەوانییەوە هەڵدەقوڵێت، دارستانی خورما دەوری ئاوەکەی داوە، بەڵێ بەقەڵاکەی، شوراکانی، بازاڕەکەی، پەرستگاکەی (پەرستگای دەلفی بەناوبانگ)، تەلاری سەناتۆ، گۆڕستانەکانی دۆڵ، بازاڕە درێژەکانی و کۆشکە زۆرەکانی شارێکی ئەفسووناوییە. تەواو سەمەرەیەکی هەڵکۆڵینی بەردە. ئەو شارەی مرۆڤ لەناو سەرسوڕمان و نەوازشی خۆیدا جێدەهێڵێت.

گرنگییەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە دەکەوێتە ناوەندی تۆڕی بازرگانی رۆژهەڵات ـ رۆژئاوا، باکوور ـ باشوور، و رۆڵی دەوڵەتشاری سنوور (تامپۆن)ی نێوان ئیمپراتۆرییەتی رۆما ـ ساسانی دەبینێت. چەند سەدەیەک لەسەر بنەمای پاوانکاری بازرگانی چەندەی بۆی بکرێت گەورە و دەوڵەمەند دەبێت. لەبواری گەردوونییەوە، لێکچواندنی بە ئەمستردامی قۆناخی خۆی و نیویۆرکی رۆژگاری ئەمڕۆمان، بەگوێرەی من هێشتا

کەمە! ئیمپراتۆرییەتی رۆما بەوێنەی قەرتاجە زۆر لەم نموونەیەش نیگەرانە. مێژوو پیشانیدەدات کە لەدوا قۆناخی خۆیدا (٢٧٠ی زایینی) ئەم شارە بەوە رازی نەبووە کە وەک قەوارەیەکی پادشایەتی پشتبەستوو بەهێزی بنەماڵە و گرێدراوی رۆما بمێنێتەوە، بە تایبەت خواستوویەتی ببێت بە ئەڵتەرناتیفی رۆما.

ئەوەی قەرتاجە تێیدا سەرنەکەت، دەشێت تەدمور سەرکەوتن بەدەست بێنێت؟ ئەمە کێشەکەیە، ئاشکرایە ماتەوزەیەکی مەترسیدار لەخۆوە دەگرێت. دەگێڕنەوە کاتێک ئاریالیۆسی ئیمپراتۆری رۆما دوای شەڕو پێکدادانێکی درێژخایەن دەستی بەسەرداگرت خواستوویەتی شار وەک خۆی لەژێر دەسەڵاتی زەنوبیای شاژنی بەهێزی ئەو قۆناخەدا بهێڵێتەوە. دوای ئەوەی بەخۆیەوە دەبەستێتەوە، وەک ئەیالەتێکی گرێدراو شار بۆ زەنوبیا بەجێدێڵێت. لەکاتی گەڕانەوەیدا کاتێک هێشتا لەنیوەی رێگایە زانیاری پێدەگات کە دیسان شار راپەڕیوە و بەدوای سەربەخۆیی خۆیدا دەگەڕێت، بە ڕق و نەفرەتێکی زۆرەوە پەلاماری شارەکە دەدات. تەنیا وێرانەکەی لە دوای خۆیدا جێدێڵێت. زەنوبیاش کە رادەکات و دەیەوێت پەنابەرێتە بەر دراوسێ ساسانییەکانی لە کەنارەکانی رووباری فوراتدا دەیگرێت و لەگەڵ خۆی بەرەو رۆمای دەبات. باسێکی دیکەی مێژووش ئەوەیە کە بەهەموو دەوڵەمەندییەکەیەوە وەک دیلێک لەلای گەلی رۆما ریسوا دەکرێت.

زەمانی رۆمای تایبەت بە ژنان بەردەوام کاریگەری لە من کردووە. دوای ئەوەی لە چیرۆکی زەنوبیا تێگەیشتم، هەروەکو بڵێی بەنهێنییەکەی گەیشتووم. رۆما تەنیا ئەو شارە نییە کە هەموو رێگاکان لەوێدا بەیەکتری دەگەن، بەڵکو شارێکە کە سەرجەم پادشا و شاژنەکان، تەواوی بەهرەمەندە خاوەن هێزەکانی بۆ گواستراوەتەوە. هەڵبەتە ئەوەی بەسەر منیش هات دەبێت لەنزیکەوە پەیوەندی بەم دیرۆکەوە هەبێت (کاروانە نیو کۆمیدی ـ نیو تراژیدییاکەی رۆمام). ئەگەر بەشێوەیەکی باشتر دەرکم بە راستینەی سپارتاکۆس،ساینت پاول[1] و برونۆ بکردایە، ئاشکرایە وریا و

١ـ ساینت پاول: یەکێکە لە دوازدە حەوارییەکەی عیسا. لەسەدەی یەکەمی زایینیدا ژیاوە. لەزۆر لایەنەوە بۆ ئایینی کرستیانی

وشیارتر دەبووم. هەروەها دەبوایە باش گرامسیم بخوێندبایەتەوە. ئاخ سۆسیالیستەكان!

تاكە رێگای رزگاری تەدموریش رێگای ئەمستردام یان لەندەن بوو. بەرخودانی كرد، بەڵام سەرنەكەوت.

وەكو نموونە باسكردنی ئەسینای چاخی كلاسیكیش دەشێت ئەزموونبەخش بێت. ئەم شارەی بەرهەمی بازرگانی دەریا بوو (٥٠٠ - ٣٥٠پ.ز) لەقۆناخی خۆیدا وەک ئەستێرەی شارستانی بوو. دەتوانین دەستنیشانی بكەین كە سەرمایەداری سەرەتایی هەرە زێدە لە ئەسینا پێشكەوتبوو. پاوانە مەزن و تایبەتەكان (دەوڵەت نییە)ی بازرگانی لەدووری سەدان میل و كیلۆمەترەوە لە رەوشێكی چالاكدابوو. دەوڵەمەندێتییەكان بەرەو ئەسینا دەچوون. لە رۆژهەلاتی دەریای سپییەوە تا مارسیلیا، لە ئەفریقیای باكوورەوە تا مەكەدۆنیا، لە رێگای تەواوی تۆڕەكانی بازرگانی ئەنادۆڵ و دەریای رەشەوە زێدە - بەرهەم و پارە بۆ ئەسینا دەڕۆیشت. فەلسەفەی ئافراندووە، پیشە بەدەروازەی كارگە گەیشتووە: هونەری دروستكردنی كەشتی لە لووتكەدایە، پارە كەوتۆتە گەڕ. لەهەموو شوێنێک كۆلۆنی خۆی هەیە. لەهەر لایەكەوە دەوڵەمەند و خاوەن پارەكان دێنە ئەسینا. یەكەمین جار دەبێتە خاوەن ناوەڕۆكێكی تێكەڵ. شرۆڤەی شەخسی خۆم، تاكە كەموكوڕییەكەی بەدەستنەهێنانی یەكێتی ناوخۆی نیمچە دوورگەیە، ئەمەش تاكە كۆسپی بەردەم سەركەوتنی سەرمایەدارییە. كێشەی هێزی كاریش لە ئارادا نەبوو، لە بازاڕ كۆیلەكان لە ئاویش هەرزانتربوون. لەو قۆناخەی پێی گەیشتبوو یان ئەسینا پێكهاتە كۆنەكەی كۆیلایەتی بەلاوە دەنا و لە ئاستی نیمچە دوورگەدا وەک دەوڵەتێكی (نەتەوەیی) هەنگاوی دەهاوێشت و

لەدوای حەزرەتی عیسا بەكەسی دووەم دەژمێردرێت. بە رەچەڵەک منداڵی خێزانێكی یەهودی هاوڵاتی رۆمایە. سەرەتا هەروەک لە خێزانەكەیەوە بۆی ماوەتەوە دوژمنی ئایینی كرستیانی بووە. دواجار بۆ وەرگرتنی پەروەردەی ئایینی خێزانەكەی دەینێرنە قودس. وەک دەگێڕدرێتەوە و تۆماركراوە: رۆژێک دەكەوێتە سەر رێ كە دەچێت لە شام سزای كرستیانەكان بدات، لەوێدا پەرجوویەكی بەسەردێت و حەزرەتی عیسا خۆی پیشان دەدات. لێرەوە ئایینی كریستیانی پەسەند دەكات و دەكەوێتە بڵاوكردنەوەی لەزۆر جێی جیهان و بە تایبەتیش لە رۆژهەلاتی ناویندا. گرنگترین خزمەت كە بۆ ئایینی كرستیانی كردوویەتی: بەرتەسک مانەوەی ئایینی كرستیانی لەناو یەهودییەكاندا بەو باوەڕەی كە نوێگەرییەكە لە یەهودیەتدا و هچی تر، تێک شكاندووە و لەجیاتی یەهودییەكان بڵاوكردنەوەی ئایینی كرستیانی لەناو گەلانی "پاگان"دا بەبنەماگرتووە، شێوەیەكی نوێی داوە بە ئایینی كرستیانی و رێساكانی پەرستن و بنەماكانی باوەڕی داناوە، هەروەها رۆڵێكی گرنگی هەبووە لە شێوەگرتنی ئەرنیجیلەدا كە ئەمڕۆ بەبنەما دەگیرێت.

بەشێوەیەکی پێشوەخت دەبوو بە هۆڵەندا، یاخود لەلایەن رەقیبەکانیەوە تێک دەشکێنرا و لەرەوشێکی بێبایەخدا دەمایەوە. پادشایەتی سپارتا وەک هێزی زەمینی، ئیمپراتۆرییەتی پارسیش کە لەوبەری دەریاوە هاتبوو سەد ساڵ زیاتر بەردەوام زەبریان لەم شارە وەشاند. بەڵام لە رێگای دیموکراسییەوە بەردەوام هەوڵی لەسەرپێ مانەوەیدا. چەپۆکی فیلیپی باوک و ئەسکەندەری مەکەدۆنی کوڕی ئەسینایان دووچاری تێکشکانێکی ستراتیژی کرد. لەساڵانی دوای ٣٠٠ پ.زبەرامبەر بە هەڵکشانی رۆما و پادشا هێلێنییەکانی ئانادۆڵ شانسی ئەنجامدانی هەڵمەتی نەمابوو.

پێشکەشکردنی نموونەکانی سەرمایەداری بەرایی شارستانی ئیسلامی چاخی ناوین و نموونەکانی لەدەروازەی نیمچە دوورگەی هیند ئاواکران دەبێتە دووبارە بوونەوەیەکی قەبە. بەکاریگەرترین نموونەکانی ئەم قۆناخە شارە سەرمایەدارییە بەناوبانگەکانی نیمچە دوورگەی ئیتاڵیان. ڤێنسیا، جەنەوا و فلۆرەنسا کە لەلایەن ئاشقانی شێوازی کۆنی ئیمپراتۆرییەتی ئیسپانیا، فەرەنسا و نەمساوە هەروەکو تەواوی نیمچە دوورگە تێکشکێنران و سەروەرییان لەدەست دەرهێنرا، شانسی پێشوەخت بوون بە ئەمستردام و لەندەنیان لەدەستدا.

شارەکانی ئیتاڵیا هەموو شتێکی پێویستیان بۆ سەرمایەداری هاوچەرخ ئافراندبوو. نیمچەدوورگەی ئیتاڵیای قۆناخی ساڵانی ١٣٠٠ - ١٦٠٠ بەکۆکردنەوەی سەرمایە، بانک، کۆمپانیا، بیمە، دەستاوێز کە ئامرازی فینانسن، بازرگانی نزیک و دوور، مانیفاکتۆر، ئەزموونەکانی ئیمپراتۆرییەت و کۆمار، ئایین و هەموو جۆرە مەزهەبەکانییەوە، شێوەی سەرەتایی و تاقیگەی ئەو ئەوروپایەیە کە دواتر لەدایک دەبێت. هەروەها وڵاتی رێنسانسیشە. بێگومان ئەمەش گرێدراوی رەوشی پێشەنگایەتی پەیوەندییەکەیەتی لەگەڵ جوگرافیاکانی رۆژهەڵات و میراسە مێژووییەکەی. کاتێک دەڵێین ئیتاڵیای ئەم قۆناخە، بە واتای رۆژهەڵاتی ناوینی ئیسلامی، چین، هیندستان و تەنانەت روسیاش دێت کە تازە بەرزدەبێتەوە. تواناکانی ئەم جوگرافیایە لەلایەن پاوانەکانی بازرگانی شارەوە لەسەررووی هەمووشیانەوە ڤێنسیا، فلۆرەنسا و جەنەوا بە

ئارەزوویەک کە تێربوون ناناسێت بەرەو نیمچە دوورگە گواستراوەتەوە. گرنگتریش ئەوەیە، بزووتنەوەکانی ئاواکردنی شار کە بۆیەکەمین جار بوو بەپێشەنگایەتی شارەکانی ئیتالیا پێشکەوت، بەندەرێکی سەرسوڕهێنەری کۆکردنەوەی سەرمایەبوون. دەشێت لە هەر شارێکی ئەوروپادا شوێنپەنجەی بازرگانێکی ئیتالیایی ببینرێت. بێگومان کڵێسای کاسۆلیکی لەمێژبوو زەمینەی شارستانی دانابوو. رێنسانس دەبوو بە دواترین و مسۆگەرترین گووتەی پێشەنگایەتی.

تاکە هۆکاری نەبوونی ئیتالیا بە ئینگلتەرا و هۆڵەندا جوگرافیاکەی بوو. بەشێوەیەکی پارادۆکسانە هەمان جوگرافیا لەسەرمایەداری شاردا دەیکات بەپێشەنگ، لە ئاستی نیمچە دوورگەدا بە دەروازەی سەرکەوتنی دەگەیەنێت، بەلام نەیدەتوانی هەنگاوی سەرکەوتنی دوایی بهاوێژێت. کاتێک هەنگاوی هاوێشت هیچ بەلایەک نەما دووچاری نەبێت. هۆکارەکەی زۆر ئاشکرایە. ئەگەر ئیتالیا ئینگلتەرای پێشوەخت بووایە، تاجی ئیسپانیا، فەرەنسا و نەمسای بەسەریاندا بڕووخاندایە کە خوازیاربوون داگیری بکەن، هەروەکو قەڵەمبازی رۆما بۆ ئیمپراتۆرییەت، ئەوکاتە دەبووە دووەمین هێزی ئیمپریالی جیهان. بەلام لەسەربنەمای ئابووری کۆمەلایەتی سەرمایەداری. کۆبوونەوەی خاوەن تاجەکان (پادشاکان) لەسەر سەری شارەکانی ئیتالیا، شتێک نییە مایەی تێگەیشتن نەبێت. یەکێتی شارەکانی ئیتالیا لەسەر بنەمای ئابوورییەکی کۆمەلایەتی نوێ، دەبووە کۆتایی ئیمپراتۆرییەتەکان، سەرەتا لە ئەوروپا و دواتریش لەتەواوی جیهان قۆناخێکی پەلهاوێشتن دەبوو بەناچارییەک. لەسەرووی هەموویانەوە سەرمایە، هەموو شتێکی بۆ ئەمە لەبەردەستدا بوو. لە راستیدا ژێرکەوتن بێ شانسییەکی گەورەبوو، بەواتای دواکەوتنێکی نەتەوەیی سێ سەد ساڵە هات.

بەگوێرەی من بەهۆی جوگرافیاکەیەوە شانسی بوون بە رۆمای دووەمیان لەدەستدا. رۆمای یەکەمیش بە ئاستەم لە هانیپاڵ رزگاری بوو کە دوای کاروانێکی دوور لە باکوورەوە هێرشیکرد. ئەمجارە ئەوانەی لەباکوورەوە هێرشیان هێنا نەک هانیپاڵێک بەقەدەر چل هانیپاڵ بەهێزبوون.

هەربۆیە دەرفەتی سەرکەوتنی نەبوو. تاکە ریگای ئەمە ئەوەبوو کە وەکو ئایینی ئیسلامی عەرەبەکان کە لەتەواوی رۆژهەلاتی ناویندا بلاوبووبۆوە، دەبوایە ببیتە ئایینێکی شمشێربەدەست. گەر لەجیاتی کرستیانییەکەی رۆما ئیسلام یاخود مەزهەبی کاسۆلیکی کرستیانی بووایە و پەلهاویشتنی ئایینی و سیاسی بەیەکەوە لە ریگای شمشێر بەرێوەببردایە، ئاراستەی رەورەوەی مێژووی جیهان تەواو شتێکی تر دەبوو. مرۆڤ ناتوانێت نەپرسێت: ئەگەر ئایینی کرستیانی نەبوایە کۆتاییەکەی رۆما چۆن دەبوو و ریگای لەپێش چی دەکردەوە؟ سەیرتر ئەوەیە، سولتان محەمەدی فەتحکار ئەگەر داواکەی پاپای پەسەندبکردایە و ببوایە بە کرستیانێکی شمشێر بەدەست، ئەنجامەکان چۆن دەبوو؟ مێژوو گۆرەپانێکی قەبلاندن نییە. بەلام ئەوەش راستییەکی حاشا هەلنەگرە کە بەردەوام چەندین ئەلتەرناتیف لەخۆیەوە دەگرێت. ئەوەی شارەکانی ئیتالیا تێیدا سەرنەکەوتن، لەکۆتاییەکانی سەدەی شازدەهەمدا ئەمستردام و لەندەن سەرکەوتنیان تێدا بەدەست هێنا. هۆکار و ئەنجامەکانی بوارێکە هەرە زێدە لەلایەن مێژووناسەکانەوە کراوەتە بابەتی لێکۆلینەوە و پێشخستنی تێزەکانی خوێندنی بالا. چەندەی بلێی ئەم بابەتە رۆشن کراوەتەوە. ئەگەر بەکورتی هۆکارەکانی ریز بکەین بەم شێوەیە:

١- گشت ئەو گۆرەپانانەی کە بەشێوەیەکی لاواز و هەرە درەنگ شارستانێتی کۆنیان بۆ گوێزراوەتەوە لەوپەری باکووری رۆژئاوای ئەوروپا دان.

٢- هەرسێ هێزە مەزنەکەی ئەوروپا فەرەنسا، نەمسا و ئیسپانیا لەنێوان خۆیاندا شەری بالادەستی لەسەر ئەوروپا بەرێوە دەبەن.

٣- هێندەی شارەکانی ئیتالیا بەمەترسی نابینرێن، بەیەکەوە و بەهێزێکی پێویست پەلاماریان نادرێت.

٤- لە پەلهاوێشتن و بلاوبوونەوەی ریفۆرم لەباکووری ئەوروپادا پێشەنگایەتی دەکەن.

٥- هەلکەوتەکەیان لە کەنارەکانی زەریای ئەتلەسیدا ئەوەنتاژێکی مەزن بۆ بازرگانی نزیک و دوور دەرەخسێنێت.

٦ـ تەواوی كلتووری ماددی و مەعنەوی شارەكانی ئیتاڵیایان بۆخۆیان گواستۆتەوە.

٧ـ لەسەررووی ئەو گۆڕەپانانەوە دێن كە لە رووی كلتووری ماددی و مەعنەوییەوە دەرەبەگایەتی تێیاندا لاوازە.

٨ـ هەروەكو چۆن دەرەبەگایەتییەكی هێندە بەهێزیان تێدا پێكنەهاتووە كە گۆڕینی گەیاندن، كشتوكاڵ و پیشەسازی بۆ شێوازی سەرمایەداری ئاستەنگ بكات، لە زۆر ناوچەشدا بۆ یەكەمین جار شارستانی بە ناوەڕۆكێكی سەرمایەدارانە پەرەی سەندووە.

كاریگەری ئەم هۆكارانە كە دەتوانین ژمارەكەیان زیاتر بكەین لەنزیكەوە گرێدراوی پێگەی جوگرافییە. جیۆستراتیژ و جیۆپۆلیتیك لە راستیدا لەبارترین پێگەی بۆ دەرەخسێنێت. كاتێك ئەم پێگەیە لەگەڵ هەلومەرجە كۆمەڵایەتییەكاندا كراون بەیەك سەركەوتن بەدی هاتووە.

ئەوروپا و ئاسیا، تەنانەت ئەفریقیاش سێ كیشوەری یەككرتوون. یەكێك لە چەسپاندنە گرنگەكانی ئەنترۆپۆلۆژی ئەوەیە كە تا دوا قۆناخی سەهۆڵبەندان ئەفریقیا لە ئەزموون و بەسەرهاتی مرۆڤایەتیدا لەپێگەی پێشەنگایەتیدا بوو. دواتر جوگرافیای بنارە بەپیت و سەرنجڕاكێشەكانی زاگرۆس ـ تۆرۆس لەمیانەی شۆڕشی نیولیتیكەوە دەبێتە جوگرافیای پێشەنگ. لەساڵانی ١٥٠٠٠ ـ ٤٠٠٠پ.ز وەك كلتووری ماددی و مەعنەوی هەرچییەك بۆ قۆناخەكەی دواتر (شارستانی) پێویست بێ بنارەكانی ئەم چیایانە گشتی بەرهەمهێناوە. ناوبردنی بەگەورەترین شۆڕشی مێژوو دەستنیشانكردنێكی لەجێگای خۆیدایە. رووبارەكانی دیجلە و فورات تەنیا بەپیتترین لیتەو خۆڵەكانی ئەم چیاو بنارانەیان لەكەنارەكانی كەنداو كۆنەكردەوە، لەمیانەی دروستكردنی یەكەمین بەلەم و پیشەی كەشتییەوانییەوە خۆیان و سەرجەم بەها كلتوورییەكانیان گوازراوەتەوە. كاتێك شارەكانی ئوروك و ئەریدۆ یەكەمین ئەزموونی شارستانیان دەست پێكرد، لە راستیدا بەهای ئەم كاروانە پڕ لە پەژارەیەیان كردبوو بەسەنتێزێك. گەورەبوون بەشێوەی لێشاوی رووبارێك بەردەوامبوو، لە كەناری سەرچاوە (كانی) پیرۆزەكانەوە تا ئەو دەروازەیەی لە رێگایەوە

دەرژێتە زەریاوە. بەبێ پچڕان گەورە دەبوو.

ئوروک (وەرکا) کلتوورێکی ئاسایی مرۆڤایەتی نییە. سەرەتای پەرجوویکی نوێیە. دەنگی خوداوەندە ژنی ئوروک ئینانا[1] تاکو ئێستاش سەرچاوەی بنەڕەتی سەرجەم داستان، هەڵبەست و گۆرانییەکانە. ئەو دەنگە، دەنگی ئەم کلتوورە سەرسووڕهێنەیە. لە هەمان کاتدا دەنگی ئەو ژنەیە کە هێشتا پیاوی چەپەڵ پیسی نەکردووە. کلتووری ئوروک لە جوگرافیای خۆیدا گوڵی کرد. یەک بەدوای یەک وەک قارچک شارەکان زیادی کرد. پشتێنەیەکی شارەکان دروست بوو. پیاوی فێڵباز و بەهێز ئەمجارە سەرچاوەی سەرەکی توانا و کۆکردنەوەی لە توانستە بازرگانییەکانی شاردا بینی کە لە زیادبووندا بوو. لێشاوێکی کلتووری بە ئاراستەی پێچەوانە دەستی پێکرد کە تا بناری چیاکان ڕۆیشت. ئەمەش قۆناخی سەرەتای قووتدانی جوگرافیای نیولیتیک بوو لەلایەن شارەوە. دەنگی کچکراوی ئینانا، دەنگی ژنی بێکاریگەرکراوە. ئیتر پیاوی فێڵباز و بەهێز دەنگیشی بڵندە. پێشگر و پاشگری وشەکانی زمانی سۆمەری کارەکتەری ڕەگەزی مێینەیان هەیە. ئەم بابەتەش ڕۆڵی ژن لە ئاواکردنی زماندا پیشاندەدات.

لێرەدا پێویست بەباسکردنی بەسەرهاتی جوگرافی ئەو شارستانیانە ناکات کە پشت بەتوندوتیژی دەبەستن. بەڵام ئەگەر بنووسرێت باش دەبێت. تەنیا بەشێوەیەکی ڕەمزی ئاماژە بەوە دەکەین: وەک ڕووبارێکی بنەڕەتی بەگوڕ دێتەخوار، بەهەزاران کیلۆمەتر کەنار و زەوییە بەرز و نزمەکانی تێپەڕکرد، هەرە دوایی لەکەنارەکانی ئەمستردام و لەندەن کلتوورێکی نوێی لەدوای خۆی بەجێهێشت و ڕژایە ناو زەریای ئەتڵەسییەوە.

ئاشکرایە کە تەواوی کلتووری ماددی و مەعنەوی تەواوی چاخەکان و جوگرافیاکانی وەرگرتووە، هەرەدوایی بەپێشەنگایەتی ئەم دوو شارە

---

١ـ ئینانا: یەکێکە لەناوەکانی قیبەلەی خوداوەندە ژن. نانا و نیناشی پێدەگوترێت. ئەکەدییەکان بە (عەشتار) وەریان گێڕاوەتە سەر زمانەکەی خۆیان. وشەکانی ئانا، ئاننە کە بە واتای دایک دێت هەرلەمەوە سەرچاوەیان گرتووە. لەمیتۆلۆژیای میزۆپۆتامیادا بەکچی خوداوەندی "ئانزو" یان "ئان" ناوی دەبرێت کە خوداوەندی عەشق و شەڕە. بابلییەکان لەسەدەی شەشی زاییندا "ئانومیتو" یان پێگووتووە.

نەتەوەو ئابووری سەرمایەداری مۆدێرنی هێنایە سەرشانۆی مێژوو. هەمان ناوچە ئەو شوێنانە بوون کە هەرە درەنگ کلتووری نیولیتیکیان وەرگرت. بەردەوام پەیوەندییەکی بەمجۆرە لەنێوان جوگرافیا و کلتووردا دەبینین: لەو گۆڕەپانەی کلتووری کۆن ریشەی خۆی داکوتابێت ئاوابوون (پێکهاتن)ی کلتوورێکی نوێ زۆر زەحمەتە. کلتووری کۆن بەئاسانی نوێکە پەسەند ناکات، بەرگری لەخۆی دەکات، ئەمەش خاڵێکی مایەی تێگەیشتنە. تاکە گۆڕەپانێک کە کلتووری شارستانی کۆنی رۆژهەڵاتی ناوین بەپێی پێویست داگیری نەکردبوو ناوچەکانی ناوەوەی عەرەبستان بوو. ئەم بۆشاییە جوگرافییە جوگرافیای کۆمەڵایەتی ئیسلامی پێکهێنا. ئەم جوگرافیایە نەبوایە ئیسلامیش نەدەبوو.

باکووری ئەورووپا دوو- سێ وڵات (تازە بەتازە زاراوەی وڵات بەواتای سنووری نەتەوەیی سەریهەڵداوە)، ئینگلتەرا و هۆڵەندا سەبارەت بەشارستانییە کۆنەکان بەڕادەیەک کە بگووترێت زەوییەکی دەست لێنەدراو و خاڵین و بەپاکیزەیی ماونەتەوە. بەهۆی ئەم خەسڵەتەیانەوە گۆڕەپانێکن ئەگەر تۆوێکی نوێی لێ فڕێ بدرێت بە باشترین شێوە تێیاندا شین دەبێت. شانسی رەگ داکوتان و هەمیشەییبوونی زۆرە.

ئەم تووەی ئابووری سەرمایەداری هاوێشتراوە و بەباشی سەری گرتووە. دوا میراسی ئوروکە کە لە کەنارێکەوە بۆ کەنارێکی دیکە گواستراوەتەوە. هەڵگری ئەم میراسە بەردەوام بازرگانەکان بوون. دەگووترێت: بازرگان ئەو کەسانەن باش هەست بەو گۆڕەپانە دەکەن کە قازانجێکی زۆری لێدەکەوێتەوە. بەبایەخەوە ئاماژەی پێدەکەم، پێگەی مارژینالی ناوچەکە جێگای خۆی لە ئاسۆی ناوەندەکانی هێزدا نەگرتبوو، هەروەها ئەوەنتاژەکانی دووری رێگا، رێگای لەپێش ئەوەکردۆتەوە شانسیان بەلایەنی ئەرێنیدا بڕوات. کاتێک بەشێوەی چەتەگەرێتی دەستیان بەسەر تەواوی داهێنانە سەرمایەدارییەکانی شارەکانی ئیتاڵیا و ئەو رێگا جوگرافیانەدا گرتووە کە لەلایەن پاپۆڕی بازرگانی ئیسپانیا - پورتوگال دۆزرابوونەوە، شانسی پێشەنگایەتی خۆیان بەهێزتر کردەوە. ئەوەی ئەنجامیانداوە، پرۆسەیەکی تواندنەوەیەتی لەناو زمانی خۆیاندا.

لەکاتێکدا شەڕی نێوان خودی هێزە گەورەکانی ئەوروپا ئەو مەترسی و هەڕەشەیەی بەربەست کردووە کە لە دەرەوە دێت، مسۆگەربوونی بەپیتی ئابووری نوێ لەناوخۆدا (هەرزانی کەرەستەی خاو و هێزی کار)، بەسبووە بۆ ئەوەی لەکۆتاییەکانی سەدەی شازدەهەمدا وەچەخستنەوەی ئەم جوگرافیایە سەرکەوتووبێت و بیکات بەهەمیشەیی.

ئەم دوو هێزەی تەنیا لە رووی شێوەوە هەندێک جیاوازیان لەنێواندا هەبوو، لە رێگای ئەو رێککەوتنەی بەستیان بە رەوشێک گەیشتن لەئاستی جیهاندا نوێنەرایەتی ئابووری نوێ بکەن. نوێبوونەوەی ئابووری دەوڵەتیشی بەرەو خۆنوژەنکردنەوە راپێچ کرد، بەرەو شێوەی دەوڵەتێکی بەپیت و سەرکەوتووی برد. بالابوونی ئابووری کۆمەکی پێشکەش بە بالابوونی سەربازی و سیاسی کرد. بۆ یەکەمین جار پاوانکاری بازرگانەکان شەراکەتیان لەگەڵ پاوانخوازییەکانی دەوڵەت پێشخست و بەهێزێکی فەرمی گەیشتن (کۆمپانیاکانی رۆژئاوا و رۆژهەلاتی هیند). زەوتکارانی شارستانی کە بەردەوام لە قوژبن و دالانەکاندا خۆیان دەشاردەوە و شەرمیان دەکرد، بۆیەکەمین جار بوون بەو ئەفەندیانەی کە ئیتر مەشروعییەتەکەیان حاشاهەڵنەگرە. بەدەستی شا و شاژنەکانی تەواوی ئەتەکێتەکانی ئەرستۆکراتی کۆن بە یەخەیانەوە کرا. هەروەکو چۆن شێرەکەی ئوروک ئەو هێزەی نییە لەسەردەمی خۆیدا بەرەنگاری گلگامێش بێتەوە، هیچ خێرێک نەمابوو بەرامبەر دووا میراتگرە (نەڵێین شێر) درندەکانی ئەمستردام و لەندەنیش بوەستێت. ئەگەر هەشبووایە، وەک چۆن گلگامێش ملی شێرەکەی گرتوو خنکاندی، خنکاندنیان زەحمەت نەبوو.

ئەو داستانەی باسی تێکۆشانی خوداوەندە ژن ئینانا بەرامبەر بە یەکەمین خوداوەندە پیاوی فێڵباز و زۆردار (پیاوی دەسەلاتدار کە بووە بەخوداوەند)ی دامەزرێنەری شاری ئەریدۆ 'ئەنکی'[١] دەکات، کە هەوڵدەدات ٩٩ جۆرە هونەر، شاکار و دۆزینەوەکانی ژنی لە دەست دەربێنێت، ئەو

---

١ـ ئەنکی: ناوەکەی تری خوداوەند "ئێیا"ی شاری ئەریدۆیە، لەلای سۆمەرییەکان خوداوەندی ئاوە. لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا بەرامبەر بە خوداوەندی نیپور بەهێز دەبێت و دەبێتە خولقکارترین خوداوەند کە کارەکان رێکدەخات. هەربۆیە لەبەرئەمەش بەسیمبۆلی چینی دەسەلات و سیاسی دادەنرێت. خوداوەندێکی فێڵباز: سازشکار و دانایە.

ه‌ره‌ی باسی ده‌کات، له‌ راستیدا یه‌که‌مین و به‌کاریگه‌رترین داستانه‌. هه‌رچی شاژنه‌کانی ئینگلته‌را و هۆڵه‌ندایه‌ که‌ گوایه‌ به‌میراتگری داده‌نرێن، بوونیان به‌سیمبۆڵی ژنێک که‌ ته‌واوی چه‌په‌ڵییه‌کانی پیاوی فێڵباز و زۆردار تێیاندا ره‌نگیداوه‌ته‌وه‌ و شێوه‌ی گرتووه‌، وه‌ک کورتکردنه‌وه‌ی سه‌رجه‌م ئه‌زموون و به‌سه‌رهاته‌کانی شارستانی بۆ پوخته‌یه‌ک وایه‌.

## هـ - شارستانییە کۆمەڵایەتییە - مێژووییەکان و سەرمایەداری

کاتێک رۆڵی کەرتی سەرمایەداری وەک چالاکی ئاڵوگۆڕکارانەی شێوەپێدانی کۆمەڵگا شرۆڤەبکەین، ئەوکاتە بەشێوەیەکی بەرجەستە نزیکی کێشەی شێوەکانی کۆمەڵگا دەبینەوە. هەوڵدەدەم وەڵامی ئەم پرسیارە بدەمەوە: ئایا شێوەی کۆمەڵگا و ئابووری سەرمایەداری ناچارییەکی کۆمەڵایەتی - مێژوویی بوو؟ وەک وەڵامێک ئەم بەشەی بەرگرینامەکەم سەبارەت بەوەیە کە ناچارییەکی کۆمەڵایەتی - مێژوویی نەبووە. لادان و هەڵە گەورەکەی شرۆڤەی مارکسیانە بۆ ماتریالیزم (ماتریالیزمی قەبە)ی مێژوویی ئەوەبوو بانگەشەی کرد کە ئەم شێوە کۆمەڵگایە ناچارییەکە. لەمەش مەترسیدارتر، رێکخستنی یەک بەدوای یەکی شێوەکانی کۆمەڵگا و پێشکەشکردنی ئایدیالیزمی هیگڵ لەژێر ناوی ماتریالیزمدا جگە لە کۆپییەی دووەم هیچ ناوەڕۆکێکی دیکەی نییە. ئەوەی کانت بەشێوەیەکی زۆر شەرمنانە هەوڵی ئەنجامدانی داوە: دەستنیشانکردنی هێزی سۆبژەیە بەرامبەر بەمجۆرە چەمکەی پێشکەوتنی ئۆبژە، بەواتایەکی تر دەستنیشانکردنی رۆڵی ئەخلاقە وەک بژارێکی ئازادی. مارکسیزم سەبارەت بە ئەخلاقی ئازادی لە دواوەی کانتیزمیشدا ماوەتەوە. لەم رووەوە باسکردنی چەمکە راسترەوەکان بێواتایە. ئەوان سەرمایەداری تەنیا وەک ناچارییەک نابینن، بەڵکو وەک دواگووتەی مێژوو هەڵیدەسەنگێنن.

تا رووی راستەقینەی ئەم پێناسانەی سەرمایەداری ئاشکرا نەکرێت کە لە ئایین زۆر مەترسیدارترن و پشتیان بە مەحافەزەکارترین ئایین

(پۆزیتیفیزم) بەستووە و نەپووكێنرێنەوە، بژاری ئازادی هیچ شانسێكی نابێت. بێگومان مێژووی دووسەد ساڵەی سۆسیالیزم و سۆسیالیزمی بونیادنراو پیشانیدەدات كە هەوڵی كۆمەككردنی سەرمایەدارییان لەباڵی چەپەكانەوە تێپەڕ نەكردووە. مەسەلەكە زۆر لەوە گەورەترە كەلەكوێدا چی راست بووە، لەكوێدا چی هەڵەیەكی كردووە. خودی جیهانبینیەكە بۆخۆی هەڵەیە. لەناویدا جیاكردنەوەی چەند هەڵەیەك یان چەند هەنگاوێكی راست، لەلایەنی جیهانبینییەوە هیچ ئەنجامێك ناگۆڕێت. لەمیانەی راستەهێڵێكی یەك ئاراستەوە تەماشای كۆمەڵگا دەكەن، بەجۆرێك تەماشای شێوەكان دەكەن هەروەكو بڵێی بەرپیزە لە لەوح ئەلمەحفوزدا (زۆر پێشتر لەنهۆمی خوداوەند دا دەستنیشانكراوە) نووسراون وكاتێك نۆرەی هات جێبەجێدەكرێت. تەنانەت گفتوگۆكانی لەجۆری پارچە و گشتی (جزئي ـ كلي) چاخەكانی ناوین لە رووی ئیرادەوە لەسەرووی هەڵوێستەكانی پۆزیتیڤیست ـ ماتریالیستییەوەیە. فاكتەری دیاریكەر لە تێكشكانی ئەو تێكۆشانانەی لەپێناو سۆسیالیزمدا كراوە، ئەم هەڵوێستە جیهانبینیەیە دەرهەق بە كۆمەڵگا.

ئاشكرایە ئەو پێناسانەی لەژێر سەرەدێڕەكانی پێشووتردا پێشمخست بەتەواوی لەدەرەوەی ئەم هەڵوێستانەیە. بینینی سەرمایەداری وەك قۆناخێكی ناچاری كۆمەڵگا لەولاوە بمێنێت، خودی هەڵوێستێكی وەها بەئەنقەست بێت یان بەبێ ئاگایی لەژێر كاریگەری سیستەمدایە و بۆتە ئامرازێكی پڕوپاگەندە كردن بۆی. ئەوەی پێویستە لەكۆتاییدا بیڵێم با لەسەرەتادا بیڵێم: **سەرمایەداری نابێتە شێوەیەكی كۆمەڵگا.** دەخوازێت كاری لێبكات، بەكاریگەر دەبێت، بەڵام نابێتە شێوەیەكی. لەوانەیە بگووترێت ئەی چوارسەد ساڵە تاكە شێوەیەك نییە كە بەسەر جیهاندا زاڵە؟ زاڵبوونی بابەتێكی جیاوازە، شێوە بابەتێكی جیاوازترە. مێژوو سێ شێوە یان سێ شێوازی كۆمەڵگا دەناسێت: **كۆمەڵگای تیرەی سەرەتایی، دەوڵەتی چینایەتی یاخود كۆمەڵگای شارستانی، لەگەڵ كۆمەڵگای دیموكراتی فرەرەنگ.** هەڵوێستەكانی پێشكەوتنی راستە هێڵانەی لەجۆری كۆمەڵگای سەرەتایی، كۆیلەداری، دەرەبەگایەتی،

سەرمایەداری و سۆسیالیستی، لەرادەبەدەر دۆگماتیکین. بەگووتەیەکی دیکە ئایدیالیستانە و قەدەرگەرایین. گرنگتریش ئەوەیە، لە پێناسەکەی مندا هەرسێ شێوازی کۆمەڵگا بە ئاراستەی راستەهێڵ بەرەوپێشەوە ناچن. لەسیستەمێکی خولگەیی نزیکترە کە قووڵ و فراوان دەبێت. بەشێوەیەکی راشکاوانە دەڵێم، لەگەڵ ئەوەی شێوازی کاری دیالیکتیکی پەسەند دەکەم، شرۆڤەیەکی بەمجۆرە راست نابینم کە دەڵێت: جەمسەرە دژەکان یەکتری لەناودەبەن و پێشکەوتن بەدیدێت. هەڵوێستەکانی تێز، دژەتێز و کۆتێز دەشێت ئامرازێکی لەباری لۆژیکی روونکردنەوەی بنەماکانی میکانیزمی پەرەسەندن بێت. بەڵام تێگەیشتنی یاخود شێوازی پەیوەندییەکی دیالیکتیکی کە زۆر دەوڵەمەندە، دەرفەت بەجیاوازییەکان دەدات، دان بەکار لەیەکترکردندا دەنێت، زیاتر نزیک بەشێوازی کارکردنی سروشتە. یاخود گەوهەرێکی رۆشنکەرەوە تری هەیە. ‌.

نابێت لەبیری بکەین و دەبێت ئاگاداربین، لە بچووکترین گەردەکانی گەردوونەوە تا دەگاتە ئاستی یەکپارچەیی خودی گەردوون، هەموو پێکهاتەکان لە ئەنجامی پەیوەندی و کارلەیەک کردنی خودی دوالیزمەکانەوە پەیدا دەبن کە تاکە دەرفەتی پەیدابوونیانە و لەکاتێکدا کە هەردوو جەمسەری دوالیستەکە لەخۆوە دەگرن بریتیش نین لە کۆی هەردووکیان و جیاوازترن. ئەمە شێوازی بنەڕەتی و گەردوونی پێکهاتنە. لەبناخەی تەواوی گۆڕانکاری و پێشکەوتنێکدا ئەم شێوازەی پێکهاتن (هەبوون) دەبینین.

کۆمەڵگاش هەبوونێک نییە لەدەرەوەی ئەم شێوازەی پێکهاتن بێت. خاوەن زمانی هەمان شێوازی پێکهاتنە. بەکورتی بەردەوام دوالیزمەکان ئاوادەکات. هەربۆیە هەردووکیان لەناواخنی خۆیدا هەڵدەگرێت، بەڵام دەرفەت بە ئاواکردنی پێکهاتەی نوێ و جیاواز دەدات کە کۆی هەردووکیانی تێپەڕکردووە. بەمجۆرە دەرککردن بە دیالیکتیکی گۆڕانکاری و پێشکەوتنی کۆمەڵگاکان، دەرفەتی ئەوەمان بۆ دەڕەخسێنێت زیاتر ببینە خاوەن زانیاری بەرجەستە. کاتێک نزیکبوونەوەمان لە بچووکترین یەکینەکانی کۆمەڵگا و شێوە گشتگیرەکەیان، لەمیانەی چەمکێکی

دیالیکتیکی بەمجۆرەوە نییە، هێزی تێگەیشتن و شرۆڤە کردنمان خەسڵەتە مرۆییەکانمان (ماتەوزەی مرۆڤی ئازاد) دەخاتە گەڕ. بەمجۆرە هەم لە رێگای بەرجەستەکردنی کۆمەڵگاوە لە تاکەکاندا دەتوانین تاکێکی ئازاد و بەرپرسیار پێشبخەین هەم دەتوانین ئەو کۆمەڵگایەش کە تاکە ئازادەکانی کاریگەریان لێکردووە زیاتری ئازاد بکەین. توانای ئازادبوون خاوەنی باشترین شانس و ماتەوزەی یەکسانی و دیموکراتیزەبوونە.

دەبێت دووبارە بڵێم کاتێک باسی دینامیزمی سێیانەی راستینەی کۆمەڵگا دەکەم داهێنانێکی نوێ ناکەم. تەنیا هەوڵدەدەم دینامیزمی ئاوابوونی گەردوون لەسەر کۆمەڵگا پەیڕەو بکەم. ئەگەر پرسیارێکی لەمجۆرە بپرسن "بۆچی دینامیزمی سێیانە؟" لە وەڵامدا دەڵێم: بەهۆی هەبوونەوە. ئەگەر هەبوونیش وەک پرسیارێک لەوەڵامەکەی خۆی بگەڕێ، ئەو کاتە پێویستە بچینە سەر پرسیاری: "بۆچی هەین؟". بەگوێرەی من هەبوون بابەتی گفتوگۆکردن نییە. هەبوون نەبوایە، هەڵبەتە بەهیچ شێوەیەک پێویستی بەم پرس و پرسیارانە نەدەبوو. شتێک کە نەبێت، شوێنی نابێت. لە رەوشێکی نەبووندا، تەنیا دەتوانرێت باس لە نەبوون بکرێت، ئەمەش ئەو شتەیە کە قسەی پڕوپووچی پێدەڵێن.

ئەگەر هەبوون و ژیان پەسەند دەکەین، ئەو کاتە باسکردنی شێوازی پێکهاتن واتادارە. هەستیان بەوەکردووە کە گۆڕانکاری و پێشکەوتنی هەبوون سەرچاوەی تەواوی واتای ژیان و سەرجەم پێشکەوتنە هزرییەکانە. لەسەر ئەم بنەمایە گشتگیرییەکی سەرسوڕهێنەریان لە پۆلێنە هزرییە میتۆلۆژی، ئایینی، فەلسەفی و زانستییەکاندا پێکهێناوە. بێگومان ناتوانین نکوڵی لەم گشتگیرییە بکەین. هەر هەموویان خواستوویانە وەڵامی هەبوون بدەنەوە. هەندێکیان بە میتۆلۆژی، هەندێکی دیکەش لە رێگای ئایینەوە، کاتێک ئەمانەش بەس نەبوون، فەلسەفە و زانست فریایان کەوتوون. رۆڵیان وەکو یەکە. بەڵام وەڵامەکانیان جیاوازە. بەردەوام پرسیار لەبارەی هۆکار، چۆنییەتی و ئامانجەکانی هەبوونەوە کراوە، هەر پۆلێنێک بەگوێرەی دسپلینەکەی هەوڵی وەڵامدانەوەی داوە. زانست کە بە بانگەشەترین دسپلینە، تا ڕادەیەکی گرنگ دینامیزمی

سێیانەی هەبوونی ڕۆشن کردۆتەوە. کاتێک میکانیکی تەنۆکە ـ شەپۆل و مادده ـ ووزە بهێنرێتە ئاستی کوانتەمییەوە[١] (چ بەتاقیکردنەوە چ بە تیۆری)، هەروەها سەلمێنراویشە دەبینرێت کە بەردەوام دوالیزم ڕێگا لەپێش پێکهاتە ...کاتەوە، ئەو دەرئەنجامەی بەرهەمی ئەم پێکهاتەیە شوێنپەنجەی دوالیزمەکە (بیرۆکەکانی مادده ـ وزە، شەپۆل ـ تەنۆکە، گەردوونین) لەناو سێیەمیندا درێژە پێدەدات و بەمجۆرە جیاواز دەبێت، گۆڕانکاریش بەشێوەی پێشکەوتن یاخود پێچەوانەکەی دواکەوتن دەبێت، کارەکتەری سەرەکی ... نامێ... هەبوون ئەم شێوازەیە. دووبارەش پێویستی بە سەلماندنی

سەیری خۆمان بکەین. ... دایک ... اوک بوونێکە کە زۆر لەدایک و باوک دەچێت، درێژە بە بۆماوەی ...ەردوو ...کیان دەدات، بەڵام بەجیاوازی و شێوەیەکی نوێیەوە نوێنەرایەتییان دەک... (ئە... جیاوازییە زۆر بەهێواشی ئاراستە دەگرێت. لەهەر ڕووداوێکی سروشتیدا جیاوازی بەمجۆرەیە). دەشێت وەک تۆزقاڵێکی هەبوونی ئەزەلیش شرۆڤە بکرێت. تەنیا لەمیانەی ئەم شێوازەوە هەبوون شەڕی بوون دەباتەوە. شەڕی هەبوون چییە؟ مانەوەی بوون چۆن بەدیدێت؟ مانەوەی هەبوون لە ڕێگای گۆڕانکارییەوە درێژەدان بەهەبوونە. بۆچی؟ لەوانەیە بۆ سەلماندنی هەبوونی خۆی بێت. بۆ ئەوەی لەمیانەی گۆڕانەوە سەیری ئیلاهیبوون و سەرسوڕهێنەری هەبوون بکرێت!

ئەوەی شتێکی زۆر پڕو پووچە لێرەدا: لەکاتێکدا دەبوایە لەمیانەی چاودێریکردنی هەبوونە هەرە نزیکەکانمانەوە لۆژیکێکی تەندروستمان بەدەست بهێنایە، بۆچی توانیمان هێندە لەم ڕاستییە بنەڕەتیانە دووربکەوینەوە یاخود دووریان خستینەوە؟

ئەگەر ئەم کردە پووچە روون بکەینەوە بەپرسە سەرەکییەکە دەگەین. مەبەستم تۆڕەکانی گێڕانەوە، رووخسارەکانی و دەمامکەکانیتی کە هەر

١ـ کوانتەم لە لاتینیدا بە واتای (بڕ) دێت، هەرچی فیزیای کوانتەمە ئەو زانستە نوێیەیە کە لە بڕێتی رەوشتەکانی ئەم جیهانەی دەورووبەرمان دەکۆڵێتەوە؛ بەڵکو یەکێکیشە لە بنچینە سەرەکییەکانی. لەلایەکی ترەوە دەبینین ئەم بڕێتییە گشتی نییە و لەهەموو کات و شوێنێکیشدا نابینرێت. ئەوەی لەمیش کەمتر سەرسووڕهێنەر نییە توانێتی رەوشتەکانی ماددەیە. سروشتی توانی مادده لەوەدایە کەهەمان قەوارە تەن رەوشتی تەنۆکەیی و شەپۆلیشی هەیە.

لە سەردەمی پەیدابوونیەوە كارەكتەری كاركردنی دیاردەی كۆمەڵگایان شاردۆتەوە. بۆچی كۆمەڵگابوون پێویستی بەم دەمامك و پەردانە بینی؟ بەرامبەر بەم پێشكەوتنانە بۆچی ژیری بۆ ڕەهەندی سۆزداری و ئەنالیتیكی پارچەبوو؟ ڕۆڵیان چی بوو؟ لەمیانەی ئەو وەڵامانەی دەدرێتەوە، دەتوانین هەروەكو چۆن هەیە كۆمەڵگابوونی خۆمان شرۆڤە بكەین، یان دەتوانین چۆن بمانەوێت بەوجۆرە بیگۆڕین و شرۆڤەی بكەین. مرۆڤ وەك سۆبژە، بوونەوەرێكە شرۆڤە دەكات و بەهای گۆڕینی شتەكانی بۆ ئەو شێوەیە هەیە كە دەیەوێت. توانای شرۆڤەكردن و ئارەزوو (بەواتایەكی تر داخواز، بیركردنەوە و هەستكردن) چەندە لەگەڵ دینامیزمی هەبوون ڕێك بێت، شانسی پێشكەوتنی شێوەی نوێ هێندە بەرزدەبێت. چەندە دوور بێت، لە كۆمەڵگابووندا مەحافەزەكاری یان دواكەوتن ڕوودەدات. ژیری سۆزداری و ئەنالیتیكی لە دەوروبەری ئەم كێشانەدا پێكدێن.

لێرەدا خاڵ بۆ ئەم بەشە دادەنێین كە زیاتر شرۆڤەی فەلسەفی لە خۆوە گرت. زیاتر لە كۆمەڵناسی ئازادیدا هەوڵی باسكردنی دەدەم.

ئەو كۆمەڵگابوونەی بەكلان ناوی دەبەین بێگومان هەبوونێكی جێگیر نییە. پێشخستنی جیاوازی جۆر (لەگەڵ جۆرە بەراییەكانی مرۆڤ)، لە هەمانكاتدا پێشكەوتنی كۆمەڵگای كلانیشە. سەرەكیترین كێشەی، لەسەرپێ مانەوەیە. بەشێوەیەكی گشتیش كێشەی كۆمەڵگایەك (كۆمەڵگای هەزاران جۆر) پێش هەموو شتێك پاراستنی هەبوون و لەسەرپێ وەستانە. پاراستنی هەبوونی خۆیەتی بەرامبەر ئەو هێزانەی خوازیارن لە ڕەوشی كۆمەڵگایان دەربخەن. لەهەمووكاتێك و هەموو شوێنێكدا كۆمەڵگاكان ئامانجی ئەم كێشەیان هەیە. ئەم بەرگرییە هەندێك جار بەشێوەی بەرگرییەكی گەوهەری بەرامبەر هەڕەشە و ڕیسكەكان، پاراستنی هەبوونە. هەندێك جاریش بوونەوەر و ناوەندێكە كە لەباربێت و دەرفەت بە پێشكەوتنی سیمبیۆتیانە و دوولایەنەی هەردوولابدات. لەوشوێن و كاتەدا پێشكەوتنی پۆزێتیڤ خێرادەبێت. كۆمەڵگا یاخود كلانی جۆر لە ڕووی كلتووری ماددی و مەعنەوی دەوڵەمەند دەبێت. ئەگەر

بەشێوەیەکی فراوان لەمیانەی دوالیزمی "من و ئەویتر"ەوە باسی بکەین کە زاراوەی دواقۆناخی کۆمەڵناسی، من بەرامبەر ئەویتر کە بریتییە لە هەڕەشە و ریسک دەکەویتە رەوشی بەرگری گەوهەرییەوە. یان ئەویتر تێکدەشکێنێت، درێژە بەپێشکەوتن دەدات، یان لە رەوشی هاوسەنگیدا دەمێنێتەوە و هەبوونی خۆی دەپارێزێت، بەڵام پێشکەوتن خاو دەبێتەوە، یاخود دووچاری تێکشکان دەبێت و بەگوێرەی ئاستی تێکشکانەکە بەشێکی یاخودی تەواوی هەبوونەکەی لە دەستدەدات. ئەو کاتە بۆخۆی لە رەوشی هەبوون دەردەکەوێت. دەبێتە ئۆبژەی هەبوونێکی دیکە. یاخود دەتوێنرێتەوە، وەک هەبوونێکی دیکە (هەبوونی جاران نییە) درێژە بە بوون دەدات. ئیتر پۆلێنی هەبوونە ناماقوڵ و خراپەکان پێکدێت.

بەشێوەیەکی بەرجەستەتر تێکۆشانی هەبوونی کۆمەڵگا لە ئاستی بوونەوەرە سادەکاندا، لەلایەکەوە بۆ ئەوەی نەبێتە نێچیری ئاژەڵە درندەکان، لەلایەکی دیکەوە بۆ ئەوەی بەرامبەر هەلومەرجەکانی ئاووهەوا، کەمی خۆراک و نەخۆشییەکان خۆی بپارێزێت، بەرامبەر بە هەلومەرجە سروشتییەکان بەردەوام لەناو تێکۆشاندایە. لەکاتێکدا مەترسییەکان هەڕەشە لەبوونی دەکەن، هەلومەرجە لەبارەکان بەشێوەیەکی ئەرێنی پێشیدەخەن. ئەم ئەزموونەی بەشی هەرە زۆری لە ئەفریقیا و نزیکەی ملیۆن ساڵی دواییشی لە ئەوروپا و ئاسیا بەسەربرد، ئەگەر بەشێوەیەکی سنوورداریش بێت ئەڵقە سەرەکییەکانی رۆشن کراوەتەوە. ئەم کۆمەڵگابوونەی لەیەکتر دەچن، هێشتا زمانی قسەکردنی هێمایان پێشنەخستووە، ژمارەیان سەد کەسی تێپەڕنەکردووە. لە دەوروبەری دایک ـ ژن پێکدێت کە تایبەتمەندێتیە جەستەییەکانی بەکاریگەرە، بەڵام زیاتر بەکرداری مۆڵکردن لەپێشە. بەمجۆرە کۆدەبنەوە. پێکهاتەی یەکەمین زمان و پاشگر و پێشگرە مێینەکانیان ئەم راستییە ئەرێ دەکات. پێویستە کارەکتەری دایکانەی کۆمەڵگا پشتگوێ نەخرێت. لەوە زیاتر دایک ـ ژن وەک بەرپرسیار و دەسەڵاتێک ببینرێت، گرنگە بەهۆی ئەزموونی ژیان و بەخێوکردنی منداڵ وەک ناوەندێکی هێزی "ئیداری" ببینرێت. لەکاتی یەکەم نیشتەجێبوونە شێوە "ماڵ"ەکاندا پێگە و سەرنجڕاکێشیەکەی زیاتر

دەبێت.

زاراوەی باوکایەتی پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتییە زۆر دواتر پەیدا دەبێت، تا قۆناخێکی درێژخایەن کۆمەڵگا لەم زاراوەیە بێبەشە. هەرچی دەزگای میراسە دوای ئەوەی سیستەمی موڵکایەتی پێشکەوت گرێدراو بە باوکسالارییەوە سەرهەڵدەدات. مەحسوبییەتی منداڵان و خاڵێتی، زاراوەیەکن زووتر سەریانهەڵداوە. کۆکردنەوەی خۆراک و نێچیروانییەکی سنووردار، شێوەکانی دابینکردنی پێداویستییە ماددییەکانە. ئەندامێتی کڵان گرنگترین گەرەنتی ژیانە. شیمانەیەکی بەهێزە: دەرکردن لە کۆمەڵگای کڵان یاخود بەتەنیا مانەوە بەمردن ئەنجامگیر دەبێت. بینینی کڵان وەک ناوکێکی تۆکمەی کۆمەڵگا لەجێگای خۆیدایە. رەسەنترین شێوەی کۆمەڵگایە.

زۆر جار ئاماژەمان بەو خاڵە کردووە کە دوای قۆناخە درێژخایەنەکانی پێشکەوتن و لەسایەی لەباری هەلومەرجی جوگرافیشەوە هەنگاو بۆ کۆمەڵگای نیولیتیک هاوێشتراوە، سەرچاوەی ئەمەش ئەو زەمینە لەبارەیە کە سیستەمی چیاکانی زاگرۆس ـ تورۆس پێشکەشیان کردبوو. هەروەها ئاماژەمان بەوەش کرد کە دەشێت ئەم قۆناخە وەک لووتکەی کۆمەڵگای دایکانەش هەڵسەنگێنرێت، و دەرفەتی بەرهەمی ـ زیادەشی تێدا رەخساوە. ئەم سیستەمەی زانستە کۆمەڵایەتییەکان زیاتر وەک سیستەمی کۆمۆنەی سەرەتایی، چاخی بەردینی کۆن و نوێ و سیستەمی هۆڤێتی بەناوی دەکەن، بەگوێرەی من ناوبردنی بە کۆمەڵگای ـ دایکانەی کۆمەڵکاری بۆ ئەو قۆناخە یەک بەدوای یەکانە واتادارترە کە جێگای باسن. پرۆسەیەکە نزیکەی لەسەدا نەوەدونۆی کۆی ماوەی ژیانی کۆمەڵگای مرۆڤ پێکدێنێت. پێویستە بچووک نەبینرێت. بەرامبەر بە کۆکردنەوەی زیادە ـ بەرهەم، بەها کلتوورییەکانی دیکە لە ناواخنی (هەناوی) کۆمەڵگای دایکانەی کۆمەڵکاریدا، دەستنیشانکردنی ئەم راستییە هێندە زەحمەت نییە کە پیاوی بەهێز و فێڵباز لە تەنیشتییەوە وەکو ئاوارەیەک دەگەڕا و دەسوڕایەوە و هەندێک جاریش بەهۆی کاروانە سەرکەوتووەکانی راوەوە هێزی بەدەست دەهێنا، کەوتە ناو لێگەڕینەکانی

پێشخستنی یەکەمین بالادەستی بەسەر ئەم سیستەمە کۆمەلایەتیەدا. چەندین نیشانەی مرۆڤناسی و تۆماری شوێنەوارناسی، چاودێری و بەراوردکاری و تێڕوانین ئەگەری ئەم شیمانەیە بەهێز دەکەن.

باسی کۆمەڵگای باوکسالاریمان کرد کە پێکهاتەیەکە بەزۆری لە پیاوە شامان+ تەمەنداره بەئەزموونەکە (شێخ)+ فەرماندە سەربازییەکان پێکهاتووە. لەم پێشکەوتنەدا گەڕان بەدوای شێوەی بەرایی کۆمەڵگایەکی نوێدا راست و گونجاوترە. مەبەستمان لەکۆمەڵگای نوێ: زیادبوونی دۆخی پلەدارییە لە کلاندا. رێخۆشکردنی پلەداری بۆ جیابوونەوەی چینایەتی هەمیشەیی و رێکخستنی شێوازی دەوڵەت ئەم پارچەبوونەی مسۆگەر کرد. ئەو کۆمەڵگایەی ئاشنای چین و دەوڵەت بووە ئاشکرایە کە ناوەڕۆکی گۆڕاوە. دەرخستنی زێدە بەرهەم لەدۆخی بەکارهێنانی وەکو دیاری، بەشێوەی مولکێکی گۆڕینەوە کردنی بەکالا و بابەتی کڕین و فرۆشتن لە بازاڕدا، دینامیکی سەرەکی ئەم گۆڕانکارییەیە. کاتێک سێیانەی بازاڕ ـ شار ـ بازرگانی وەک فاکتەرێکی جێگیر لەناو کۆمەڵگادا دەکەوێتە گەڕ جیاوازی چینایەتی و دەوڵەت بەهێزتر دەبن. لەبەرئەوەی پێشتر باسمانکرد کە لەناو هەلومەرجەکانی کات و شوێندا ئەم پێشکەوتنە چۆن ئاراستەی گرتووە، هەربۆیە دووبارەی ناکەمەوە. وەک پێناسەی جیاواز کۆمەڵناسییە هەمەجۆرەکان هەوڵیانداوە لەمیانەی چەندین زاراوەی لەجۆری کۆمەڵگای چینایەتی، کۆمەڵگای شار، کۆمەڵگای دەوڵەتی، کۆمەڵگای کۆیلەداری، دەرەبەگایەتی و سەرمایەداری بەرامبەرێکی بۆ دابنێن. لەبەرئەوەی سیفەتەکانی چینایەتی، شاری و دەوڵەتی خەسڵەتە جێگیرەکانیتی و وەک قۆناخێک سیفەتەکانی "شارستانی" و "مەدەنییەت"ی دەخرێتە پاڵ، بەبڕوای من بەگوێرەی ناوەڕۆکەکەی ناوبردنی بە"کۆمەڵگای شارستانی"یان کورتکراوەکەی "شارستانی" گونجاوترە.

بەلام دەبێت سەرنج بدرێت کاتێک دەڵێین شارستانی، سەبارەت بە ئاکاری کۆمەڵگا، مەبەستمان شکۆداربوون و پێشکەوتن نییە، بەڵکو کەوتن و و فشار وەک ناوەڕۆکی شارستانی شرۆڤە دەکەین. کۆمەڵگای شارستانی لەچاو نەریت و بەهای کۆمەڵگای دایکایەتی کۆندا، واتە لەچاو

چەمکە ئەخلاقییەکەیدا بەواتای کەوتنێکی مەزن دێت. لە زمانی سۆمەریدا کە کۆنترین زمانی زانراوە، بەشێوەیەکی بەرچاو ئاماژە بەم پەیوەندییە دەکرێت. وشەی ئامارگی هەم بە واتای ئازادی، هەم بە واتای گەڕانەوە بۆ دایک و سروشت دێت. ئەو چۆنیەکییەی لەنێوان ناوەڕۆکی دایک، ئازادی و سروشتدا دانراوە بەکاریگەرە و تێگەیشتنێکی راستە. کۆمەڵگای سۆمەر کە یەکەمین کۆمەڵگایە ئاشنای شارستانی بووە، لە رێگای وشەی ئامارگییەوە تامەزرۆیی و حەسرەتی خۆی بۆ کۆمەڵگای دایکایەتی کۆمەڵکاری نیشاندەدات کە هێشتا زۆر لێیەوە دوور نییە. تێبینی ئەم سەراوژێربوونە کۆمەڵایەتییە لە سۆمەری رەسەن و سەرسووڕهێندا هەم دەرفەتی هەیە، هەم زۆر بەکاریگەر و ئەزموونبەخشە.

رەنگدانەوەی تێکچوونی هاوسەنگی پەیوەندی نێوان ژن - پیاو لەدژی ژندا، بەشێوەی دیالۆگی نێوان ئینانا- ئەنکی رێکخراوە (هەردوو خوداوەندە ژن و خوداوەندە پیاوی دامەزرێنەری ئوروک و ئەریدۆ) و یەکەمین ئەزموونی نووسینی داستانە. داستانێکە بەر لە داستانی گلگامێشە. باسی ململانێ و شەڕی نێوان کۆمەڵگای دایکانەی کۆمەڵکاری و کۆمەڵگای پلەداری باوکسالاری کۆمەڵگای پەڕینەوە بۆ شارستانی دەکات. بەشێوەیەکی روون دەرکی پێدەکرێت کە پرۆسەیەکی ناعادیلانەیە و پڕ لەتێکۆشان دەربازبووە. پێدراوە مێژووییەکان ئەوەمان پیشاندەدەن کە لەیەکەمین قۆناخی کۆمەڵگای سۆمەردا پرۆسەیەکی لەجۆری دیموکراسی سەرەتایی جێگای باس بووە. ئەنجوومەنی ریش سپیان هێشتا بۆ سیستەمێکی پیاوسالاری نەگۆڕاوە. گفتوگۆ زیندووەکان نیشانەیە بۆ هەبوونی جۆرێک لە دیموکراسی. هێشتا زاراوەی لەجۆری فەرمان و فەرموودەی خودا (لە راستیدا پرەنسیپی تاک لایەنی ئەو سیستەمە سەربازی - دەستپۆتە و سەرچاوەکەی بوونێکی بەدەمامک بۆ پیاوی بەهێز و فێڵباز) پێکنەهاتووە. بێگومان شێوازی دیالۆگەکەی داستانی ئینانا زۆر زیندووە، باسی رووداوەکانی ناو کۆمەڵگا، بێ عەدالەتی و ئەو کارەساتانە دەکات کە بەسەر ژن، بەهرەکانی و منداڵەکانیدا هاتووە. ئەگەر بەڵگەیەکی زۆر لە بەردەستدا بوایە، ئەوکاتە وەک ئەگەرێکی بەهێز

دەمانبینی و هەستمان پێدەکرد کە قۆناخێکی پەڕینەوەی دیموکراسی زۆر لەهی ئەسینا. کە دیموکراتی کۆمەڵایەتی بووە - لە پێشتر جێگای باس بووە.

لە رووی تیۆرییەوە دەتوانرێت مەزەندە بکرێت کە پەڕینەوە بۆ کۆمەڵگای شارستانی لە هەمان کاتدا لەگەڵ دەربازبوون بۆ کۆمەڵگای دیموکراتی لەناویەکتردا پێکدێن. گفتوگۆ توندەکانی ناو یەکەمین ئەنجوومەنی پیران (ریش سپیان) یەکەمین رەنگدانەوە و دەنگی پێی کۆمەڵگای دیموکراتییە. لەم قۆناخەی گشت کۆمەڵگاکاندا دەبینە گەواهی دوالیزمێکی هاوشێوە: دوالیزمی کۆمەڵگای دیموکراتی و کۆمەڵگای شارستانی، ئەگەر بەشێوەیەکی دیکەی بەرجەستە بیڵێین کە باشتر دەرکی پێ بکرێت، دوالیزمی دەوڵەت و دیموکراسی. هەر شوێنێک دەوڵەتی لێبێت، کێشەی دیموکراسی هەیە. لەهەر گۆڕەپانێک دیموکراسی تێدا هەبێت مەترسی ئاوابوونی دەوڵەت هەیە. هەروەکو چۆن دیموکراسی شێوەیەکی دەوڵەت نییە، بەکارهێنانی زاراوەی دەوڵەت وەک شێوە دیموکراسییەک، ئەویش چەوتە. پێویستە زۆر بەباشی سەرنجی ناوەڕۆکی پەیوەندی نێوان هەردووکیان بدرێت.

یەکێک لەو دوالیزمانەی بەدرێژایی مێژوو یاری لەسەر کراوە، ئەمەیە. بابەتی ئەوەی سەریهەڵداوە لە ناواخنی کۆمەڵگای کۆنەوە دەوڵەت بووە یان دیموکراسی؟ رێگای لەپێش گفتوگۆ و شێواندنی مەزن کردۆتەوە. بەناویەکداچوونی پرۆسەکە پیشانیدەدات کە پڕ لە پێکدادان، کێشمەکێش و شەڕ تێیەڕبووە. بۆ نموونە لە ئیسلامدا کە باش شارەزاین گفتوگۆ و کێشەکان لە رووی دیموکراسییەت - جمهورییەت و سەڵتەنەتەوە روون و بەکاریگەرە. 'پەیمانی مەدینە'ی حەزرەتی محەمەد هەروەک پەیمانی کۆمەڵایەتی جان جاک رۆسۆیە[1]. لە قورئان و فەرموودەکاندا بەروونی دەبینرێت. بەڵام ئەرستۆکراتی خێلایەتی کە لەتەنیشتیانەوە زۆر

[1]- جان جاک رۆسۆ: بیرمەند و ئەدیبێکی ئەدەبی رۆمانسییە لەنێوان ساڵانی (١٧١٢ - ١٧٧٦) ژیاوە. بەبۆچوونە یۆتۆپییەکانی سەبارەت بە کۆمەڵگا و پەروەردەیەکی تەندروست دەناسرێت. وەک ئەدیبە رۆمانسییەکانی تر ئەمیش سەبارەت بە زیانەکانی مۆدێرنیتە رەخنە و وشیارکردنەوەی زۆری بۆ کۆمەڵگا پێشکەشکردووە، بەڵام لە رووی چارەسەری دانانەوە لاوازماوە. گرنگترین لایەن کە داکۆکی لەسەرکردووە باڵایی مرۆڤی سروشتی بووە بەسەر مرۆڤی مۆدێرنیتەدا و پێی وابووە کە دەبێت کۆمەڵگا لەگەڵ سروشتدا هەماهەنگ بێت. بەناوبانگترین بەرهەمەکانیشی "پەیمانی کۆمەڵایەتی"یە.

بەهێزبوون، بەتایبەتیش سیستەمی پلەداری تیرەی قورەیش بەشێوەیەکی ئاشکرا چاویان لە سەڵتەنەتێکی لەجۆری بێزەنت و ساسانی بوو. هێشتا لەسەردەمی حەزرەتی محەمەددا ئەم کێشمەکێشە لە ئارادا بووە. بێگومان واتایەکی ململانێی نێوان مەککە ـ مەدینە ئەوە بوو کە: سیستەمی نوێ دەبێتە جمهورییەت (بەزمانی عەرەبی واتای دیموکراسی گەلە) یان سەڵتەنەت (سیستەمی مۆنارشی کە لە باوکەوە بۆ کوڕ دەمێنێتەوە). ئەم قۆناخە پڕ لە ناکۆکی و پێکدادانە بە راکردنی حەزرەتی محەمەد لە مەککە ساڵی (٦١٠) دەستی پێکرد و بەشەهیدکردنی حەزرەتی عەلی لە کوفە لەساڵی (٦٦١)دا کۆتایی هات (هەمان پێکدادانی ئەمرۆ دیسان لە کوفە جێگای باسە). پارتەکەی مەعاوییە کە لایەنگری سەڵتەنەت بوو لەم پێکدادانە پەنجا ساڵییەدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا. لەو سەردەمەدا سیستەمی پلەداری خێڵایەتی کە زۆر بەهێزە شانس و دەرفەت بەکۆمار، واتە دەرفەت بە دیموکراسییەکی سەرەتایی نادات. کاتێک لەم لایەنەوە ـلام بخرێتە ژێر لێکۆلینەوەو لێتوێژینەوەیەکی کۆمەڵناسییانەی ـتەقینە ئەنجامی بەکاریگەر و سەیری لێدەکەوێتەوە.

کاتێک ئیمپراتۆرییەتی پارسی ئێران ئاوا دەکرێت مێژوو نموونەیەکی کەی بەکاریگەری پێشکەشکردووە. دوای گفتوگۆ و شەڕێکی ـێژخایەن کۆنفیدراسیۆنی میدیایان بۆ ئیمپراتۆرییەت گۆڕی. بنەماڵەی خامەنشینی رۆڵێکی دیاریکەری لەمەدا بینیوە. چەندین بەڵگە هەن یشانماندەدەن کە لە ساڵانی نێوان ٥٦٠ـ٥٧٠پ.ز لەژێر رێبەرایەتی راهیبە میدییەکاندا قۆناخێکی زۆر دژوار جێگای باس بووە. کامبیزی ساختە نموونەی هەرە بەکاریگەرە. کەچی پێکهاتەی کۆنفیدراسیۆنی پێشووتری میدییەکان نموونەیەکی سەرەتایی دیموکراسی بوو. مێژووی هێرۆدۆت سە ـرەت بەم بابەتە باسی سەیرمان پێشکەشدەکات.

دیموکراسی ئەسیناش نموونەیەکی دیکەیە کە باش دەناسرێت. ئەو شەڕەی لەگەڵ پادشایەتی سپارتا و ئیمپراتۆرییەتی پارس و مەکەدۆنییەکان کردوویەتی، بە واتایەکی دیکە شەڕێکە بۆ یەکلاییکردنەوەی دیموکراسی، ئیمپراتۆرییەت یان پادشایەتی. هەرچەندە سەرەتایی و لەسەر بنەمای

چینایەتی بێت، بەڵام بەردەوام گفتوگۆی کۆمەڵگای دیموکراتی یان کۆمەڵگای شارستانی هەر لەئارادابووە. لە رۆما لە ئاکامی پێکدادانی نێوان کۆمار و ئیمپراتۆریەت، بەناوبانگترین کەسایەتییەکان لەسەرووی هەمووشیانەوە قەیسەر رووبەڕووی کوشتن بۆوە، ئەمەش پیشانی دەدات کە دوالیزمێکی پڕ لە شەڕ و توندوتیژی جێگای باسە. دەشێت ئەم نموونانە زیاتریش بکرێن. تەنانەت بۆ ئەوەی سەرنجمان سەبارەت بە بابەتەکە زیاد بێت و هێزی تێگەیشتنمان بەرەو پێشەوە ببەین دەتوانین شۆڕشە گەورەکانی فەرەنسا و روسیاش لەم چوارچێوەیەدا پێناسە بکەین.

شۆڕشی فەرەنسا (١٧٨٩) بەرامبەر بە مۆنارشی موتڵەق هەڵگیرسا. بە کۆمار ئەنجامگیر بوو (دیموکراسی کۆمەڵایەتی رادیکال). بەقۆناخێکی زۆر دژواردا تێپەڕی، واتە بە قۆناخی تیرۆری شۆڕشگێڕیدا تێپەڕی. دوای بەڕێوەبەرایەتی سیانی بە ئیمپراتۆرییەتی ناپلیۆن بەردەوام بوو. دوای چەندین قۆناخی پەڕینەوە، تا رۆژگاری ئەمڕۆمان پێنج جار راگەیاندنی کۆماری بەخۆیەوە بینی. شەشەمیان گفتوگۆی لەبارەوە دەکرێت.

لە شۆڕشی مەزنی روسیا (١٩١٧)دا پەردە بە دیموکراسییەکی رادیکاڵانەتر کرایەوە (قۆناخی سۆڤێت و شوراکان). لەشەڕی ناوخۆدا ئاشنای دیکتاتۆریەتی شۆڕشگێڕی بوو. لەسەردەمی ستالیندا دیکتاتۆرییەت جێگیر بوو. لە ساڵی١٩٨٩ لە دووسەدەمین ساڵوەگەڕی شۆڕشی فەرەنسادا دووبارە بۆ دیموکراسی گەڕایەوە. هێشتا دەخوازێت دیموکراسییەکەی بەرەو پێشەوە ببات. لەسەردەمی مۆدێرنیزمی سەرمایەداریشدا تەنانەت ساڵانە بەسەدان نموونەی لەمجۆرە جێگای باسە.

بە ئامانجی روونکردنەوەی گۆڕەپان و ناوەندی گرژی و پێکدادان و ناکۆکی نێوان گلۆلەی ئەم دوو پەیوەندییە، واتە نێوان ناوەندەکانی شارستانی و دیموکراسی ئەم هەموو نموونانەمان هێنایەوە.

خاڵێکی هەرە گرنگی پێویستە سەرنجی بدرێتێ، هەردوو کۆمەڵگای نوێش هەوڵدەدەن هەبوونی خۆیان لەسەر کۆمەڵگای کۆمەڵکاری فەراهەم

بکەن. هەروەکو پێناسەمان کرد، کۆمەڵگای کۆمینالْ (کۆمەڵکاری) تاکو ئێستاش بەردەوامە، ئەگەر بەشێوەی پاشماوەش بێت لەتەواوی شانەکانی کۆمەڵگاکاندا درێژە بەهەبوونی خۆی دەدات، کۆمەڵگای "خانەی دایکە" کە پێویستە هیچ گومانێک لەوەدا نەبێت کە تا جۆری مرۆڤ هەبێت هەمیشە بەردەوام دەبێت. هەروەکو چۆن خانە بنەڕەتییەکان لە شانە جیاوازەکانی جەستەدا بونیاد بەخێو دەکات، کاتێک پێویست بێت ڕۆڵی سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی دەبینێت، کۆمەڵگای کۆمەڵکاری دایکانەش لەتەواوی کۆمەڵگا دوالیزمەکاندا بەشێوازێکی هاوشێوە درێژە بەهەبوونی خۆی دەدات. بەردەوام جەختکردنەوەم لەسەر ئەوەی هەرچەندە لەگەڵ ئەو کۆمەڵگا دیموکراتی و شارستانییەی لە بونیادی خۆیدا بەرهەمی هێناون، لەناو پێکدادان و گرژی، هەندێک جاریش لەناو ڕێککەوتندابێت، بەڵام کۆمەڵگای کۆمینالْ لەناو ناچێت، هۆکار و ئەنجامی گرنگی خۆی هەیە. کاتێک شوێنی هات باسیان دەکەم.

کاتێک هەرباسی پێکدادانی نێوان کۆمەڵگای دیموکراتی و کۆمەڵگای شارستانی دەکەم، ئەگەری ڕێککەوتن بەلاوە نانێم. بەپێچەوانەوە، ڕێککەوتن لەنێوان ئەم دوو کۆمەڵگایەدا مەرجە. ڕاستتر بڵێین دەبوایە سەرەکی بێت. هۆکارە سەرەکییەکەی، وەک ئەنجامی چەمکی جەمسەرەکان کە لووتکەکان یەکتری لەناونابەن، کۆمەڵگای دیموکراتی و کۆمەڵگای شارستانی بەبێ یەکتر ناتوانن بژین. هەبوونی یەکێکیان، بەهەبوونی ئەویدیکەوە بەندە. هەروەکو جەختم لەسەر کردەوە، دیموکراسی و شارستانی هەردووکیان پەیدابوونیان بۆ هەمان کۆمەڵگای کۆمەڵکاری دایک دەگەڕێتەوە. لەکاتێکدا دیموکراسی فرەڕەنگی و زۆرینەی ژێر بۆخۆی بە بنەمادەگرێت کە دووچاری چەوسانەوە، فشار و خیانەتی چینی ژوور و پلە ـی هاتوون، هەرچی شارستانییە ئەو توێژە بە بنەمادەگرێت کە چەوساندنەوە، فشاربردن و هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی چینی سەردەست بەڕێوە دەبات. هەڵبەتە ئەم توێژانە بەشێوەیەک لەیەکتری و کۆمەڵگای کۆمەڵکاری دایک دانابڕین وەک بڵێی بەچەقۆ لێکرابنەوە. ناوەندێکی تێکەڵ بەیەکترن، بەڵام جیاوازییەکانیشیان زۆر بووە.

لەم حاڵەدا بەشێوەیەکی سەرتاسەری پێویستی هەیە چەمکی "زاراوەی کۆمەڵگا" چاوێکی پێدا بخشێنرێتەوە. تەنانەت بەجۆرێک کە بەردەوام بەبیرمان بێتەوە و دەرکی پێ بکەین. پێویستە کۆمەڵگاکان بەشێوەی تاک لایەنی نا، بەڵکو وەک گشتگیری یەکپارچەیی بەهەزاران تاکەلایەن دەرکی پێبکرێت کە لەناو هەزارو یەک چەشن پەیوەندی و تاکی وەک کائیوس، گرژی، پێکدادان و هاوکاریدا بەشێوەی: جیاوازی چینایەتی، لەناو هەر چینێکیشدا بەهەزاران گروپی ژێرن، بە ملیۆنان بنەماڵە، جۆرەها جڤاتی بەچین نەبوو یاخود بەرخودانکار بەرامبەر بە چینایەتی جیهانگیربووەکان و بە ئەندازەی ئەوانیش یەکینەی لۆکاڵ، ئایینی، زمانی، سیاسی، ئابووری، خێڵایەتی، نەتەوەیی و نێونەتەوەییەکاندا بە ناویەکتردا چووە. لەناو ئەم شپرزەییە گەورەیەدا بەوڕادەیەی دیموکراسی و دەوڵەت یەکتری هاوسەنگ بکەن، سیستەمێکی کۆمەڵایەتی نزیک بە ئاشتی سەقامگیر دەبێت. دۆخی ئاشتی تەواو پێویستی بەدۆخی بێدەوڵەتی هەیە. ئەویش هەرچەندە لەبواری تیۆری بیری لێبکرێتەوە، بەڵام لەبواری کرداری هێشتا زۆر دوورین لێیەوە.

تەنیا ژیانێکی دیموکراتیانەی درێژخایەن کە تەواوی کۆمەڵگا تەنانەت کۆمەڵگای دەوڵەتیش لەخۆوە بگرێت دەشێت بەرەو ئاشتی تەواومان ببات. لە ساتە مێژووییە هەییەکاندا ئاشتی بەشێوەی ئاگربەستی پشت ئەستوور بەهاوسەنگی هێزە ناوبراوەکان (هێزەکانی دیموکراسی و دەوڵەت) بۆتە جێگای باس. ئەگەر دیموکراسی بخوازێت بەتەواوی دەوڵەت قووتبدات، لەو ساتە مێژووییەدا خەسڵەتەکانی کائیوس زیاتر دەبن. ئەو ئەزموونەی لەچەندین وڵاتدا بەڕێوە چووە ئەمە پیشاندەدات. ئەگەر دەوڵەتیش نابەردەوامی دیموکراسی بسەپێنێت، سیستەمە سەرەڕۆ و دیکتاتۆرییەکان سەرهەڵدەدەن، لە ساتی مێژوویی وەهاشدا ئەنجام هەر کائیوسە. ئەو شارستانییەی بە قۆناخی مێژووییش بەناو دەکرێت نزیکەی پێنج هەزار ساڵە بەردەوامە. دیموکراسی بەشێوەیەکی سنووردارتر شانسی ژیانی بەدەست هێناوە. بەڵام مرۆڤایەتی و زۆرینەی کۆمەڵگا بەردەوام چاوەڕوانی دیموکراسی بوون. هەر لەم پێناوەشدا

تێکۆشانیان کردووە. لەوانەیە هەزاران ساڵی تریش بەسەردا تێپەڕێت، بەهەمان شێوەش نەبێت، وەک جۆرێک لە دەوڵەت و دیموکراسی لەناو یەکتردا درێژە بە ژیان بدەن.

بە ئەندازەی لەیەکتر جیاکردنەوەی دەوڵەت و دیموکراسی، کێشەکە دەستنیشانکردنی ئەو بەیەکەوە بوونەیە کە بەرهەمدارە یان بەلاتی کەم نکۆڵی لەیەکتری ناکەن و لەمیانەی ڕێسا سیستەماتیکەکانەوە دیاری دەکرێت. لەوانەیە پێویست بە نووسینی جۆرێکی نوێی دەستوور بکات. بەناویەکداچوونی ئێستای دەوڵەت و دیموکراسی کە لە ئارادایە، تەواو هەڵخەڵەتاندنێکە. بەکەڵکی داپۆشینی عەیبی یەکتری دێت، وەک نموونەی گەڵای مێوە کە شوێنە عەیبدارەکانی جەستەی رووت دادەپۆشێت. تا ئەم رەوشە بەلاوە نەنرێت، تەنانەت گفتوگۆیەکی کۆک و هاوسەنگیش سەبارەت بە دەوڵەت و دیموکراسی ناکرێت. شۆڕشی فەرەنسا و روسیا کە دوو شۆڕشی هەرە مۆدێرنن لەجیاتی ئەوەی سەبارەت بەم بابەتە پێشکەوتن و روون بوون لەگەڵ خۆیاندا بێنن، ئاڵۆزی و شپرزەییان زیاتر کردووە. پێویستییەکی زۆر بەوە هەیە کە تیۆری سیاسی شێوەو ناوەڕۆکی ئەو دەوڵەتەی بەلانی کەم بۆ دیموکراسی کراوەیە (خۆی ناخاتە جێی دیموکراسی و دیموکراسی قەدەخە ناکات) لەگەڵ ئەو دیموکراسییە دەست نیشان بکات کە نکۆڵی لە دەوڵەت ناکات (دیموکراسییەک کە هەر زوو خۆی ناکات بەدەوڵەت و بەردەوام دەوڵەت بەو ئاستەنگە نازانێت کە دەبێت بڕووخێنرێت). بەڕاستی پێویستی بەتیۆری هەیە. بەڵام تیۆرییەک کە وەڵامی دۆخی ئاڵۆزی و شپرزەیی ناو زەمینەی کرداری بداتەوە. لەو بڕوایەدام هەم دەرفەت هەیە هەم پێویستییەکی زۆر بەو شێوانەی دەوڵەت و دیموکراسی هەیە کە زیاتر لەناو ئارامیدان و یەکتری بەرهەمدارتر دەکەن، پێم وایە دەبێت بەهێزترین ئەگەری سیاسی پێویستیش لەسەر ئەم بنەمایە پێشبخرێت. ئەو دەوڵەتەی لە ئارادایە لە گەوهەردا دان بەدیموکراسیدا نانێت. پێکهاتەیەکی زۆر قەبە و زەبەلاحی هەیە. هەرچی دیموکراسییەکانیشە، هەریەکەیان کاریکاتێری دەوڵەتێکن، نادروست و بێ ڕۆڵن. هیچ گومانێکی تێدا نییە کە دەبێت ئەمە

سەرەکیترین مەسەلەی فەلسەفەی سیاسی و پراکتیکەکانی بێت.

دیسان دووبارەی دەکەمەوە، ئەم بابەتانەی چەندین لایەنی تازە لە خۆوە دەگرێت لە پەرتووکی کۆمەڵناسی ئازادیدا بەفراوانی گفتوگۆی دەکەم.

ئاگادارم کە جیا لە پارادیگمای سۆسیالیستی و لیبراڵی باو، پارادیگمایەکی جیاواز و چوارچێوەی گشتی تیۆرییەکەم پێشکەشکردووە. زیاتر هەوڵی پڕکردنەوەی ناوەڕۆکەکەی دەدەم. ئەم چوارچێوە کورتەم بۆ ئەوە دەست نیشانکرد کە وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە: سەرمایەداری وەک "شێوەی کۆمەڵگا" چۆن و لەکوێ دابنێین. ئاشکرایە هەروەکو چۆن سەرمایەداری وەک شێوەیەکی ئابووری نابینم، وەک شێوەیەکی کۆمەڵگاشی نابینم.

باپێش هەمووشتێک هەوڵبدەین ئەو پەیوەندییەی بە ئابووری سەرمایەداری بەناو دەکرێت لەناو یەکپارچەیی کۆمەڵگای شارستانیدا ببینین. دەبێت باش تێبگەین و هەرسی بکەین کە ئابووری سەرمایەداری پشت بە قازانجی پاوانخوازییەک دەبەستێت کە بە ئابووری ئاڵوگۆڕکردنیش ناو دەبرێت و لەسەر پەیوەندی کاڵا بە بازاڕ و کێبڕکێیەکەی هەڵنیشتووە، بەشێوەیەکی سەرەکیش یاری بە نرخەکان دەکات و سوود لە جیاوازی نێوان نرخی ناوچەکان دەبینێت. وەک پێویستییەکی ئەم پێناسەیە دەبێت باش تێبگەین کەرتێک نییە بەهای گۆڕینەوە بخولقێنێت. بەشێکی زۆر کەمی ژیانی ئابووری دەگرێتەوە. بەڵام بەهۆی پێگە ستراتیژییەکەیەوە ئەو بەشە کەمەیە کە رۆڵی دیاریکەر دەبینێت. کۆی بەهای ئەو ئاڵوگۆڕەیە کە لە دەستی کەسانێکی کەمدا بەشێوەیەکی زۆر گەورە کەڵەکە بووە. لەم سۆنگەیەوە یاریکردن بەخواست و خستنەڕوو باڵابوونێکی هەیە. نابێت لەبیری بکەین، ئەم باڵابوونە تا رۆژی ئەمرۆمان تەنانەت لە دەوڵەتەکانیشدا نییە. ئەوەی سەیرە، لە دایکبوونی ئەم باڵابوونە و شێوازی بەکارهێنانێتی. کەم زۆر لە پەیدابوونەکەی تێدەگەین. هەرچی شێوازی بەکارهێنانەکەیەتی لەبەرئەوەی بەردەوام پشت بە گەورەبوونی سەرمایە دەبەستێت، زۆر سەیرترە و کۆمەڵگا سەراوبن دەکات. ناوبردنی

بەشۆڕشگێڕ، خیانەتکردنە لە کۆمەڵگا. بەتایبەتیش لە کۆمەڵگای مێژوویی دیموکراتی.

کەی زانستی ئابووری ـ سیاسی دان بەو راستییە دادەنێت کە خۆ گەورەکردنی سەرمایە (یاسای بەناوبانگی قازانج، کە ئابووریناسە سیاسی و سوپەرمانەکانی ئابووری وەک یاسا سوود لە پیرۆزی ناوەکەی دەبینن) و بەکارهێنانی زراڤترین تالانی دەمامکدارە؟ بۆچی پیاوی فێڵباز و بەهێز بەسەرمایەدار ناونابەم؟ چونکە دەستبەسەرداگرتنەکەی بە پاڵپشتی شەڕ و هێزی ئاشکرایە. هەڵبەتە لەبیری ناکەین کە شەڕ بەواتای تەڵەزگە نانەوە دێت. پێویستی بە پەنابردنە بەر حقوق، چیرۆکی ئایینی و دەمامک نییە. بەلام لەم خاڵەدا پێویستە هەقی ئابووری سەرمایەداری بدرێت: پەیوەندی دەوڵەت ـ ئابووری قۆناخی پێشخۆی پشتی بە دەستبەسەرداگرتنی زۆرەملێیانە دەبەست. نەریت و حقوقی باوی پلەداری بەپێی ئەو ئایینەی کە مەنسوبێتی لە رێگای رێسای 'موڵکی کافر حەلاڵە' دەستبەسەرداگرتن و غەنیمەتی وەک مافێک دەستنیشان کردبوو. واتە ئیتر پیاوی بەهێز و فێڵباز خۆی دەبوو بە دەوڵەت. لەم خاڵەدا ئابووری سەرمایەداری لە دەوڵەتی کلاسیکی جیا دەبێتەوە. ناڵێم دەبێت بەدژەکەی. لەبەرئەوەی ئاستی پێشکەوتنی کۆمەڵگای شارستانی تالانێکی لەجۆری غەنیمەت بەپێت دانانێت ئیتر رۆژی ئەم کەرتە هەڵدێت. بێگومان دەرکەوتنی لەقۆناخێکدا کە بەئاشکرا ئیتر دەوڵەتی کۆیلەداری و دەرەبەگایەتی بێبەرهەم بوون (کاتێک ئەو تالان و دەست بەسەردا گرتنە ئاشکرایەی بەغەنیمەت ناو دەبرێت چیتر دەگاتە ئاستێک کە خانەکانی کۆمەڵگا وشک دەکاتەوە و بەرهەمی زیادەی لێناکەوێتەوە) زۆرچاک ئەم جیاوازییەی دەخاتەڕوو. شانسی ئەتیکێتی سیستەمێکی نوێی ئابووری بۆخۆی دەخولقێنێت.

پاوانکاری دەوڵەتی کۆیلەداری لەچاخەکانی یەکەمیندا زۆر بەپیت و بەرهەمدارە. کاتێک تەماشای ئەهرامی گۆڕستانی فیرعەون و پاشماوەی شارەکانی گریک ـ رۆما بکەین بەرچاومان دەکەوێت. کەرتی سەرمایەداری لەم قۆناخەشدا هەیە، بەلام زۆر سنووردارە. بەپێی پاوانی دەوڵەت،

شانس بەپێشکەوتنی ئەم کەرتە نادات یاخود زۆرکەم دەرفەتی پێدەدات. هەروەکو دەزانین کاتێک سیستەمی کاری کۆیلەداری بێبەرهەم دەبێت، سیستەمی کاری دەرەبەگایەتی بڵاودەبێتەوە. شیکارکردنی هۆکاری بێبەرهەمبوونی شارستانی کۆیلەداری بابەتی باسەکەمان نییە. تەنیا ئاماژە بەوە دەکەم: ئەو چەمکەی ژیان و کارکردن زۆر درێژخایەن بوو (٤٠٠٠پ.ز ٥٠٠ز)، بەهۆی بڵاوبوونەوەی لە گۆڕەپانێکی بەرفراواندا کاتێک پێکهاتە پڕ خەرجییەکەی وشکبوونی سنوورەکانی بۆ بەدەستهێنانی ناوچە و مرۆڤی زیاتر لە ڕێگای کۆیلایەتی و توندوتیژییەوە لێکەوتەوە، لەناوەوە و دەرەوە لەمیانەی هەزاران یاخیبوون و بەرخودانی ئازادیخواز و دیموکراسیخوازەوە بەلاوەنراوە.

کۆمەڵگای شارستانی بونیادنراو کە زیاتر لەرێگای رۆژهەڵاتی ناوینی موسڵمان و ئەوروپای کرستیانەوە نوێنەرایەتی دەکرا، بە بەراورد لەگەڵ گریک ـ ڕۆمای پێش خۆی کە میراسی ئەوی وەرگرتبوو، هەروەها لەچاو شارستانی سۆمەر و میسر کە بناخەی ئاواکردنی ئەوانەی دوای خۆی بوو، پشتی بە شێوازێکی جیاوازی چەوسانەوە و مەشروعییەت بەست. لەکاتێکدا هەردوو ئایین مەشروعیەتێکی بەهێزیان پێشکەش دەکرد، لە ڕێگای ئەو سەپانە لادێییەی بە بەراورد لەگەڵ کۆیلەدا کەمێک موڵکی خۆی بوو کۆمەڵگای شارستانی توانی لە نوێکردنەوەی خۆیدا سەرکەوتووبێت. بێگومان ماوەی سێ سەد ساڵی ئایینی کرستیانی کە ویژدانی هەژاران بوو، لەگەڵ تێکۆشانی ئازادی و یەکسانی ئیسلام کە لەژێر پەردەی مەزهەبی جیاوازدا بەردەوام بوو، واتە هەوڵ و لێکەڕینەکانی کۆمەڵگای دیموکراتی، ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینێت لە خۆ نوێکردنەوەی شارستانی و گەیشتنی بە دۆخێک کە گواستنەوەی ئاسان بێت. بەپێچەوانەی بانگەشەی ئایدیۆلۆگەکانی شارستانییەوە، سەرچاوەکەی شکۆداری و پێشکەوتنی شەرەفمەندانەی شارستانی نییە. ئەگەر هەندێک دەستکەوتیشی هەبێت، بەهۆی پاشماوەکانی کۆمەڵگای کۆنی کۆمەڵکاری، هەزاران ڕاکردن و یاخیبوون و بەرخودانی خێڵ و قەوم و هەژاران و کۆیلەکانەوە پێی گەیشتووە.

خۆنوێکردنەوەی فشار و چەوسانەوەی کۆمەڵگای شارستانی لە ڕێگای ئامرازی نوێی مەشروعییەتەوە، نوێکردنەوەی ئامرازە سەرەکییەکانیشی فەراهەمکرد کە لە چین، شار و دەوڵەت پێکهاتووە. لەزەمینەی نوێی پەیوەندییەکانی سەپان ـ ئاغا، شار ـ بازاڕ، دەوڵەت ـ بەندەدا پێشکەوتنی ئەندامەکانی سەرمایەداری ئاسان بوو. ئەو شارانەی لە چینەوە تا دەگاتە زەریای ئەتڵەسی لەدەوری بازاڕ پێشکەوتن، خێرابوونی بەرهەمهێنانی کاڵا و قووڵی و بەرفروانی گۆڕانکاری لەگەڵ خۆیدا هێنا. جیاوازی نرخی نێوان بازاڕەکان قازانجی بازرگانی بە ئاستێک گەیاند کە تا ئەو کاتە نەبینرابوو. بۆ یەکەمین جار شارەکان بەرامبەر بە ناوچە لادێییەکان هاوسەنگیان بەدەست هێنا. شارستانی ئیسلام بەجۆرێک لەجۆرەکان شارستانی بازرگانی نێوان رۆژهەڵاتی دوور و ئەورووپا بوو. هەرچییەک لە رووی بازرگانی پێویست بێت، پێشکەشی ئەورووپای کرد. هەم لە رووی کلتووری ماددی، هەم کلتووری مەعنەوییەوە. ئامرازە سەرەکییەکانی دیکەی شارستانی بێگومان هەر لەچاخە کۆنەکانەوە پێشکەشکرابوون. گواستنەوەی شار ـ چین و دەوڵەت بۆئەوێ بە ئیسلام کۆتایی دێت. بێگومان عەرەب و یەهودییەکان رۆڵێکی سەرەکییان لەمەدا بینی. ئەو کارەی گریک ـ رۆماییەکان لە چاخی کلاسیکدا بەنیوەچڵی جێیان هێشتبوو زانا، پیشەکار و بازرگانە عەرەب و یەهودییەکان تەواویان کرد.

تاکە کەموکوڕی گرنگ و لەپێشی شارستانی رۆژهەڵاتی ناوین ئەوەبوو: کەرتی سەرمایەداری شارەکانی تێپەڕنەکرد و نەیتوانی لە ئاستی جوگرافیای وڵاتێکدا رۆڵی پێشەنگایەتی ببینێت. ئەو هەنگاوەی ئەمستردام و لەندەن سەرکەوتنیان تێدا بەدەست هێنا، ئەو نەیتوانی سەرکەوتووبێت. دەسەڵاتی سەرەڕۆ و ناوەندی رۆڵی سەرەکی لەم دۆخەدا بینی کە لە رژێمە موتڵەقگەراییەکانی ئەورووپا زۆر توندڕەوتربوون. پێکهاتەی سیاسی چین و هیندستانیش لە سەڵتەنەتەکانی رۆژهەڵاتی ناوین زیاتر ناوەندیبوون و خاوەن باڵادەستییەکی ناهاوسەنگ بوون. ژاپۆن بەشێوەیەکی رێژەیی لەناو پێکهاتەی سیاسی دەرەبەگایەتی شێوازی ئەورووپادا مایەوە.

کاتێک گەیشتینە سەدەی شازدەهەم، شارستانییە کۆنەکانی ئاسیا توانای هەڵمەتی نوێیان نەمابوو. هێرشەکانی جەنگیزخان و تەیموری لەنگ لەبەخشینی خوێنی تازە بە لێشاو و کۆچی تیرە تورکەکانی پێشووتر، لە درێژکردنەوەی تەمەنیان بەولاوە رۆڵێکی دیکەی نەبووە. هەرچییەکی ببوایە، لە ئەورووپا روویدەدا کە لەوپەڕی رۆژئاوای ئاسیادا وەک نیمچە دوورگەیەک مابۆوە. ئەوێ دەبووە تاقیگە نوێکەی شارستانی.

کاتێک بازرگانی و کەرتی سەرمایەداری لەگەڵ شارستانی بۆ ئەورووپا گواسترانەوە، لە خاکێکی دەست لێنەدراودا تازەبەتازە شار ئاوا دەکران و دەرەبەگایەتی ناشارەزا و نەوجەوانی ئەورووپا پێدەگەیشت. تەنانەت بە شارستانیش بەناو نەدەکران. ئەوەی لە کۆتاییەکانی سەدەی دەیەمدا ئایینی کرستیانی سەرکەوتنی تێدا بەدەست هێنا موتربەکردنی موراڵی مەعنەوی بوو. ئەگەر شارستانییەکی دێرین لەسەر شێوازی رۆژهەڵاتی ناوین لە ئەورووپا ئاوابیوایە، شانسی پێشکەوتنی شارستانی سەرمایەداری تا دوارادە دەبووە جێگای گفتوگۆ. شارستانییە نوێکان لە خاکی دەست لێنەدراودا پێکدێن. سەبارەت بە شارستانییەکان رەچاوکردنی ئەم لایەنەش ئەزموونبەخشە. کاتێک سەیری هەوێنکردنی شارستانی ئەورووپا بکەین، هەست بەبۆشاییەکی سەیر دەکەین. ئاستەمییەکانی بەردەوامبوونی کۆن و ناشارەزایی نوێکە (دەرەبەگایەتی)، شانسی دەرکەوتنی سێیەم لەنێوان هەردووکیاندا دەڕەخسێنێت. بۆ نموونە ئەگەر لقێکی هێرشی عەرەبەکان لە رێگای ئیسپانیاوە، عوسمانییەکان لە رێگای بەلقانەوە، قەومەکان لەباشووری سیبریاوە، هەرە دواییش لێشاوی مەغۆلەکان، لە ئەورووپا ئیمپراتۆریەتێکی شێوازی کۆنیان ئاوابکردایە، ئایا مێژوو چۆن ئاراستەی دەگرت؟ کەواتە شانسیش بۆ ئەورووپا فاکتەرێکی گرنگە.

تەواوی ئەم قەبلاندن و گریمانانەی سەبارەت بە شارستانی پێشی دەخەین گشتی بە ئامانجی روونکردنەوەی سەرهەڵدانی کەرتی سەرمایەداری و کارەکتەرە هەژموونگەراییەکەیەتی. لێرەدا دەبینین ئەڵقەیەکی ناچاری پێشکەوتنی شارستانی نییە. گرووپێکی قەبڵێنەری (دەلاڵی) بازرگانە مەزنەکان کە لەمیانەی کۆی کاریگەرییەکانی هەزار و

یەک ریکەوتەوە، لەناو درزی شارستانییە کۆن و ناوچە مارژینالەکانیدا، لەبەشی خۆی زیاتر ئەو دەستکەوتانەی وەرگرتووە کە لە ریگای یاریکردنەکانی بەپارەوە لەسەر بازاڕ و لەدژی بازاڕ و ریگا دوورەکانی بازرگانی و تالانی کۆلۆنیەکانەوە کۆکراوەتەوە، لە ریگای دوو شاری بێ بانگەشەی ئەورووپاوە، دەرفەتی بۆ رەخساوە کە هەیمەنەی خۆی سەرەتا لەسەر ئەورووپا دواتر بەسەر تەواوی جیهاندا زاڵ بکات، بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر ئەم دەرفەتەی بەکارهێناوە.

تەواوی لێکۆڵینەوەکان پیشانیدەدەن ئەم گروپە قەبلێنەرە تا دواڕادە مەحافەزەکارن ، هیچ هزرو داهێنانێکی خوڵقێنەرانەیان نییە. ئەوکارەی تێیدا کارامەن قازانجکردنی پارەیە بەپارە. هەروەها قازانجکردنی پارە لە ریگای داهاتی شەڕ و گرانییەوە، قازانجکردنی پارەی زیاتر لەمیانەی جیاوازی نرخەکانی جیهانەوە بەگشتی، تاکە گۆڕەپانی کۆمەڵایەتییە کە تێیدا بەهرەدارن. خەسڵەتێکی سەیری ئەورووپای سەرەتاکانی سەدەی شازدەهەم ئەوەیە پارە بەو هێزە گەیشتبوو حوکمڕانی هەمووشتێک بکات. بەڕێوەبەر و فەرماندەی راستەقینە پارەبوو. پارە لای کێ بوایە، هێز بەدەست ئەوەوە بوو. بێگومان کاڵا، بازاڕ و شار فاکتەری سەرەکی ئەم رەوشەبوون.

هیچ هێز و دەسەڵاتێکی کۆنی ئاسیا، سوڵتان و ئیمپراتۆرێک، تەنانەت هیچ ئیمپراتۆریەتێکی رۆما گرفتێکی بەمجۆرەیان نەبوو کە بەرهەمەکان (کاڵاکان) بکەن بە پارە، لە ریگای پارەشەوە دەسەڵات بەڕێوەببەن. هەشبووبێت زۆر سنووردارە. ئەگەر لەدونیادا گەنجینەش هەبن، لەمێژە بۆ کۆشکەکانیان گواستراوەتەوە. لەکاتێکدا کەرتی سەرمایەداری یەک لەسەریەک سەرکەوتنی بەدەست دەهێنا، پادشاکانی ئەورووپا سواڵیان دەکرد. قۆناخێکی جیاوازی هێزی پارە ـ دەسەڵات جێگای باس بوو. بۆ یەکەمین جار دەسەڵاتی سیاسی لەبەرامبەر پارەدا چۆکی دادەدا. ئەم راستینە بەڵگەی سەلمێنەری ئەو دۆخەیە: پارە هێندە بەهێزبووە دەتوانێت هێزی فەرمانداریتی وەربگرێت. کاتێک ناپلیۆن سەبارەت بە بابەتی سوپا گوتوویەتی: "پارە، پارە، پارە" ئاماژەی بەم راستییە کردووە.

لەمێژووی شارستانی جیهاندا (نەک مێژووی دونیای دژ بە شارستانی!) کاتێک پارە بووە فاکتەرێکی قورسی بناخەی نوژەنی، لەشارستانیدا رێگا لەپێش نوێبوونەوەیەک دەکاتەوە. بەڵام لەناوەڕۆکە بنچینەییەکەیدا رێگا لەپێش هیچ گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی ناکاتەوە. خۆی لەخۆیدا شارستانی تازە ئاشنای پارە، بازاڕ، شار، بازرگانی، بانک و دەستاوێز نەدەبوو، هەمووی ئامرازێکبوون کە هەزاران ساڵ پێشتر دۆزرابوونەوە.

سەرە دێرێکی دیکەی گرنگ کەرتی سەرمایەداری لە سەرەتادا پەیوەندی بە بەرهەمهێنانەوە نییە. تەنانەت پەیوەندی بە بازرگانی بچووکیشەوە نییە. لە پەیوەندییە سەرەکییەکانی ئابووریدا هیچ دۆزینەوە یان نوێگەرییەکی نییە. هێزی خوڵقێنەری کالا و گۆڕینەوەش نییە. هەزاران ساڵە کالا و گۆڕینەوە بەردەوامە. ئەگەر هەر باسی بەهرەیەکی بکەین، زۆر چاک هێزی پارەی دەستنیشانکردووە، بەکاریدێنێت و دەیکات بە سەرمایە، بەشێوەیەکی کارامە پیشەی بە پارە قازانجکردنی پارە دەزانێت. شارەزاییان لە بەدواداچوونی ئەو رێگاو شار و ولاتانەدا حاشا هەڵنەگرە کە پارەی لێ قازانج دەکرێت. پسپۆڕی تۆڕەکانی هەڵسوڕانی پارە و موڵکن. بەستنەوەی فەرمانداریێتیکردنی ئەوروپای سەرەتاکانی سەدەی شازدەهەم لەلایەن پارەوە، بە شارەزایی ئەم گروپەوە فشارهێنانە بۆ سەر راستییەکان. تەواوی ئەو بەڵگانەی ئاماژەمان پێکردن پیشانیدەدات کە رۆڵی ئەم گروپە لە پەرەسەندنی شارستانیدا تا دوایی بێکاریگەرە. خوڵقاندنی کەرتی ئابووری سەرمایەداری لەلایەن پارە و بازاڕەوە ناچارییەک نەبوو. لە ئاستێکی زۆر سەرووتردا لە ئەوروپا هێزی پارە و بازاڕ لە شارستانییەکانی ئاسیادا هەبوو. ئەگەر راستەوخۆ پێیەوە گرێدراو بوایە، سەرەتا لەوێدا لە دایکدەبوو. ئەوەی بەگشتی پەسەند دەکرێت، ناتوانرێت بە زانست، هونەر، ئایین و فەلسەفەشەوە ببەسترێتەوە، بەپێچەوانەوە لە رووی پرەنسیپی مۆراڵییەوە ئەم دسپلینانە بەردەوام

بەشێوەیەکی گوماناوی و ڕکابەرێتی تەماشایان کردووە.
بابەتێکە کە بەردەوام هەوڵدەدەم لەیادم بێت. بۆچی هێزێکی وەکو ژن بەدەستی پیاوەوە کە خەسڵەتێکی ئەوتۆی بەرهەمهێنان و خوڵقکاری نییە لە دۆخێکی هێندە کڵۆڵ و مەحکومدایە. وەلام هەڵبەتە ڕۆڵی توندوتیژییە. کاتێک ئابووریشی لەدەست دەردێنن دیلێتییەکی ترسناک دەبێت بەناچاری. بەو ئەندازەیە لەگەوهەری خۆی نامۆکراوە، کوڕێکی بچکۆلانە بەسەر سەریەوە دابنێت، رازییە بەوەی چل ساڵ ئەو ژنێتییەی بۆ بکات کە داڕووخاوترین هونەرە. ئەمە لەکاتێکدا ژنێتی کردن بۆ پیاوی بەهێز زۆر مەترسیدارترە.
بەراوردکردنی پارە و ئەو هێزەی پارە وەکو سەرمایە بەسەر کۆمەڵگاوە بەدەستی هێناوە لەگەڵ ئەم نموونەیە لەو بڕوایەدام کە زۆر ئەزموون بەخشە. کاتێک پارە هێزی بەڕێوەبردن بەدەست دێنێت، لە ڕاستیدا داننانە بەو حەقیقەتەدا کە لە ڕووداوێکی ئابووری دەرکەوتووە. مێژووناسی شارەزا فرناند براودل کاتێک دەڵێت: "**سەرمایەداری دژی بازاڕە، هەربۆیە دژی ئابووریشە، تەنانەت لەدەرەوەی ئابووریشە**" ئاماژە بە ڕاستییەکی زۆر واتادار دەکات. لەبەرئەوەی کاتێک ئابووری تاوتوێ دەکات، بە دیاردەکانی ئاڵوگۆڕ و بازاڕ دەست پێدەکات ئەم داوەرییەی بەهایەکی مەزنی هەیە. بۆچوونێکە بەردەوام خویازیاری ئاماژەپێکردنی بووم. سەرمایەداری کە هەموو شتێکی بە ئابووری خنکاندووە، پەیوەندی بە ئابوورییەوە نییە، تەنانەت دوژمنی ڕۆحی ئابوورییە. بانگەشە دەکەم: **سەرمایەداری ئابووری نییە، دوژمنی ڕۆحی ئابوورییە.** لەبەشەکانی داهاتوودا بەشێوەیەکی بەرفراوان تاوتوێی دەکەم. فینانس، ئابوورییە؟ ئایا فینانسی جیهانگیری ئابوورییە؟ ئایا کارەساتەکانی ژینگە ئابوورییە؟ بێکاری کێشەیەکی ئابوورییە؟ بانک، دەستاوێز، نرخی دراو و سوو ئابوورین؟ بەشێوەی شێرپەنجە بەرهەمهێنانی کاڵاکان لەپێناو بەدەستهێنانی قازانجدا ئابوورییە؟ لیستەی پرسیارەکانمان درێژە. تاکە وەڵامێکی کە بۆ هەموویان

بدرێتەوە، نەخێرێکی گەورەیە. فۆرمێلەکەی بەمجۆرەیە: پارە ـ سەرمایە بەهانەیە= دەسەلات شاهانەیە! لەمیانەی یارییە تەڵەکەبازییەکانی پارە ـ سەرمایە نەشێوەیەکی نوێی ئابووری خولقێنراوە، نەشێوەیەکی کۆمەڵگای سەرمایەداری، تەنانەت شێوەیەکی شارستانی بە ناوی شارستانی سەرمایەداریش جێگای باس نییە. ئەوەی لە ئارادایە گەمەی زەوتکردنی کۆمەڵگایە، بە تایبەتیش دەستبەسەرداگرتنێکە لەهیچ قۆناخێکی مێژوودا نەبینراوە. تەنیا زەوتکردنی هێزی ئابووری کۆمەڵگا نییە، بەڵکو دەستبەسەرداگرتنی تەواوی هێزی سیاسی، سەربازی، ئایینی، ئەخلاقی، زانستی، فەلسەفی، هونەری و تەواوی هێزی کلتووری ماددی و مەعنەوییە. سەرمایەداری پێشکەوتووترین باڵادەستی و دەسەلاتە.

با سەیرێکی ئەم چوارسەد ساڵەی مرۆڤ بکەین کە بە سەردەمی سەرمایەداریش بەناو دەکرێت. سەبارەت بە کۆمەڵگا تا دەگاتە موولوولەکانی ئایا تاکە خانە و شانەیەکی مرۆڤ ماوە کە نەخرابێتە ژێر چەپۆکی باڵادەستییەوە و تەختی دەسەلاتی تێدا دانەنرابێت؟

کۆمەڵناسی فێلبازی ئینگلیزی ئەنتۆنی گیدنس[1] باس لەنابەردەوامی سێ فاکتەر دەکات: شێوەی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری، دەوڵەت ـ نەتەوە و پیشەسازی. کاتێک لەمیانەی ئەم سێ کۆڵەکەیەوە مۆدێرنیتە پێناسە دەکات، لە رووخساردا واقیعییە. بەڵام لەو بڕوایەدام ئاگادارە کە لە رێگای ئەم پارادیگمایەوە رۆڵی تیۆریستی قۆناخی شەڕی رزگارکردنی سەرمایەداری لە وڵاتی دایکدا بەڕێوە دەبات. خوازیارن تیۆری ئەبەدیکردنی سەرمایەداری لە رێگای ئەنجامدانی گۆڕانکارییەوە: لەلایەک لەمیانەی بانگەشەی شێوازی راستڕەوی لیبرالیزمەوە کە

---

١ ـ ئەنتۆنی گیدنس: کۆمەڵناسێکی ئینگلیزییە ساڵی ١٩٣٨ لەدایک بووە. بەبۆچوونە کۆکەکانی لەسەر بیرۆکەی بونیادنەری و کۆمەڵگای مۆدێرن دەناسرێت. یەکێکە لە گرنگترین کۆمەڵناسە مۆدێرنەکان. زیاتر لە ٣٤ پەرتووکی بە ٢٩ زمانی جیاواز بڵاوکراوەتەوە. لە پەرتووکەکانیدا قورسایی خستۆتە سەر لێکدانەوەی سەرمایەداری مۆدێرنیتەو کاریگەرییەکانیان لەسەر کۆمەڵگا و رێسا تازەکان لە بونیادنانی کۆمەڵگادا. گرنگترین بەرهەمەکانی "مۆدێرنیتە و ناسنامە" و "لەودیو راستگەری و چەپگەرییەوە" و "رێگای سێیەم: نوێبوونەوەی دیموکراسی کۆمەڵایەتی". مامۆستای روحی تۆنی بلێر و بیل کلینتۆنە.

دەڵێت: "سەرمایەداری کۆتایی مێژووە" لەلایەکی دیکەشەوە لە ڕێگای بانگەشەی شێوازی چەپڕەوی لیبرالیزمەوە کە دەڵێت: "سەرمایەداری ئەبەدییە" لە مێشکدا جێگیر بکەن. لەمیانەی دوا هەڵمەتی سەرمایەداری جیهانگیرییەوە خوازیارن ئەمە جێبەجێ بکەن.

لێرە بەدواوە شرۆڤەکانم سەبارەت بەسەرمایەداری لەسەر بنەمای شیکارکردنی مۆدێرنی درێژە پێدەدەم. بە تایبەتیش لە رووی رەهەندەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە و پیشەسازییەوە. بەڵام بەدواداچوونەکانم لەسەرخودی دەسەڵات و لە بڕیارگەکانیدا دەبێت. ئیلهامم لە فرناند براودل وەرگرت، بەڵام ئەو سەرە دێڕەییم بە ناتەواو دیت کە دەڵێت: "سەرمایەداری لەماڵی خۆیدا"، بۆیە بەوشێوەیە نا، بەڵکو پێم وایە کە هەروەکو خوداوەندی فێلبازی سۆمەرییەکان ئەنکی و خوداوەند "هادیس"[1]ی هێلینییەکان لە کۆشکە ژێر زەمینییەکاندایە، واتە لەگۆڕەپانە شاراوەکانی گەمەی دەسەڵاتدایە. هەربۆیە ئەگەر سەرە دێڕەکەمان بەشێوەی "لە کۆشکی پادشای رووت و خوداوەندی بێدەمامکدایە" بێت واتادارتر دەبێت. تەواوی شێوازەکانی گێڕانەوە دەکەم بە سەنتێزێک بۆ ئەوەی روونی بکەمەوە ئەو سەرمایەدارییەی لە سەرەتاوە ئارەزووی سیستەمی دەسەڵاتی جیهانگیری هەبوو چۆن لەمیانەی کۆڵەکەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە و پیشەسازییەوە هەوڵی سەرکەوتنی داوە. چونکە پارچەکردنی شێوازە مەزنەکانی گێڕانەوە یەکێک لە کارە یەکەمینەکانی ئەم لیقی ئەتهانەیە. گێڕانەوەیەکی پارچەکراو و یەکنەخراو گێڕانەوەیەکی زۆر ناتەواوە. ڕێگا لەپێش خزمەتکردن بەئامانجی رەخنەکان دەکاتەوە. دەشێت پەیڕەوی من سەیر ببینن و لەسەری رانەهاتبن، بەڵام لەو بڕوایەدام کە بەرەو شرۆڤەیەکی تۆکمەی پەیوەندی کۆمەڵایەتی و هۆشیارییەکەی بردووین. هەوڵدەدەم دوا بەشی هەڵسەنگاندنەکانم لەژێر ناوی "سەرمایەداری دوژمنی رۆحی ئابووری" تەواوبکەم.

---

١ـ وەکو وشە هادیس بە واتای شاراوە و نادیار دێت. لە میتۆلۆژیایی یۆنانیدا ناوی خوداوەندی حوکمداری مردووانە لەژێر زەویدا. برای زیۆسە.

هەوڵەکانی دواترم لەژێر ناوی کۆمەڵناسی ئازادیدا بۆ شیکاریکردنی کۆمەڵگای دیموکراتی، ئازاد و یەکسانخواز تەرخان دەکەم.

## ٣ـ سەرمایەداری ئابووری نییە، دەسەڵاتە

ـ خوداوەندی بێدەمامک، پادشای رووت و پارەی فەرماندە لە کۆشکی خۆیدا ـ

پەندێکی ناو خەڵکە، کاتێک خوازیارن هەواڵی راستیان دەست بکەوێت دەڵێن "قسەی راست لەمنداڵ ببیستە". هەم وەک پێویستییەکی رێزگرتن لەتەواوی منداڵان، هەم بۆ شۆڕبوونەوە بۆ ناو سەرچاوەی هەواڵی راست، جارێکی دیکە هێما خەیاڵییەکانی منداڵیم شرۆڤە دەکەم.

کاتێک گوێبیستی ئەو هەواڵە بووم کە ئەمینی کوڕە دراوسێمان پەرتووکی (علم الحال) دەخوێنێتەوە، مەیل و پەیوەندیم بەرامبەر بە ئیسلام و مزگەوت زیادی کرد. بەرامبەر بە ئەزبەرەکردنی چەند نزا (دوعا)یەک توانیم یەکسەر لە ریزی دوای ئیمام موسلیم جێی خۆم بگرم. هیچ گووتەی ئیمام موسلیمم لەبیرناچێت کە گووتبووی: "عەبدوڵلا بەم خێراییە بڕوات دەفڕێت". کەواتە سەرەتایەکی راستم دەستپێکردبوو. هێشتا ئەوەشم لەیادە: خۆم لەقەدی دار زەیتوونێک پێچابوو، لەعەزیزی هاوڕێی قوتابخانەی سەرەتاییم (دواتر زانیم کە بووە بە ئەندازیاری کشتوکاڵی لە دائیرەی تاپۆدا بەڕێوەبەرە) پرسی دەبێت قوتابخانە و مامۆستا چۆن بێت و لەم بارەیەوە گفتوگۆم لەگەڵ کرد. زیاتر وەک دڕندەیەک دەهاتە بەرچاوم (لیڤی ئەتهانی مۆدێرن). لەمەشدا بەهەڵەدا نەچووبووم. چونکە قوتابخانە ئەو شوێنە بوو کە خوداوەندی نوێ دەوڵەت ـ نەتەوەی تێدا ئەزبەرە دەکرا. زۆر دواتر کاتێک لە فەلسەفەی هیگڵدا خوێندمەوە کە خوداوەندی نوێ بەشێوەی دەوڵەت ـ نەتەوە دابەزیوەتە سەر رووی زەمین، لە کەسایەتی ناپلیۆندا کەوتۆتە جووڵەوە، کاتێک دەستم بەو شرۆڤەیەکرد کە لە قوتابخانەی سەرەتاییەوە لەلایەن مامۆستاـ راهیبەکانەوە بە منداڵان ئەزبەرە دەکرێت، هەستم کرد لە منداڵیدا هەواڵی راستم وەرگرتووە. لەکاتێکدا خوداوەندی مزگەوتی ئیمام موسلیم لاواز دەبوو، خوداوەندی مامۆستای سەرەتاییمان محەمەدی خەڵکی چۆرم لە هەڵکشاندا بوو. هەروەها کاتێک شەوقی فول لایتی

اوربیەکەی حەیدەری شۆفێر کە خەڵکی گوندی ئارگل بوو، ساڵانە چەند جار بەیانییان لەسەر کەپرەکە لە چاوەخەواڵووەکانی دەدام، هێمای نەفسوونی مەکینەکەی وەک نیو ـ خوداوەندێک لە خەیاڵمدا جێگیرکرد. بەلامەوە وەک ئۆتۆمبێلی خوداوەندی نوێ بوو. دیسان زۆر دواتر کاتێک پیشەسازیم وەکو بەهێزترین کۆڵەکە یان خەسڵەتێکی لیڤی ئەتهانی نوێ شرۆڤە کرد، جارێکی دیکە باوەڕیم کرد کە هەواڵی راستم لەخەیاڵەکانی منداڵیم وەرگرتووە.

لێرەدا یەکسەر دەبێت ئاماژە بەم خاڵە بکەم، هیچ ئیلاهیبوونێک بە ئەندازەی پیشەسازی نەبووە بە دڕندە. گوندەکەمان نزیکەی پەنجا کیلۆمەتر دووری سنووری سوریایە وەک سێیەمین هەواڵی منداڵییم بەردەوام ئەوە دێنمەوە بیرخۆم: کاتێک بلاجەکتۆرەکانی رووناککردنەوەی سنوور ناوە ناوە وەک شەوقی بروسک لەچاویدەدام خەیاڵێکی تێکەڵەی دەوڵەت ـ خوداوەندم لا دروست دەبوو.

کۆماری تورکیا یەکەمین نموونەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ولاتە نیو ـ کۆلۆنیەکانە کە بۆ دۆخی دەوڵەت ـ نەتەوە گۆڕاوە. کۆماری تورکیا لەسەردەمی دامەزراندنیدا شوێنپەنجەی کۆماری فەرەنسای وەرگرتووە. وەکو فەرەنسا، سەرەتا دیموکراسی و دەوڵەت لەناویەکتردایە. هەروەکو کۆماری ئیسلامی ئێران، یەکەمین کۆماری ئیسلامی لە مەدینە، تەنانەت وەک یەکێتی سۆڤێتی سەرەتا. بەپێی بەسەرچوونی کات وەک شێوەیەکی دەسەلاتی سەرمایەداری فاکتەرەکانی دیموکراسی کەمبوونەوە و بۆ چینێکی رووتی نەتەوە ـ دەوڵەت وەرچەرخێنران. لە بەشە پەیوەندیدارەکاندا نموونەی ئەم بابەتە بەشێوەیەکی بەرفراوانتر شیکار و گفتوگۆ دەکەم. لەوانەیە یەکەمین نموونە بێت. یەکەمین نموونە بەردەوام پێویستی بە شرۆڤەیەکی وریا و هۆشیارانە هەیە. خوازیاربووم هێما خەیاڵیەکانم لەبارەی کۆمارەوە وەک چیرۆک ـ رۆمانێکی جیاواز و درێژ باس بکەم. بەلام تەنیا بە رستەیەک دەخوازم بڵێم کاتێک گەیشتمە ساڵی تەواوکردنی کۆلێژی زانستە سیاسییەکان (قوتابخانەی مولکایەتی ـ دەوڵەت) کە هەڵبژاردەترین خوێندنگای کۆمارە هەستم کرد بوومە بەو

جاهیلەی کە ژیری ئەنالیتیکی و سۆزدارییەکەی ئیفلیج بووە، هیچ شتێک نابیستێت و تێناگات، دۆخی ئەو کەسایەتییەم وەرگرتووە کە لیڤی ئەتهانی نویّ دەیخوازێت، لە تەنەکە دروستکراوە و لە دەرکردنی دەنگێکی وەکو هی لیڤی ئەتهاندا زەحمەتی دەبینێت، وەک چەمکی دواترم باسی دەکەم.

دوای سالانێکی درێژ بەتایبەتیش لە ڕێگای ئەزبەرەکانی خوێندنگاکانی مەزهەبی سۆسیالیزمی بونیادنراوەوە توانیم کاریگەری ئایینە کۆنەکەی گوند بشکێنم. ئاماژە بەوەش بکەم لەم سالانەدا کەوتبوومە ناو ڕەوشێکی مەترسیداری گومانکردنەوە. چەندەی بیرم دەکردەوە نقوم دەبووم، هەروەک بلێی دەخنکام. زۆر دواتر کاتێک تێگەیشتم ئەوەی بە پۆشاکی کۆماری تورکیا یان سۆسیالیزمی بونیادنراوی سۆڤێت خۆی سەپاندووە لیڤی ئەتهانی مۆدێرن بوو، توزێک هاتمەوە هۆش خۆم. ئیتر کاتێک بینیم ڕووبەڕووی خوداوەندی ئایینی مۆدێرن بوومەتەوە کە لە خوداوەندی هەموو ئایینەکان مەترسیدارترە (هێما خەیالی و بتە لەژمار نەهاتووەکانی هەموو لایەکیان گەمارۆدابووم) و، کاتێک سەرهەلدان و چۆنییەتی بەدەستهێنانی بالادەستییەکەیم بۆ ڕوون بۆوە و بینیم بەگوێرەی من نییە، ئەوکاتە هەستم کردوو تێگەیشتم چەندە خۆم نەدەم بەدەست ئەم ئایینەوە و خاوەندارێتی لەخۆم بکەم بژاری ژیانی ئازادانەم پێشدەکەوێت. بۆ یەکەمین جار زهنی ئەنالیتک و سۆزداریم دەستی یەکتریان گرت و منیان هێنایەوە سەرخۆ. لەم دێڕانەدا هەولی شرۆڤەکردنی ئەم پرۆسەیە دەدەم.

مارکس، ئەنگلس کاتێک 'سۆسیالیزمی زانستی' واتە کاتێک کۆمەلناسی خۆیان شرۆڤە دەکەن، دەلێن: **'سەنتێزێکمان لە ئابووری ـ سیاسی ئینگلیز، فەلسەفەی ئەلمانی و سۆسیالیزمی فەرەنسا پێکهێنا'.** هەر سێ قوتابخانەکەش هەولی پێشخستنی شیکاری تیۆری مۆدێرنیتە دەدەن کە هەولدەدات بەسەر ژیانی تەواوی ئەوروپادا زال بێت. لەکاتێکدا قوتابخانەی ئابووری ـ سیاسی ئینگلیز هەولدەدات بیسەلمێنێت ئەوەی ڕوویداوە سەرکەوتنی ئابووری نوێیە (یاخود وەک ئایینی نویّ باوەڕی پێ بهێنرێت)، فەلسەفەی ئەلمانیش جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە پێویستە

دەوڵەت ـ نەتەوە وەک ئەکتەرێکی سەرەکی بەبنەما بگیرێت (شێوەی نوێی پادشا ـ خوداوەند)، هەرچی سۆسیالیزمی فەرەنساشە هەوڵدەدات کە بەناوی سەرجەم کۆمەڵگاوە (یەکێتی شارستانی و دیموکراسی) ئەوە تیۆریزە بکات، باسە ئایینییە کۆنەکان سەردەمی بەسەر چووە و سەرکەوتنی کۆمەڵگای عەلمانی ـ پۆزێتیڤیزم (ئایینی نوێی سیستەم) جێگای باسە.

ئەو شۆڕشە هزرییەی لەسەدەی شازدەهەمەوە لە ئەوروپا دەستی پێکرد، کاریگەری سەرسوڕهێنەر و سەراوژێرکارانەی پاوانخوازیی سەرمایەداری لەبناخەکەیدا شاراوەیە. لەکاتێکدا هەوڵی پێناسەکردنی ئەم شۆڕشە هزرییە دەدەین، پێویستە بەردەوام ئاماژە بە چەند نموونەیەکی مێژوویی هاوشێوە بکەین. یەکەمین نموونەمان دەرهەق بەوەیانە کە لە منداڵدانی پەرستگای راهیبی سۆمەردا لە دایک بووە. هەلومەرجەکانی رێکخستنی شێوەی دەوڵەت لەسەر زێدە ـ بەرهەم لەگەڵ شۆڕشی بیرکردنەوە بەیەکەوە هەڵسەنگێنران. لەمیانەی کامە ئامێری چاودێرییەوە دەتوانرێت زێدە ـ بەرهەم هەمووی زەوت بکرێت؟ ئامرازە سەرەکییەکانی مەشروعییەت پێدان (رازیکردنی کۆمەڵگا بە سیستەمی نوێ) چۆن دەدۆزرێتەوە و رێکدەخرێت؟ ئەو رێگە چارەیەی دۆزراوەتەوە رێکخستنی دەوڵەت و ئافراندنی خوداوەندی نوێیە کە یەکەمین نموونەی سەرجەم ئایینەکانی شارستانییە. وەڵامێکی زۆر رادیکاڵانە دراوەتەوە. بۆ یەکەمین جار دەوڵەت بەشێوەی پادشا ـ راهیب رێکدەخرێت. بۆ یەکەمین جار ئابووری بەشێوەی سۆسیالیزمی دەوڵەت، لەگەڵ دەوڵەت لەناو یەکتردا رێکدەخرێت و بەمجۆرە دەخرێتە ژێر کۆنترۆڵەوە. هەرچی هێزە باوەکانی پلەدارییشە وەک خوداوەندە نوێکانی ئاسمان، زەوی، هەوا، ئاوو شار دەمامک دەکرێن و دەچەسپێنرێن. کۆیلەکردنی مرۆڤیش بۆ یەکەمجار لە داستانی خولقاندنی (ئەنوما ئەلیش) وەک پیسایی خوداوەندەکان دەکرێت بەسیمبۆل. شوێنی تەواوی ئەم ئافراندنانەش زەقورەیە. نهۆمی سەرەوەی پەرستگا (زەقورە) شوێنی پانتائۆن (یەکێتی خوداوەندەکان، دەسەڵاتی چینی سەرووی پلەداری)ە. نهۆمی ژێر ئەویش شوێنی پادشا

- راهیبە (خولقێنەری سیستەم و یەکەمین بەڕێوەبەری هەژموونگەرا). نهۆمی خوارەوەش بۆ پیشەکار و کۆیلەکان جیاکراوەتەوە کە بەرهەمی زێدە و بەهای زێدە بەرهەمدێنن. کاتێک دەڵێین پەرستگا منداڵدان و یەکەمین نموونەی سەرەتایی شار، دەوڵەت و چینەکانە، بەمجۆرە فۆرمێلی تەواوی سیستەمی شارستانی دەستنیشان دەکەین. تا دوا مۆدێلەکانی ئەوروپا گشتییان شوێنپەنجەی ئەم نموونەیان پێوەیە. لەم سۆنگەیەوە لایەنگری ناوبردنی نموونەی سۆمەرم بەسەرچاوەی راستەقینە و ئەم دەستنیشانکردنەش راست دەبینم. هیچ ڤێرسیۆن و جۆرێک بە ئەندازەی رەسەنەکە سەرنج راکێش و بەکاریگەر نابێت.

ئیۆنا- گریک ڤێرسیۆنی سێیەمە. دووەمین ڤێرسیۆنی سۆمەرییەکان شارستانی هیتیتەکانە کە بەڕەچەڵەک دەگەڕێتەوە سەر میزۆپۆتامیای سەروو و لەگەڵ هۆرییەکاندا بەناویەکدا چوون. جیاوازی گریکەکان ئەوەیە چیرۆکی میتۆلۆژی (ئەفسانەیی) یان تێپەڕکردووە و شێوازی فەلسەفییان بونیادناوە. هۆکاری سەرەکی ئاواکردنی فەلسەفەی کۆمەڵگا و سروشت بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە چیتر روونکردنەوەی دەوڵەتشار و پێشکەوتنەکانیان لە رێگای میتۆلۆژییەوە جێگای باوەڕنەبووە. هەرچەندە هێزی مەشروعییەتی چیرۆکە میتۆلۆژییەکان لەناوچینەکانی خوارەوە بەردەوام بوو، بەڵام بۆ ئەوانەی لەگەڵ کێشە کۆنکرێتییەکانی بەڕێوەبەرایەتیدا لەناو ململانێدا بوون، ئیتر گوتارێک کە جێگای باوەڕهێنان بێت لەگەڵ بەسەرچوونی کات دەبووە پێویستییەک. بەهۆی ئەو کێشانەوە کە شارەکان رێگای لەپێش دەکەنەوە، لەژیانی کۆمەڵایەتیدا پێویستی بەشێوازی روونکردنەوەی فەلسەفییانە هەیە. بەڵام ئەو پانتائۆنەی خوداوەندەکانی ئۆلۆمپیۆس کە بە زیۆس دەستی پێکردووە تاکو ئێستاش زۆر بەکاریگەرە. لەکاتێکدا سوقرات گیانی خۆی کردە قوربانی یەکەمین هەلوێستە گومانکارییەکانی، قوتابییەکانی توانیان باوەڕییەکەی کە لەشێوەی گەلالەنامەیەکدابوو بکەن بەسەرچاوەی سەرەکی فەلسەفە. بەتایبەتیش ناوبردنی ئەرستۆ و ئەفلاتۆن بەباوکی فەلسەفە هەڵە نییە.

دەتوانین عیبرانییەکان وەک یەکەمین تیرە پێناسە بکەین کە لە میتۆلۆژیای سۆمەر و میسرەوە دەربازی گێڕانەوەی ئایینی تاکخودایی بوون. لەباڵێکی جیاوازترەوە ڤێرسیۆنیان دروستکردووە. چەندین لقی لابەلاش تەڤلی دەکەن (بە زەردەشتی و فەلسەفەی یۆنانیشەوە) و دەرکەوتنی جۆری وەک موسەوی، عیسایی و محەمەدی دادەهێنن.

توانا کلتوورییە ماددی و مەعنەوییە تازەکانی لەسەدەی شازدەهەمدا لەئەوروپا هێزی هەڵمەتێکی مەزنیان بەدەست هێنابوو، لە بنەڕەتدا پشت بەم نموونە رەسەنەی مێژوو و ڤێرسیۆنەکانی دەبەستێت. بیرکردنەوەیەک کە ئەمانە بەنەبوو دادەنێت و مێژوو لە ئەوروپاوە دەست پێدەکات، مەگەر لە رێی سەرلەنوێ خوڵقاندنی میتۆلۆژی و ئایینەوە بکرێت کە ئەویش هەر لەسەرەتاوە نابێتە جێگای باوەڕی. پرۆسەکانی بونیادنانی هزری کە لەژێر ناوی پۆزێتیڤیزم، عەلمانی، لیبرالیزم و تەنانەت سۆسیالیزمیشدا کراون، هەرچەندە هەندێک لایەنی نوێ لەخۆوە بگرن، بەلام لەژێر کاریگەری قووڵی سەرچاوە بنەڕەتییە مێژووییەکەدا ئاواکراون. زاراوە و ناوەڕۆکەکەیان لەوەوپێشتر لە ڤێرسیۆنەکانی تردا بەدرێژایی هەن. نەک تەنیا فەلسەفە، زانست، هونەر و حقوقی گریک ـ رۆما، تا پشت بەمیراسی سۆمەر و میسر نەبەستێت، مەحاڵە قۆناخی رێنسانس، ریفۆرم و رۆشنگەری ئەوروپا روونبکرێتەوە.

بێگومان ئەوروپاش کۆمەک و رۆڵێکی هەیە، لەسەدەی شازدەهەمدا میوەکانی خۆی دەدات. باسە تێکەڵەکانی زانست، فەلسەفە و ئایینی فرانسیس باکۆن[1]، مۆنتاگنۆ[2]، ماکیافیللی و کۆپەرنیک[3] و چەندانی دیکە

١ـ فرانسیس باکۆن Bacon فەیلەسوف و پێشەنگی هزری زانستی تاقیکارییە. ئینگلیزە و لە سالانی (١٥٦١ – ١٦٢٦)دا ژیاوە. بە پێی هەندێک لە شارەزایانی مێژووی فەلسەفە ئەم پێشەنگی فەلسەفەی مۆدێرنە نەک دیکارت.

٢ـ میشل مۆنتاگنۆ: نووسەرێکی رێنسانسی فەرەنسییە، لەنێوان سالانی (١٥٣٣ ـ ١٥٩٢)دا ژیاوە. لەسەر بابەتەکانی ئەقڵ، ژیری، پەروەردە، ژن، دۆستایەتی، مردن، عەشق و بابەتی جیاجیا تێڕوانینە سەیرەکانی خۆی نووسیوە. نووسینەکانی لەژێرناوی "تاقیکردنەوەکان"دا بڵاوکراوەتەوە.

٣ـ نیکۆلاس کۆپەرنیک: بەیەکێک لە ئەستێرەناسەکانی مۆدێرن دەژمێردرێت. لە پۆڵەندا لەدایک بووە و لەنێوان سالانی (١٤٧٣ـ١٥٤٣)دا ژیاوە. سەربارەی ئەوەی کە لە زانکۆ ماتماتیک دەخوێنێت، لەسەر زۆر لێکردنی مامی لەئیتالیا دەبێتە راهیب، بەلام هەر درێژە بەلێکۆڵینەوە ئەکادیمییەکانی دەدات. پەیوەندیداری بۆ ئەستێرەناسی پەرەدەسێنێت و تیۆری خۆی لەم بوارەدا بەرهەم دەهێنێت. ئەم تیۆرییەی خۆی هیچ بڵاوناکاتەوە لەبەرئەوەی پێی وایە کە بەردەوام دەبێت چاوی پیابخشێنێتەوە و گۆڕانکاری تێدا بکات. دوای مردنی خۆی بڵاوکراوەتەوە تیۆرییەکەی، کە سەرەکیترین لایەنی ئەوەیە: گەردوون بۆ مرۆڤ دروست نەکراوە، بەپێچەوانەوە مرۆڤ پارچەیەکی بچووکی گەردوونە.

نیشانەی دەرکەوتن و ڤێرسیۆنێکی تازەن. شارستانی تەنیا شار، دەوڵەت، چین، بازرگان، پارە و بازاڕی پێشکەش بە ئەورووپا نەکرد، بەڵکو فەلسەفە، ئایین، زانست و هونەریشی پێشکەشکرد. ئەورووپا سەلماندوویەتی کە خاوەن بەهرەی وەرگرتنی کلتووری ماددی و مەعنەوی مێژووی دێرینە و دوای ئەوەی بەشێوەیەکی وردەکارانە بە تاقیگەی خۆیدا تێپەڕیکردووە توانای سەنتێزکردنیانی پیشانداوە. شارستانی هیند و چین نەیانتوانی لەم هەنگاوەدا سەرکەوتن بەدەست بێنن. شارستانی رۆژهەڵاتی ناوینیش هێزی ئەنجامدانی دوا هەڵمەتی پیشاننەدا. باسی هۆکارەکانیم کرد.

کاتێک دەڵێین ئەوەی ئەورووپا لەمێژووی شارستانیدا ئەنجامیداوە سێیەمین ڤێرسیۆنە گەورەکەیەتی، بەکورتی بەبیرهێنانەوەی ئەم راستییە مێژووییانە ئەزموونبەخش دەبێت. ئەنتۆنی گیدنس هەوڵدەدات ئەم رۆڵەی ئەورووپا لەمێژووی شارستانیدا بەدەستەواژەی "نابەردەوامەکان" دەست نیشان بکات. لەم رێگایەوە هەوڵی چەسپاندنی رەسەنەکە دەدات. بێگومان شارستانی ئەورووپاش رەسەنێتی خۆی هەیە. بەڵام نابەردەوامەکانی گیدنس (سەرمایەداری، دەوڵەت ـ نەتەوە و پیشەسازی) تارادەیەک بەڵگەی سەلمێنەرن. لە بەشەکانی داهاتوودا هەڵیدەسەنگێنم کە کۆمەڵناسی گیدنس لە پێناو رزگارکردنی سەرمایەداری رۆژگاری ئەمڕۆماندایە. بەڵام ئەو سێ بابەتە سەرەکییەی تیشکی خستۆتە سەر پێویستی بە شیکارێکی قووڵ دەکات. هەربۆیە گرێدانی پەیوەندی نێوانیان گرنگە.

دیسان بگەڕێینەوە سەر هەرسێ سەرچاوە گرنگەکەی مارکسیزم. سەبارەت بە کۆکردنەوەی سەرچاوەکانی هزری ئەورووپا جیاکردنەوە بۆ سێ بەش گرنگە. بەڵام لەیەکچوونی نێوان هەرسێکیانی دەستنیشان نەکردووە. چونکە دەستنیشانی بکردایە، خۆشی بەدەستەوە دەدات. بە مارکسیزمیشەوە، ئەوەی ئابووری ـ سیاسی ئینگلیز، فەلسەفەی ئەڵمانی و سۆسیالیزمی فەرەنسی کۆکردۆتەوە (لایەنی هاوبەشی) ئایدیۆلۆژیای رۆشنگەرییە. ئەوەی پێویستە شیبکرێتەوە، ئەم ئایدیۆلۆژیایە. ئەوەی تا ئێستا بەکاریگەرە و هەیمەنەی لەسەر جیهان هەیە ئەم ئایدیۆلۆژیایەیە.

هەرچەندە كۆمەڵناسیش وەک زانستێک پێشکەش دەکرێت، بەڵام جگە لە چوارچێوەی هەمان ئایدیۆلۆژیا هیچ نوێبوونەوەیەکی دیکە لە خۆوە ناگرێت. ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم وابزانم کۆمەڵناسی بەناوبانگی ئەمریکی "**مانوێل والرشتاین**"[1]ە کاتێک هزری ئەوروپا بە مارکسیزمیشەوە شرۆڤە دەکات ئیعترافێکی هاوشێوەی ئەمە دەکات: "**کاتێک قسە دەکەین، گفتوگۆ لەبارەی ئازادی و سۆسیالیزمەوە دەکەین، دەترسم دووچاری غەزەبی خوداوەندەکان بێین، چونکە لەهەمان سەرچاوەی ژەهراویمان خواردۆتەوە**". ئەو هزرەی باسی دەکات ئایدیۆلۆژیای رۆشنگەرییە. هەرچی ئیعترافی (دان پێدانانی) نوێنەرە بەهێزەکەی قوتابخانەی فرانکفۆرت ئەدۆرنۆیە بەزمانی خۆی. گوتوویەتی: "**ژیانی چەوت، بە راستی ناژێنرێت**".

نیچە و هاوشێوەکانی دوای خۆی بەشێوەیەکی زۆر ئاشکراتر ئایدیۆلۆژیای رۆشنگەرییان رەخنە کرد. نیچە دەڵێت: "**تەواوی زاراوەکانی رۆشنگەری لە ئایین وەرگیراوە**". کارل سمیتیش[2] ریشە ئایینیەکەی تەواوی زاراوە و گریمانەکانی فەلسەفەی سیاسی روونکردۆتەوە. لیستەیەکی دووروودرێژی نموونەی ئەو شێواز و کەسایەتیانە هەیە دەسەلمێنێت کە ئەوروپا بەرامبەر بەشێوازی هزری خۆی کەوتۆتە ناو گومانێکی قووڵەوە.

دۆخی شارستانی لە ئەوروپا زۆر شپرزە و تۆقێنەرە. نەک تەنیا لەرووی شەرە تۆقێنەرەکانی داگیرکاری، ئیمپریالی، ئایینی و نەتەوەییەکانەوە، لە رێگای کۆنترۆڵکردنی ئابووری و دواتریش ئاراستەکردنی و کردنی بە دەسەلات ودەوڵەت بەگەورەییەک گەیشت کە لەگەڵ هیچ قۆناخێکی

١ـ مانوێل والرشتاین: کۆمەڵناس، هونەرمەند و شارەزایەکی بواری ئابووری سیاسی ئەڵمانە، لە نێوان ساڵانی (١٨٦٤ـ١٩٢٠) دا ژیاوە بە باوکی کۆمەڵناسی ئانتی پۆزەتیڤ دەژمێردرێت. لەجیاتی ئەو شیکردنەوانەی بنەمای چینایەتییان هەبووە زاراوەی "ستاتۆ"ی جێگیرکردووە. هەروەها بە لێکۆڵینەوەکانی لەسەرکۆمەڵناسی سیاسی و کۆمەڵناسی پەروەردەیی و کارەکانی لەسەر بیرۆکراسییەت دەناسرێت. پێی وابووە کە بەشێکی زۆری کێشە کۆمەڵایەتییەکان دەبێت لە رێی ئابوورییەوە شیکرێتەوە و چارەسەر بکرێن. لەشیکردنەوەی کێشە ئابوورییەکانیشدا پەیرەوی ئامارییانەی بەکارهێناوە. گرنگترین بەرهەمی "رۆحی سەرمایەداری و ئەخلاقی پرۆستانتی"ە.

٢ـ Carl Schmitt: فەیلەسوفێکی ئەلمانییە، کاسۆلیک و بۆرژوایە. لەساڵی ١٩٣٠ەوە بەرگرییەکی فەلسەفی لەو رژێمە سیاسییە دەست پێکرد کە لەسەربنەمای سەرۆکایەتی دیکتاتۆرییە. یەکێک لەبنەماکانی رژێمی نازییە، یەهودییەکان وەک هەڕەشەیەکی سەر ئەلمانەکان دەبینێت.

مێژوودا بەراورد ناکرێت. لەم حاڵەدا ناتوانرێت نکۆڵی لە "نابەردەوامەکان" بکرێت. تەنانەت لەهەندێک لایەنەوە سەرمایەداری، پیشەسازی و دەوڵەت ـ نەتەوە بێگومان گوزارشت لە "نابەردەوامە" گرنگەکان دەکەن.

تەواوی ئەم باسانە لەسەرووی هەمووشیانەوە ئایدیۆلۆژیای رۆشنگەری "نابەردەوامەکان"ی شارستانی ئەوروپا روون ناکاتەوە. ئەگەر بە ئاگاداریش نەبێت بەوێنەی مەنسوبە ئایینیەکان کە ناچارن پروپاگەندە بۆ ئایینەکەی خۆیان بکەن، لە دواشیکاردا لە رووی پەسەندکردنی ئایینێک و پیشاندانی وابەستەیی لێیەوە، پروپاگەندەچییەکان لەهەمان دۆخدان. بەردەوام هەبوونی نموونە شازەکان یاسا گشتییەکە تێکنادات، بەڵکو پشتڕاستی دەکاتەوە. هەرگیز نابێت هیچ کاتێک ناوەڕۆکی میتافیزیکی و ئایینی پێکهاتەی هزری ئەوروپا پشتگوێ بخرێت، کە رەگەکانی لە قووڵایی مێژوودایە، بەچەند ڤێرسیۆنێکدا تێپەڕیوە و لە زەمینەیەکی یەکجار ئاڵۆزی شارستانییە ماددییە رەسەنەکەدا پێکهاتووە. وەکو هەر ئایینێک، ئەویش ئەرکی بەرگریکردنە لە هەلومەرجەکانی کلتوورە ماددییەکەی و ئەبەدیکردنێتی. بڵاوکردنەوەی لە تەواوی جیهاندا ئەرکی ستراتیژییانەیەتی. لە راهیبەکانی سەرەتاوە تا قوتابخانە و ئەکادیمییەکان و گشت زانکۆ فەرمییەکان، لە قوتابخانەی سەرەتایی تا سەربازگەکان، لە کارگەکانەوە تا ناوەندە گەورەکانی کڕین و فرۆشتن، لە میدیاکان تا مۆزەخانەکان و پاشماوەی ئایینە کۆنەکان، لە نەخۆشخانە تا زیندان و گۆڕستانەکان، هەروەکوچۆن لە ئاستی جیهانگیری و لۆکاڵدا، لە ئاستی نەتەوەییشدا تەواوی کۆمەڵگای لە رووی زهنییەتەوە فەتحکردووە، لەرێگای ئامرازەکانی دەسەڵاتی سیاسی و توندوتیژییە سەربازییەکەیەوە وەکو قەڵغانێک خۆی لێیەوە ئاڵاوە. بە واتایەکی تر "لەقەفەسی ئاسنیندا بەندکراوە".

ئایینەکان و ئەو هزرانەی شوێنپەنجەی ئایینیان لەخۆوە گرتووە، چەندەی فەرمی بێت دەبێت بە ئایدیۆلۆژیا. هەرچی ئایدیۆلۆژیایە، پرەنسیپەکانی ئەو پرۆگرامەیە کە بەشێوەیەکی بەرجەستە بەرگری لە گروپەکانی مرۆڤ و بەرژەوەندییەکانی دەکات. هزری ئەوروپا یاخود

ئایینەکەی، کە لەئاستی جیهاندا فەرمی بووە ئیتر ئایدیۆلۆژیایەکە. وەکو شارستانی ناچارە بەهەموو هێزی خۆیەوە چینی سەردەست بپارێزێت، بیکات بە جاویدانی و دەسەلاتدار. هەروەها بۆ ئەوەی بە هەڵە تینەگەن، ئەم رەخنانە تەنیا لەمرۆڤی ئەورووپی ناکرێت، بەخۆم، ناوچە و دونیاکەشمەوە، رەخنەیەکە ئاراستەی تەواوی مرۆڤایەتی فەتحکراو دەکرێت.

بۆچی هێندە بەکاریگەرە؟ پرسیارێکە لەجێگای خۆیدایە. لەبەرئەوەی پێشکەوتووترین ئایینی تێکەڵە (کۆسمۆپۆلیتە)یە، موخاتەبەی مەنسوبی تەواوی ئایینەکانی پێش خۆی دەکات. نەتەوەییە. کۆمەڵگابوون و نەتەوایەتییەکی نەهێشتۆتەوە کە دەوڵەت ـ نەتەوە نەپەرستێت. مرۆڤی بێ دەوڵەت ـ نەتەوە، وەک مرۆڤێکی بێ ئایینی لێکراوە. لە دۆخی ئایینێکی هەرە لاوازدایە. هەربۆیە پەسەندکردنی هێندەی ئایینەکانی دیکە زەحمەت نییە. بەردەوام لە رێگای زانستگەراییەوە تێردەکرێت. شێوازی ژیانی ماددی کراوە بە جۆرێک لە مەراسیمی ئایینی. ئامرازەکانی کلتووری مەعنەوی لەسەرووی هەمووشیانەوە ئۆرگانەکانی راگەیاندن (میدیا) بەردەوام پروپاگەندەی بۆ دەکات. ژیانی سیاسی و ئابووری تەواو لەژێر کۆنترۆڵیدایە. بووە بە جیهانگیری.

کاتێک ئاماژە بەم خاڵە گشتیانە دەکەم، ئاگادارم وێنەی دونیایەکی بنبەست بوو دێنێتە بەرچاو. دەمەوێت ئەم خاڵەشی لەسەر زیادبکەم، ئەو شارستانییەی خۆی بەمجۆرە پێشکەش بکات بە دوا قۆناخی ئیمپراتۆرییەتی رۆما دەچێت کە متمانەی بەخۆی نەمابوو. هەرچەندە شکۆدار و بەهێز دیاربێت، تەواوی مۆزایکەکانی ناو کۆمەڵگاو پاراستنی ژینگە کە دووچاری کاولکاری کردوون، لە مێژە لەناو تێکۆشاندان. بە ئەندازەی وەرچەرخانی شارستانی بۆ ئیمپراتۆرییەتێک، وەرچەرخانی دیموکراسیش بۆ کۆنفیدراسیۆن بەردەوامە.

## ا- سەرمایەداری ئابووری نییە، دەسەڵاتە

بیرکردنەوە لەوەی کە سەرمایەداری ئابووری نییە، هزرێکە بەلانی کەم هێندەی پەرتووکی سەرمایەی مارکس پێویستە دەرئەنجامی هەبێت. پێش هەموو شتێک دەبێت بڵێم ئەو هزرەی لێرە هەوڵی روونکردنەوەی دەدەم هیچ پەیوەندییەکی بە'میتۆدی بچووککردنەوەی دەسەڵات'ەوە نییە. هەروەها ئەو رەخنەیەش پەسەند ناکەم کە بەهزرێک دابنرێت گوایە سەرمایەداری وەک ئابووری بە دەوڵەتەوە دەبەستێتەوە. لە رێگای زاراوەکانی سەرمایەداری، سەرمایەدار و ئابووری سەرمایەداری، باس لە هێزێکی سیاسی و دەمامکێک دەکەم کە ئابووری کۆنترۆل کردووە. بۆ یەکەمجار ئەم هێزە لە ئەوروپای سەدەی شازدەهەمدا بەکاریگەربووە، بەتایبەتیش لە هۆڵەندا و ئینگلتەرا بەم ناوانەوە بوونەتە دەسەلاتداری سیاسی ئەم وڵاتانە. بەکارهێنانی ئابووری، نیشانەی ئەوە نییە ئابووری بێت. دەتوانرێت بگووترێت فرناند براودل یەکەمین مێژوونووس - کۆمەڵناسە کە دەرکی بەو راستییەکرد. بەڵام فکری خۆی نەکردووە بە سیستەماتیک. هەرچەندە دەرکی بەو راستییە کردبێت کە سەبارەت بە تەواوی هزرەکانی ئەوروپا بچووکترین ئیمانهێنان تێکدەرانەیە بەڵام باسی نەکردووە. لەوانەیە لەم بوارەدا هزری خۆی پێشنەخستبێت. زۆر بە ئاشکرا گووتویەتی، سەرمایەداری دژی بازارە، تالانی پاوانخوازی و سەپاندنی دەرەوەیە. ئەو کاتە پێویستە بپرسین: ئەوەی لە دەرەوە خۆی دەسەپێنێت، دژی بازارە و ئابووریش نییە، چییە؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە زۆر ناتەواوە. ئەو کاتە، هێزی سیاسییە، ئایینە، یاخود قوتابخانەی فکرییە؟

لێکۆڵینەوە و لێتوێژینەوەی پەرەسەندنی کرداری لەو گۆرەپانانەی هزری تیۆری تێدا بووە بە دوو لق، دەشێت ئەنجامی ئەزموونبەخشتری

لیبکەویتەوە. با نموونەکەمان بەتوێژینەوەی ڤینسیا دەست پێ بکەین. لەسەدەی سێزدەهەمدا گروپێکی گەورەی بازرگانەکان لەم شارە هەبوون. بەڵام ئەم گروپە لە هەمان کاتدا دەسەڵاتی بەسەر بەڕێوەبەرایەتی شاریشدا هەیە. شەڕ لەگەڵ رکابەرەکانی دەکات. هێزی دەریاییان هەیە. واتە شارێکی سەربازیش جێگای باسە. هەروەها رۆڵی پاراستنی رێنسانسیش دەبینێت. کۆنترۆڵی لەسەر کۆمەڵگا و ئابووری بەهێزە. راشکاوانە دەتوانم بڵێم تەواوی ئەم پەیوەندیانە لەناویەکدا بوون، پارەش رۆڵی کەتیرەی تێدا بینی. ئەوکاتە کامە زاراوە دەتوانێت وەڵامی یەکپارچەیی ئەم پەیوەندیانە بداتەوە؟ ئەو خاڵانەی دەتوانرێت روون بکرێتەوە ئەوەیە، ئابووری لە رێگای ئەو گروپەوە چاودێری دەکات کە بازرگانی گەورەیان پێدەڵێن، و بەشێکی زۆری زێدە - بەها دەدزێت. هەربۆیە یان خودی دەسەڵاتی سیاسی یاخود جڵەوەکەی لەدەست خۆیدا دەگرێت. کاتێک توندوتیژی پێویست بێت، دەتوانێت هێزی سوپا بەکار بێنێت.

ئەگەر سەرنج بدرێت، دەبینرێت کەم زۆر بزاوتێکی گشتگیری هەمان گروپ جێگای باسە. هەرچەندە لەناو گروپەکەدا هەندێک ناو گۆڕانکاریان بەسەردا بێت، بەلانی کەم لەئاستی ڤینسیادا گروپێک جێگای باسە کە رۆڵێکی دیاریکەریان هەیە. ئەگەر دووبارە پێکهاتنی ئەم گروپە بخەینە بەرچاو، پاوانخوازی بازرگانەکان، دەوڵەت، سوپا و بیرۆکراسییە. ئەو داکۆکیکارە لەپێشینانەن کە کاریگەری لە کڵێسا و جڤاتی هونەرمەندان دەکەن. ئەم گروپەی دەوڵەتیش دەرباز دەکات، وەک پاوانێک لەدەرەوە خۆی بەسەر ئابووریدا دەسەپێنێت، بەڵام ئابووریش نییە، هەیمەنەیەک بەسەر کۆمەڵگادا دەسەپێنێت کە دەوڵەتیش تێپەڕ دەکات، ناوبردنی ئەم گروپە بە **'چەری دەسەڵات'**، یاخود خودی 'دەسەڵات' شرۆڤەیەکە لایەنی راستی بەهێزە. ئەگەر گروپەکەمان لەتەواوی ئیتاڵیادا بەکاریگەر بووایە، بەدەسەڵاتی نیشتمانی - نەتەوەیی ناومان دەبرد. لەناو تەواوی توێژەکانی کۆمەڵگا خۆی جێگیر بکردایە دەوڵەت - نەتەوەمان پێدەگووت. ئابووری وڵاتی بخستایەتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە، وەک دەسەڵاتی ئابووری

ناومان دەبرد. رەوشی خۆی بۆ تەواوی ئەوروپا لەوێشەوە بۆ تەواوی جیهان بگواستایەتەوە، ئیمپراتۆرییەتی ئەوروپا و جیهانمان پێدەگووت.

لەسەر بنەمای ئەم گریمانانە با سەیرێکی جوگرافیای سەدەی شازدەهەمی هۆڵەندا و ئینگلتەرای رۆژگاری ئەمڕۆمان بکەین. بوویەری بەکاریگەر، فشارهێنانی بەردەوامە لەلایەنی پادشایەتی فەرەنسا و ئیسپانیا. ئەم پادشایەتییانە خوازیارن خۆیان وەک ئیمپراتۆریەت راگەیەنن، هۆڵەندا و ئینگلتەراش بکەن بە دوو ئەیالەت (هەرێم)ی خۆیان. لەکاتێکدا کە پادشاو شازادەی ئینگلتەرا و هۆڵەندا دەیانەوێت سەربەخۆیی خۆیان بپارێزن و بەرەوپێشی ببەن بۆ ئەمەش پێویستیان بە هێز هەیە، لە رەوشێکی پێچەوانەدا، قووتدرانیان مەسەلەی ئان و ساتە. ئەو هێزەی پێویستیان پێیەتی سیاسی، سەربازی، پارە و بواری رۆشنبیرییە. بیرمەند و هونەرمەندەکان بانگهێشت دەکەن. دیکارت، سپینوزا و ئارسمۆس لەوێن. سەڕافە[1] یەهودییەکان وەک خاوەن پارە روو لەوێ دەکەن. بناخەی سوپایەکی نوێ دادەنرێت. سوپایەکی پرۆفیشیۆناڵە کە راهێنان، دسپلین و تەکنیکەکەی نوێیە. لەپێناو یارمەتی و هاوکاری کۆمەڵایەتیدا گرنگی بەئازادی دەدەن. ململانێ سیاسییە ناوخۆییەکان چارەسەر دەکەن. ئەوەی هەرە گرنگیشە، بەهرەیەکی ئابووری ئەوتۆ بەدەست دێنن کە لەئاستی ئەوروپادا بەرهەمدارە. کاتێک بەشێوەیەکی یەکگرتوو بیرمان لەو هەموو فاکتەرانە کردەوە، دەبینین کە هۆڵەندا و ئینگلتەرا دەتوانن بەشێوەیەکی بەهێز خۆیان لەبەرامبەر دوژمنەکانیاندا بپارێزن. تەنانەت لە کۆتاییەکانی هەمان سەدەدا شانسی هەژموونگەراییان بۆ دەرەخسێت. بەلانی کەم ئەوانەی زانیارییان هەیە پەسەندی دەکەن کە هێڵی گشتی پەرەسەندنەکان لەبواری کرداری (مەیدانی)دا بەمجۆرە بووە.

ئەوکاتە سەرلەنوێ پرسیارەکانی خۆمان بپرسینەوە. ئەم تۆڕەی پەیوەندی کە هەمووی لەناویەکدایە و بەیەکترەوە پەیوەستە، چ ناوێکی پێبدەین؟ وەک چۆن سیستەمێک پێناسەی بکەین؟ ئایا تەواوی ئەم گۆڕانکارییانە لەلایەن چینێکی خوڵقێنەری ئابووری نوێوە بەدەست

1ـ سەڕافەکان: ئەوانەی بازرگانی کڕین و فرۆشتنی پارە؛ زێڕ و زیو دەکەن.

هێنرا؟ ئابوورییەک لە ئارادایە کە بە بەرهەمە. خولقێنەرەکانی کێن؟ هەزار و یەک چەشنە پیشەکار، جووتیار، کرێکار، بازرگانی بچووک، دوکاندار، بازاڕ و پارە و دەستاوێزەکان کە هەڵسوڕانیان خێراکردووە. لەهەمووی گرنگتر، ئەم ئابوورییە بەپێتە، زێدە ـ بەها گەورە دەکات. کێ بەشی شێر وەردەگرێت؟ هەڵبەتە ئەوانە وەریدەگرن کە لە ڕێگای پارە و هێزی سیاسی ـ سەربازییەوە ئابوورییان کۆنترۆڵ کردووە. چونکە پارە نەبێت فرۆشتن نابێت. فرۆشتن نەبێت، بەرهەمهێنان دەوەستێت. ئەگەر سوپا و هێزی سیاسی نەبێت داگیر دەکرێت، ئەوکاتە دیسان بەرهەم دەکەوێت. کەواتە لەگەڵ ئەوەی پارە و پێدراوەکانی کاریگەرییان لە دیاریکەریدا هەیە، بەڵام بۆ هێشتنەوەی ئابووری لە ئاستی کۆنترۆڵکردن و زەوتکردنی ئەو زێدە ـ بەهایەی لە بەرامبەریدا گەورە دەبێت ئەم کۆنترۆڵە بەڕێوەدەبەن. شیمانە دەکرێت ئەو توێژانە بن کە لەگەڵ هێزی سیاسی و سەربازی لەناو پەیوەندییەکی توندوتۆڵدان. میر و پادشا دەبنە سەرلەشکر، پێویستییەکی زۆریان بە پارەش هەیە، هەربۆیە لەگەڵ ئەوانەدا کە زێدە ـ بەها کۆدەکەنەوە یان لەهەمان گروپدا جێدەگرن یان پەیوەندییەکی چڕیان لەگەڵیاندا هەیە. لەم نێوانەدا پەیوەندی خۆیان لەگەڵ بزاوتە فکری و هونەرییەکان باش دەکەن. لە ئەورووپا ناسینیان وەک ئەو پادشا و میرانەی گرنگی بەئازادی دەدەن دەکەوێتە خزمەتیانەوە. لە پشتگیریکردنی بزووتنەوە رکابەرەکانی دوژمنەکانیشیان دوو دڵی ناکەن: جارێکی دیکە بپرسین ئەم بزاوتە سەرتاسەرییە بە چ زاراوەیەک ناوبنێین؟ ئەگەر بڵێین ئابوورییە، تاکە کەسێک لەئارادا نییە کە خەریکی ئابووری راستەقینە بێت. ئەوان، ئەوکەسانەن کە زێدە ـ بەهایان زەوتکردووە. ئەمانە کێن؟ ئەوانەن کە لەدەرەوە خۆیان بەسەر ئابووریدا دەسەپێنن. ئەوانەن کە پارە ـ بەها لە هەڵسووڕاندا خێرادەکەن، پارە زیاد دەکەن. وەک قەرز دەیدەنە دەوڵەت. لەوانەیە لە بەرامبەریشیدا ببن بە هاوبەشی دەوڵەت.

بەمجۆرە دەبینین ئەوانەی سەرمایەداریێتی، سەرمایەدار و ئابووری سەرمایەدارییان پێدەڵێین، ئەو کەسانەن کە بەشێوەیەکی ناڕاستەخۆ

ئابووری کۆنترۆڵ دەکەن، بەڵام جێگای خۆیان لە ئابووریدا ناگرن. کەواتە ئەمانە بەچییەوە خەریک دەبن؟ خەریکی پاوانی دەسەڵاتن. پاوانەکانی ئابوورییان لەگەڵ پاوانەکانی دەسەڵات دەکەن بەیەک. شەڕدەکەن. کاتێک لە وڵاتدا لە شەڕدا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، لەناو وڵاتدا هێزیان زیاد دەبێت. ئەمەش بە واتای زێدە ـ بەهایەکی زیاتر دێت. کاتێک لە شەڕێکی دەرەوە سەرکەوتوو بن، ئەمەش بە واتای بەدەست هێنانی کۆلۆنی (داگیرکەر)یەک و هەیمەنە دێت. هەرچی ئەم گۆڕانکارییە واتای تاڵانکردنی پاوانە.

کاتێک نموونەی هۆڵەندا و ئینگلتەرا لە زەمان و شوێندا بڵاوبکەینەوە، پێشکەوتنەکان بەرجەستەتر دەبن. ڕێککەوتنەکەی نێوانیان سەرەتا لەپێناو هەیمەنەیان بەسەر ئەوروپادا بەکاری دەهێنن. لە کۆتاییەکانی سەدەی شازدەهەمدا حوکمڕانی ئیمپراتۆرییەتی ئیسپانیا تێکشکا و ئومێدەکانی ئاواکردنی ئیمپراتۆریەتێک لەئاستی ئەوروپادا گوڕزێکی کوشندەی بەرکەوت. لەکۆتاییەکانی سەدەی حەڤدەهەمدا مۆنارشی فەرەنساش دووچاری شکست هاتووە و هیواکانی هەژموونگەرایی لەسەر ئەوروپا زەبری قورسی بەرکەوت. بەرامبەر بە نەمساش پشتگیری لە ئەڵمانیای پروسیا کردووە، لەڕێگای بنەماڵەی هابسبورگەوە گورزێکی کوشندە بەر ئەو خەیاڵانەیان کەوت کە سەبارەت بە ئەوروپا ئاوایانکردبوو. لەگەڵ شەڕی سی ساڵەی هەرە دواییان سەردەمی شەڕی ئایینی کۆتایی پێهات، لەئەنجامی ڕێککەوتنی ویستفالیای ١٦٤٩ەوە لەچوارچێوەی ڕێبازی خۆیاندا لەسەر بنەمای هاوسەنگی دەوڵەتە نەتەوەییەکان بناخەی سیستەمیان داناوە. وەڵامی فەرەنسا بەرامبەر بەمە لەمیانەی شۆڕشی ١٧٨٩ەوە بوو، لە کەسایەتی ناپلیۆندا بە لەدەستدانی هەیمەنەی ستراتیژی ئەنجامگیر بوو. لەهەمان قۆناخدا شەڕەکانی داگیرکاریشیان بردۆتەوە، بە شۆڕشی پیشەسازییەوە هەنگاویان بۆ سەدەی نۆزدەهەم هاوێشتبوو. شۆڕشی پیشەسازی هەیمەنەی ئینگلیزەکانی مسۆگەر کردووە، ڕێگای ئیمپراتورییەتی جیهانی بۆخۆی کردۆتەوە. دێوەکەی ئەڵمانیا کە لە کەسایەتی پروسیادا درەنگ هۆشیاربۆوە، دوای ئەو سەرکەوتنەی لەساڵی

١٨٧٠ بەرامبەر فەرەنسا بەدەستی هێنا، بۆ ئەوەی ببێتە هێزی باڵادەستی ئەوروپا و جیهان کەوتۆتە دوو جەنگی جیهانییەوە، لە هەردووکیشیاندا دووچاری شکستی قورس هاتووە. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا (وەک ئینگلتەرای دووەم) لەهەردوو شەڕی جیهانیش سەرکەوتو بووە، هەر لە دوای شەڕی دووەمی جیهانییەوە بوو بەهێزی باڵادەستی جیهان. ئیمپراتوریەتی روسیای سۆڤیتی کە خوازیار بوو رۆڵی ئەڵمانیا دووبارەبکاتەوە لەشەڕی باڵادەستیدا بە دۆڕاوی دەرکەوت. ئیتر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا رۆڵی ئیمپراتۆرییەتی جیهان دەبینێت، بۆ ئەوەی هەرەس بەربەست بکات، لەرێگای شەڕی خۆپاراستنەوە هەوڵی درێژکردنەوەی تەمەنی خۆی دەدات.

ئاراستە بنەڕەتییەکانی دەسەڵات بەمجۆرەیە. رووباری دەسەڵات کە لە شاری ئوروک دەستی پێکرد، هەزاران لقی لابەلاشی تەقلی لێشاوی خۆی کرد، لە نزیک شاری نیویۆرکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئیتر لە ئاوەکانی زەریادا ون دەبێت. کەنارێکی دیکەی تێیدا بگەڕێت، بیر لە کەنارەکانی زەریای چین دەکرێتەوە، ئەمە گریمانەیەکە. شیمانەی گەیشتن بەوکەنارە لاوازە. شانسی هەڵوەشانەوەی کۆمەڵگای شارستانی شیمانەیەکی بەهێزترە. کێشە ژینگەیی و کۆمەڵایەتییەکان لەئاستی جیهاندا بە رەهەندی گەورە و زەبەلاح گەیشتوون، کەوتنەگەڕی کۆمەڵگا دیموکراتییەکان و ئاواکردنی شارستانێتی خۆیانی کردووە بە یەکێک لە ئەگەرە لەپێشەکان. لەجیاتی باوەڕی ئیمپراتۆری کە پاشماوەی دەوڵەتە کۆنەکانە، یەکێتی کۆنفیدراڵیانەی دیموکراسی شانسی چارەسەرکردنی کێشەکانی زیاترە.

ئەم گریمانانە لەپێناو جێگیرکردنی سەرمایەداری لە شوێنی راستەقینەی خۆیدا پێشدەخرێت. وەک گەشتێکی وەرزشیانەم بۆ ئاسۆی مێشک: رووباری بنەڕەتی شارستانی دوای ئەوەی لەوێستگەی ئینگلتەرا و هۆڵەندا پێچولولێکی قووڵی خوارد دیسان بەردەوام دەبێت. لەمیانەی بەدەستهێنانی رەنگ و خێرایییەکی نوێوە بەردەوامە. ئەو نابەردەوامانەی لەگەڵ پێچولول خورادنەکەیدا بەیەکەوە تەقلی رووباری

بنەڕەتی بوون، ئاشکرایە ڕەنگ و خێراییەکی نوێیان بەلێشاوەکەی دواتری شارستانی بەخشی. دەوڵەت ـ نەتەوەی بەردەوامی دەوڵەتی باو، لەگەڵ پیشەسازییەکەی کە دوای شۆڕشی نیولیتیک گەورەترین شۆڕشی ئابوورییە، دوو ڕووباری بەهێزن. هەر ئەم دوو فاکتەرەشن کە شارستانی باوییان خێراکردووە و هەمەڕەنگییان کردووە.

دیسان ئەو پرسیارە دێتەوە پێشێ کە بەردەوام دەیپرسم: سەرمایەداری لەکوێیە؟ سەرمایەداری لەکوێی دەوڵەت ـ نەتەوە و پیشەسازیدایە؟ ئەم پرسیارە سەبارەت بە ناوەڕۆکی ئابوورییەکەی دەپرسم. چونکە سەرباری ئەوەی بەوردی لە وەلامەکەی دەگەڕێم، بەلام لە ناو ئابووریدا نایدۆزمەوە.

لەوانەیە بەشتێکی سەمەرەی بزانن، بەلام بەگوێرەی من سەرباری هەوڵەکانی داگیرکاری و چەوسانەوە خاوەنە ڕاستەقینەکەی ئابووری ژنە. ئەگەر لەبواری کۆمەڵناسییەوە بخوازین هەڵسەنگاندنێکی واتادار لەبارەی ئابوورییەوە بکەین، ڕاسترین هەڵوێست ئەمەیە: مادام نۆ مانگ منداڵ لەسکی خۆیدا بەخێو دەکات، دوای زایینێکی پڕ بە ئازار و زەحمەت تا بە ئاستێکی دەگەیەنێت کە منداڵەکە بتوانێت پشت بەخۆی ببەستێت هەر ئەو بەخێوی دەکات، هەروەها پیشەی بەخێوکردنی ماڵ دیسان هی ژنە، کەواتە هێزی هەرە سەرەکی ژنە. وەلامەکەی من، وەلامێکی کۆمەڵناسییە کە بەرامبەر بە ڕاستی بەڕێزە. مسۆگەر پەیوەندییەکەشی بەبایۆلۆژییەوە ڕەچاو دەکرێت. نەک هەر ئەمە بەڵکو ڕۆڵی لە شۆڕشی کشتوکاڵ و بەملیۆنان ساڵ کۆکردنەوەی خواردەمەنیدا، تائێستاش دەریدەخات کە تەنیا لە ماڵەوە نا، بەڵکو لەزۆربەی بوارەکانی ژیانی ئابووریدا ئەوەی چەرخ دەسووڕێنێت هەر ژنە. یۆنانییە کۆنەکان کە خاوەن شەرەفی دانانی بناخەی زانستەکانن، کاتێک ئابوورییان بە یاسای ماڵ، یاسای ژن بەناوکردووە هەزاران ساڵ بەر لە ئەمڕۆ ئەم ڕاستییەیان دەستنیشانکردووە.

بێگومان ئەوانەی بەپلەی دووەم بەدوای ژنەوە دێن ئەو چین و توێژانەن کە وەک کۆیلە، سەپان: لەلایەن هێزەکانی شارستانییەوە کە

هونەری سەرەکییان زەوتکردنی زێدەبەرهەم و زێدەبەهایە بەردەوام لەژێر چاودێری و کۆنترۆڵدا بەکار دەهێنرێن. ئەوانەی بەپلەی سێیەم دێن، هەموو جۆرە پیشەکارێک، بازرگانی بچووک، دوکاندار و جووتیارەکانن کە پارچەزەوی بچووکیان هەیە و کەمێک ئازادترن. کاتێک پسپۆڕییە سەربەستەکانی وەک پزیشک، بیناسازی، ئەندازیار و .. هتدیشی بخەینە سەر کەم زۆر تابلۆکە تەواو دەبێت. ڕاستییەکی بەڵگەنەویستە ئەو گروپ یان چین و توێژە کۆمەڵایەتییانەی بەدرێژایی مێژوو چەرخی ئابوورییان سوڕاندووە ئەمانە بوون. دیسان سەرمایەدار، ئاغا و کۆیلەداریان لە ناودا نییە. زۆر ئاشکرایە ئەمانە هێزی ئابووری نین، هێزی داگیرکەر، چەوسێنەر، و تواندنەوەن کە لە دەرەوە دێن و هەموو جۆرە چەوسانەوە، زۆرداری و داگیرکارییەک لەسەر مرۆڤ و ڕەنجەکەی بەڕێوەدەبەن. تەنیا سەرمایەدار نییە کە لە دەرەوە خۆی دەسەپێنێت و ئابووریش نییە. بەڵکو جگە لەو سەرمایەدارانەی بەشێوەی بازرگانی گەورە، کارساز و خاوەن بانکەکانن، ئاغا، ئەفەندی، سیاسەتمەدار، سەرباز و ڕۆشنبیرانی شارستانیش ئەو هێزانەن کە ئابووری نین، بەڵام لەدەرەوە خۆیان بەسەر ئابووریدا دەسەپێنن.

## ب ـ پێدراوەکان سەبارەت بە بانگەشەی سەرمایەداری ئابووری نییە

پێدراوەکان سەبارەت بەو بانگەشەیەی کە سەرمایەداری نەک هەر ئابووری نییە بەڵکو دوژمنی ئابووریشە زۆر سەرنج راکێشن.

١ـ تەنگژە (قەیران) ئابوورییەکان: تاقمی راهیبە "**پۆزیتیڤیستە زانستگەراکان**" کە لە ناو هەوڵی سەلماندنی بانگەشەی "**سەرمایەداری سیستەمێکی ئابوورییە**" دان، بەهەڵە لەمەسەلەی تەنگژەکان تێگەیشتوون، بەهەڵەش خەڵک تێدەگەیەنن. تەنگژە ئابوورییەکان تەنیا یەک روونکردنەوەی هەیە ئەویش لەناسنامەی دوژمنە رۆحی و رکابەرەکەیدا شاراوەیە، هەندێک جار پێناسەیەکی لەمجۆرە پێشدەخەن گوایە تەنگژەیەکن بەرهەمهێنانی زیاد سەرچاوەیانە. لە لایەک بەشی هەرە زۆری جیهان لەبرسان تێکدەشکێت، لەلایەکی دیکەشەوە باس لە بەرهەمی زیاد دەکرێت. دژایەتی سەرمایەداری بەرامبەر ئابووری هەرە زێدە لەم تەنگژەیەدا ئاشکرا دەبێت کە خۆیان بەئەنقەست دەیخولقێنن. هۆکارەکەشی یەکجار ئاشکرایە: قازانجی پاوانکارییە. ئەو بەشەی بۆ رەنجدەران بەجێدەهێڵدرێت، کە بەهەرزانی بەرهەمی هێناوە، کاتێک هێزی کرینی تێر ناکات گوایە تەنگژە دەردەکەوێت. راستتر بەمجۆرە تەنگژە دەخولقێنن. لە رەوشێکی بەمجۆرەدا کام راهیبی ساختە، راستتر بڵێین کامە بەناو ئابووریناس فریای دەکەوێت؟ کێنیس[1]! چی دەڵێت؟ دەڵێت دەوڵەت خەرجییەکان زیاد بکات. چۆن؟ لە رێگای بەرزکردنەوەی هێزی کرِیاری رەنجدەران! یارییەکە چۆن بەهەموو چەپەڵییەکەیەوە

---

١ـ کێنیس: بیرمەندێکی بواری ئابووری ئینگلتەرایە، لەنێوان ساڵانی (١٨٨٣ ـ ١٩٤٦)دا ژیاوە. بەبۆچوونە رادیکاڵەکانی لەسەر ئابووری دەناسرێت. داکۆکی لە کاراکردنی پارە و سیاسەتی ئابووری کردووە لە تێکۆشاندا بەرامبەر مەنگی لە ئابووریدا. پێی وایە کە پێویستە دەستبەرداری لە دەوڵەتی سنووردار و لیبراڵ بکرێت و دەوڵەت دەست لە ئابووری وەربدات. گرنگترین بەرهەمی "تیۆری دامەزراندن و پارە و سوود".

ئاشکرا دەبێت؟ بەدەستێک گیرفانی بەتاڵ دەکەی بەدەستەکەی دیکەت گیرفانەکەی تری پڕ دەکەیت! بەشێوەیەکی ئاشکرا ئەمە سیاسەتێکە "مردن پێشانی رەنجدەران دەدات، بە گرانەتا رازییان دەکات". روون و ئاشکرایە رووبەڕووی پەیوەندییەکی سیاسین. کاتێک بخوازن چالاکی هێزە دیموکراتییەکان بەرامبەر شارستانی سەرکوت بکەن، سەرەتا برسییان دەکەن، دواتر پاش تکاو پاڕانەوە سکیان تێر دەکرێت. رووبەڕووی کۆنترین تەکتیکەکانی شەڕین: ئەگەر بخوازیت شارێک، یان گەلێک رادەست ببێت، سەرەتا ئابلوقەی بدە، برسی بکە! دواتر بەرامبەر بەخۆ بەدەستەوەدان سکی تێر بکە!

لە رێگای سەدان نموونەوە دەتوانم بیسەلمێنم کە ناوەڕۆکی راستەقینەی تیۆری تەنگژەی دروستکراوی سەرمایەداری ئەمەیە کە ئاماژەمان پێکرد. تەنیا تەنگژە بەناوبانگەکەی ١٩٣٠ شیکار بکەین ئەوا تەواوی لۆژیکەکەی ئاشکرا دەبێت. لەو قۆناخەدا چی روودەدات؟ یەکێتی سۆڤێت کە هەیمەنەی ئینگلتەرا پەسەند ناکات بووە بە رژێمێکی جێگیر و سەرکەتوو. بەتایبەتیش هەڕەشەی لەو جیهانە دەکرد کە سەرمایەدارییان پێدەگووت. ئەڵمانەکان کە لە ناوەوەی ئەورووپا لە رێگای مەرجی قورسەوە رێککەوتنی خۆبەدەستەوەدانیان بەسەردا سەپێنرا، بە راستڕەوو چەپڕەوەکانییەوە بەرخودانیان کرد. چینیش بەڕێبەرایەتی ماو راپەڕینێکی مەزنی جووتیاران بەڕێوە دەبات. بەرامبەر بەهەژموونگەرایی ئینگلتەرا، بەئەنادۆڵیشەوە، لەئاستی دونیادا بزاوتەکانی بەرخودانی نیشتمانی سەریانهەڵداوە. ئەو وەڵامەی هەژموونگەرایی ئینگلتەرا بەرامبەر بەم رەوشە دایەوە، تەنگژە دروستکراوەکەی ١٩٢٩-١٩٣٠بوو. لەلایەکەوە ئەو کاڵا و سامانەی لەسەر یەکتر کۆکراونەتەوە، لەلایەکی دیکەشەوە ئەو رەنجدەر و گەلانەی لەبرسان لەناو دەچوون. دەرمانی کێنیسی ئینگلیز هەموو شتێک ئاشکرا دەکات. ئەو شانسە بۆ گەلان و رەنجدەرانی جیهان هێڵرابۆوە کە بەشێوەی تەڵەزم بژین. گوایە سیاسەتی دەوڵەتی سۆشیال (کۆمەڵایەتی)ە. ئەنجامی ئەم سیاسەتانەی دەوڵەتی سۆسیال چی بوو؟ هەنگاو هەنگاو دواخستن، شێواندن و وەک خۆڵێکردنی کۆمەڵگای

دیموکراتیی جیهان کە بە شۆڕشی ئۆکتۆبەری سۆڤێتی دەستی پێکرد. لەساڵی ١٩٩٠دا ڕاگەیاندنی فەرمی لەناوچوونی سیستەمی سۆڤێت بوو کە لەمێژبوو لە ڕێگای سیاسەتەکانی پووکاندنەوەی ناوخۆیی دەستی پێکردبوو (سیاسەتە نادیموکراتییەکانی ستالین لە ساڵانی ١٩٣٠کان. واتە دیکتاتۆرییەتەکەی بۆچی؟ بۆ ئەوەی کاریگەری تەنگژەکەی ١٩٢٩ـ٣٠ بەلاوە بنێت. کێ بەلاوەنرا؟ تاقمەکەی ستالین و ئابووری سۆڤێت). خاڵیکردنەوەی ناوەڕۆکی کۆمەڵایەتی دەوڵەتەکانی ڕزگاری نیشتمانی (ناوەڕۆکی شۆڕش و کۆمەڵگای دیموکراتیان) گونجاندیان بوو بەگوێرەی سیستەمی سەرمایەداری. ئاشکرایە ئەمە ئامانجی سەرەکی تەواوی تەنگژەکانە، کاتێک لە ڕێگای سیاسەتە پیلانکراوەکانی دەوڵەتەوە بەردەوامبوونی هەبوونی سیستەمی هەژموونگەرایی بە ئامانجی خۆی دەگات، دەڵێن بەلانی کەم قۆناخێکی هەستیار بەرتەرەفکرا.

٢ـ دەتوانین تەنگژەکانی بواری نەبوون (قاتی بوون)یش لەچوارچێوەی هەمان پۆلێنبەندیدا هەڵسەنگێنین. ڕەوشێکی بە ئەنقەست وەستاندنی بەرهەمهێنانە یاخود سوودمەند بوونە لەبێچارەیی خەڵک بەرامبەر نەخۆشی و کارەساتەکان. لەرەوشی ئێستای تەکنۆلۆژیا و پۆشتەییدا بیر لە برسێتی و نەخۆشییەکی سەرتاسەری ناکرێتەوە. ئامانجیان ئەوەیە، کاتێک کێشەی هەبوونی سیستەمی هەژموونگەرایی دەرکەوت پەنا ببەنە بەر ئەم جۆرە تەنگژە دروستکراوانە. جارێکی دیکە دەتوانین بەشێوەیەکی ئاشکرا پەیوەندی ئەو ئامێرەی بە "کۆمەڵگا و ئابووری سەرمایەداری" بەناو دەکرێت لەگەڵ هێزی فەرمی هەژموونگەرایی شارستانی ببینین و شرۆڤەی بکەین. میتۆد هەمان شتە: برسی بکە، نەخۆشی و ڕەوشە کلۆلیەکەی بەکار بێنە! تەنانەت بەمجۆرە دەیسەلمێنیت کە فریشتەی فریادڕەس و خوداوەندەکەیانی. تا بەندەکانت سوپاسگوزاریت بکەن!

٣ـ دەبێت باش تێبگەین سەرمایەداری تەنیا دژی ئابووری نییە، دژی کۆمەڵگاشە. زۆر لە مێژە ڕۆزا لۆکسەمبۆرگ لە بواری تیۆرییەوە هەوڵیداوە بیسەلمێنێت تەواوی کۆمەڵگا نابێت بە سەرمایەدارو ئەمە مەحاڵە. بەگوێرەی من پێویستی بە تیۆری وردەکارانە ناکات. ئەگەر

هەموو کۆمەڵگایەک بەشێوەی کۆمەڵگایەکی سەرمایەداری ڕێکبخرێت بە واتایەکی تر بۆ کرێکار و سەرمایەدار دابەش بکرێت، ناتوانێت موڵکێک بەرهەم بێنێت کە بە ئامانجی قازانج بفرۆشرێت! نموونەیەکی قەبە: شیمانەی کارگەیەک بکەین کە سەد کارکەر تێیدا کاردەکات. توانای بەرهەمهێنانی سەد ئۆتۆمبێلیان هەبێت. کۆمەڵگاکەشیان بریتی بێت لە ١٠٠ کرێکار+ ١ سەرمایەدار (چونکە کۆمەڵگا تەنیا لە کارکەر و سەرمایەداران پێکدێت. ئەمەئەو کۆمەڵگایەیە کە بە کۆمەڵگایەکی سەرمایەداری ساف ناودەبرێت. هەڵبەتە ئەم خاڵە هەڵە هەرە گەورەکەی بەلانی کەم بەشێکی زۆری مارکسیستەکانیشە). سەد ئۆتۆمبێلەکە بفرۆشین تا قازانج بکرێت. سەد کرێکارەکە بەکرێکەیان سەد ئۆتۆمبێلەکەیان کڕی. لێرە قازانجی خاوەن کارچەندە؟ سفر. کەواتە ئەوانەی ناچنە یەکێک لە دوو پۆلێنەکەی کۆمەڵگای سەرمایەداری و من لە ئەنالیزکردنی سیستەمدا بە "**کۆمەڵگای دیموکراتی دژی شارستانی**" بەناویان دەکەم، پێویستە بەردەوام هەبن تا کۆمەڵگای شارستانی بتوانێت بەردەوام بێت. "**شارستانی سەرمایەداری**"یش کە هێزە نوێکەی هەژموونگەراییە، وەکو ئەوانی دیکە تەنیا لەمیانەی دژایەتیکردنی کۆمەڵگای دیموکراتییەوە، بەتایبەتیش لەکاتی چالاکییەکانی کۆمەڵگای دیموکراتیدا هارتر دەبێت و بەمجۆرە لەسەر بنەمای دوژمنایەتیکردنی کۆمەڵگای دیموکراتی دەتوانێت بەردەوام بێت. ئەویش لەناو شەڕ یان ئاشتیدا. هەروەکو لە مێژووی تەواوی شارستانیدا لە ئارادابووە، لەمێژووی شارستانی سەرمایەداریشدا هێندە ڕووداو و شەڕ جێگای باسن کە لەژمار نایەن و ئەم باسەمان پشتڕاست دەکەنەوە.

٤ـ بێکاری. وەکو سیستەم سەرمایەداری بۆ ئەوەی ڕادەی قازانجکردن لە زێدە ـ بەها بەرز ڕابگرێت، ناچارە بەردەوام سوپایەکی بێکاران لە یەدەگدا دابنێت. تەنانەت ئەگەر نەبێت، ناچارە بیخوڵقێنێت. بێکاری قۆناخێکە بەپیلان خوڵقێنراوە. لەکاتێکدا سادەترین ئاژەڵ و ڕووەک سوودبەخشن، چۆن بوونەوەرێکی وەکو مرۆڤ بێکار دەکرێت، بەمجۆرەش بێ کەڵک دەبینرێت؟ بۆ نموونە ئایا دەشێت مێرووولەیەکی بێکار هەبێت؟ ئەگەر

تەنانەت مێرووولەش بێکار نەبێت، بوونەوەرێکی پێشکەوتووی وەک مرۆڤ چۆن بێکار بێت؟ لە گەردووندا زاراوەی بێکاری شوێنی نییە. بەڵام بێکاری وەک بەرهەمێکی گومڕایی ژێری ئەنالیتیک و دڕندانەترین کردەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی بەشێوەیەکی دەستکرد دەخوڵقێندرێت و زیندوو دەهێڵدرێتەوە. هیچ بوویەرێک هێندەی "بێکاری" دوژمنایەتی بێ ئامانی سیستەمی سەرمایەداری بەرامبەر بەژیانی ئابووری روون ناکاتەوە. تەنانەت لە رژێمی فیرعەونیشدا جێگای زاراوەی "کۆیلەی بێکار" نابێتەوە. هەروەکو چۆن فیرعەون بێکار نابێت، ئەوا وەک زاراوە بیر لە کۆیلەی بێکاریش ناکرێتەوە. کۆیلەیەک بەردەوام بەهاو کاری هەبووە. تەنیا لە سەرمایەداریدا بێکاری هەیە، واتە دوژمنایەتییەکی بێ ئامان لەبەرامبەر ئابووریدا هەیە.

٥- سەرمایەداری دوژمنی ئامرازی (تەکنیک)ی ئابووریشە. ئاستی زانستی و تەکنۆلۆژی لە ئارادایە، ئیتر ناوی بنێین "**کۆمەڵگای خۆشگوزەرانی**" یان "**کۆمەڵگای بەهەشت**"، هەموو کۆمەڵگایەک بەو ئاستە گەیشتووە هەم وەک سیستەمێکی سیاسی، وەک کۆمەڵگای دیموکراتی درێژە بەهەبوونی خۆی بدات، هەم لەبواری ئابووری بەو شێوازە گەیشتووە گرفتەکانی چارەسەر بکات. "یاسای قازانج"ی سیستەمی سەرمایەداری دەبێتە کۆسپ لەپێش بەکارهێنانێکی بەرهەمداری ئەم ئاستەی زانست و تەکنۆلۆژیا بۆ جێبەجێکردنی پێداویستییەکانی مرۆڤ. ئەگەر یاسای قازانج نەبێت و ئابوورییەک جێگای باس بێت کە تەنیا بەگوێرەی پێداویستییەکانی مرۆڤ رێکخرابێت، ئاستی زانست و تەکنۆلۆژیای ئێستا بەئاسانی توانای دۆزینەوەی هەر چارەسەرییەکی هەیە لەکاتی پێویستدا. ئەم توانایە هیچ کاتێک بە تەواوی بەکارنەهێنراوە، بەپێچەوانەوە بەردەوام لەرێگای خوڵقاندنی تەنگژە، بێکاری و هەڵاوسانی کۆمەڵایەتییەوە خوازیارن درێژە بە شارستانی سەرمایەداری بدەن. کەواتە سەرمایەداری تەنیا دوژمنی ئابووری نییە، بەڵکو دوژمنی ئەو زانست و تەکنۆلۆژیایەشە کە دەتوانێت بەشێوازێکی بەپێت ئابووری بەڕێوە ببات.

٦ـ سەرمایەداری دوژمنی ئەخلاق و بەها مۆراڵییەکانیشە کەبنەمای سەرەکی ئابوورییین. مرۆڤایەتی تەنیا لە ریگای پرەنسیپە ئەخلاقییەکانەوە دەتوانێت پێداویستییە ئابوورییەکانی ریکبخات. لە رەوشێکی پێچەوانەدا لەوانەیە وەک مێروولە زیاد بێت، دە هەسارەی بەقەدەر دونیاش بەشی ناکات. ئەخلاق نەبێت، کۆمەڵگاش دەبێت بە "کۆمەڵگای شێر"، وردە وردە هیچ مانگا و ئاژەڵێک نامێنێت کە شێر بیخوات. ئەو کاتە بۆ شێرەکەش دونیایەک نامێنێت کە تێیدا بژی. واتە سنوورێک بۆ سەرمایەداری دانەنرێت و نەوەستێنرێت، یان کۆمەڵگا بۆ "کۆمەڵگای مێروولە" وەردەچەرخێت و بە لێوارەکانی لەناوچوون دەگات (بۆ نموونە رەوشی چین و ژاپۆن)، یاخود بە رەوشی"کۆمەڵگای شێر"ی دەگەیەنێت (نموونە، کۆمەڵگای ئەمریکا). ئەگەر هەموو کۆمەڵگاکانی وەکو ئەمریکا، چین و ژاپۆنیان لێبێت ئاشکرایە شانسی بەردەوامبوونی کومەڵگای مرۆڤ کەمدەبێتەوە. لێرەدا سەرمایەداری پرەنسیپی ئەخلاقی کردۆتە قوربانی بەناو "ئابووری سەرمایەداری"یەوە. سەردەمێک هەبوو منداڵان، کیژۆڵە بچووکەکانیشیان بە زیاد دەبینی و دەیانکردن بەقوربانی. ئەگەر هەبێت، بەئەخلاقێکی بەمجۆرە مرۆڤ دەکرێتە قوربانی و درێژە بەکۆمەڵگا دەدرێت. لەم چوارچێوەیەدا ئەگەر تەواوی ئەو شەڕانەی مۆری سەرمایەدارییان پێوەیە وەک "ئایینەکانی قوربانیکردنی مرۆڤ" ببینین، ئەوکاتە تێدەگەین رووبەڕووی چ جۆرە "پرەنسیپێکی ئابووری سەرمایەداری" یان بێ ئەخلاقییەکی بووینەتەوە. ئەم بێ ئەخلاقییە تەنیا شانە کومەڵایەتییەکانی ناوەوەی کۆمەڵگا تێکنادات. بۆ یەکەمین جار ژینگە و سروشتیش دەخاتە ژێر حوکمڕانی خۆی، لە ریگای پەیڕەوکردنی کاولکارییەکی مەزنەوە، بەئاستێک گەیشتووە نەک تەنیا ژیانی مرۆڤ بەڵکو هەڕەشە لەژیانی تەواوی زیندەوەران دەکات. ئایا دوژمنایەتیکردنی بوونەوەران و بێ ئەخلاقییەکی لەوە گەورەتر هەیە؟

٧ـ سەرمایەداری دوژمنی ژنانیشە، کە خوڵقێنەرو هێزی سەرەکی ئابوورییین. تەواوی شیکارەکانمان دەیسەلمێنێت کە جێگای ژن لە ژیانی کۆمەڵایەتی و بەهای ئابووری لەپێشەوەیەو ئاستێکی بەرزی

هەیە. هەروەکو چۆن لە تەواوی مێژووی شارستانیدا لە ئارادا بووە، لەسەردەمی سەرمایەداریدا کە بێ رەحمترین قۆناخێتی بەوەی راستینەی 'ژنی لە ئابووری دابڕێنراو'ی تێدا هێنراوەتە کایەوە، بووە بەکاریگەرترین و قووڵترین ناکۆکی کۆمەڵگا. بەشی هەرە زۆری ژنان بێکار هێڵراونەتەوە. سەرباری ئەوەی کارەکانی ماڵەوە سەختترین کارە بەقەدەر پێنج فلس نرخی نییە. سەرەڕای ئەوەی وەچەخستنەوەو بەخێوکردنی منداڵ قورسترین کاری ژیانە، تەنیا بەبێ نرخکردنی ناوەستن، ئیتر بە بەلایەکیشی دەبینن. هەم هەرزانە، بێکارە، ماکینەی خستنەوەو بەخێوکردنی منداڵە، هەم بێ کرێیەو تەنانەت تاوانباریشە! بە درێژایی مێژووی شارستانی ژن لە نهۆمی (ئاستی) هەرە خوارەوەی کۆمەڵگادا جێگیرکراوە. بەلام هیچ کۆمەڵگایەک بەشێوەی سەرمایەداری قۆستنەوەی بەڕێوەنەبردووەو نەیکردووە بە سیستەم. ئەمجارە نەک تەنیا لە نهۆمی خوارەوە، لەسەرجەم نهۆمەکان ژن ئۆبژە (بابەت)ی نایەکەسانی، نەبوونی ئازادی و دیموکراسییە! لایەنی سامناکتر ئەوەیە، بەشێوەیەک کە لەگەڵ هیچ قۆناخێکی مێژوودا بەراورد ناکرێت، کۆمەڵگای رەگەزپەرست بەشێوەیەکی دژوار و بەرفراوان دەسەلاتی خۆی لە رێی مەحرەمترین ئۆرگانەکانی مرۆڤەوە مەرجدار و زیاد دەکات، ژن دەکات بە پیشەسازییەکی زایەند (سێکس)، ئەشکەنجە لەناو سەرجەم چینەکانی کۆمەڵگادا بلاودەکاتەوە، لە قۆناخی شارستانی سەرمایەداریدا **'کۆمەڵگای پیاوسالاری'دەگەیەنێتە بەرزترین ئاست، هەروەکو بلێی تۆڵە لە 'ئیکونۆمۆس' خولقێنەری ئابووری دەکاتەوە، لە هەموو شوێن و زەمەنێکدا دوژمنایەتی ژن و ئابووری دەکات.**

٨ ـ سەرمایەداری کە لە قۆناخی هەرەدوایی جیهانگیریدا لەمیانەی گەیاندنە لووتکە بازاڕی 'بۆرسە، نرخی دراو و سوود' ەوە، ئابووری بۆ یاری قومار وەرچەرخاندووە (پارەی کاغەز)، بە رۆژی نیوەڕۆ هەم دوژمنایەتی خۆی، هەم نەبوونی هیچ پەیوەندییەکی بە ئابووری راستەقینەوە سەلماندووە. هەروەها لەهیچ قۆناخێکی مێژوودا، تا ئەم رادەیە ئابووری بۆ یاری کاغەز و سیستەمی وەهمی ـ شاشەیی

وەرنەچەرخێنرابوو. ئابووری وەکو هەستیارترین شانەکانی کۆمەڵگا هەڵسەنگێنراوە، بەردەوام لەئاستی پیرۆزیدا بینراوە (وشەی پیرۆزی بۆ کۆمەڵگای سۆمەر دەگەڕێتەوەو بە زاراوەی خۆراک دەبەستریتەوە). بەخێوکردن وەک لەپێشترین کێشە بینراوەو هەوڵی چارەسەرکردنی دراوە. سەرجەم ئایینەکان لایەنێکی روونکردنەوەکانیان پشت بە گەرەنتی ئابووری دەبەستێت. جەژن بە یادی دەوڵەمەندی ئابووری یاخود بەیادی ئەوکاتانە رێکدەخرێت کە تەنگژە کۆتایی پێهاتووە. خاڵێک کە مارکس لەجێگای خۆیدا دەستنیشانی کردووە **"ئابووری هێندە گرنگە کە دەبێتە گوزارشتی کۆی ئەو خەسڵەتانەی کاریگەری دەکەنە سەر گشت بوارەکانی کۆمەڵگا"** سەرمایەداری بەوەی وای لێکردووە وەک گۆڕەپانێکی خەستی زهنی سۆزداری و ئەنالیتیکی نەمێنێت، بەستوویەتییەوە بە یارییەکانی پارە ـ کاغەز (قومار)ەوە، کردوویەتی بە نابەرپرسیارترین گۆڕەپانی زهنییەتی ئەنالیتیک ـ قەبڵاندن و لەژیانی واقیعی دابڕیوە، بەمجۆرەش ناوەڕۆکە راستەقینەکەی خۆی خستۆتەڕوو. بەبێ هیچ رەنجێک، لە رێگای یاریکردن بەنرخی دەستاوێز، سوود و نرخەکانی دراوەوە، لەماوەی چەند کاتژمێرێکدا بە ملیار دۆلار (دراوی جیهانگیری) دەستگۆڕکێ دەکات. لەکاتێکدا نیوەی مرۆڤایەتی لەناو سنووری برسێتی و هەژاریدایە، زەحمەتە سیستەمێک وێنا بکرێت کە هێندەی ئەم هەڵسوڕاندنانەی بەها دژایەتیکردنی ئابووری پیشانبدات. سەرمایەداری لە دواقۆناخی خۆیدا کە بە سەردەمی فینانسیش بەناودەکرێت، ئەگەر تەنیا لەمیانەی ئەم لایەنەشیەوە تەماشای بکەین دەبینین سەلماندوویەتی کە سیستەمێکی بێواتایە، لەدەرەوەی ئابوورییە و دوژمنانەیە.

٩ـ سەرمایەداری دەست بەسەر هەردوو بواری سەرەکی بەرهەمهێنان و بەکاربردنی ئابووریدا دەگرێت، دەیخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە، لەرێگای سیاسەتێکەوە کە هیچ پەیوەندییەکی بە پێویستییە راستەقینەکانی خۆراک، پۆشین، حەوانەوە و گەڕانی کۆمەڵگاوە نییە و تەنیا ئامانجی بەدەستهێنانی قازانجی هەرە زۆرە، هەروەکو پێشتریش ئاماژەمان پێکرد لەگەڵ دروستکردنی تەنگژەکانی بەرهەمهێنان و بەکاربردندا لە بناخەوە

پێکهاتەیان تێکدەدات. رەنجی مرۆڤایەتی بۆ هەندێک پرۆژە خەرج دەکرێت کە هیچ پەیوەندییەکیان بەپێکهاتە راستەقینەکانی بەکارهێنان و
[illegible]

## ج ـ سەرمایەداری لەکوێ و کامە زەمەنی راستینەی کۆمەڵایەتی و شارستانیدایە

سیستەمی سەرمایەداری کە ئابووری نییە و دوژمنایەتیکردنی بۆ ئابووری بەرچاوە، لە کامە زەمەنی راستینەی کۆمەڵگا و شارستانیدا جێگیر بکرێت، واتاو شرۆڤەیەکی بەهێز بەدەست دەهێنرێت؟
دەشێت سەبارەت بەسەرمایەداری لەرێگای ئەو چالاکی، پێکدادان و شەڕانەی بەدرێژایی مێژووی شارستانی هێز و سیستەمەکانی شارستانی لەلایەک لەناوخۆیان، لەلایەکی دیکەشەوە لەگەڵ رکاربەرەکانی شارستانی کردوویانە بە ئەنجامێکی واتادار بگەین.
ئاگادارم کە زۆر جەختم لەسەر بابەتەکە کردۆتەوەو دووبارە بۆتەوە. داوای لێبوردن دەکەم، جارێکی دیکە لەمیانەی هێڵە گشتییەکانی و بەشێوەیەکی گشتگیر ئەم خولە سەیر و ئاسۆ فراوانکارەتان پێشکەش دەکەمەوە.

**١ـ چاخی کۆمۆنی سەرەتایی:** (لە مرۆڤی سەرەتاییەوە تا کۆتایی چوارەمین قۆناخی سەهۆڵبەندان، واتا تا ٢٠٠٠٠ ساڵ لەمەوبەر)

لەسیستەمی کۆمۆنەی سەرەتایی دایکدا بناخەی کلتووری ئابووری دایک دادەنرێت. ئەو خۆراکەی لە کۆکردنەوەی خواردەمەنی و نێچیروانییەوە بەدەست دەهێنرێت هەر لە جێدا تەواو دەبێت، سوود لە پێست و بەشە ژێدارەکانیان دەبینن. بەزۆری دایک ـ ژن دەسەڵاتی رێکخەری کلانە (تیرەی سەرەتاییە). جۆرێک لەیەکەمین باڵادەستی دایکانەیە. ناکۆکی و پەیوەندی بنەڕەتی کۆمەڵگای کلان: خۆپاراستنە بەرامبەر ئەو هەلومەرجانەی ژینگەی سروشتی کە جێگەی مەترسین، سوود وەرگرتنە لەوانەی گونجاون و زەمینەی سوود وەرگرتن

بەدەستەوە دەدەن. لەم هەلومەرجانەدا ناسنامەی کلان گرنگییەکی ژیانی هەیە. چەمکی ژنایەتی - مێردایەتی سەریهەڵنەداوە. دایک دەناسرێت چونکە وەچە دەخاتەوە. بەڵام ئەو پیاوەی لەگەڵ ژندا جووت دەبێت هێندە بێ بایەخە ناناسرێتەوە. کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لەسەدا نەوەد و هەشت و نیوی ٩٨،٥٪ی تەمەنی خۆی بەم شێوەیە بەسەر بردووە. درێژخایەنترین شێوەی کۆمەڵگایە. لەبەرئەوەی بەردە داتاشراوەکان یەکەمین و سەرەکیترین ئامرازی بەکارهێنانیان بوون، ئەم قۆناخە بەچاخی بەردی داتاشراویش ناودەبرێت. هەندێک جاریش بە قۆناخی بەربەرێتی سەرەتایی ناودەبرێت. ئەو ناوەی لەبواری کۆمەڵناسیدا پەسەندکراوە "سیستەمی کۆمۆنەی سەرەتایییە"، زمانی ئیشارەت بەکاردەهێنرێت. لە لێواری دۆڵ و گۆلەکان، ئەشکەوت و ساباتەکاندا دەحەوانەوە. مەزەندە دەکرێت نزیکەی دوو ملیۆن ساڵ تەنیا لە ئەفریقیا، ملیۆنێک ساڵیش لە کیشوەرەکانی ئاسیا و ئەوروپا مرۆڤ بەمشێوە ژیاوە. زاراوەی نیشتمان (زێد)، سنوور و موڵک هێشتا دەرنەکەوتوون. عائیدبوون (مەنسوبییەت) تەنیا بە کلان دەناسرێتەوە. کلان لە رێی شتێک یان تەوتەمەوە سیمبۆلیزە دەکرێت. هەرچەندە لەناوخۆیاندا لە قۆناخ و ئاستی پێشکەوتنی لێک جیاوازدا بن، بەڵام سیستەمێکی راگوزارییە کە تا کۆتاییەکانی چوارەمین قۆناخی سەهۆڵبەندانیش درێژەی کێشاوە.

## ٢- چاخی نیولیتیک: (١٥٠٠٠- ٤٠٠٠پ.ز)

دوای تەواوبوونی چوارەمین قۆناخی سەهۆڵبەندان، پاش قۆناخێکی کورتخایەنی مەزۆلیتیک (چاخی بەردینی ناوین ١٧٠٠٠ ساڵ لەمەوبەر) لە بنارەکانی زنجیرە چیاکانی زاگرۆس - تۆرۆس هەنگاو بۆ قۆناخێکی بایەخدار دەهاوێژرێت، کە گەوهەرەکەی شۆڕشی گوندو کشتوکاڵە، بەهۆی بەکارهێنانی بەردی ئۆبسیدیەن[1] ی داتاشراوی بریقەدارەوە بە (چاخی بەردینی نوێ)ش ناودەبرێت. ئەم کۆمەڵگایەی لەبواری شوێنەوارناسییەوە تەمەنەکەی بۆ ١٠٠٠٠ساڵ بەرلەئێستا دەگەڕێتەوە،

١- ئۆبسیدیەن: جۆرە شووشەیەکە بەشێوەیەکی سروشتی لە ئەنجامی تەقینەوەی بورکانەکانەوە دروست دەبێت. رەنگەکەی رەش یان خۆڵەمێشییە.

لەبەرئەوەی کەش و ژینگەی زنجیرە چیا ئاماژە پێکراوەکان پڕ لە ڕووەک و ئاژەڵە سوود بەخشەکان بوو قەڵەمبازێکی مەزن ئەنجامدەدات. دەرفەتەکانی خواردەمەنییان زیاد دەبێت. ڕستن و چنین دادەهێنن. لە ژیانی ئەشکەوتەوە دەربازی ژیانی گوند دەبن. ڕووەکەکان بۆ کلتووری کشتوکاڵ بەکاردێنن، ئاژەڵەکانیش ماڵی دەکرێن. نزیکەی لە ساڵانی ٦٠٠٠پ.ز دا دەفری قوڕین دروست دەکەن. بەتایبەتی لەناوچەکانی چیاکانی ڕۆژهەڵاتی دەریایی سپییەوە تا زاگرۆس کە کەوانەیەک دروست دەکات دەربازی کلتوورێک دەبێت (کلتووری تەل ـ حلف) کە زۆر بەهێزە و بە تۆڕی توند بەیەکترەوە گرێدراون.

میزۆپۆتامیای سەروو دەبێتە مەڵبەندی سەرەکی. لە ڕووی ئامرازی بەرهەمهێنان و دۆزینەوەی نوێوە کۆمەڵگا تەقینەوەیەک بەخۆیەوە دەبینێت. جۆرێک لە قۆناخی پیشەسازی نیولیتیک جێگای باسە. لەم کلتوورەدا دایک ـ ژن بۆ پلەی دایکە ـ خوداوەند بەرز دەبێتەوە. شیمانەیەکی بەهێزە لە پێکهاتنی کۆمەڵگای نوێدا ڕۆڵێکی یەکلاکەرەوەی هەیە. سیستەمی دایکایەتی مۆری خۆی لە کۆمەڵگای کلان دەدات. تازەبەتازە ناکۆکییەکان لەگەڵ پیاو پێشدەکەوێت. هەنگاو بۆ زمانی هێماکردن بە وشە هاوێشتراوە. ئیتر گروپە ڕەش پێستەکانی باشوور کە بە سمیتیک (سامی) ناو دەبرێن، چیتر وەکو جاران، بەئاسانی لە ڕێگای ئەم ناوچەیەوە ناتوانن بەرەو ئاسیا و ئەورووپا کۆچ بکەن. شیمانە دەکرێت ئەم فاکتەرە ڕۆڵێکی گرنگی لە پێکهاتەی کلتووری سامیدا بینیبێت. گروپە زەرد و سوورپێستەکانی باکووریش ناتوانن بەئاسانی بەرەو ناوچەکە بێن. لە کاتێکدا لقەکانیان بەرەو کیشوەری ئەمریکا دەچێت (لەڕێگای گەرووی بیرینگەوە، شیمانەی ساڵانی ١٢٠٠٠-٧٠٠٠پ.ز)، لقەکانی دیکەش لەچین، ئاسیایی ناوین و ڕۆژهەڵاتی ئەورووپادا جێگیر دەبن. گروپی هیندۆ ـ ئەورووپی سپی پێستی ناوەڕاست، بەهۆی فاکتەرەکانی ئاوو هەوا و خۆراکەوە، ڕۆڵی پێشەنگی و حوکمڕان دەبینن. بەتایبەتیش گروپی کەوانەی بەپیت گروپی باڵادەستە. بۆ ماوەیەکی درێژخایەن، تا قۆناخی شارستانی ئەم خەسڵەتەی خۆی دەپارێزێت.

کلتووری هیلالی بەپیت (زێڕین) کە بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا سەلمێنراوە و ببوو بە هەمیشەیی، نزیکەی سالآنی ٦٠٠٠پ.ز بەرەو میزۆپۆتامیای خواروو، ٥٠٠٠پ.ز بەرەو دۆلی نیل، میسر، ئێران و مێرگەکانی دەریای رەش، لە سالآنی ٤٠٠٠پ.ز بۆ تەواوی ئەورووپاو چین دەگواسترێتەوە. هەرچەندە بۆ چین باس لە نیولیتیکێک بکرێت کە بە دینامیزمی ناوخۆیی بەدیهاتبێت، بەلام بەمەزندەی من زیاتر پشت بەو کلتووره دەبەستێت کە بۆی گواستراوەتەوە. گواستنەوەی کلتووری بەخێوکردنی مانگاو بەکارهێنانی (ئۆبسیدیەن) ئەم تێزە بەهێز دەکات. بەشێوەیەکی سروشتی کاتێک ماوە درێژخایەنەکان جێگای باس بێت، هەر ناوچەیەک دەرفەتی پێشخستنی نیولیتیکی خۆی هەیە. بەلام تەواوی نیشانەکان دیاری دەکەن کە چاوگی سەرەکی یەکەمین چەخماخەی کلتووری هیلالی بەپیتە. لە پەلهاوێشتندا کۆلۆنی و داگیرکاری جێگای باس نییە. بەرفراوانی گۆڕەپانە بەتالەکان جێگا بەمجۆرە پەیوەندیانە نادەن. زانیارییەکی کۆمەلناسی و بۆچوونێکی مێژوویی بەگشتی پەسەندکراوە: یەکەمین بزاڤی مەزنی جیهانگیری کە شوێنپەنجەی هەمیشەیی خۆی لە دونیادا بەجێ هێشتووە و تا رۆژی ئەمرۆشمان کاریگەریەکەی بەردەوامە، لەسەر ئەم بنەمایە پێشکەوتووە.

### ٢ـ چاخی شارستانی سۆمەر (٤٠٠٠ ـ٢٠٠٠پ.ز)

لەسالآنی ٥٥٠٠پ.ز لەمیزۆپۆتامیای خواروو قۆناخێکی نوێ تاسالآنی ٣٨٠٠پ.زبەکاریگەر دەبێت و بەکلتووری ئەلعوبێد ناودەبرێت. لەگەل ئەوەی پشت بەکلتووری هیلالی زێڕین دەبەستێت (بەتایبەتی کلتووری تەل ـ حلف)، بەلام بەهۆی هەنگاونانی بۆ کۆمەلگای باوکسالاری، ئەو پێشکەوتنانەی لە دروستکردنی دەفر، دیزە و قاپدا بەدیهێناوە، سەبارەت بە دەستپێکردنی یەکەمین قۆناخەکانی هێرشی داگیرکاری و کۆلۆنی، ئەم سەردەم و کلتووره بایەخی مێژوویی خۆیان هەیە. دەشێت بە کلتووری ئوروکی سەرەتاییش ناوببرێت. بە تایبەتیش لەبەرئەوەی سەرهەلدانی کۆمەلگای پیاوسالاری بە واتای قۆناخی پێش شارستانی دێت گرنگە. کلتووری دایکە ـ خوداوەند گرنگی خۆی لەدەست دەدات. ژن

ناچاردەکرێت دان بە باڵادەستی مسۆگەری پیاودا بنێت. بەڕێوەبەرایەتی پلەداری پێشکەوتنێکی مەزن بەخۆیەوە دەبینێت. بۆ یەکەمین جار لەم کلتوورەدا پێکهاتەی سێکوچکەیی بەڕێوەبەرایەتی شارستانی باو بەشێوەی گەلاڵەنامەیەک بەچەشنێکی بەکاریگەر خۆی رادەگەیەنێت. ئیتر لەم قۆناخەدا دەنگی پێی شامان (جۆرێک لە راهیبە)، شێخ (بەڕێوەبەرە بەئەزموونەکەی کۆمەڵگا) و بەرپرسیاری سەربازی (خاوەنی هێزی جەستەیی) بەهێز دەبێت. کلتووری سەربازی، سیاسەت و ئایینی رۆژهەڵاتی ناوین میراسێکی قووڵی لەم قۆناخەی وەرگرتووە.

ئەمە کلتوورێکە خۆی سەلماندووە. لەسالآنی ٤٥٠٠پ.ز کاریگەرییەکەی دەگاتە میزۆپۆتامیای سەروو. کلتووری تەل - حلف دەخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە، بەجۆرێک لە جۆرەکان دەیکات بە کۆلۆنی. لە تۆمارە شوێنەوارناسییەکاندا سەلمێنراوە کە یەکەمین کۆلۆنیەکان لە ساڵانی ٤٠٠٠پ.ز تا مەلاتیا و ئەلازخی (دوو شاری باکووری کوردستانن) رۆژی ئەمڕۆمان هاتووە. خانەدانێتی ئەو کلتوورەش دەگوازێتەوە کە بنەماڵەی بەرفراوانی پێدەگووترێت. لە کلتوورەکەی پێشووتردا ئەم ئەندامانە نەبوون. شوێنپەنجەی کردەوە وێرانکاریەکانیشیان بینراوە. شوێنپەنجە کلتوورییەکانی هەندێک گوندی تێکدراو گەواهی راستینەی وێرانکاری و داگیرکارین. کلتووری بازرگانی مسۆگەر دەبێت. لەوانەیە یەکەمین هەژموونگەرایی جددی مێژوویی لەگەڵ ئەم کلتوورەدا بەدیهاتبێت.

ئیتر ناوبردنی قۆناخی نزیکەی ساڵانی٤٠٠٠-٣٠٠٠ بە کلتووری ئوروک دەبێت بە عادەت و نەریتێک. کلتووری ئوروک لەسەر میراس و شوێنپەنجەی کلتووری ئەلعوبێد پێشدەکەوێت. جیاوازییەکەی لەگەڵ کلتووری ئەلعوبێد ئەوەیە: یەکەمین پێهەڵگرتنەکانی شار - چین - دەوڵەت ئەنجامدەدات، واتە دەستپێکردنی شارستانی و مێژووی نووسراوە. هەڵبەتە وەرچەرخاندنی کلتووری باوکسالاری بۆ یەکەم کلتووری شارستانی سەبارەت بە مێژوو زۆر گرنگە. ئاودێری دەستکردی میزۆپۆتامیای خواروو رۆڵێکی سەرەکی لەمەدا دەبینێت. پێویستی ئەم جۆرە ئاودێرییە بە ژمارەیەکی زۆری دانیشتوان، هەروەها ئامرازەکانی ئاودێریش دەبنە

مەرجە لەپێشینەکانی ئاواکردنی شار. بەیەکەوە کارکردنی ژمارەیەکی زۆری دانیشتوان کێشەی بەخێوکردن لەگەڵ خۆیدا دێنێت، ئامرازەکانی ئاودێریش پێویستی دروستبوونی پیشەکاران دێنێتەکایەوە. لە رەوشێکی وەهادا ناچارن شوێنی نیشتەجێبوونیان لە قەوارەی شاردا بێت. ئەمەش بەڕێوەبەرایەتی شار و، چارەسەرکردنی کێشەی مەشروعییەتی بەڕێوەبەرایەتی دەسەپێنێت. لە هەمان کاتدا بەرامبەر پەلاماری تیرە تالانکارەکان کە لە مێژە دەستی پێکردووە. پێویستییان بە پاراستنیش هەیە. کاتێک هەموویان یەکدەگرن سێکوچکەیەکی سەرسوڕهێنەری راهیب + پادشای بەڕێوەبەر + فەرماندەی سەربازی سەرهەڵدەدات. داستانی گلگامێش کە سەبارەت بە پادشای ئوروک نووسراوە بەشێوەیەکی کاریگەر و سەرنج راکێش ئەم پێشکەوتنە مێژووییە پیشاندەدات.

شار بۆخۆی ژێرخانێکە پێشکەوتنی لۆژیک دەکات بەناچارییەک. چونکە رێگا لەپێش پرسیارگەلێکی زۆر دەکاتەوە. کێشەکانی لۆژیک دەخەنە جووڵەوە، هەربۆیە ئەویش هزر، هزریش ئامرازە نوێکانی بەرهەمهێنان دەئافرێنێت. دوای ئەو بەڕێوەبەرایەتی ئابووری پێشدەکەوێت، ئەویش بەڕێوەبەرایەتی سیاسی و سەربازی بەدوای خۆیدا دەهێنێت. دەتوانین پێشکەوتنی جیاوازی چینایەتیش وەک بەرهەمێکی شار لەقەڵەمبدەین. شار جڤاتێکە یەکینەکانی تیرەو خانەدانی تێپەڕکردووە. هەروەها وەک پێویستییەکی سروشتە ناکۆکەکەی بەڕێوەبەرایەتی پیاوسالاریی و پلەداری، دەبێت ئەو ئەگەرەش رەچاوبکرێت کە ژمارەیەکی زۆری دانیشتوان لەپێکهاتەی خۆیدا کۆناکاتەوە. ئەگەر تەنیا بەهۆی بواری سک تێرکردنیشەوە بێت، شار دەبێتە ناوەندێکی سەرنجڕاکێش. لەشاردا کۆبوونەوەی ئەو کەسانەی بە هۆکاری جیاواز لە دەرەوەی خێڵ و خانەدان ماونەتەوە، بەگوێرەی ئەوەی توێژی بەڕێوەبراو ـ خەباتکاران پێکدێنن، ئیتر لەدایکبوونی جیاوازی چینایەتی دەبێت بە ناچارییەک. پەیوەندییەکی کۆمەڵناسی، واتە جیاوازی چینایەتی، فاکتەرێکی گرنگی کلتووری ئوروکە. وەک بەردەوامییەکی سروشتی ئەم تۆڕانەی پەیوەندییەکانی شار و دەوڵەت لەدایک دەبێت.

بەڕێوەبەرایەتی شار دەرفەت بە بەڕێوەبەرایەتی تیرەو خانەدان نادات. پێویستی بە بەڕێوەبەرایەتییەکی شارەزایە کە پەیوەندی خوێنی تێپەڕکردبێت. هەروەها بۆ مەشروعییەتیش پێویستییەکی باوەڕهێنان خۆی دەسەپێنێت. ئەوەی فریای دەکەوێت راهیبە، پەرستگایە، کە وەک یەکەمین گەلاڵەنامەی دەوڵەت و یەکەمین مۆکێتی شارە. لە رووی ئایدیۆلۆژییەوە وەک دەزگا ئاواکردنی شار، دەوڵەت و جیاوازی چینایەتی لەناو زهندا، کاری میتۆلۆژیا و بەرهەمی ئایینییە. کارتێکردنی کلتووری مەعنەویی لەلایەن کلتووری ماددییەوە، لە کلتووری ئوروکدا بەرچاوە. پێچەوانەکەشی زۆر بەکاریگەرە. تەنانەت بەهۆی کاریگەری قورسی کلتووری مەعنەوی تێکەیشتن لە کلتووری ماددی زەحمەت بووە. لەڕێگای بونیادێکی مەزنی ئایدیۆلۆژی وەهای لێکراوە نەبینرێت: لە بواری زمان و ناوەڕۆکەوە ئەم پێکهاتەیە بەشێوەیەک لە زهندا جێگیر دەکەن کە بەهەزاران ساڵ بەردەوام بێت، داپۆشینی هەلومەرجە ماددییەکانیش ئەرکی سەرەکی ئایدیۆلۆژییای دەوڵەتی نوێیە. لەکۆمەڵگای سۆمەردا بەشێوەیەکی زۆر کاریگەر ئەم رۆڵە بەرچاو دەکەوێت.

لەکاتێکدا دەوڵەت وەک دەزگایەکی ئیلاهی واتابەخش دەکرێت، چینی خەباتکار وەکو ئەو بەندانە پیشاندەدرێت کە خوڵقاندوویەتی. ئەڵقەی نێوان دەوڵەت و بەڕێوەبراوەکان، لەزاراوەی فریشتەدا رەنگیداوەتەوە. گەورەترین دەسەڵاتی بەڕێوەبەرایەتی وەک خوداوەندی مەزن رەنگدەداتەوە، یاریدەدەرەکانیش وەک خوداوەندە پلەدووەکان، پانتائۆنی خوداوەندەکان، واتە وەک بەڕێوەبەرایەتی باڵای دەوڵەت و سیستەمی کۆبوونەوەی رەنگدەداتەوە. ئەوەی خوداوەندە ژنەکانی جارانن وەکو هێزی کاریگەری ژن هێشتا لەنەوەی پێش شار رەنگدەداتەوە. تەواوی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بۆ زمانێکی نیو ـ میتۆلۆی، نیو ـ ئایینی وەردەگێڕدرێت، لەناو دونیایەکی میتافیزیکی زۆر جیاوازدا، جێگای خۆیان لەیەکینەکانی دانیشتواندا رەوا دەکەن و مەشروعییەتی پێدەدەن. لە بواری ئایدیۆلۆژیدا سەرلەنوێ شار- دەوڵەت ـ چین دەخوڵقێنرێتەوە. سەرلەنوێ خوڵقاندن لەبواری ئایدیۆلۆژیدا، وەک کلتوورێکی مەعنەوی

کە ڕۆڵێکی مەزنی هەیە، دەبێتە شرۆڤەی هەموو جۆرە پێشکەوتنێکی ماددی، تەنانەت شرۆڤەی سروشتیش. بە پشتبەستن بەم سەرلەنوێ خوڵقاندنەوەیە، بەتایبەتی لەمیانەی بەبنەماگرتنی زمانی ڕەنگدانەوەو واتا دەئافرێنرێت، خەڵکیش باوەڕدەکات، لەناو ئەم دونیا نوێیە ڕەوایەدا ژیان پیرۆزی دەبینێت، بەمجۆرە دەژی. پرسیارێکی وەک: ئایا لەگەڵ ئەم سەرلەنوێ لەدایکبوونەوەیەدا لە دایکبوونێکی راستەقینەی ماددی جێگای باسە یان نا؟ واتای خۆی لەدەست دەدات، تەنانەت ئەگەر بشبینرێت بەجۆرێکی دیکە دەکرێت بەخەیاڵ. شۆڕشی ئوروک بەوێنەی شۆڕشی کشتوکاڵ، یەکەمین شۆڕشی گرنگی شارە. سەرچاوەی هەڵقوولانی لقی رووباری دایکە. لقەکانی دواتر جۆگەلەن یان گۆلی داخراون و هەموو جموجۆڵێکیان مەگەر لەسایەی رووباری دایکەوە بێت. ڕاستە، لەچینیش شۆڕشی شار هەیە. لە ئەمریکای ناوەڕاستیش هەیە. بەڵام کلتووری لۆکاڵن: رووباری بنەڕەتی دروست ناکەن، لەوشوێنەی سەریانهەڵداوە یان وشکیان کردووە، یان وەک گۆلێکی مەنگ خەڵکانێکی زۆر کەم سوودی لێ دەبینن. بۆ ئەوەی ببێت بە شارستانی مەرجی گرنگ ئەوەیە: یان دەبێت رووباری بنەڕەتی (دایک) بێت، یاخود دەبێت تەقلی رووباری بنەڕەتی ببێت. شارستانی ساف نییە.

میراسی دەهەزار ساڵەی نیولیتیک پاڵپشتی کلتووری ئوروکیشە. ئەم کلتوورە نوێیە شارستانی (مەدەنییەت)ی پێدەگووترێت. دەتوانرێت وەکو شارنشینی وەرگێردرێت، ڕاستیشە. کاتێک پێکهاتەی ماددی و مەعنەوی و ڕەنگدانەوەکەی بەمجۆرە پێناسە دەکەین، لەڕاستیدا تەواوی شارستانیمان پێناسەکردووە.

وەک پێویستییەکی پێکهاتەکەی کلتووری ئوروک بڵاودەبێتەوە. لەبەرئەوەی بەهۆی زیادبوونی بەرهەمەوە شار لەهەموو بوارێکەوە گەورە دەبێت و تەنیا تا ئاستێک دانیشتوان لەخۆوە دەگرێت یەک لەدوای یەک ڕێگا لەپێش سەرهەڵدانی شاری نوێ دەکاتەوە. کلتووری لادێیی (گوندێتی) هیلالی بەپێتیش بەمجۆرە زیادی کرد و بەشێوەی زنجیر ڕێگای لەپێش کلتووری لادێیی کردەوە. یەکەمین نەوەکانی گوند لە نەوالا

جۆری (ئورفا- سیڤەرەکی کەناری فورات) تاکو چایئۆنوو (دیاربەکر - ئەرگانی، کەناری لقێکی دیجلە)، لەوێشەوە بۆ چەمی هەللان (نزیک زێی باتمان)، بەمجۆرە بەرەو خواروو تا دەگاتە کەرکوک وەک قارچک لەهەموو شوێنێک بڵاودەبێتەوە (نزیکەی سالانی ١٠٠٠٠پ.ز). ئەمەیە ئەو رووداوەی بەگوڵ کردنی کلتوورەکانی ناودەبەین. کلتووری ئوروکیش ئاراستەیەکی هاوشێوەی گرتبوو. زیادبوونی ژمارەی شارەکان واتای زیادبوونی کێبرکێیە. لەبەرئەوەی لە هەمان کاتدا شار بەواتای بازاڕیش دێت، کلتووری نوێ فاکتەری کێبڕکێش لەگەڵ خۆیدا دێنێت. هەر لەئێستاوە بازرگانی بۆتە پیشەیەکی بەرەواج. تەنانەت پیشەسازییەکی پیشەکاران سەبارەت بەکشتوکاڵ و هاتووچۆ (گەیاندن) دەمێکە پەیدابووە. شەڕی نێوان شارەکان بەشێوەیەکی سروشتی کێشەی هەیمەنەی دەخستە رۆژەڤەوە. راستەوخۆ دوای ئەمە قۆناخی پەڕینەوە لە دەوڵەتشارەکانەوە بۆ ئیمپراتۆریەتە سەرەتاییەکان (لە رەوشێکی وەهادا تەواوی شارەکان دەکەوێتە ژێر بەڕێوەبەرایەتی هەمان کەس یاخود هەمان خانەدانەوە) خۆی دەسەپێنێت.

پێویستی ئوروک بە بازرگانی وایکرد هەرە زوو گۆڕەپانی نیولیتیک بخاتە قۆناخی شارستانی و ژێر کۆلۆنیەوە. چەندین پێدراوی لەبەردەستدان دەیسەلمێنن کە بەپێی بەدواداچوونی چینەکانی کۆلۆنی پشتبەستوو بە کلتووری ئەلعوبێد، گۆڕەپانێکی پێشکەوتووتری پەلهاوێشتن و کرداری کۆلۆنیەکانی ئوروک جێگای باسە. بەتایبەتیش لە کەنارەکانی رووباری فورات کۆلۆنی زۆر پێگەیشتووی ئوروک دەبینرێت. پێدراوە شوێنەوارناسییەکان دەیسەلمێنن بەرامبەر بەبزاوتی ئاواکردنی کۆلۆنیەکانی ئوروک کە لە سالانی ٣٥٠٠پ.ز دەستی پێکرد، هەم راپەڕینێکی کلتووری میزۆپۆتامیای سەروو جێگای باسە کە لەسەردەمی کلتووری تەل حلفەوە ئەڵقەکانی گەورەبوونی نەوەستاوە، هەم هەبوونی مەیلی ئاڵوگۆڕی دوولایەنە لەنێوانیاندا نیشاندەدات. چەندین تەپۆلکەی هەڵکۆڵدراو پیشانیدەدەن کە لە سالانی ٣٠٠٠پ.ز ناوچە لەمیانەی دینامیزمە بەهێزەکانی ناوخۆییەوە ئاواکردنی شاری

دەست پێکردووە. ئەو پێدراوانەی بەردەوام لە زیادبووندایە بەرەو هزراندنێکی بەمجۆرەمان دەبات کە هەروەکو چۆن کلتووری شار لە چاوگی سەرەکییەوە بۆ میسر، ئیلام و هەراپا گواستراوەتەوە بەهەمان شێوە بۆ میزۆپۆتامیای خوارووش گواستراوەتەوە. بەتایبەتیش لەم ماوە نزیکانەدا دەستپێکردنی هەڵکۆڵینەکانی (گۆبەکلی تەپە)[١] ی نزیک بە ئورفا (سەلمێنراوە کە سالانی ١٠٠٠٠پ.زدەستی پێکردووە) رێگای لەپێش هەندێک پێدراوو دۆزینەوە کردۆتەوە کە بۆچوونەکانی ئێستا دەگۆڕێت. بوونی کلتوورێک دەست نیشانکراوە کە بەرلەوەی ببێت بە گوند، بەگوێرەی قۆناخی خۆی پێکهاتەیەکی مەزنەو شیمانەی پەرستگای بۆ دەکرێت. ئەگەر بە تەواوی واتای ئەم بەردە چەقێنراوانەش شیکار نەکرێت، مسۆگەرە کە رەنگدانەوەی کلتوورێکی زۆر پێشکەوتووە. لەوانەیە توێژینەوە نوێکان رێگا لەپێش گۆڕینی ناوەندە کلتوورییەکان بکاتەوە.

ئەم پەرەگرافەم بەو ئامانجە نووسی کە تەنیا کلتوورێکی بەهێز دەتوانێت بەرەنگاری پەلهاوێشتنی ئوروک ببێتەوە. کلتووری ناوچە پێشتریش بەرامبەر پەلهاوێشتنە کلتوورییەکانی تر (کلتووری ئەلعوبێد، شیمانە دەکرێت لە سالانی٥٠٠٠پ.زدەستی پێکردووە) بەرخودانی کردو لەسەر کلتووری خۆی سووربوو. لە هەمیشەیی بونیادی کلتووری ناوچەکەوە دەرکی پێدەکرێت کە بەرامبەر کۆچە بەردەوامەکانی سەردەمی مەزۆلیتیک و نیولیتیک کە لەباکوورو باشوورەوە دەهاتن رەوشێکی بەرخودان لە ئارادا بووە.

---

١ـ هەڵکۆڵینێکی شوێنەوارناسییە و لەساڵی ١٩٩٥وە دەستی پێکردووەو تا ئێستاش بەردەوامە.ئەم هەڵکۆڵینە کە لە کێلگەی پیاوێکی ئورفەیی لەئەنجامی دۆزینەوەی پەیکەرو دیزەیەکی بچکۆلانە دەستی پێکردووە، بەپێی ئەو دوا ئەنجامەی شوێنەوارناسە سەرپەرشتیارەکانی پێی گەیشتوون شوێنێک دۆزراوەتەوە کە رووبەرەکەی٣٠٠ـ٤٠٠مەتر دووجایە ولە پەرستگا دەچێت. ئەم پەرستگایە شوێنەوارە سابیتەکەی ئەماوە بەلام کۆڵەکەکانی کە هەمووی بەردی گەورەن و بە تەنکییەک و درێژیەکی وەک یەک لەشێوەی پیتی T ئینگلیزی دانراون. لەسەر قەدە درێژەکەی وێنەی جۆرەها ئاژەڵی لەجۆری گورگ و بزن و ئاسک و مانگا دروست کراون. لەبەردەم کۆڵەکەکانیش شوێنی هەڵکۆڵراوی وەک دەفری فراوان لەسەر بەرد هەیە. شوێنەوارناسەکان پێیان وایە ئەم کۆڵەکە شێوە T یانە هێماکردنن بۆ مرۆڤ و وێنەکانیش بۆ شتێک کە بە پیرۆزیان زانیوە یان لێی ترساون و پەرستوویانە و هەرچی دەفری بەردەم کۆڵەکەکانیشە یان لەکاتی پەرستندا ئاگری تێدا کراوەتەوە، یان خۆراکی بۆ سیمبۆلە پیرۆزەکە تێدا دانراوە.لێرەوە زانایانی شوێنەوارناسی دەچنە سەر ئەو بڕوایەی کە بۆ یەکەمجار لێک کۆبوونەوەو پێکەوەژیانی بەکۆمەڵی مرۆڤ تەنیا لەئەنجامی پاڵنەرە سروشتیەکانەوە نەبووە بەڵکو باوەڕییەکی هاوبەشیش کۆی کردوونەتەوە.
٢

ئەم راستینە، واتە تواندنەوەی کلتووری ئوروک لەناو کلتووری خۆجێیی (لۆکاڵ)دا، هێزی کلتوورەکەی بەرامبەری پیشاندەدات. لەراستیدا پرۆسەیەکە تا رۆژی ئەمڕۆمان بەردەوامە. هێزی دەوڵەت کە پشت بە هێزی بەرهەمهێنان و ژمارەی دانیشتوان دەبەستێت، بالابوونی ئوروکی ئەراهەمکرد. رووبەڕووی نموونەیەکی سەرەتایی هۆڵەندا و ئینگلتەراین.

شرۆڤەی شەخسی من ئەوەیە: میسر، ئیلام (لە باشووری رۆژئاوای ئێرانی ئەمڕۆدایە) و کلتووری میزۆپۆتامیای سەروو بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە لەبەرامبەر یەکەمین پەلهاوێشتنی ئەلعوبێد و ئوروکدا کلتووری شاری خۆیان خولقاندووە. رۆژانە ئەو بەڵگە شوێنەوارناسیانە زیاد دەبن کە دەیسەلمێنن لە سالانی ٣٠٠٠پ.ز بەولاوە لەم سێ مەڵبەندە مێژووییەدا پەرەسەندنی شار خێرابووە و لقەکانی خۆیان رژاندۆتەوە رووباری شارستانییەوە.

ئەوەی گرنگ و بایەخدارترە، لە ناوچە لادێیی و شارەکانی نزیک ئوروک چی روویداوە. مێژوو دەستنیشانی کردووە کە چاخی کلتووری ئوروک لە سالانی٣٠٠٠پ.زکۆتایی پێهاتووەو لەڕێگای خانەدانی یەکەمی ئورەوە قۆناخێکی نوێ دەستی پێکردووە. شیمانە دەکرێت ئەم گۆڕانکارییە ئەنجامی پێکدادانی خەستی شار بێت. هەڵبەتە کاتێک تابلێتەکان دەخوێندرێتەوە ئەم جۆرە گۆڕانکاریانە بەشێوەیەکی روون دەرکی پێدەکرێت. ئاوازەکانی **"شیوەن بۆ نیپور"** و **"لەعنەت لە ئاگادا"** سەبارەت بە ئەنجامی ئەو شارانەیە کە وێرانکراون و سووتێنراون. ئەمە چەندە لەو رووداوانە دەچێت کە ئەمڕۆ لە بەغداد و دەوروبەری روودەدات! یەکەمین و دووەمین قۆناخی ئور تا سالانی٢٣٥٠پ.ز بەردەوام دەبێت. لەسالانی ٢٣٥٠ـ٢١٥٠پ.ز لەژێر بەڕێوەبەرایەتی سەرجۆنی بەناوبانگدا سەردەمێکی خانەدانی دەست پێدەکات. سەرجۆن کە دەتوانین وەک یەکەمین ئیمپراتۆریش پێناسەی بکەین، زۆر بە شانازییەوە پەسنی خۆی دەدات کە چۆن لە رێگای شەڕە خوێناوییەکانەوە حوکمی خۆی بەسەر تەواوی هیلالی بەپیتدا سەپاندووە. دڕندایەتییەکی بێ سنوور، وەک گەورەکردنی شەرەف و هەیبەت باس دەکرێت. دەشێت لەسەرچاوە

نووسراوەکاندا بە دواداچوونی بۆ بکرێت. ئاگادا (ئەکەد)ی کردووە بە پایتەخت، لە تۆمارەکاندا دەستنیشانکراوە کە ئامۆری (ناوێک بوو سۆمەرییەکان بەو تیرانەیان دەگووت کە لە بیابانی عەرەبستانەوە هاتوون بەواتای "پیاوە پیس و تۆزاوییەکان" دێت) بووە. لەسالانی ٢٢٥٠پ.ز ئینجا خەڵکانی زاگرۆس بەرێبەرایەتی گودیا ئەکەد تەخت دەکەن و خانەدانێکی نوێ ئاوا دەکەن. نزیکەی سالانی ٢٠٥٠پ.ز ئەم خانەدانەش دەرووخێت. سێیەمین خانەدانی ئور کە جێی دەگرێتەوە تەنیا سەد ساڵ بەردەوام دەبێت.

مێژوو نیشانیدەدات کە لەسالانی ١٩٥٠پ.ز چاخە شکۆدارەکەی بابل دەستی پێکردووە. لەم شەڕانەی نێوان شارەکاندا دوالیزمێکی سەیر رووبەڕوومان دەبێتەوە. سۆمەرییەکان کۆمەڵگای (دایک) بنەڕەتین کە شارستانیان ئافراندووە. کاتێک دەڵێم دایک بە واتای سەرچاوە (چاوگ) بەکاریدێنم. بنەچەکەیان شیمانە دەکرێت گەل یان کۆمەڵگایەکن زۆر پێشتر لە کلتووری هیلالی بەپیتەوە هاتوون بەلام ئیتر نیشتەجێبوون. زمانی سۆمەرییەکان لە زمانی هەردوو دراوسێ نزیکەکەی ئامۆری و گۆتییەکان جیاوازترە. چەندین وشە هەن کە بەناویەکتردا چوون. بەتایبەتی زیاتر لە گروپی زمانی ئاریانی نزیکە. بەشێوەیەکی زەق لە ریشەی سامی جیاوازترن. هێرشی تیرە ئامووررییە ـ سامییەکان بەردەوامە. شاری ئەکەد، سەرجۆن و خانەدانی ئەکەد بەڕیشە سامی ـ ئامۆرین. تەنانەت شیمانەی لەپێش ئەوەیە: سەرجۆن لە کۆشکەکانی شارەکانی سۆمەردا گەورەبووە، دواتر وەک فەرمانداریێک جێگای خۆی لەبەڕێوەبەرایەتیدا گرتووە. داستانەکان ئەمە پیشان دەدەن. گۆتییەکان زیاتر وەک هاوپەیمانێک نزیکی سۆمەرییەکان دەبنەوە. بنەچەکەیان ئاریانەکانی زاگرۆسن. خاڵی سەیر لێرەدایە، لە ئێراقی ئەمڕۆشماندا تابلۆیەکی هاوشێوە جێگای باسە.

ئەنجام، لەدایکبوون و پێشکەوتنی شارستانی وەک سیستەم، کە بۆ سەرەتای سالانی ٢٠٠٠پ.ز دەگەڕێتەوە لەمیانەی کارەکتەرێکی خوێناوی، داگیرکاری، ئاواکاری و رووخێنەری شار، پڕ هاوپەیمانی،

کۆلۆنی و هەژموونگەرایییەوە دەبێت. کشتوکاڵ کە لە زەوییە ئاوییە بەپیتەکانن هەوڵی تێرکردنی سکی کۆیلەکان دەدات، لەگەڵ ئەو پیشەکاری و بازرگانییەی شارە دراوسێکان و ناوچەکانی نیولیتیکدا سەرهەڵدەدەن زێدە ـ بەرهەمێکی زۆر بەرهەمدێنن. سیستەمی شارستانی لەسەر ئەم بەرهەمە، واتە لەسەر ئەم کلتوورە ماددییە ئاوادەکرێت، کلتوورێکی مەعنەوی سەرسوڕهێنەریش ئاوادەکات، گروپەکانی بەڕێوەبەرایەتی دەکات بە خوداوەند، کۆیلە خەباتکارەکانیش بە پیسایی خوداوەندەکان بەناو دەکات و بچووکیان دەکاتەوە. دەبێت دەرکی پێبکرێت کە لە ئەفسانەکانی خوڵقاندندا بەمجۆرە پیشاندانی ژیانی ماددی روونە. هەرچی خوداوەندە ـ دایکی ئافرێنەرە، لەئێسکی پەراسووی راستی پیاو دروست دەکرێت. ئەفسانەکانی زۆر سەیرن، بەشێوەیەکی کاریگەر مسۆگەربوونی وابەستەیی دایک ـ ژن نیشاندەدەن: ئیتر لە رێگای زمانی ئەم ئەفسانانەوە دەرک بە ژیان دەکرێت، شرۆڤەی لەبارەوە پێشدەخرێت.

هەرچی ژیانی ماددی راستەقینەیە، سەرباری ئەوەی تا رۆژگاری ئەمڕۆمان زمان و شرۆڤەی خۆی نەئافراندووە، هەندێک جار خوازیارە"**بەزمانی ئەزۆپ**"[1] باسی هەندێک لە راستییە کۆنەکان بکات، بەلام لەبەرئەوەی کەس لەو زمانە تێناگات دەکەوێتە رەوشی لاڵی (بێ زمان) و لەدەستدانی واتاوە. نابێت لە یادی بکەین کە تا ئێستا زمانی راستی و بەهرەی گێڕانەوەی نەخوڵقێنراوە.

## ٤ ـ چاخی شارستانی بابل و ئاشوور: (٢٠٠٠ـ٣٠٠پ.ز)

چاخی ئەم دوو شارستانییە کە جیاوازی تایبەت بەخۆیان داهێناوە، هەرچەندە لەبواری کات و شوێندا جیاوازیشیان هەبێت، بەلام لەرووی دەرکەوتنە سەرشانۆی مێژوو و وەک دەسەلات دابڕانیان لە خانەدانی سۆمەر، هاوکاتی و لێکچوونی کلتووری جێگای باسە. شیمانەی بەهێز ئەوەیە: سەرچاوەی خۆیان لە ریشەی سامی ـ ئامۆری وەردەگرن و

---

[1] ـ زمانی ئەزۆپ: شێوازی خیتاب و قسەکردنی کۆیلەکانی سەردەمی رۆمایە.

لەگەڵ خانەدانی ئەکەدی شارستانییەکی هاوبەشیان هەبووە. لێکچوونی زمان و کلتوور، هەروەها سەرچاوە نووسراوەکان بەڵگەی سەلمێنەرن.
دوا چاخی شکۆداری سۆمەرییەکان لەنیپۆری شاری کلتووردا بەسەرچوو. وەک شارێک دەستنیشاندەکرێت کە یەکەمین پەروەردەی ئەکادیمی تێدا بینراوە. شیمانەی بەهێز، دوای خاپوورکردنی شار لەلایەن خانەدانی ئەکەدییەوە، لە تەنیشتییەوە بەرزبوونەوەی شاری بابل کە زمان و کلتووری ئەکەدی مۆری خۆی لێداوە، دەکرێت بە سەرەتای چاخی نوێی شارستانی لەقەڵەم بدرێت. پاش دوا خانەدانی سۆمەر، دوای سێیەمین قۆناخی ئور، لەسەرەتای ساڵانی٢٠٠٠پ.ز بەولاوە بە پێشەنگایەتی بابل دەستبەسەرداگرتنی بەڕێوەبەرایەتی شار لەلایەن خانەدانە نوێکانەوە، رەوشێکی نوێ دەخوڵقێنێت. زمانی ئەکەدی وەک زمانی نوێی شارستانی بایەخدار دەبێت. وەک زمانی بازرگانی و دەسەڵاتی سیاسی لەتەواوی گۆڕەپانی شارستانیدا هەستی پێدەکرێت. دواتر بەناوی زمانی ئارامییەوە دەبێتە ئامرازی لێک تێگەیشتنی تەواوی گەلە شارستانییەکان، رۆڵێکی هاوشێوەی زمانی ئینگلیزی رۆژگاری ئەمڕۆمانی بینیوە. لەلایەنی شارستانییەوە کلتووری ئەکەدی لە رووی ناوەڕۆکەوە میراتگری کلتووری سۆمەرە. ئەو وەرچەرخانەی لە رووی میتۆلۆژییەوە ئەنجامیداوە، لەهەڵکشانی "ماردۆک" وەک خوداوەندێک دەردەکەوێت. "ئەنوما ئەلیش" گرنگترین داستانی ئەم قۆناخەیە. ماردۆک رۆڵی سەرۆکی خوداوەندەکانی ئەو کلتوورە دەبینێت کە خوداوەندی - دایک بەخراپەکار پیشاندەدات، کلتووری پیاوی - باڵادەست دەکات بە سیمبۆڵ و ئیلاهی. لە کلتووری یۆناندا زیۆس، لە کلتووری رۆمادا جۆپیتەر، لەکلتووری هیندۆ - ئەوروپیدا گودیای بە ریشە ئاریانی (گۆتە ئەڵمانەکان، گۆت خوداوەندە، لەهەمان بنەچەی GOTەوە دێت، وشەی خودا کە تائێستا لە زمانی کوردیدا بەکاردەهێنرێت لەهەمان چاوگەوە دێت)، لە کلتووری عەرەبەکاندا ئەڵلا، لای هیندییەکان براهمان و چینییەکانیش تاوۆ، نوێنەرایەتی هەمان پشتێنە (نەوە)ی ئیلاهی دەکەن.
قۆناخی هاوبەشی شارستانی و لێکچوونی کلتووری لەم قۆناخەدا،

هەرە زێدە لەناولێنانی خوداوەندەکاندا خۆی پیشاندا کە هێمای سەرەکییە و نوێنەرایەتی کۆمەڵگا دەکات. وەک ناو هەموویان لە سالانی ٢٠٠٠پ.ز دا دەرکەوتوون، ئەمەش ڕێکەوت نییە. سەرچاوەی خۆی لەو کلتوورە هاوبەش و قووڵە وەردەگرێت کە بناخەکەیان پێکدێت. بەوشێوەیەی کراوە بە سیمبۆڵ کلتووری پیاوسالاری دەکرێتە ئیلاهی (دایک - ژن و ئابوورییەکەی ئیتر لەلایەن پیاوی فێلباز و زۆردارەوە زەوتدەکرێن). ناوی سەرەکی دایکە - خوداوەند، بەزمانی ئاریانی ستار (ئەستێرە)، بە سۆمەری ئینانا، بە زمانی هیتیتی کیبەلە، زمانی سامی عەشتار و زمانی هیندیش کالی چەندەی دەچێت کز دەبێت، ئیتر ناوی خوداوەندە پیاوەکانی ئاماژەمان پێکرد شکۆدار دەکرێت. لەگەڵ کشانەوەی ژن بۆ نهۆمی هەرە خوارەوەی کۆمەڵگا، لەسالانی ٢٠٠٠پ.ز لەرووی زمان و کلتووریشەوە شکستێکی مەزن و کەوتن جێگای باس دەبێت. لە کلتووری ماددی و مەعنەوی شارستانیدا کۆیلایەتی رەگەزی ژن لەپێش کۆیلایەتی تیرەو پیاوەوە دێت، لەڕاستیدا ژن لە قووڵترین ئاستی کۆیلایەتیدا بەدۆخێک گەیەنراوە کە تێکشکێنراوە، دەنگی کپ کراوەو هەناسەی لەبەر براوە، سووکایەتی پێکراوە، نەعلەتی لێکراوەو لەرەوشی بوونەوەرێکی مردوودایە. پیاو- مێردایەتی لەسەر زەمینەی ژنێتی و دەسەڵاتدارێتی بەسەر ژن بەرز دەبێتەوە. بەردەوامکردنی ئەم ستاتۆیەی ژن لای عەرەبەکان و ئەو کۆمەڵگایانەی لە رۆژهەڵاتی ناویندا خاوەن هەمان زەمینەی کلتوورین ئەم هەڵسەنگاندنە پشتڕاست دەکاتەوە. تاوانەکانی نامووس فاکتەرێکی بچووکی ئەم کلتوورەیە.

سەردەمی بابل بەر لەسەردەمی ئاشوورە. لێرەدا هەنگاو هەنگاو ئاراستەگرتن بەرەو میزۆپۆتامیای باکوور رۆڵێکی گرنگ دەبینێت. لە کاتێکدا بابل دەکەوێتە باشووری بەغدادی رۆژی ئەمڕۆمان، ئەو شارەی بەناوی خوداوەندی ئاشوور کرابوو نزیکی شاری موسڵی رۆژی ئەمڕۆمانە. دواتر بووە بە نەینەوا.

هەروەکو دەزانرێت شاری بابل بەهەندێک تایبەتمەندی سەرنجی راکێشاوەتە سەرخۆی. پێش هەمووشتێک تەواوی کلتووری شاری

نیپوری هەرسکردووە کە دواترین شاری کلتووری سۆمەرییەکان بوو. لەقۆناخی ئیمپراتۆرییەتدا توانای کلتووری و رەچەڵەکە سەرەکییەکانی تەواوی کۆمەڵگا هاوچەرخەکانی بۆ بابل گواستۆتەوە. بورجە بەناوبانگەکەی بابل و بەکارهێنانی ٧٢ زمان ئەفسانە نییە راستییە. راستتر بڵێین، بە ئەفسانەکردنی راستییە. قۆناخی ١٩٠٠ـ١٦٠٠پ.ز شکۆدارترین سەردەمی شارستانی بابلە. لە تەواوی ناوچەکانی شارستانیدا وەک هێزێکی ئیمپراتۆری حوکمی خۆی دەکات. حامورابی کە بەناوبانگترین ئیمپراتۆری شارستانی بابلە، دوای سەرجۆن دووەمین ئیمپراتۆری مێژووە. هەرچەندە "**یاساکانی حامورابی**" کە ناوی خۆی لێنا بەردەوامی نەریتی یاساکانی پێش خۆیشی بێت، بەڵام لە رووی کاریگەری و مانەوەی شوێنپەنجەکانییەوە لە مێژوودا بایەخ و گرنگی هەیە و بەیەکەمین دادەنرێت. "**یاسا ئیلاهی**"یەکان بێت یاخود "**یاسا حقوقی**"یەکان مسۆگەرە کە شوێنپەنجەی قۆناخی حامورابی پێوە دیارە. دوای شەڕێکی خوێناوی تەواوی شارەکانی ئەو سەردەمەی خستۆتە ژێر حوکمڕانی خۆیەوە. هەروەها بەپێی پێدراوەکان دەرکی پێدەکرێت کە باڵادەستییەکی بێ ئامانی بەسەر کلتووری تیرەکانی ناو سنوورەکانی خۆی و دراوسێکانیدا سەپاندووە. لە مێژووی ناوچەکەدا لە کاتێکدا پادشا ـ خوداوەندەکانی میسر بە "**فیرعەون**" ناودەبرێن، پادشا خوداوەندەکانی ئاشوور و بابلیش بە "**نەمرود**" ناودەبرێن.

دەرکەوتنی یان راکردنی حەزرەتی ئیبراهیم لە ئور (ئورفای ئەمڕۆ) کە لە (عهد القدیم ـ تەورات: کۆنترین کتێبی پیرۆزی یەهودییەکان)دا باس دەکرێت، وەکو دەرکی پێدەکرێت لە نزیکەوە پەیوەندی بە ستەمکاری نەمرودەکانی بابلەوە هەیە. لە مێژوودا نووسراوە کەنزیکەی ساڵانی ١٧٠٠ـ١٦٥٠ حوکمڕانی کردووە. کاتێک بیر لەوە بکرێتەوە کە کۆچی حەزرەتی ئیبراهیمیش لەهەمان بەرواردا بووە، ئەوکاتە زۆر بەباشی دەرک بە کێشمەکێشی نێوان نەمرود ـ حەزرەتی ئیبراهیم دەکرێت. حەزرەتی ئیبراهیم سەرۆکی تیرەیەکە. تیرەکەی یەکێک لەو تیرانەی دەوروبەری ئورفایە کە لەڕێگای کشتوکاڵ، ئاژەڵداری و بازرگانییەوە

گوزەران دەکەن. هەروەکو رۆژگاری ئەمڕۆمان کۆمەڵگا تێکەڵەکانی راگوزاری لەناوچەکەدا زۆرن: کە لە بواری بنەچە لەژێر کاریگەری کلتووری بەڕیشە ئاریانی و سامیدان.

بەهای سیمبۆڵی چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیم و تیرەکەی دەزانرێت کە نیو ئاینی، نیو میتۆلۆژییە. لەقەڵەمدانی وەک باپیرەی هەرسێ ئاینی تاکخودایی و کاریگەری لەسەر تەواوی ئاینەکانی جیهان گرنگییەکەی پیشاندەدات. چەندین تیرە و شار بەرامبەر سەرەڕۆیی نەمرودەکانی بابل (ئەمانە تەواوی بیرۆکراسییە لە پێشینەکانی ناوەند و ناوچەکانی سەر بە بابل دەگرێتەوە) بەرخودانیان کردووە. ئەو تیرە و تەنانەت گوند و شارانەی هێشتا لەژێر کاریگەری بەهێزی سیستەمی کۆمیناڵدان، لەژێر ناوی کامە خوداوەند (ناوی ئەڵلا) ئەنجامبدرێت، بەرامبەر بە داسەپاندنەکانی ئیمپراتۆرییەت بەرخودان دەکەن. ئەو کۆمەڵگایانەی نازانن کۆیلایەتی چییە، زۆر بە زەحمەت دەکرێن بەکۆیلە. هەندێک جار لەجیاتی کۆیلایەتی، لەناوچوونی تەواویش دەدەنە بەرچاو. لە مێژوودا ئاشنایی نموونەی لە ژمارنەهاتووی بەمجۆرەدەبین.

ئاینی حەزرەتی ئیبراهیم یاخود چیرۆکەکانی لە راستیدا نوێنەرایەتی کلتووری بەرخودانی دژی ـ نەمرود دەکات. سەرچاوەی یەکەمی ئەم کلتوورە، زەمینەو زەمەنی ئیمپراتۆرییەتی بابلی سالانی١٧٠٠پ.ز. سەرچاوەو لقی دووەم، چیرۆکی پێهەڵگرتنی سالانی ١٣٠٠پ.زحەزرەتی موسایە بەرامبەر بە فیرعەونەکانی میسر. کلتووری بەرخودانی ئەو جڤاتانەیە کە نیو کۆیلەن، لەسەر نەریتی حەزرەتی ئیبراهیمن و داخوازی رزگارییان هەیە، بەرامبەر ئەو کلتوورە وەستاون کە نوێنەرایەتی دەسەڵاتی فیرعەونی میسر دەکات. کۆیەکەشی نەریتی پەرتووکی پیرۆز پێکدێنێت. بەرامبەر بە نەمروود و فیرعەونەکان کە خۆیان بە دوو پادشا ـ خوداوەندی بەهێز دادەنا بەرخۆدانێکی درێژخایەن بەڕێوەچوو، تەنانەت ئەم نەریتە هەنگاو بەهەنگاو بوو بە کلتوورێکی نوێ، دوای ئەوەی لەپاش حەزرەتی موسا (ئەو نەریتەی بەهارونی برای موسا دەستی پێکرد، سامۆئیلی یەکەم و دووەم و چەندین پێغەمبەر) لەرێگای

راهیبە بەهێزەکانەوە نوێنەرایەتی دەکرێت، لەمیانەی حەزرەتی داود و حەزرەتی سولەیمانەوە لە سالانی ١٠٢٠-٩٠٠پ.ز لەسەر خاکی ئیسرائیل - فەلەستینی رۆژی ئەمڕۆمان پادشایەتییەکی بەهێز ئاوا دەکەن. تا کاروان و کاریگەری ئەم نەریتە و نوێنەرەکەی (تیرەی عیبرانی) لەمێژوودا بەسەرنجەوە شرۆڤە نەکەین، لە مێژووی شارستانی و بەرخودانە هەمەجۆرەکانی بەرامبەری تێناگەین، ناتوانین شیکاری بکەین (کاتێک دەڵێم هەمەجۆر، مەبەستم سەرجەم بزاوتە ئایدیۆلۆژی، میتۆلۆژی، فەلسەفی، ئایینی، سیاسی، جەستەیی، ئابووری، حقوقی، خێلایەتی و نەتەوەییەکانە).

یەکەمین قۆناخی بابل لە ساڵی ١٥٩٦پ.ز دا لەلایەن کاشییەکانەوە کۆتایی پێهێنراوە، کە هێزێکی بەبنەچە هۆری و هیتیتین. لێرەدا ئەوەی سەیر و جێگای بایەخە رێککەوتنی نێوان هیتیت و ناسنامەی کاشییەکانە. ئەم بابەتەی لەلایەن مێژووناسەکانەوە هێندە باس نەکراوە، سەبارەت بەفێربوون و ناسینی مێژووی گەلانی ناوچەکە زۆر جێگای بایەخە. بەهەرحاڵ تێکشکاندنی نەریتێکی سەربازی، سیاسی و کلتووری بەهێزی وەک بابل ئاسان نییە و پێویستی بە دژە کلتوورێکی زۆر بەهێز هەیە. کەچی ئەوەی نەریتی ئیبراهیمی ئەنجامیداوە کۆچی بەردەوامە، راستتر راکردنی بەردەوامە. تەنیا کاتێک بۆشایی ببینێت دەتوانێت ببێتە هێزی سیاسی.

شیکارکردنی ئەو نەریتەی لە دەورووبەری چیاکانی زاگرۆس - تۆرۆس پێکهات و لەسەردەمی ئوروک و ئوردا بریتی بوو لە فیدراسیۆنی تیرەکانی زاگرۆس و پادشای بەناوبانگی گۆتییەکان گۆدیا (سەیرە، گەورەترین خوداوەندی ئاریانییەکان هەمان ناوی هەیە. کەوتۆتە ناو جۆرێک لە قۆناخی دژە - شارستانی) دوا نوێنەری بووە کە لە ساڵی ٢١٥٠پ.زکۆتایی بە بنەماڵەی ئەکەد هێنا، رۆڵی کلیل دەبینێت. زۆر کەم باسکردنی یان هیچ باسنەکردنی ئەم نەریتە لەمێژوودا بەو ئەندازەیەی سەیرە، گۆڕەپان و بوارێکی گرنگی توێژینەوەیە کە پێویستی بە تاوتوێکردن هەیە.

ئەگەری بەهێز ئەوەیە کە بەرامبەر بە کۆلۆنی کلتووری ئەلعوبێد، یان کۆلۆنییە سیاسی و بازرگانییەکانی ئوروک و ئور، جڤاتی ئەو تیرانەی پێشتر کلتوورێکی هەمیشەیی کشتوکاڵیان خوڵقاندووە، تۆڕێکی بەرفراوانی گوندیان ئاواکردووەو گەیشتوونەتە لێوارەکانی ئاواکردنی شار، یان هیچ دوور نییە پێشتر شاریشیان ئاوانەکردبێت (گردی پەرستگا گەورەکەی گۆبەکلی تەپەی ـ ئورفا شیمانەی ئەوەمان بەبیر دێنێتەوە. ئەوانەی لە سالانی ١٠٠٠٠پ.ز ئەم کلتوورەیان ئافراندووە، زۆر بەئاسانی دەتوانن کلتووری شارێک ئاوا بکەن کە زۆر لە ئوروک و ئور پێشکەوتووتر بێت. بیناسازی و میتۆلۆژیەکەی ئەمە نیشاندەدات)، بەیەکەوە بەشێوەیەکی هاوبەش شاخ و بنارو دەشتەکانیان بەکارهێناوە، هەر ئەوان بەرخودانیان کردووە، بەرامبەر بەهەرەشەی هاوبەش فیدراسیۆنیان ئاواکردووە، دواتریش یەکینەی سیاسی هەمیشەیی بەهێزتریان پێکەوەناوە.

ئەم جڤاتانەی لە سالانی ٣٠٠٠پ.ز بەگشتی لەژێر ناوی هۆرییەکاندا کۆبوونەوە کە ناولێنانێکی سۆمەرییەکان بوو، لەساڵی ١٦٥٠دا دوو یەکینەی سیاسی بەهێزیان لەباکوور بەناوەکانی هیتیت کە ناوەندەکەیان کانیش و هاتوشاش بووە، میتانییەکان ناوەندەکەیان واژوکانی (خۆشکانی: کانی جوان، جەیلان پناری ئەمڕۆ، و شاری سەرێ کانی بەرامبەری کە دەکەوێتە سوریاوە) ئاواکردووە. لەرێگای چەندین بەڵگەوە سەلمێنراوە کە میتانییەکان لە کەرکوکەوە (زاگرۆس) تا تەل ئەلئەعلا (ئەمانۆس) بەرفراون بوون، لە سالانی ١٤٠٠پ.ز دا بەیەکەوە لەگەڵ میسر و هیتیتەکان سێیەمین هێزی کلتووری و سیاسی بوون. لەگەڵ هیتیتەکان زمان و کلتوورێکی هاوبەشیان هەیە. پەیوەندی بەهێزی خوێنیان لەنێواندا هەیە و لە ئاستی سیاسیدا هاوسەرگیری لەگەڵ یەکتردا دەکەن. ئیمپراتۆری هیتیتەکان شوبیلیۆلیۆما لە نامەیەکدا بۆ شای میتانییەکان ماتیزاوا دەنووسێت" کچی خۆمم پێشکەش کردوویت، وەک پیاو با بەیەکەوە ناوچەکە بەڕێوەببەین". لە نووسینە هیرۆگلیفییەکانی میسردا هێزی میتانییەکان دەبینرێت. لە کۆشکەکانی میسردا چەندین بووکی میتانی هەن. نەفەرتیتی بەناوبانگ یەکێک لەوانەیە.

خوداوەندە ژنە بەناوبانگەکەی هیتیت پودوهاپا بەڕەچەڵەک هۆرییە. هەروەکو دوانوێنەری شوێنپەنجەی ژنە لەناوچەکەدا. گۆتی و کاشییەکانی پێشتر، بەناوە نوێکەیان میتانییەکان، لقەکانی خوارەوەی هۆرییەکانن. وشەی هۆری لە زمانناسیدا بە زمانی سۆمەری بەواتای "شاخییەکان" دێت، کە ناوێکە تاکو ڕۆژگاری ئەمڕۆشمان ناوەناوە بەکاردەهێنرێت. لەوەش گرنگتر، تەواوی نیشانە بەهێزەکان دیاری دەکەن کە پادشاو میرەکانی ئەو دەوڵەتەی بە هیتیت ناودەبرێت هەموویان ناوەکانیان هۆرییە، ئەو ژنانەی کە هاسەرگیریان لەگەڵ کردوون شاژنی هۆرییەکانن. بەگوێرەی شرۆڤەی خۆم، میتانییەکان یەکینەیەکی سیاسی یاخود پێکهاتەیەکی شێوەی کۆنفیدراسیۆنن کە لە کەوانەی بنارەکانی باشووری زنجیرە چیای زاگرۆس - تۆرۆس، واتە لە هیلالی بەپیتدا ئاواکراوە: لقێکی جڤاتەکانی هۆریش لەباکوور تا چیاکانی دەریای ڕەش، لە تەواوی باکووری تۆرۆسیش لەژێر ناوی هیتیتەکاندا وەک ڕێکخستنی دووەمین لق بەهێزترەو تەنانەت نوێنەرایەتی ئیمپراتۆرییەتێکی سەرەتایی دەکات. دەشێت بناخەی کلتووری، خزمایەتی، پەیوەندی دیبلۆماسی و لەهەمووی گرنگتر ڕێککەوتنی هیتیت ـ کاشییەکان وەک فاکتەر و بەڵگەی سەلماندنی ئەم شرۆڤەیە پێشکەش بکرێت.

بەدڵنیاییەوە دەتوانرێت بگووترێت کە قۆناخی یەکەمی بابل لەلایەن ئەم بەرخودانە کلتووری و یەکێتییە سیاسییەی باکوورەوە کۆتایی پێهێنرا. بابل لەدووەمین قۆناخی خۆیدا (١٦٠٠ـ١٣٠٠پ.ز) یان لەژێر باڵادەستی ئەم یەکێتییە سیاسییەدا، یاخود لەناو جۆرێکی ڕێککەوتن لەگەڵیدا بەڕێوەبراوە، وەک گەورەترین ناوەندی کلتووری و بازرگانی سەردەمی خۆی بەردەوام بووە. وەک پاریسی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان بووە.

کلتووری بابل بەقووڵی کاریگەری کردۆتە سەر هەرسێ پەرتووکی پیرۆز. شوێنپەنجەیەکی زۆری دەبینرێت. دەشێت وەک کۆگای بازرگانی، بازاڕی ناوچەو شاری زانکۆش پێناسە بکرێت. ڕاشکاوانە دەتوانرێت بگووترێت ڕۆڵی ناوەندی نێودەوڵەتی شارستانی سەردەمی خۆشی بینیوە (ڕاستتر لەنێوان قەوم و مەزهەبەکاندا). سەرجەم تەڵەکەبازییە

هەواڵگری، بازرگانی و سیاسییەکان لە بابل دەهۆنرانەوە. رۆڵی مەڵبەندی پیلانگێڕانەش نابێت پشتگوێ بخرێت. وێناکراوەکانی لە پەرتووکی پیرۆزدا زۆر کاریگەرە. بەکورتی بەشێوەیەکی شایستە رۆڵی مەڵبەندی شارستانی دەبینێت. لەم لایەنەوە زۆر لە لەندەنی رۆژی ئەمڕۆمان دەچێت.

سێیەمین قۆناخی بابل (٦١٠-٣٣٠پ.ز) بەرێککەوتنیان لەگەڵ میدییەکان دەستی پێکرد (زۆر لەرێککەوتنی شیعە - کوردی رۆژگاری ئەمڕۆمان دەچێت) کە لەساڵی ٦١٢ نەینەوای لەسەر نەخشە سڕیەوە، بەفەتحکردنی ناوچەکە لەلایەن ئەسکەندەرەوە ٣٣٠پ.ز کۆتایی دێت. بە ئیمپراتۆرییەتی نەبوخزنەسری بەناوبانگ دەناسرێتەوە. دوایین ئیمپراتورییەتی گەورەی میزۆپۆتامیایە. لەم بەروارە بەدواوە میزۆپۆتامیا هێدی هێدی رۆڵی ناوەند لە دەستدەدات. دوای ئەوەی نزیکەی ١٥هەزار ساڵ لە دۆڵەکانی دیجلە - فورات، لقەکانی، چیاو دەشتەکانی نێوانیاندا وەک مەڵبەندی سەرەکی مێژوو، کلتووری مرۆڤایەتی پێگەیاند و لە تەواوی کیشوەرەکاندا بڵاویکردەوە، زۆر ماندوو، بەڵام بە ئومێدەوە ئەمڕۆ بۆ قۆناخێکی نوێ ئامادە دەبێت.

چاخی ئاشووریش بەهەمان شێوە دەتوانرێت بۆ سێ قۆناخ جیابکرێتەوە. یەکێک لەپێکهاتە سیاسی، سەربازی و بازرگانییە هەرە بەهێزەکانی مێژووی کۆنە. رۆڵی ئەلقەی سەرەکی لەنێوان شارستانی سۆمەر و شارستانی گریک - رۆمادا دەبینێت. لە شارستانیدا بەخوێنڕێژی، زۆرداری و خوڵقکاری بازرگانییەوە دەناسرێت. رووخانی لەلایەن تەواوی گەلانی رۆژهەڵاتی ناوینەوە (گەلی خۆشی لەناودا) وەک جەژنێک پیرۆز دەکرێت. لەم پیرۆزبایانەدا رۆڵی کۆتاییهاتنی زۆردار و ستەمکارەکانی لەجۆری نەمرود و فیرعەون یەکلاکەرەوەیە.

قۆناخی یەکەم (٢٠٠٠-١٦٠٠پ.ز) قۆناخی بەرزبوونەوەی ئەرستۆکراتی بازرگانییە. بەشێوەیەکی کاریگەر و تۆکمە بازرگان و هێزی سیاسی لەهەمان کەسایەتیدا وەک پاوانێک نوێنەرایەتی دەکرێت. دەتوانرێت بگووترێت کە پاوانی هێزی سیاسی و بازرگانی جاری یەکەم لەلایەن جڤاتی ئاشوورەوە ئاواکراوە. بەشێوەیەکی راشکاوانە دەتوانین بڵێین پشتیان بە

میراسیێکی مێژوویی بەرفراوان بەستووە، توانا بازرگانییەکانی ئەلعوبێد ـ ئوروک ـ ئور ـ بابل یان بەکارهێناوە، لەسەر رێگای ئەوان بەردەوام بوون، لەسالانی ٢٠٠٠پ.ز بەولاوە لە تەواوی گۆرەپانی شارستانی و گوندەکانی نیولیتیک و جڤاتە کۆچەرەکانی دراوسێدا بازرگانییان پێشخستووە، لەهەندێک ناوەندی بازرگانی دیارو سەرەکیدا کۆلۆنی بازرگانیان ئاواکردووە، بۆ یەکەمین جار وەک "سەرمایەدارانێکی" سەربەخۆ کاریان کردووە، خاوەن تۆرێکی بەرفراوانی کاروانە بازرگانییەکان بوون، شارستانییەک بوون تێگەیشتن و هۆشیاری بازرگانیان لە بەرزترین ئاستدا بوو، بۆ ئەوەی تەواوی ئەم پەیوەندیانەش بخەنە ژێر گەرەنتییەوە بەشێوەیەکی زۆر بێ رەحمانە هێزیان بەکارهێناوە. هەروەکو شاری ئەمستردامی هۆلەندا، نەینەوا نوقمی دەولەمەندترین زێڕ و زیو دەبێت. ناوەندی باشترین جۆری قوماش، بەناوبانگترین کۆشکەکان لە نەینەوا و شارە نزیکەکانی کۆدەبێتەوە. هەروەکو پێشبڕکێی ئەمستردام لەگەڵ پاریس، رەقیبی نەینەوا (ئاشوور)یش بابلە. بۆ ئەوەی یەکتری بخەنە ژێر کاریگەری و هەژموونگەرایی یەکترەوە هەولێکی زۆریان داوە. بەهۆی بەرژەوەندییە دوولایەنییەکانیانەوە پێکدادانە سەربازی، سیاسی، بازرگانی و ئابوورییەکانی نێوانیان کەم نابێتەوە. بەشێوەیەکی کاتی بەسەر یەکتردا زاڵیش بن، بەلام بەیەکجارەکی ناتوانن.

لە قۆناخی دووەمدا (١٦٠٠ـ١٢٠٠پ.ز) لەژێر ئەو بالادەستییەدا کە میتانی و بابلییەکان بەرێککەوتن بەدەستیان هێناوە، بەردەوامی بە رۆلی بازرگانیان دەدەن.

لە قۆناخی سێیەمدا (١٣٠٠ـ٦٠٠پ.ز) هێزی سیاسی و سەربازی راستەقینەی خۆیان ئاوادەکەن، دەبنە تۆقێنەرترین هێزی ئەو سەردەمە. لەدەرەوەی ئورارتوو، بەمیسریشەوە هیچ شوێنێک نامێنێت لەرێگای سەندنی باجەوە بەخۆیانەوە نەبەستبێتەوە. قەوم و تیرەکان لەناو قۆناخێکدا دەژین کە هەرە زێدە دووچاری ئازارچەشتن دێن. دەشێت بگووترێت خوێناویترین رووی شارستانییە. بەشانازی و پیاهەڵدانەوە، وەک گەورەییەک دەیگێڕنەوە کە چۆن قەلاو شورایان لە کەللە سەری

مرۆڤ دروست کردووە. لە دەرەوەی ئەوانەی دەکرێن بە واوی قەوم و قەبیلەکان دەکوژرێن. تەنانەت شارستانییەکی و مریش لە داگیرکردن (٦٧٠پ.ز) رزگاری نابێت. پادشایەتی ق لەگەڵ ئەرز تەخت دەکرێت. هێزێکی جیهانی هاوشێوەی ئەمریک گاری ئەمڕۆمانە. بە پێشکەوتووترین جۆری ئەو ئەگۆیزمەدا دە لەهەر ئیمپراتۆرییەتێکدا هەیە. کلتووری رێککەوتن، بەیەکەوە ژ ئاشتی ناناسن. لە خولقاندنی نەریتی ئیمپراتۆریدا ناتوانرێت رۆ چووک بکرێتەوە.

دیسان هۆرییەکان رۆڵی یەکلاییکەرەوە لە رووخاند ەبینن. هەروەکو دەزانین ماوەیەکی درێژخایەن (١٦٠٠-١٣٠٠پ.ز هێشت میتانییەکان چاویان بکەنەوە. کاتێک میتانییەکان دەڕوو اتوانن کۆتایی بە بەرخودانی هۆرییەکان بێنن. جڤاتی خێڵەکان ائیری دەناسرێن (بەزمانی ئاشوور واتا گەلی ئاوی، گەلی ئەو ئاو دەبەخشێت) لەناوچەی بۆتانی رۆژگاری ئەمڕۆماندا لەرێگا ەکانی هاوشێوەی کۆنفیدراسیۆنی خێڵەکانەوە (١٢٠٠-٩٠٠پ.ز) یەکی درێژخایەن بەرخودان دەکەن. لەم بەرواره بەدواوە ییەکی سیاسی بەناوی ئورارتوویەکان دەکەوێتە گەڕ. بەرخودا امبەر ئاشوورییەکان لەسالانی ٨٧٠ تا رووخانی٦١٠پ .زبەردەوا . ئەم بەرخودانەی نزیکەی ٣٠٠ساڵی خایاند بۆ پێکهاتەیەکی سیا ەندی بەهێز وەرچەرخاوە کە شاری وانی رۆژی ئەمڕۆمان مەڵبەن بووە، بەمجۆرە شوێنپەنجەی خۆی لە مێژوودا بەجێهێشت. شی کرێت سەرخانێکی سیاسی تێکەڵ لە ئارادا بووبێت. لەسەرەتاو گەری زمانی ئاشووری زاڵە. زمانێکی هۆری تێکەڵ بەکاریگەری زمانی ئەرمەنی و قەفقاس بەکاردەهێنرێت. ئەم پێکهاتەی زما زایکی بەرخودانەکەش دەخاتەڕوو. وەکو دەرکی پێدەکرێت لانەی بەشێوەیەکی تێکەڵ لەناوچەکەدا دەژین بەرامبەر بە ی و هەرەشەی هاوبەش یەکیان گرتووە و لە رێگای پێکهاتە یاسی بەهێزەوە بەرگرییان لەهەبوونی خۆیان کردووە. لە کاتدا

قۆناخێکە کە ئیسکیتەکانی قەفقاسیا بەشێوەیەکی بەهێز کەوتوونەتە گەڕ. کاتێک ئەوە بێنینە بەرچاوان کە لەبواری ئاسنگەریدا شارەزابوون، لە مس چەندین چەک و قاپ و قاچاخیان دروستکردووە، لەبیناسازیدا لەسەرووی هەمووشیانەوە لە دروستکردنی قەڵادا دەست ڕەنگین بوون، لەبواری سەربازیشدا بەردەوام ئاشوورییەکانیان دووچاری شکست دەکرد، ئەوکاتە باشتر دەرک بەگرنگی و بایەخەکەیان دەکرێت. هەرچەندە بەشێوەیەکی یەکجارەکی ئاشوورییەکانیان تێکنەشکاند، بەڵام گەورەترین ڕۆڵی لە پەلوپۆ خستنیان بۆ دەوڵەتی ئورارتۆ دەگەڕێتەوە. شوێنپەنجەیەکی شارستانییە کە سڕینەوەی ئاستەمە.

شکستی یەکجارەکی ئاشوور، کە دوای هەوڵێکی درێژخایەنی دیبلۆماسی نهێنی بابلییەکان و سەرقاڵییەکی زۆری ڕاهیبە مۆغە (مۆغ، لە زمانی کوردی بە واتای ئۆجاخی ئاگردێت) میدییەکان، لە ئاکامی ئەو ڕێککەوتنەوە دەبێت کە لە ساڵی ٦١٢پ.ز دا کۆنفیدراسیۆنی میدیا و دەوڵەتشاری بابل پێی گەیشتن. قۆناخی میدیا و سێیەمین قۆناخی بابل لەناوچەکە دەست پێدەکات.

گرنگترین ئەنجامێک دەتوانرێت لە پراکتیکی شارستانی ئاشوور هەلێنجرێت، بەناویەکداچوونی پاوانی سیاسی و پاوانی بازرگانی و پەیوەندییەکەیەتی بەشەڕەوە، ئاشوور گرنگترین قۆناخی پاوانی سیاسی و پاوانی بازرگانییە لەمێژووی شارستانیدا. دەتوانرێت بگووترێت بەر لە ئیمپراتۆرییەتی پارس پاوانکارییەکانی بازرگانی ئاشوور یەکەمین ئەڵقەی ناوەندی نێوان شارستانییەکانی میسر، چین و هیندستانی ئاواکردووە. جیهانێکی بازرگانییان ئافراندووە. جۆرێک لە جیهانگیری سەردەمی خۆیەتی. دیسان جارێکی دیکە ئاشکرا دەبێت کە پاوانی بازرگانی ئابووری نییە، لە ڕێگای ڕژێمێکی تیرۆری کەم وێنە لە مێژوودا لەدەرەوە بەسەر ئابووریدا دەسەپێنرێت، ئەو توانستانەی گەلان و تیرەکان بەرەنجێکی پڕ زەحمەت کۆیانکردۆتەوە یان ئافراندوویانە زەوتی کردووە. ئاشکرایە دەوڵەت نەبێت پاوانخوازی بازرگانی بەڕێوە ناچێت. لەکاتێکدا تەواوی پاوانکارییە سیاسییەکانی پێشووتر پەیوەندییان لەگەڵ شێوازی کۆیلەداری

کشتوکاڵ هەبوو، بۆ یەکەمین جارە بازرگانی قورسایییەکی هاوسەنگی لەگەڵ کشتوکاڵ بەدەست هێناوە. ئەگەر پاوانخوازی بازرگانی وەک سەرمایەداری پێناسەبکەین، ئەوکاتە پاوانخوازی سیاسی لە زەوتکردنی زێدە ـ بەرهەمی کشتوکاڵدا، وەک هێزی بەکاریگەری چەوسانەوە جێگای خۆی لە شارستانیدا دەگرێت. ئیمپراتۆرییەت شێوەیەکی بەڕێوەبەرایەتییە کە لە کشتوکاڵ زیاتر بازرگانی دەپەروژێنێت. ئاسایشی ڕێگا پێویستییەکی بازرگانی گۆڕەپانێکی درێژ و بەرفراوانە. تەنیا ئیمپراتۆرییەت دەتوانێت فەراهەمی بکات. هەرچی چڕبوونەوەی توندوتیژییە، بەڵگەنەویستە کە بەشێوەیەکی تێکەڵاو لەگەڵ بەرخودانی کۆمەڵگا بەرامبەر داسەپاندنەکانی ئابووری نوێ پێشکەوتووە و گەورەبووە.

ئاشکرایە کە چەندین توێژی تایبەتی سەربەخۆی کشتوکاڵ، بازاڕ، بازرگانی بچووک و پیشەکاران دەتوانن سوود بە ئابووری بگەیەنن. ڕەنجی مرۆڤ لە تەواوی ئەم بوارانەدا سەلماندوویەتی کە پەرە بە بەرهەمهێنان دەدات. چەسپاندنی ئەو ڕاستییە هێندە زەحمەت نییە کە: چ پاوانی بازرگانی ـ ئابووری، چ پاوانی سیاسی و سەربازی هیچ یەکێکیان پێویست نیین. ئایا ئاشوور نەبوایە ئابووری دەوەستا؟ بەپێچەوانەوە، بەڵکو زەمینەیەکی ئارام و ئاشتیخوازانە ژیانێکی ئابووری جیاوازتر و ئەرێنی دەڕەخساند. دەوڵەت کە بەڕێوەبەرایەتییەکی دژی دیموکراسییە نەک هەر بێبایەخە، بەڵکو بەهۆی ئەو بیرۆکراسییەی کە لەگەڵ خۆیدا هێناویەتی، ئەو شەڕانەی ڕێگای لەپێش کردۆتەوەو ئەو تاڵانانەی ئەنجامیداون، هێزێکە ئابووری و کۆمەڵگای تێکداوە. لێرەدا گفتوگۆ لەبارەی پێویستی و گرنگی شار و جیابوونەوەی چینایەتییەوە ناکەم: بەڵکو لێرەدا لێپرسینەوە لەبارەی پەیوەندی هێزی زۆرداری (کە خۆی بە پەردەی ئایدیۆلۆژی ئیلاهی پۆشیوە، خۆی دیوارێکی تۆکمەی سیاسی ـ سەربازی دەپارێزێت) بەشارستانییەوە دەکەم. ئەگەر شارستانی لەبواری شارنشینی دا لایەنی ئەرێنیشی هەبێت: جەخت لەسەر ئەوە دەکەمەوە کەچۆن قێزەوەن کراوە، لەڕێگای کۆسپێکی مەحافەزەکاری و کۆنەپەرستی سەرسوڕهێنەرانەوە کراوە بەنەرێنی. کۆردیناسیۆن

(دەستەی سەرپەرشتیار)ی بەڕێوەبەرایەتی شتێکە و پاوانخواز و زۆردار و تاڵانکارەکان شتێکی ترن.

جەخت لەسەر ئەو خاڵە دەکەمەوە کە بەناویەکترداچوونی پاوانخوازی ئابووری، بازرگانی و سیاسی تەنیا تایبەت بەسەرمایەداری نییە، لەگەڵ ئاواکردنی شار و خانەدانێتیدا هەر لەسەرەتاوە شارستانی هەمان خەسڵەتی بەرجەستەکردووە، بەشێوەی زنجیرێکی نەپچڕاو لایەنە ئەرێنییەکانی شارستانی و بزاوتی دیموکراتی سەرکوت کردووە و پێچاوێتی و بەمجۆرە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان درێژەی بەهەبوونی خۆی داوە. با درێژە بەناسینی ئەڵقەکانی زنجیرەکە بدەین.

## ٥. شارستانی میسر، هیند، چین، هیتیت و فینیقییەکان

گفتوگۆکردنی ئەو کۆمەکانەی شارستانی میسر، چین و هیند پێشکەش بە رووباری بنەڕەتییان کردووە، کارێکی بەرفراوانی دەوێت، هەرچەندە ئێرە شوێنی خۆی نییە بەڵام بەکورتی لێپرسینەوە لەبارەی ئەوەی بۆچی لایەنی قورسیان کشتوکاڵییەو ئیرادەو هێزیی تێپەڕکردنی ناوچەی خۆیان نیشاننەداوە، دەشێت فێرکەر و ئەزموونبەخش بێت. لەوبڕوایەدام بەهێزی ناوخۆییان و ماوەیەکی درێژخایەن لەسەر پێ مانەوەیان، هۆکارەکەی بۆ پەنا نەبردنە بەر پاوانی ئابووری، بەتایبەتیش هانا نەبردنەبەر پاوانخوازی بازرگانی دوور دەگەڕێتەوە. هەرسێکیشیان بازرگانی دەرەوەیان زۆر کەمە. وەکو دەبینرێت لەبونیادی ناوخۆی بازرگانی و کشتوکاڵیاندا شانسێکی ئەوتۆیان بە پاوانخوازی نەداوە. ئەو پاوانکاری سیاسییانەیان لە ئارادایە بەو رادەیەی لە پاوانخوازی ئابووری دوور بمێنێت تەمەن درێژ دەبێت. هێزی سیاسی و سەربازی بەوەی پاوانی دەرەوەو کائیوسی ناوخۆ ئاستەنگ دەکەن، ناڕەزاییەکی کەمتریان بەرامبەر نیشاندەدرێت. هەربۆیە تەمەنی درێژ دەبێت. دواجار ئەمانەش پاوانگاری داهاتی ئابوورین، بەڵام تا قوڕگ لەناو پاوانخوازی ئابووریدا نقوم نەبوون.

میسر بەو رادەیەی کاریگەری کردۆتە سەر کلتووری گریک ـ ڕۆما،

..ەکی خۆی پێشکەش بە کلتووری شارستانی ئەوروپا کردووە. ...ەبارەت بە ئەفریقیاش وەک کلتوورێکی نەبوو وایە، هیچ کاریگەرییەکی ..ێگای باس نییە. دەستی بۆ بازرگانی نەبردووە. خۆی لە ڕۆژهەڵاتی ناوینیش دابڕاندووە. لەوانەیە یەکەمین نموونەکانی سۆسیالیزمی دەوڵەت ...ت. هیچ یەکێکیان وەک میسر بەکاریگەر نییە. میسر بەتەواوەتی، هیندستان و چینیش بەشێوەیەکی ڕێژەیی لە ڕێگای ڕۆژهەڵاتی ناوینەوە ..ەشداری شارستانی چاخی ناوینیان کردووە. موسڵمانێتی هەمووی ..ژاندۆتە ناوچەوزی خۆیەوە و لەپێشکەشکردنی بۆ ئەوروپا ڕۆڵێکی ...ەرەکی بینیوە.

پێویست ناکات سەرە دێرێکی تایبەت بە هیتیتەکان جیابکەینەوە. وەک هاوپەیمانێکی هۆری - میتانییەکان شارستانی لە ئەنادۆڵ بڵاوکردۆتەوە. لە ڕێگای کاریگەرییەکانی بۆ سەر کەنارەکانی دەریای ئیجە بەلانی ..ەم هێندەی میسری و فینیقییەکان کۆمەکیان پێشکەش بە پێشکەوتنی شارستانییە نوێکەی نیمچە دوورگەی یۆنان کردووە. پەلهاوێشتنی میسری لەسەر هێڵی سوریا بەربەست کردووە. پێشتریش لەوەستاندنی ئاشوور و پەلهاوێشتنی بابلدا بەکاریگەربووە.

بازرگانی ناوچە دوورەکان کە میسر نەیتوانی ئەنجامی بدات و وەک بۆشاییەک بەجێی هێشتبوو، قەومی فینیقی ئەنجامیدا کە لە ڕۆژهەڵاتی دەریای سپی جێگیر ببوون. ئاواکردنی کۆڵۆنی بازرگانی لە هەموولایەکی دەریایی سپی تایبەت بە فینیقییەکانە. ئەوانەی یەکەمین جار کلتووری ڕۆژهەڵاتی ناوین و میسریان نزیکی ئەوروپا کردەوە دیسان فینیقییەکان بوون. دۆزینەوەی ئەلف و بێ و هونەری دروستکردنی کەشتی لای فینیقییەکان سەبارەت بە شارستانی زۆر بەکاریگەرە. ئەوان یۆنانییەکانیان فێری ئەلفوبێ کرد، هەر ئەوانیش یەکەمین بەندەریان دروست کرد. لە گواستنەوەی کلتووری مەعنەویشدا ڕۆڵێکی گرنگیان هەیە. لە مێژووی شارستانیدا شوێنپەنجەکەیان بەلانی کەم هێندەی ئوراتووییەکان بەکاریگەرە.

کاریگەری پادشایەتی ئیسرائیل زیاتر لەبواری مەعنەویدایە. گرنگترین

لایەنیان ئەوەیە کە نەریتی عیبرانی ئایینە تاکخوداییەکانی ئافراندووە. هەروەکو بلێی بەرامبەر بە دەوڵەتی ماددی سۆمەر و میسر بەهانەیەکی مێژووییان بۆ ئافراندنی دەوڵەتی مەعنەوی هەبووە. نابێت لە پەنجەرەی تەسکی یەهودییەکانەوە تەماشای نەریتی عیبرانی بکرێت. لە کاتێکدا یەهودییەکان لەقوڵی پارەی ماددی ئەم نەریتەوە بەرەوپێشچوون، لەقوڵە مەعنەوییەکەشیدا دەرکەوتنی چەندین پێغەمبەر، نووسەر و رۆشنبیر بۆتە جێگای باس. کاریگەربوونیان لەهەردوو قوڵەوە، بەقووڵی کاریگەری کردۆتە سەر مێژووی شارستانی جیهان. بۆ ئەوەی بە تەواوی ئاشنای شارستانی ببین، پێویستە لەهەموو لایەنێکەوە نەریتی عیبرانی، میسر و سۆمەر شیکار بکرێت. هەربۆیە روونکردنەوەی ئەورووپا پشت بە کلتووری چاخی ناوین و تاڕادەیەکیش گریک ـ رۆمای کۆن شێوازی روونکردنەوەیەکە کە پێیەکانی لەهەوادا دەمێنێت. شێوازێکی زۆر ناتەواو و چەوتە. دواتر هەوڵی گفتوگۆکردنی دەدەم کە ئەم شێوازە رێگای لەپێش ئەنجامی چەندە مەترسیدار کردۆتەوە.

### ٦ـ چاخی ماد ـ پارس: (٧٠٠ـ٣٣٠پ.ز)

مادەکان (میدییەکان) کاریگەرییەکیان لەسەر شارستانی هەیە کە هێشتا تەواو ئاشکرا نەبووە. گرنگترین سیفەتە ناسراوەکانیان بنەچەکەیان بۆ هۆرییەکانی زاگرۆس دەگەڕێتەوە، لەگەڵ فارس (پارس)ەکان خزمن و لقێکی تیرەکانی ئاریانیان پێکهێناوە. لەژێر کاریگەری فشاری قورسی ئاشوورییەکاندا ناسنامەیەکی بەرخودانیان بەدەست هێناوە. فێرکەرو رێکخەرە سەرەکییەکانیان راهیبەکانیانن کە بە مۆغ (ماغ) ناو دەبرێن. دەتوانرێت بگووترێت ئەم ماغانە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن لە بەڕێوەبەرایەتیدا رۆڵیان بینیوە. مسۆگەرە کە لە ساڵانی ٧٠٠ پ.ز دا یەکێتییەکی کۆنفیدرالیانەیان ئاواکردووە، لەو گۆڕەپانەدا ژیاون کە میدیای پێدەگووترێت و دەکەوێتە شوێنی لێک نزیکبوونەوەی سنوورەکانی ئێران، ئێراق و تورکیای رۆژی ئەمڕۆمان. لەگەڵ ئەو ئیسکیتانەی لە قەفقاسیاوە هاتبوون، هەندێک جار دۆست، هەندێک جاریش لەناو پێکداداندابوون.

بەوەی ئاشوورییەکانیان لە ساڵی ٦١٢پ.ز دا تێکشکاند هەم ناوبانگ دەردەکەن و هەم ڕێگایان لەپێشدا دەکرێتەوە. لەساڵی ٥٨٥پ.ز لە لێوارەکانی زێی سوور فریگیاییەکان تێکدەشکێنن. لەم نێوانەدا دانایەکی بەتوانا بەناوی زەردەشت لەناو موغەکاندا سەرهەڵدەدات. ئایینێک پێکدێت کە لایەنی ئەخلاقی تێیدا لە پێشە. نە تەواو ئایینە، نە تەواو فەلسەفەیە. لەگەڵ ئەوەی لە نەریتی عیبرانی جیاوازترە، بەڵام کاریگەرییان لەسەر یەکتر بەهێزبووە. کاریگەری زەردەشتی بەتایبەتی لەساڵی ٥٩٥ پ.ز دا بووە کە نەوەکانی ئیسرائیل بەدەست نەبوخزنەسری ئیمپراتۆری بابلەوە دیلبوون. شارستانی یۆنان میدییەکان لە پارسەکان گرنگتر و باڵاتر لە قەڵەمدەدات. لەمێژووی هیرۆدۆتدا هەرە زێدە باسی گەلی میدی دەکرێت. لەساڵی ٥٥٩ پ.ز لە ئاکامی خیانەتێکی ناوخۆییەوە پارسە هاخامەنشینەکان دەست بەسەر پێکهاتەی سیاسی میدیادا دەگرن. "کۆرشی" دامەزرێنەری ئەم خانەدانە لە کۆشکەکانی میدیادا گەورەبووە. پارس و میدیاییەکان ئەندامی هاوبەشی دامەزرێنەری ئیمپراتۆریەتن. تەنیا گووتەی ئیمپراتورییەتی پارس، ناولێنانیکی ناتەواوە.

ئیمپراتورییەتی پارس - ماد لەماوەی نزیکەی سێ سەد ساڵدا لە میسرەوە تا ناوەوەی هیندستان (لە ساڵی ٥١٥پ.ز دا فەتحکراوە)، لە سنووری چین تا نیمچە دوورگەی یۆنان بەرفراوانترین یەکێتی سیاسی سەردەمی خۆیان بەدەست هێناوە. بۆ بیست و دوو ئەیالەت (هەرێم) دابەشکرابوون و جۆرێک لە نیمچە دەوڵەتیان ئاواکردبوو. ڕۆڵ و کۆمەکیان بۆ شارستانی ئافراندنی بیرۆکراسی، سیستەمێکی باشی پۆستە و ڕێگا و دامەزراندنی گەورەترین و شکۆدارترین هێزی سوپای سەردەمی خۆی بووە. گرنگیان بەنەریتی ئەخلاقی داوە.

شارستانی یۆنان چەندین فاکتەری کلتووری لە مادو پارسەکانەوە وەرگرتووە. جیابوونەوەی ڕۆژهەڵات - ڕۆژئاوا لەم قۆناخەدا دەرکەوتووە. کارتێکردنێکی بەهێز لەنێوانیاندا هەبووە. چەندین یۆنانی لە کۆشکی پارسەکاندا ئەرکداربوون، بەهەزارانیشیان سەربازی مووچەداربوون. کەڵەکەکردنی دەوڵەمەندێتییەکی مەزن، بەدرێژایی

دووسەد ساڵ دەست بەسەرداگرتنی ناوچەی ئیجە، وەک حەسرەتێک ڕەوتێکی دژیان لەبەرامبەر پارسەکان پێشخستووە. هەم شکاندنی فشارەکانیان، هەم دەست بەسەرداگرتنی دەوڵەمەندێتییەکانیان وەک ئامانجێکی میللی لێهاتبوو. سەرهەڵدانی ئەسکەندەر وەک هەرەکۆلێکی نوێ ڕێککەوت نییە. بەشی خۆی لەم زەمینەیە وەرگرتووە و بەپەروەردەی تایبەتی ئەرستۆشدا تێپەڕیوە. تەنانەت فەلسەفەی یۆنانیش کاریگەرییەکانی کێشمەکێشی ڕزگاربوون لەژێر ئەم فشارانە لەخۆوە دەگرێت. بەتایبەتیش کاریگەرییە میتۆلۆژییەکان زۆر زیاترە. جۆرێک لە کلتووری بەرخودانی پێکهێناوە. یۆنانییەکان ئەزموونی مادەکانیان بەرامبەر بە ئاشوور، لەبەرامبەر پارسەکاندا بەکارهێناوە. ئەو هێزەی لەپشت پارچەکردنی ئیمپراتۆرییەتی پارسەوەیە، کە لەلایەن ئەسکەندەری مەکدۆنییەوە ئەنجامدرا، سەنتێزکردنی کلتووری بەرخودانی سەدان ساڵە و ڕۆشنگەری فەلسەفی و ڕۆحی ئازادانەی تیرەی مەکدۆنییە.

### ۷ ـ شارستانی و کلتووری گریک ـ ڕۆما:

هەڵەیەکی گەورەیە کە کلتوور و شارستانی گریک ـ ڕۆما وەک سەرەتای کلتووری ڕۆژئاوا شرۆڤە دەکرێت. لە ڕۆژئاوا، واتە لە ئەورووپا کلتوور و شارستانییەکی بەمجۆرە سەریهەڵنەدا تا بە شارستانی و کلتووری ئەورووپا بەناوبکرێت. ئەوەی ڕوویانداوە بە چاخی ناوینی کریسیتیانیشەوە تا سەدەی پازدەهەمی زایینی، بە درەنگ کەوتنێکی واتادارەوە گواستنەوەی ڕووداو، کلتوور و شارستانییە بە ریشە ڕۆژهەڵاتییە ناوینەکان (میزۆپۆتامیا و میسر)ە بۆ ئەورووپا. ئەوەی هەوڵی ڕوونکردنەوەی دەدەین: ئەو کلتوورەی لەدۆخی ئەڵقەکانی زنجیرێک دایە، وەک ڕووباری بنەڕەتی سەرچاوەی خۆی لە 'درێژماوە'ی ۱۵هەزار ساڵی و 'شوێنێکی دیار'ەوە وەردەگرێت، چۆن بەرەو ئەورووپا ڕۆشتووە.

هەرچەندە ئەڵقەی گریک ـ ڕۆما لە جوگرافیای ئەورووپادا پێکهاتبێت، هەموو شتێکی خۆی لەو میراسە وەرگرتووە کە پێیەوە گرێدراوە. ئەوەی لەدوای سەدەی شازدەهەمەوە وەک کلتووری ماددی و مەعنەوی

پێکهاتووە، نوێبوونەوەیەکی جددی و "نابەردەوام"ێکی ئەوتۆ پێکنەهاتووە. هەنگاوە فەلسەفییەکەی کە دەتوانین وەک نوێبوونەوەیەکی ببینین، بەبێ ئەوکلتوورەی لە بابل، میسر، هیتیت، ئورارتوو، ماد و پارسەکانی وەرگرتووە ناتوانرێت بیری لێبکرێتەوە. تەنانەت ئەفلاتوون بۆخۆی دان بەوە دادەنێت کە لە سالانی ٦٠٠پ.ز دا دانا یۆنانییەکان لەسەرووی هەمووشیانەوە سۆلۆن[١]، فیساگۆرس[٢] و تالیس[٣] بە سالان لە ناوەندەکانی رۆژهەڵاتدا و لەسەرووی هەمووشیانەوە لە بابل گەڕاون و بۆچوونی فەلسەفی خۆیان گەڵاڵەکردووە. هەرچی میتۆلۆژیای یۆنان و رۆمایە، لە دەرەوەی ناوەکان، ناوەڕۆکەکەی ڤێرسیۆنی چوارەم و پێنجەمی سۆمەر و بەرێژەیەکیش میسرە (میسر + بابل + هۆری + هیتیت و میتانی + یۆنان + رۆما). هەڵبەتە لایەنی کلتووری ماددی نیولیتیک لە سالانی ٤٠٠٠ پ.ز دا گەیشتووەتە گۆڕەپانە گرنگەکانی ژیان لە ئەورووپا. کلتووری سۆمەر و میسریش لە سالانی ٢٠٠٠ـ١٠٠٠پ.ز دا پێی گەیشتووە. ئەو سەنتێزەی لە سالانی ٢٠٠٠پ.ز دا دەستی پێکرد، لەسالانی ١٦٠٠ـ١٢٠٠پ.ز دوای یەکەمین تاقیکردنەوە، لە سالانی ١٠٠٠پ.ز بەدواوە بەرهەمەکانی چرۆی کردووە. هۆمیرۆس[٤] و هیسیۆدۆس[٥] یەکەم کەس بوون کە باسیان کردووە. ئەو هەوێنەی لە سالانی ١٠٠٠پ.ز لە نیمچە دوورگەی ئیتاڵیا لە رێگای ئەتروسکەکانەوە دەستی پێکرد، لە سالانی ٧٠٠پ.ز دا بە پادشایەتی و ٥٠٠پ.ز دا بە کۆمار ئەنجامگیر بووە.

١ـ سۆلۆن: کاربەدەستێکی دەوڵەتی ئەسیناو شاعیرێکی یۆنانە لەنێون سالانی (٦٣٩ـ ٥٥٩ پ.ن) ژیاوە. وا پەسەندکراوە کە بەو ریفۆرمانەی ئەنجامی داون بناخەی دیموکراسی ئەسینای داناوە. ریفۆرمەکانی: هەڵگرتنی سنووردارێکردنی لەبەر قەرز و ئازادییەکەسێتییەکان لەپێناو دەستبەرسەردا گرتنی دا؟ کۆمەڵێک ریفۆرمی رێخۆشکەری بۆ بازرگانی و پیشەسازی. بۆ کەمکردنەوەی کاریگەری ئابوورییانەوە نەک پشتاوپشت بۆیان بمێنێتەوە.
٢ـ فیساگورس: فەیلەسوف و زانایەکی بیرکاری یۆنانییە لەنێوان سالانی (٥٨٠ ـ ٥٠٠پ.ن)دا ژیاوە.
٣ـ تالیس: یەکەمین بیرکاریزانی یۆنانە لەنێوان سالانی (٦٢٤ـ ٥٤٨) دا ژیاوە بەیەکێک لە حەوت دانا یۆنانییەکەی ئەو سەردەمە ناسراوە. جەبر بۆ یەکەم جار بە تالیسەوە بووە بە لقێکی زانستی بیرکاری.

٤ـ هۆمیرۆس: شاعیرێکی یۆنانییە لە چاخی ئانتیکدا لەهەشتەمین سەدەی پێش زایینددا لە یۆنان ژیاوە و نووسەری هەردوو داستانە بەناوبانگەکەی ئیلیادە و ئۆدیسایە.

٥ـ هیسیۆدۆس: شاعیر و فەیلەسوفێکی چاخی ئانتیکی یۆنانە. دەگوترێت کە لەسەدەی حەوتەمی پێش زاییندا ژیاوە. لە مێژوو و پێشکەوتنی هزردا بەکەسێک دەناسرێت کە روونکردنەوە میتۆلۆژییەکانی نزیکی بیرکردنەوەی فەلسەفیانەن. ئەو فەیلەسوفەی یۆنانە کە گوونوویەتی " مرۆڤ و خوداوەندەکان هەمان ریشەیان هەیە" لەرێی بۆچوونەکانیەوە سەبارەت بە دروستبوونی گەردوون و لەدایکبوونی خوداوەندەکان؛ بە باسێکی میتۆلۆژیانە بۆتە نیشانەی دەرکەوتن و لێکەڕینە ئەقڵییەکان.

ماوەی هەزار ساڵی نێوان ٥٠٠پ.ز- ٥٠٠ ز تایبەتبوونی خۆی هەیە. بەجۆرێک ئەڵقەی یەک بەدوای یەکی شارەکان پێکهاتووە کە شایستەیە لە دوای ئوروک بە دووەمین بەناو بکرێت. بێگومان ئاواکردنی شارەکانی گریک ـ رۆما قۆناخێکە بەها ئیستاتیکییەکەی بەرزە، بەڵام جیابوونەوەی چینایەتی و شێوەکانی بەڕێوەبەرایەتی بەهەمان بەرکەماڵی گریک ـ رۆماش نەبێت، لەمیانەی چەندین تایبەتمەندێتیانەوە هەزاران ساڵ پێشتر ژیاون. فاکتەرە ماددی و مەعنەوییەکانی لەجۆری بازرگانی، بازاڕ، پارە، ئەلف و بێ، زانست، فەلسەفە(دانایی)، مۆڕاڵ و میتۆلۆژی هەزاران ساڵ پێشتر پێکهاتوون. دەتوانرێت بگووترێت تەواوی ئەمانەیان بە ڤێرسیۆنێکی زۆر گرنگی دووەمیندا تێپەڕکردووە. بەڵام بەبێ ئەوەی میراسێک جێگای باس بێت، تەنیا وەک ئەوەی بڵێی چیمەن لە زەویدا رواوە، سەرهەڵدانی شارستانی لەهەردوو نیمچە دوورگەدا واتای نییە. مێژووی رۆژئاوا بۆ ماوەیەکی درێژخایەن بەشێوەیەکی ناتەواو و هەڵە لە مەسەلەی چاوگ (ریشە) تێگەیشتبوو. لە قۆناخی پۆست مۆدێرنیتەدا شرۆڤەی راستتر پێشدەخرێت.

تایبەتبوونێکی کلتووری گریک ـ رۆما ئەوەیە کە بەشێوەیەکی بەناویەکداچوو و بەدوای یەک رژێمەکانی دەوڵەتی پادشایەتی، کۆماری، دیموکراسی و ئیمپراتۆرییەتی بەخۆیەوە بینیوە. لە کاتێکدا لە سەرەتا دیموکراسی و پادشایەتی لە ناویەکدا بوو، لە قۆناخەکانی دواییدا کۆمار و ئیمپراتۆریەت لەناو یەکتردا بووە، وەکو شێوازی پێش هەرەسهێنانی ئیمپراتۆرییەت بایەخداربووە. بەجۆرێک لە جۆرەکان بووە بەدواترین و گشتگیرترین سیستەمی شارستانی و کلتووری سیستەمی کۆیلەداری. ئەم تایبەتمەندێتییەی گرنگە، یان دەڕووخێت، یان وەردەرچەرخێت. هەروەکو دەزانرێت دوای رووخان ئیمپراتۆرییەتی رۆما وەرچەرخانی بەخۆیەوە بینی. دوای ئەوەی مێژوو لەڕێگای شارستانی گریک ـ رۆماوە قۆناخێکی درێژخایەنی بەرکەماڵی بەخۆیەوە بینی دەکەوێتە نێو قەیرانێکی قووڵەوە. ئەو بەرووبوومەی لە دەرەوەی شار پشت بە کشتوکاڵ دەبەستێت، لە شاریشدا پیشەکاری، رێگا لەپێش زێدە ـ بەهایەکی بایەخدار دەکاتەوە.

زۆربوونی زێدە ـ بەرهەم بناخەی رێکخراوی لەجۆری دەوڵەتە. زێدە ـ بەرهەم لە ناوەڕۆکی خۆیدا گرێدراوی ئەو رەنجەیە کە بەهرەی بەدەست هێناوە و بۆ سک تێربوون کاردەکات. پێشکەشکردن و بەکارهێنانی شێوازی رەنجی کۆیلەداری جۆری سەرەکییە. لەسەر بنەمای بەم جۆرە، پاوانخوازی دەوڵەت ئاوادەکرێت کە لە سێکوچکەی ئایدیۆلۆژی، سیاسی و سەربازی پێکهاتووە. ئەم سیستەمەی لەگەڵ ئاواکردنی شار لەناو یەکتردا پێکدێت، لەمیانەی پیشەکارییەوە دابەشکردنی کار پێشدەخات، پێکهاتنی زنجیری کاڵا ـ بازاڕ ـ پارە فەراهەم دەکات. لەم ئەڵقەیەدا پاوانی بازرگانی دەکەوێتە گەڕ، دەرفەتی دەست بەسەرداگرتنی بەشێکی زێدە ـ بەرهەم دەڕەخسێنێت. لە گەوهەردا دوو پاوانکاری سەرهەڵدەدەن کە بۆ دەست بەسەرداگرتنی ئەو زێدە ـ بەرهەمەی لە ناو دەوڵەت و نێودەولەتیدا لە رووی کشتوکاڵ و پیشەکارییەوە بەرهەم دەهێنرێت، لەگەڵ یەکتری دەکەونە ناوپێشبڕکێ و تەنانەت پێکدادانیشەوە. هەرچەندە جیاوازییەکی زۆر زەقیان لەنێواندا نەبێت، سەبارەت بە شیکارکردنی چەندین پێکدادان و پەیوەندی سیاسی و سەربازی زاراوەی دوو پاوان رۆڵی کلیل دەبینێت.

ئەو هێزانەی بەهێزە پاوانخوازییە بازرگانی و کشتوکاڵییەکان ناو دەبرێن، ناوکی ئامێرە (میکانیزمە) ئایدیۆلۆژی، سیاسی و سەربازییەکانی پێکدێنن کە لە دەوروبەری شاردا کۆبوونەتەوە، هەروەها سیستەم (شێوە) ی ئەو کۆمەڵگایەی کە لە یەکپارچەیی کلتووره ماددی و مەعنەوییەکەی پێکدێت دەتوانین بە "شارستانی" بەناوی بکەین. لەبەرئەوەی رەنجی قۆستراوە بە شێوازی کۆیلایەتی کۆنترۆڵ دەکرێت ناوبردنی ئەم سیستەمانە بە شارستانییە کۆیلەدارییەکان دەشێت واتادار بێت. دەتوانین ئەوە لەیەکتری جیابکەینەوە کە بەدرێژایی مێژووی شارستانی کێبڕکێ و پێکدادان لە دوو کەناڵەوە بەڕێوەچووە: یەکەمیان لەناوخودی شارستانی، بەشێوەیەکی گشتی لەنێوان مۆنۆپۆڵەکان، بەتایبەتیش لەنێوان پاوانەکانی کشتوکاڵ و بازرگانیدا. دووەمیان لەنێوان سیستەمی شارستانی و تەواوی ئەو هێزانەی کۆمەڵگادا کە ناکۆکییان لەگەڵ سیستەمدا هەیە

(چین، تیرە، خێڵ، گەل، پیشەکار). هەروەک چۆن سروشتێکی شەڕ لە ڕێگای ئەم دوو کەناڵەوە خۆی تیژ دەکات، بۆ ئەوەی لەشەڕیشدا سەرکەوتن بەدەست بهێنرێت، بەردەوام کلتووری ماددی و مەعنەوی لەناو هەلومەرجی سەختی کێبڕکێ و پێکداداندا پێشدەخرێن. لێرەوە ئەو پێکهاتانە دەست پێدەکات کە لە مێژووی شارستانیدا بەکاردانەوە یەک لەدوای یەکەکان ناودەبرێت.

ئەم کاردانەوە یەک لەدوای یەکانەی تا قۆناخی گریک ـ ڕۆما بە پوختی کورتمان کردەوە قۆناخێکی قەیراناوییە. بەهۆی هۆکاری جیاوازەوە لاوازبوون یان هەرەسهێنانی بازرگانی و کشتوکاڵ لەهەندێک ناوچەدا بەردەوام قەیران لە ڕۆەڤدا دەهێڵێتەوە. ئەو سیستەم (فەلسەفە) و ڕێکخستنانەی لەبارەی بابەتەکانی کەش، بەرهەمهێنانی لە ڕادەبەدەر، پێکدادانە ناوخۆیی و دەرەکییەکان، کۆچکردنی ناوخۆیی و دەرەوە، شێوازەکانی بەرهەمهێنانی بەپیت، سەربازی، سیاسی و ئایدیۆلۆژی کە لەلایەنی ئەنالیتیکەوە لەپێشترن هۆکارە سەرەکییەکانی قەیرانن. ئەو توێژانەی ناخوازن لەهێزی پاوانکاری بێبەشبن و زیادکردنی بەشی خۆیان دەسەپێنن، پێکدادان و شەڕ لەجیاتی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان بەکاردێنن. لەبەرئەوەی پاوانخوازییەکن لەسەر ئابووری ئاواکراون بەمجۆرەن. بەتایبەتیش ئەو دەوڵەت و شارستانیانەی زیاتر پشت بە بنەمای بازرگانی دەبەستن، بەهۆی چڕی قەیرانە بازرگانییەکانەوە زیاتر ڕێگا لەپێش شەڕدەکەنەوە. ئەو شارستانی و دەوڵەتانەی پاوانەکانی کشتوکاڵ تێیدا زاڵە و خاوەن کەشێکی گونجاو و سیستەمێکی ڕێکوپێکی ئاودێرین، لەبەرئەوەی بەچڕی ڕووبەڕووی قەیران نابنەوە لەناو ئارامی و ئاسایشدا دەبن. کاتێک لەمیانەی ئەم ڕوانگەیەوە سەیر بکەین، ئەو کاتە باشتر دەرکی پێدەکرێت کە جگە لە هەندێک یاخیبوونی ناوچە، شار و کۆیلەکان، بۆچی میسر، هیندستان و چین زۆر کەم کەوتوونەتە شەڕەوە. بۆیە مایەی تێگەیشتنە کە هۆکاری پەلهاوێشتن و شەڕانگێزی شارستانییە میزۆپۆتامیاییەکان دەگەڕێتەوە بۆ گرێدانی زیادیان بە بازرگانییەوە. بەردەوام گوزەرانی شارستانییەکانی ئەلعوبێد، ئوروک،

ئور، بابل، ئاشوور و پارس لەناو کەشی کۆلۆنی، پەلهاویشتن و شەڕدا، لەنزیکەوە گرێدراوی رۆلی بازرگانییە لە قۆناخی بەرهەمهێناندا.

هۆکاری رەوشی شەڕ و هێرشهێنانی شارستانی گریک ـ رۆما لە زەمین و دەریاوە لەسەردەمی ئەسینا و لەقۆناخی رێبەرایەتی رۆماشدا، گرێدراوی قورسایی بازرگانی لەدەریای سپی ناوەڕاستە کە بەبێ ئەو نابێت. لەو سەردەمەوە کە شارستانی ئاواکراوە میزۆپۆتامیا بووە بە لانکەی کشتوکاڵ و بازرگانی. لە ساڵانی ٦٠٠پ.ز بەولاوە لە رۆژهەڵاتەوە پارسەکان، لە رۆژئاواشەوە گریک و رۆماییەکان هەم لەناوچە سەرەکییەکانی بەرهەمهێنانی خۆیاندا، هەم بەهۆی وابەستەییان بە بازرگانی و کشتوکاڵی میزۆپۆتامیاوە، لەبەرهەمان هۆکار "شەڕی هەزار ساڵەیان" لەسەر میزۆپۆتامیا بەڕێوەبردووە.

ئەگەر بازرگانی میزۆپۆتامیا و دەریای سپی نەبێت، شارستانیش نابێت. یان ئەوەتا هەردووکیان بەیەکەوە یان یەکێکیان دەکەوێت، یاخود یەکتر هاوسەنگ دەکەن. هەروەها سەرکەوتوو و دۆڕاویشی تێدا هەبووە. هاوسەنگیش بۆتە جێگای باس، واتە ئەو قۆناخەی هیچ لایەکیان سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە درێژخایەنتر بووە. بۆ نموونە نەلعوبێد ـ ئوروک لەناو پێکدادان و هاوسەنگیدا بوون. هەروەها هەردووکی پێشتریش لەگەڵ کۆمەڵگای میزۆپۆتامیای ژووریدا هەم لەناو پێکدادان و هەم لە هاوسەنگیدا بوون. پێکدادانی ترسناک لەنێوان ئور و خانەدانی ئەکەدی لە ئارادا بووە. هاوسەنگیش جێگای باس بووە. بەلام لەهەندێک قۆناخدا ئور و ئەکەد لەمێژوودا سڕاونەتەوە. ئەکەد و گۆتییەکانیش قۆناخەکانی پێکدادان، لەناوبردن و تەنانەت هاوسەنگیشیان لەگەڵ یەکتردا هەبووە. هەروەها بابل و ئاشووریش لەناو هاوسەنگی و پێکداداندا بوون. بەشێوەیەکی سەرتاسەری لەنێوان هۆرییەکان (هیتیت، میتانی، کاشی، ماد، ئورارتوو) و بابل و ئاشووردا شەڕی سامناک و قۆناخی هاوسەنگیش جێگای باس بوون. قۆناخەکانی هاوسەنگی و شەڕ لەنێوان میسر و هیتیتەکاندا بەردەوام لەئارادا بووە. هەرە دوایی شەڕی "هەزار ساڵی" (٥٥٠ پ.ز-٦٥٠ ز) نێوان گریک ـ رۆما و پارس ـ ساسانی

روویداوە. پێکدادان و ئاشتی ناوخودی هێزەکانی شارستانی و نێوان شارستانییەکان بەمجۆرەیە!

هەروەها بەرخودان و یاخیبوونەکانی کۆیلە، گەلان، تیرە و پیشەکاران کە ویستراوە بەشێوەیەکی زۆرەملێیانە بە شارستانییەوە واتە بەکۆیلایەتی و زەوتکاری بازرگانییەوە ببەسترێنەوە، پۆلێنێکی دیکەی سەرەکین کە کۆتاییان پێنایەت. شارستانی تەنیا هی زێدە - بەهایی سەرمایەداری (سەرمایە)نییە، سیستەمێکی کۆیلەداری خوێناوی، ئەشکەنجە و چەوسانەوەیە کە زێدە بەرهەمی (سەرمایە) پێنج - شەش هەزار ساڵ لەبناخەکەیدا شاراوەیە.

### ٨ - ئیسلام و کریستیانی:

بێگومان ئیسلام و کریستیانی هەریەکە و شارستانییەکە. جیاوازی و لێکچوونی نێوان هەردووکیان سەرنج راکێش و گرنگە. سەرباری ئەوەی لەمێژووی شارستانیدا زۆرشت دەرهەق بە پێگە و کاریگەرییەکانیان گووتراوە و نووسراوە، بەڵام ئەو شرۆڤانە کەمن کە ناوەرۆکێکی زانستییانە لەخۆوە دەگرن. پێکهاتنی کەسایەتییەکان لەژێر کاریگەری ئەم ئایینانەدا رۆڵێکی دیاریکەری لەمەدا هەیە. پێشخستنی پارادیگما لەمیانەی دەرکەوتنە دەرەوەی ئایینی ئیسلام و کریستیانی، دەشێت یەکێک لەو ئەرکانە بێت کە پێویستە لەداهاتوودا جێبەجێ بکرێت. لەبەرئەوەی شرۆڤەکانی عەلمانییەت و پۆزێتیڤیزم بۆخۆیان ئایینێکن هاوشێوەی قەباترین بتپەرستین، لەو ناوەرۆکە بێبەشن کە بتوانن بەگشتی ئایینەکان و بەتایبەتیش یەهودی، کریستیانی و ئیسلام شرۆڤە و تێپەڕبکەن.

ریفۆرم و رۆشنگەری بریتین لە گونجاندنی ئایینی کریستیانی بەگوێرەی سەرمایەداری. هەروەکو دەزانرێت رێنسانس لەگەڵ ئایینی کریستیانیدا نەکەوتۆتە ناو پێکدادانەوە. بەو ئەندازەیەی رکابەرایەتی رۆشنگەری بەرامبەر بە ئایین و کریستیانی لەناوەڕۆکی "تێپەڕکردن" یان بێبەشە، لەگەیشتن بە رەخنەو شرۆڤەیەکی جێگیریش دوورە.

هەرچی ئیسلامە لەجیاتی ئەوەی لەلایەن پەیڕەوکارەکانییەوە رەخنە

بکریت، هەر زوو پیشوەخت لە ئاکامی پیکدادانە مەزهەبییەکانەوە کەوتۆتە ناو دەمارگیرییەوە. هێندەی کریستیانیش شرۆڤەی فەلسەفی لەبارەوە پیشنەخراوە. بەهیچ شیوەیەک ریِنسانس، ریفۆرم و رۆشنگەری تایبەت بە خۆیشی ئەنجامنەداوە. هەرچی رەوتەکانی "ئیسلامگەرایی نوێ"ن کە هەریەکەیان بریتین لە کاردانەوەو گێرەشێوێنییەک، لەهەلومەرجی سەرمایەداریدا لە چەمکی دەسەڵاتی میللیگەرایی و فاشیستانە زیاتر هیچ واتایەکی دیکە نابەخشن.

دەتوانین ئیسلام و کریستیانی وەک دووەمین قۆناخی میژووی شارستانی شرۆڤە بکەین. ئەو قەیرانەی ئیمپراتۆرییەتی رۆما لە سەدەی چوارەم و پینجەم تێی کەوت بەشێوەیەکی گشتی قەیرانی شارستانی بوو. هەڵوەشانەوەی گشتی چوار هەزار ساڵەی شارستانی کۆیلەداری لەم سەدانەدا خێراتر دەبێت. میژوناسەکان ئەم دووسەد ساڵە بە "سەدەکانی تاریکی" ناو دەبەن. ئەو مرۆڤایەتییەی لەژێر دەستەمۆیی کۆمەڵگای شارستانیدا دەژی پێویستی بە رزگارییەکی قووڵ، ئامراز و پێکهاتە ماددی و زهنییەکانی دەبینیت. لەهەموو لایەکەوە گەڕان بەدوای ئامانج و ئامرازدا جێگای باسە. رەوشێکی رۆحی ئەوتۆ جێگای باسە: هەروەکو بڵێی مۆتەکەی بینیوەو تازە بێدار دەبێتەوە. رۆژ دەبێتەوە، بەڵام دیار نییە کە چۆن رۆژێک دەبێت. بتە سیمبۆلییەکانی ئایینە کۆنەکان چیتر لە بازاڕ پێنج فلس ناکات. تەنانەت ئیمپراتۆرەکانی رۆماش سەردانی پەرستگای ژوپیتەر ناکەن. لەو قۆناخەدا کە بەشێوەیەکی قووڵ قاڵبوونەوەی زهنی و لێکەڕینی باوەڕی خۆیان پیشاندەدەن، سەرهەڵدانی کریستیانی، مانیگەرایی و موسڵمانێتی مایەی تێگەیشتنن.

پرسیارێکی دیکەی بەکاریگەر، سەرباری ئەوەی هەم کریستیانی و هەم موسڵمانێتی مسۆگەر بزووتنەوەی سیاسی بوون، بۆچی بەسووربوونەوە خۆیان وەکو بزاوتی "ئیلاهی" و "تیۆلۆژی" ناساندووە، واتە بۆچی وەکو ئایین خۆیان پێشکەشکرد؟ بۆ دۆزینەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە، بە ئەندازەی ئەو زەمینەیەی باسمانکرد، لەناو شێوە لێکەڕینەکانی رۆشنبیری و رزگاریخوازی ئەو سەردەمە گەڕان بەشوێن

وەڵامەکەدا، دەشێت ئەزموون بەخش بێت. هزر، گفتوگۆ، بەرنامە و چەمکی ڕێکخستنیان ناچارن لەسەر ئەو نموونانە بەڕێوە بچێت کە پێشتر شێوەی گرتووە.

گرنگترین نەریت لەمەدا نەریتی پێغەمبەرایەتی ئیبراهیمییە. لەو سەردەمەدا یەکەمین کەس پێغەمبەرانن کە مژدەی رزگاری رادەگەیەنن. تا نەبێت بە پێغەمبەر، یاخود پێغەمبەر نەبێت، هیچ کەسێک بەدوای ملیتان یان رۆشنبیرێک ناکەوێت کە بڵێ "من فریاد رەسم"، چونکە پێغەمبەرایەتی نەریتێکی رەگ داکوتاوە و لەوکاتەدا هیچ بژارێکی دیکە شانسی نییە. مانیکەرایی خوازیاری تاقیکردنەوەی نەریتێکی جیاواز بوو، سەرباری ئەوەی ناوەڕۆکێکی رۆشنکەرەوەی هەبوو، بەهۆی نەریتە کۆنەکانەوە نەیتوانی سەرکەوتنی تەواو بەدەست بێنێت. تا ئێستاش پۆشینی دەمامکی ئایینی لەلایەن ئەو بزووتنەوانەوە کە سەرچاوەکەیان بۆ رۆژهەلاتی ناوین دەگەڕێتەوە هۆکارەکەی بۆ ئەم دابونەریتە مێژووییە دەگەڕێتەوە.

لەم سۆنگەیەوە کاتێک ئیسلام و کریستیانی شرۆڤە دەکەین، دەبێت باش بزانین بزاوتێکی سیاسی رووتن کە پەردەی ئایینیان پۆشیوە. بێگومان بەشی ئایدیۆلۆژیشیان هەیە. هەروەکو لەم کورتە هەڵسەنگاندنەشدا ئاماژەمان پێکرد، نەریتی ئایینی ئیبراهیمی کە رەگەکەی بۆ چاخەکانی کۆن، بەتایبەتیش بۆ هێما خەیاڵییە میتۆلۆژی ـ ئایینییەکانی راهیبەکانی سۆمەر و میسر دەگەڕێتەوە بەشی هەرە زۆری تیۆلۆژییە. پەیوەندی بەزاراوەی خوداوەند و رێوڕەسمە ئایینییەکانەوە هەیە. هەوڵێکی زۆریان داوە تا شرۆڤەیەکی جیاوازتر لە خوداوەند و رێوڕەسمەکانی سۆمەر و میسر پێشبخەن. "کۆمەکەکانی شرۆڤەکردن" (تفسیر) کە هەوڵی پێغەمبەرە بەناوبانگەکان بووە، بەردەوام پەرەی پێدراوە. موسا، سامۆیل، داود، سلێمان، حەزەقیل، ئەشعیا و چەندینی دیکە لەم جۆرەن. بەڵام هەروەکو دەزانین بۆ رزگاربوون لە رژێمە سەرەڕۆییەکانی قۆناخی خۆی ئەم کەسایەتیانە خاوەن پێگەی رزگاریخوازی مەزن بوون.

هۆکاری ونبوونی شوێنپەنجەی مانیکەرایی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە پێش خۆی و دوای ئەو نەریتێکی تۆکمەی بەمجۆرە جێگای باس

نەبووە. سەرباری ئەوەی نەریتی ئیبراهیمی تەمەنی نزیکەی ۱۵۰۰ ساڵ بوو، بەڵام تا سەردەمی عیسای مەسیح سەرکەوتنێکی سنووورداری بەدەست هێنابوو. هیچ یەکێک لە شارستانییەکانی میسر و میزۆپۆتامیای تێکنەشکاندووە. هەرچی ئاواکردنی پادشایەتییە بچکۆلەکەی قودسیشە، هێندە تەمەن درێژ و بەکاریگەر نەبووە. گرنگترین سەرکەوتنی ئەوەیە، توانیویەتی ببێتە دەنگی هیوای ئەو مرۆڤە ستەم لێکراوانەی بەدوای رزگاریدا دەگەڕان. بووە بە ویژدان و ناوەندی سەرنج راکێشانی تەواوی ئەو هەژار و ستەم لێکراوانەی بەدەستی نەمرود و فیرعەونەکان (تەواوی بەڕێوەبەرایەتییە دەسپۆتەکان) ئازاریان دەچەشت و بەدوای خەیاڵەکانیانەوە بوون.

ئەگەر بوویەری حەزرەتی عیسای مەسیح لەم چوارچێوەیەدا تاوتوێ بکەین باشتر لێی تێدەگەین. لەمێژبوو ئیمپراتۆریەتی رۆما پادشایەتی قودسی فەتحکردبوو. کاتێک بەکرێگیراوەکان (کاهینەکان) لەگەڵ بەڕێوەبەرەکانی رۆمادا بوون، زەمینە بۆ پێغەمبەری نوێ رەخسابوو. هەروەها لەناو ئەو کۆمەڵگایانەی رۆژهەڵاتی ناویندا کە بە دەستی رۆما هەڵوەشێنرابوون کۆیلە بێکارەکان فیچقەیان دەهات، واتە پرۆلیتارێکی کەڵەکە بوو جێگای باس بوو. چەندین تەریقەت و پێغەمبەر دەرکەوتبوون. شیمانە دەکرێت عیسای مەسیح تەنیا یەکێک لەوانەیە کە لە خاچدراون. لە راستیدا زۆریان هاوشێوەی ئەو چارەنووسیان مردن بوو. مەسیح (فریاد رەس) تەنیا دەبێتە ناوێکی سیمبۆلی. دەبێتە سیمبۆل و ناوی هاوبەشی گشت بزووتنەوەکانی هەژاران. دەشێت وەکو بزووتنەوەیەکی سەرەتایی سۆسیالیستیش راڤەبکرێت. مسۆگەر لە سەرەتادا بزووتنەوەی هەژاران و ئەو کۆیلانەیە کە رایان کردووە. دوا کاروان و جووڵەی ئەو کەسەی بە عیسا ناو دەبرێت، لەپێناو فەتحکردنی قودسدایە. بەدوای پادشایەتییەکی نوێوەیە: پادشای هەژاران. وەک سپارتاکۆسی رۆمایە، بەڵام جۆرە بێ شەڕەکەیەتی. دوای ۱۲حەوارییەکە، بەتایبەتیش دوای یەکەمین گەلاڵەکانی ئینجیل (ماتریالی ئایدیۆلۆژی) و ئاواکردنی گروپەکان، دەبێت بە بزووتنەوەیەکی جەماوەری.

ساینت پاوڵ و هەندێک لە حەوارییەکان زۆر چالاکن. بەدواداچوون بۆ ئیمپراتۆرییەتی رۆما و ساسانی دەکەن. وەک دووسێ گرووپی گەلی بنەڕەتی گریکەکان لەناوەوە و رۆژئاوای ئەنادۆڵ، ئاشوورییەکان لە رۆژهەڵات لە ناوچەی ساسانییەکان، ئەرمەنییەکانیش لە باکووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ بەشێوەیەکی گەلەری بەشداری دەکەن. لەسەرووی هەموویانەوە ساینت پاوڵ، رۆشنبیرە یەهودییەکانیش زۆر چالاکن. بناخە کۆمەڵایەتییەکانی ئیمپراتۆرییەتی ساسانی و رۆما دەهەژێنن. تەواو دەبن بە بزووتنەوەیەکی سیاسی. دوای جیابوونەوەی بێزەنت وەک رۆمای رۆژهەڵات، کریستیانیش بوو بە ئایینی فەرمی. ناکۆکی لێرەدایە. ئەو باوەڕییەی لەسەر بنەمای دژایەتیکردنی رۆما سەریهەڵدا ئیتر دەبێتە ئایدیۆلۆژیا و ئایینی فەرمی بەشی هەرە گەورەی رۆما. ئەم رەوشە هەم پارچەبوون خێرا دەکات، هەم لە رێگای گۆڕینیانەوە تەمەنیان درێژدەکات.

مێژووی رۆمای رۆژهەڵات و رۆژئاوا دەزانرێت. هەروەکو دیار دەبێت ئەم پرۆسەیە لەناو بەرێوەبەرە لەپێشینەکانی کریستیانیدا رێگا لەپێش گفتوگۆو جیابوونەوەی مەزن دەکاتەوە. چەندین مەزهەب لەدایک دەبن. هەرچەندە گفتوگۆکان تیۆلۆژیانەیە (مۆنۆفیزیت[١]، دیۆفیزیت[٢]) بەڵام لە ناوەڕۆکدا تەواو سیاسییە. لەکاتێکدا بەشێکیان دەگەڕێنەوە خەباتی (نهێنی) ژێر زەمینی، بەشی گرنگیش دەبنە بەهێزترین هاوبەشی ئابووری و سیاسی هەردوو رۆما. دەمامکی سیاسەت و ئابووری لێدەچۆڕێت. کریستیانی لە ئایینەوە بۆ شارستانی دەگۆڕێت. بۆ یەکەمین جار لەمێژووی خۆیدا لەژێر پەردەی ئاییندا هەنگاونانی سەرلەبەری ئەورووپا بۆ شارستانییەت، ئەنجامێکی ئەم چالاکییە سیاسی و تیۆلۆژییەی کریستیانییە کە بەکورتی ئاماژەمان پێکرد.

---

١ـ مۆنۆفیزیت: مەزهەبی ئەو کەسانەیە کەدەڵێن مەسیح یەک سروشتی هەیە، واتە بەگوتە کوڕی خودایە، خۆی خودا نییە؛ باوکی خودایە، پەیوەندییەکەی لەگەڵ باوکی پەیوەندی کوڕایەتییە، لە سروشتی خوداییدا لەگەڵی هاوبەش و یەکسان نییە. بوونەوەرێکی مرۆیی ملکەچی خودایە؛ ئەمە مەزهەبی یەعقوبییەکانە.

٢ـ دیۆفیزیت: مەزهەبی ئەوانەیە کەدەڵێن مەسیح دوو سروشتی هەیە، لە دووکەس پێکدێت: ئیلاهی کە گوتەیە؛ مرۆیی کە یەسوعە، مەزهەبی نەستورییەکانە.

لەکاتێکدا لەسەدەی دەیەمدا بۆ باکوور و باکووری رۆژهەڵاتی ئەورووپا دەگوازرێتەوە، لە راستیدا کریستیانی بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە یەکەمین رۆڵی مێژوویی خۆی تەواو دەکات. دواتر دەکەوێتە ناو هەڵمەتێکی نوێی جیهانی. بەتایبەتیش لەگەڵ ئەو پرۆسەیەی بە ئاواکردنی سەرمایەداری بەناودەکرێت. هەرچی کریستیانییەکەی ئەنادۆڵ و میزۆپۆتامیایە، واتە گەلانی گریک، ئەرمەنی و ئاشوورییە سەرەتا لەسەر بنەمای شارستانی بیزەنتی، دواتر لەدەوروبەری کلێسا سەربەخۆکان کەوتنە ناو قۆناخێکی شارستانییەوە کە لایەنی مەعنەوییان قورس بوو. بوونیان بە "گەلە کریستیانییەکان" بەشێوەیەکی ستراتیژی کاریگەری لە چارەنووسیان دەکات. بەتایبەتیش کاتێک دەبنە ئامانجی موسڵمانەکان رووبەرووی ئەنجامێکی زۆر تراژیدیانە دەبنەوە.

چیرۆکی لەدایکبوونی شارستانی ئیسلامیش لە سەر نەریتێکی هاوشێوە دەست پێدەکات. مەککە دەکەوێتە خاڵی بەیەکگەیشتنی سێ رێگای سەرەکی بازرگانی دەریای سوور ـ کەنداو، یەمەن و حەبەشە ـ شامەوە. بەڕێوەبەرایەتی ئەرستۆکراتی و پلەدارانەی تیرەی قورەیشی عەرەبی تەواو تیرەیەکی بازرگانە، بتپەرستە. سەرمایەیەکی بازرگانی کۆبۆتەوە. شانبەشانی ئایینی یەهودی، زەردەشتی و کریستیانی چەندین بیروباوەڕی لەوناوەدا تەراتێن دەکەن. لەو شوێنەی کە ئیسماعیلی کوڕی حەزرەتی ئیبراهیم و هاجەری دایکی کۆچیان بۆی کردووە (ئەوانەی لە تیرەی سەرەکی عیبرانییەکان دابڕاون) لە دەوروبەری ئاوی زەمزەم ساباتێک دروست دەکەن. ئەمە یەکەمین پەرستگایە. بەڵام دواتر بتی تێدا دادەنرێت. لەسەردەمی حەزرەتی محەمەددا سێ بتی گرنگ هەیە: لات، مەننات و عوزە. لە پەرتووکە هەمەجۆرەکاندا باسی کراوە.

حەزرەتی محەمەد لە خێزانێکی هەژاری هۆزی قورەیش لەدایک دەبێت. لەو وڵاتانەی خۆیان بە موسڵمان دادەنێن، خۆیان لەوە بەدوور دەگرن کە ئیسلام بەگشتی و بەتایبەتیش ژیانی حەزرەتی محەمەد بکرێتە بابەتی توێژینەوەی کۆمەڵناسیی. هەروەکو بڵێی شتێک هەیە و لێی دەترسن. ئایینیش وەک هزرو شێوەیەکی ژیانی کۆمەڵایەتی، تا نەخرێتە

ژێر ڕۆشنایی توێژینەوەی کۆمەڵناسی، ڕۆشنگەرییەکی ڕاستەقینە پێشناکەوێت. ئەگەر ئەمە ئەنجام نەدرێت، ئەو کاتە ڕۆژهەلاتی ناوین لەرەوشی تەختەی تاقیکردنەوەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی رزگاری نابێت. ڕێگای هەرە باش بۆ تێگەیشتن لە حەزرەتی محەمەد بە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵناسیدا تێپەڕدەبێت. بەم هەڵوێستە کۆمەڵگا هیچ شتێک ون ناکات. لەبەرئەوەی ئەورووپا ئەم هەڵوێستەی بە بنەماگرت توانی ڕۆشنگەری ئەنجامبدات. ڕۆژهەلاتی ناوینیش تا ڕۆشنگەری تایبەت بەخۆی ئەنجام نەدات، ناتوانێت شۆڕشی هزری ئەنجامبدات. شیکارکردنی حەزرەتی محەمەد لەوانەیە ببێتە یەکێک لە هەنگاوە یەکەمینەکانی شۆڕشی هزری. سەردەمەکەی، کەسایەتی و چالاکییەکەی بۆ ئەمە گونجاوو لەبارە. لەسەر بنەمای هاوبەشێتی و بە وەرگرتنی بەشێک، کاروانەکانی خەدیجەی بازرگان بۆ شام دەبات. بە ڕاهیبە سریانییەکان کاریگەر دەبێت. یەهودییەکان قورسایی تایبەتیان لەبازرگانیدا هەیە. ناکۆکییەکان هەر لەسەرەتاوە هەن.

هاوسەرێتییەکەی لەگەڵ خەدیجە رەوشێکی نوێ دروستدەکات. دیسان لەو سەردەمەدا گووتەی "پێغەمبەری ئاخیر" لە دەورووبەردا دەگەڕێت. داواکارەکانی زۆرن. تەنانەت لەناویاندا داواکارێکی ژنیش دەردەکەوێت. بەمەزەندەی من، حەزرەتی محەمەد زۆر شت لە خەدیجە فێر دەبێت. چونکە دەوڵەمەندێتی و بوونی بە ژنێکی بازرگان کامڵبوون دەخوازێت. شیمانەیەکی بەهێزە یەکەمین کەس بێ کە گووتەی پێغەمبەرایەتی بەگوێیدا چرپاندبێت. یەکێتی نێوان هەردووکیان، مسۆگەر کردەیەکی (ناوکی) گەڕانە بەدوای دەسەلاتدا. ئەرستۆکراسی قورەیش بەهۆی نەریتە کۆنەپەرستەکەیان (بتەکان) ناتوانن دەوڵەت ئاوابکەن. یەهودی و کریستیانەکان بێکاریگەرن و پەسەند ناکرێن. هەروەها ناکۆکی ماددیشیان هەیە. چیرۆکی هاجەر - ئیسماعیل چیرۆکێکی عەرەبەکانە، ئیلهام بەخشە. بیروباوەڕو تەریقەتەکانی دەوروبەر دەناسێت. هەست بەوە دەکات کە هیچ یەکێکیان ناتوانێت ئامانجەکەی بەدیبێنێت، واتە ناتوانێت لەچوارچێوەی عەرەبستاندا یەکێتییەکی سیاسی دابمەزرێنێت.

بە هاندانی خەدیجە دەبێتە بەرئەندام (پاڵێوراو) یێکی ئەم رۆڵە. وەک نەریتی ئایدیۆلۆژی لقی عەرەبی ئیبراهیمی لەتەنیشتیەوەیە، فێربوونی ئەوەی تریش کە دەمێنێتەوە لە راهیبە سریانییەکانەوە هێندە زەحمەت نییە.

لە ساڵی ٦١٠زایینیدا یەکەمین سروشی پێغەمبەرایەتی بۆ دێت. قۆناخێکی هەرە گەرمی پێکدادانی بیزەنتی ـ ساسانییەکانە. ئەم رەوشەش وەکو شانسێکی نیمچە دورگەی عەرەبە. قورەیش و کۆلۆنیە یەهودییەکان، ئەو دوو کۆسپەن کەلە بەردەمیاندان. هەر لە سەرەتاوە پێغەمبەرایەتی بە واتای رێبەرایەتی سیاسیش دێت. هەڵبەتە بەجۆرێکی دیکە نابێت. تەواوی پەیامەکانی تایبەت بە پیاوانی دەوڵەتە. قەڵەمبازی ئیمپراتورییەتی رۆژهەڵاتی ناوینە کە تازە بەرز دەبێتەوە. ئایدیۆلۆژیای یەهودی نوژەن و هەنووکەیی کراو، بە رێبەرایەتی عەرەبەکان بۆ تەواوی گەلان دەکرێتەوەو سنووردرابوونەکەی تێپەڕدەکرێت. شێوازە نوێکەی ژیانی لە رێگای عیبادەتەوە دەکرێت بە سیمبۆل، لە رێگای ستراتیژ و تەکتیکێکی باشەوە لە هەر چوار لای جیهان بڵاو دەبێتەوە. دەشێت وەک یەکەمین بزووتنەوەی بەرفراوانی ئەنتەر ناسیۆنالیش راڤەبکرێت. بەکورتی لە رێگای ئایدیۆلۆژی، بەرنامەی سیاسی، رێبەرایەتییەکەی، ستراتیژی و تەکتیکەکانیەوە وەک بزووتنەوەیەکی سیاسی شارستانی نموونەیی مۆری خۆی لە مێژوو دەدات و بەرەو پێشەوە دەچێت.

سەیرە کەناوی ئیسلام بە واتای ئاشتی دێت. شیمانە دەکرێت، پێشداوەری قۆناخێکی پڕ لە شەڕ و پێکدادانی کردووە، بۆیە گرنگی بە ئاشتی دەدات. ناچارە هێرش بکاتە سەر سێ ئامانج. بیزەنت، ساسانییەکان و ئەرستۆکراتی قورەیش. هەنگاونانی بۆ یەکەمین ئامانجەکەی لە مەککەدا، بە دوورخستنەوە (کۆچ) ئەنجامگیر بوو (٦٢٢زایینی). لە مەدینە یەکەمین پەیمانی کۆمەڵایەتی ئامادە دەکات. جگە لە خێڵ و ئەرستۆکراتێکی سنووردراوی تیرەکان، پەیمانی نوێ لە بەرژەوەندی زۆرینەی هۆزەکاندایە. ئەو بەهەشتەی بەڵێن دراوە موڵکی بیزەنت و ساسانییەکانە، دۆزەخیش شێوازی ژیانی کۆنە. ژیانی بیابان

تارادەیەکی زۆر دۆزەخ بەبیری مرۆڤدا دێنێت. دوای شکاندنی یەکەمین هێرشی قورەیشییەکان (بەدر، ئوحد، خەندەق) ئەنجام دیار دەبێت. سەرهەڵدانی یەکەمین کۆمار (دیموکراسی)ی عەرەبەکان مەسەلەی سات بوو. گفتوگۆ و کۆبوونەوە (مزگەوت جڤات دێنێتەوە بیری مرۆڤ) بەردەوامن. بەپێچەوانەی مەزەندەکانەوە لەسەرەتادا مزگەوتەکان جێگای عیبادەت نییە، جێگای کۆبوونەوە و گفتوگۆکردنن.

بەڵام ئەو ئەرستۆکراسییەی ماوەیەکی کورت دەسەڵاتی لەدەست دا، بەتایبەتیش مەعاوییەی سەرۆکیان، لە رێگای مانۆڕی نوێوە (ئاساییە لەم بواردا پسپۆڕ بێت)، دوای کۆچی دوایی حەزرەتی محەمەد (٦٣٢) هەنگاو بەهەنگاو دەستی بەسەردا دەگرێتەوە. کوشتنی حەزرەتی عەلی باوەڕمەند و خاوەن پرەنسیپ، رێگای سوڵتانی (پادشایی) بۆ مەعاوییە و بنەماڵەکەی کردەوە. دوای کوشتنە تراژیدییەکەی حەزرەتی حوسێن لە کەربەلا بنەماڵەی پێغەمبەر لەرووی سیاسییەوە گرنگی خۆی لە دەستدەدات. بەڵام هێزێکی نوێی بازرگانی عەرەبەکان نەک تەنیا لە نیمچە دوورگە، بەڵکو لە تەواوی مولکی بێزەنتی و ساسانییەکاندا داوای هەق دەکات. بزووتنەوە گەورەکانی فەتح سەرکەوتن لەسەر سەرکەوتن بەدەست دەهێنن. یەهودی و کریستیانەکانی نیمچە دوورگەی عەرەب یەکەمین کەسانێکن کە ژێردەکەون و زەرەرمەند دەبن. لەساڵانی ٦٥٠ ی زایینیدا تەواوی وڵاتی ساسانی، بەشێکی زۆری بێزەنت و باکووری ئەفریقیا فەتحکراوە، گەیشتوونەتە دەروازەی قوستەنتین پۆلیس (ئەستەنبۆل).

دەتوانین ئەم شێوازە خێرایەی فەتحکاری بەشێوازی بروسکی فەتحکاری ئەسکەندەر بچوێنین کە رۆحی تیرەی مەکدۆنی و فەلسەفەی یۆنانی کرد بەیەک و رێگای لەپێش ئەنجامی کلتووری ماددی و مەعنەوی کردەوە. ئازایەتی تیرەکانی عەرەبستان لەگەڵ رۆحی بیروباوەڕی ئایینی نوێ دەکرێت بەسەنتێزێک، لەمیانەی هێزێکی بە توانای فەتحکارییەوە، وەک ئەسکەندەر شەڕەکانی فەتح بەسەردەخرێت. گرنگترین لقی قۆناخی دووەمی شارستانی پێکدێنێت. دواترین هەڵمەتی مەزنی کلتووری - شارستانی رۆژهەڵات بەرەو سەرکەوتن دەبات.

ئەوەی لە چیرۆکی ئیسلامدا جێگای سەرسوڕمانە، وەکو کریستیانی دوای سێ سەد ساڵ نا، بەڵکو لەگەڵ راگەیاندن و بڵاوبوونەوەیدا لەگەڵ دەسەڵات لەناو یەکدایە، وەک دەسەڵات لەدایک دەبێت. بەخێرایی چەوساوەکان، هەژاران و ئەوانەی رەنجی راستەقینەیان داوە لەدەسەڵات بەدەردەنرێن، لەمیانەی رۆحە برسی، تازە و یاخییەکەی تیرەکانەوە، لەدەوروبەری مزگەوت و کۆشکە بەهەشت ئاساکاندا، لە دەوروبەری دەوڵەتێکی بە توانا بەرەو ئاواکردنی شارستانی هەنگاو دەهاوێژن. لەماوەیەکی زۆر کەمدا (٦٤٠ـ٦٥٠) لەشارێکی بچووکی تیرەیەکی بازرگانەوە گۆڕان بۆ ئیمپراتۆرییەت، کاتێک بەشێوەیەکی زانستی ـ کۆمەڵناسی و لە روانگە ئایینییەکەیەوەو لەناو واتا سیاسیەکەیدا شیکار بکرێت تا دوا رادە ئەزموونبەخش دەبێت.

شرۆڤەی شەخسی خۆم: بۆشایی درێژخایەنی دەسەڵات لەناوەوەی عەرەبستان، گێژاوی کۆمەڵایەتی (پێکدادانی تیرەکان)، هەروەها ئەو لایەنانەیان کە هەڵگری تایبەتمەندییەکانی قۆناخی یەکەمی ئیمپراتۆریەتەکانی بێزەنتی و ساسانی بوون، تایبەتمەندێتییەکانی کەسایەتی خودی حەزرەتی محەمەد دەتوانن ئەم چیرۆکە خێرایەی دەسەڵات روون بکەنەوە. هەروەکو چۆن گۆڕەپانی شارستانییە باوەکانی رۆژهەڵاتی ناوین هەمووی فەتحکراوە، تا نیوەی هیندستان، ئاسیای ناوین، ناوەوەی قەفقاسیا، ئەوپەڕی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا (مالیزیا، ئەندەنوسیا) و ئەولاتری هەردوو نیمچە دوورگەی ئیبریک و بەلقانی باشووری رۆژئاوا و باشووری رۆژهەڵاتی ئەوروپا رۆیشتووە.

سەرەڕای ئەوەی بزووتنەوەیەکی سیاسی و سەربازی هێندە گەورەیە، وشەیەکی ئایینی لەجۆری "ئیسلام" ناتوانێت باش روونی بکاتەوە. رۆڵی پەردەپۆشکردنی راستی دەبینێت. ئیسلام ناوێکی سیمبۆلییە. زاراوەکانی ئەڵڵا و پێغەمبەر لەمێژە لەلایەن عیبرانییەکانەوە دۆزراوەتەوە. وابزانم رەخنەی یەهودییەکانی مەدینە کە گوتوویانە "ئایینەکەمان دەدزێت و بەرامبەرمان بەکاری دێنێت" حەزرەتی محەمەدی زۆر توڕە کردووە. هەروەها دەکرێت ریشەی شکۆدارکردنی پادشاو یاریدەدەرەکانی

لەبواری کۆمەڵناسیدا تا میتۆلۆژیای سۆمەر و میسر ببرێتەوە. بەڵام ئەو ناوەڕۆکەی حەزرەتی محەمەد بەزاراوەی ئەڵڵای بەخشیوە زۆر جیاوازە. وەک جۆرێک لە وزەی گەردوونە. چەمکێکی پێشکەوتووە. بەڵام زانا ئیسلامییەکان سەبارەت بەم بابەتە هیچ شرۆڤەیەکی کۆمەڵناسییان پێشنەخستووە. مەرجەکانی ئیمان (باوەڕهێنان) جۆرێک لە پرەنسیپە تیۆرییەکانە. عیبادەتیش بۆ ئەوەیە لە ڕێگای کردارییەوە پەیوەستبوون بەزیندوویی بهێڵنەوە. بەشی هەرە زۆری بۆ دابینکردنی پێویستییە ئەخلاقی و حقوقییەکانی ئەو سەردەمەیە. ڕێکخستنی حقوقی (فیقە)یان لەبارەی بەروبوومەکانی کشتوکاڵ و بازرگانییەوە کردووە. بەشێوەیەکی ڕەقوتوند دەستوەردانیان بۆ ئەو شێوازی ژیانە ئایدیۆلۆژییە کردووە کە پاشماوەی قۆناخی یەکەمی کۆیلەداری بووە. کافر 'ئەوی دیکە'یە کە پێویستە لەناوببرێت. فرەرەنگی ئایدیۆلۆژی تەنیا بۆ نەریتی ئیبراهیمی وەک مافێک دانی پێدادەنرێت.

بەبەراورد لەگەڵ کریستیانی، بەشێوەیەکی بابەتی بۆ عەلمانییەت کراوەترە. بەڵام شەڕی ڕادیکاڵانە بەرامبەر شێوازی ژیانی کۆن ئەنجامی زۆر نەرێنی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. باوەڕی دەکرێتە بیانوو، کلتووریی مێژوویی گەلان (کریستیانی)ش لەناودەبرێت، یاخود ئاسیمیلەیان دەکەن: بۆ نموونە زەردەشتی و مانیگەرایی. ئاشکرایە ئەو ژیانە نوێیەی لەگەڵ خۆیدا هێناوە ڕێگای لەپێش ئەرستۆکراتی دەرەبەگایەتی کردۆتەوە. دوالیزمی سوڵتان ـ سێبەری خودا جێگای پادشا ـ خوداوەندی گرتۆتەوە. لەئەنجامدا هەبوونی سوڵتانە دەسپۆتەکان کراوە بەناچارییەک. وەک ئایین ئیسلام توانای ڕێگرتن لە دەسپۆتیزمی نییە. هەرچی کریستیانییە لەم بارەیەوە خراپتریشە. بەو ئەندازەی بۆ مۆنارشی کراوەیە، ڕاهیبی کردووە بەهاوبەشێکی بەهێزی دەسەڵات. هەردوو ئایینیش وەک دەوڵەت، بایەخیان بەوەداوە کە ئەو توێژانەی لەدەرەوەی شارستانی ماونەتەوە، لەئاستی بەندەیەکی وەک سەپاندا بمێنێتەوە کە وەک کۆیلایەتی کلاسیک قورس نییە (لەهەندێک لایەنەوە لەهی کۆن خراپترە). هەردوو ئایینیش تەواو دژی کۆیلایەتی نین. خەسڵەتێکی بەمجۆرەیان هەیە، هەم پلەداری

هەم دەسەلاتی دەوڵەت بەشێوەیەکی بەهێزتر دەپارێزن. هەردوو ئایین بەماهییەتەکەیان هانی پەرەپێدانی قەوم دەدەن.

بەهۆی کات و شوێنیانەوە سەرەڕای ئەوەی هەردوو ئایین (بە یەهودیشیەوە) وەک دووەمین قۆناخ رژاونەتە ناو رووباری سەرەکی شارستانییەوە، نەتوانیویانە ببنە چارەسەری بۆ کێشەکانی نێوان هێزە پاوانخوازە دەسەلاتدارەکان و نە توانیویانە کێشەی دادوەری و ئازادی هێزەکانی کۆمەڵگای دیموکراتی چارەسەر بکەن کە لەلایەن شارستانییەوە پەراوێزکراون. بەپێچەوانەوە قۆناخی دووەم کێشەکانی عەدالەت و ئازادی قورستر کردووە.

ا ـ ناوەندەکانی پاوانخوازی دەسەلات هی نوێتری هاتۆتە سەر، بەرامبەر بەمەش بەرهەمی کشتوکاڵی و پیشەکاری پێشکەوتنێکی چۆنایەتی بەخۆیەوە نەدیوە. ئەو لایەنانە زۆر ببوون کە لەسەر بەرهەمی ـ زێدە لەناو شەڕدابوون. میرەکانیش هێندەی سوڵتانەکان ببوون بەفاکتەری پاوانخوازی. بنەماڵەکان زۆر بوون. بە بەراورد لەگەڵ جاران ئەوانە زیادیان کردووە کە داوای بەش دەکەن. هەروەکو جۆرێک لەچینی ناوین، کاتێک وەک ویستوویانە بەشیان نەدرابێت بەردەوام شەڕیان ناوەتەوە. شەڕەکانی دەرەبەگایەتی لە ئەورووپا و رووسیا زۆر و دژواربووە. مۆنارشەکان بیروکراسییان گەورەتر کردووە، بەمجۆرەش گرفتەکانی داهاتیان گەورەتر کردووە.

ب ـ ئەوانەی بە ئامانجی رزگاری، ئازادی و دادوەری چوونەتە ریزی هەردووک ئایینەوە، کاتێک هیواکانی خۆیان تێدا نەدۆزییەوە، بەشێوەی مەزهەبی جیاواز بەردەوام لەناو بەرخودان دابوون.

ج ـ لە بواری کلتووری مەعنەویشدا لەجیاتی پێشکەوتن، لەکاتێکدا کلتووری کۆنیان لەناو دەبرد کە بە "تاریکی چاخی ناوین" بەناودەکرا کلتووری نوێش ئاوانەکراوە، لەجیاتی ئەمە لە رێگای گفتوگۆ بێ کۆتاییەکانی مەزهەب و تیۆلۆژییەوە زهن لە دونیا و مێژوو (مێژوو بۆ چیرۆکی ئایینی گۆڕابوو) دابڕێنراوە، ئیرادە بە نەبوو دانراوە و مرۆڤیش تەنیا وەک سێبەرێک هێڵراوەتەوە. ئەو مرۆڤانەی بوونەتە دیلی خەیاڵەکانی

بەهەشت و دۆزەخ، گوێ بە دونیا نادەن و دەڵێن شایستەی ژیان نییە. هێزە پاوانخوازەکانیش ئاواکردنی قەڵا و کۆشکەکانی هاوشێوەی بەهەشتیان بۆخۆیان پشتگوێ نەخستووە. کلتووری شار و فەلسەفە بە بەراورد لەگەڵ پێشتر لەرەوشێکی دواکەوتوودایە.

د- لایەنی هەرە ترسناکیش، لەژێر دروشمی "**تاکە خودا لە ئاسمان و تاکە سوڵتانیش لەسەر زەوی**"دا هەروەکو بڵێی "**جیهان فەتح دەکەن**" لەسەرتاسەری زەوی شەڕی بڵاوکردنەوەی دەسەڵاتیان جاڕدا، ئەم شەڕانە شەڕەکانی چاخی یەکەمیشی تێپەڕکرد. شەڕکردن بەناوی خوداوە، زۆر لە شەڕەکانی نێوان خودی خوداوەندەکان کاولکارانەتر بوو. چەندین قات لەوەی قۆناخی یەکەم زیاتر پەلهاوێشتن و چەوسانەوەو داگیرکاری پێشخراوە. لەچاو چاخەکانی یەکەمدا شەڕەکانی ئوممەت سیستەماتیکتر و هەمیشەییتر بووە. پێکدادانی مەزن رەوشێکی بنبەستبوونی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو.

## د ـ رەوشی ئەورووپا لەکاتی لەدایکبوونی سەرمایەداری

نە کریستیانی، نە موسڵمانێتی هیچ یەکێکیان نەیانتوانی ئەو قەیرانە کۆتاییە چارەسەر بکەن کە لە قۆناخی کۆیلەداریدا لەسەردەمی هەرەسهێنانی ئیمپراتۆرییەتی رۆمادا قووڵبووبۆوە. ئەو سیستەمەی لەژێر ناوی "سیستەمی دەرەبەگایەتی" یان "شارستانی چاخی ناوین"دا پێشیان خست: راچێتەیەکی میتافیزیکیانە بوو کە تێگەیشتن لێی زەحمەتە و جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ راچێتەکانی راهیبی سۆمەر و میسردا نەبوو، لە رووی بەرنامەی سیاسی و کردارییەوە لە تێوەگلاندنی کۆمەڵگا بۆ ناو "تاریکی چاخی ناوین" بەولاوە تێپەڕی نەکرد. چەندین بەهای کلتووری چاخەکانی یەکەمیش لەناوچوون. قەیرانەکەی رۆما لەلایەن میراتگرەکانییەوە قووڵترکرایەوە. کۆمەڵگاکانی گۆڕەپانی شارستانی بەشێوەی "تایەفەکانی بەهەشت و دۆزەخ" بۆ کۆمەڵێک هێمای خەیاڵی گۆڕاون کە چاوەڕوانی نۆرەی خۆیانن و بەرپێیوانی سەربازی بەرەو بەرەکانی شەڕ دەچن، بەمجۆرەش خراونەتە دەرەوەی ژیانی زیندووی هەسارەکەمان.

بەگوێرەی ئەم تابلۆیەی بەشێوەیەکی تیۆری بەندە سەرەکییەکانیمان پێشکەشکرد لە رەوشی بەرجەستەدا چی دەبینین؟

اـ گریک، ئەرمەنی و ئاشوورییەکان یەکەمین قەومبوون کە ئایینی کریستیانیان پەسەندکرد، لە ئاکامی فەتحەکانی ئیسلام بەشێکی زۆری گۆڕەپانە مێژوویی و کلتوورییەکانی خۆیان لەدەستداوە. لەکاتێکدا خواستوویانە بەرامبەر رۆما ناسنامەی گریک، بەرامبەر بێزەنتی و ساسانییەکانیش ناسنامەی ئەرمەنی و ئاشووری ـ سریانی خۆیان بەهەمیشەیی بهێڵنەوەو بەهێزی بکەن، لە ئاکامی شەپۆلی فەتحی ئیسلامەوە بەشی هەرە زۆری ئەو ناوچانەیان لەدەستداوە کە لەژێر دەستیاندا بووە، بەمجۆرە کەوتوونەتە ناو رەوشێکی تراژیدییەوە، گۆڕەپانی کلتووری

ماددی و مەعنەوی هەزاران ساڵەی خۆیان لەدەستداوە. وەک قەوم ئەوانەی سوودمەندبوون و فروانبوونێکی مەزنیان بەخۆیانەوە بینی تورک و عەرەبەکان بوون. کورد و فارسەکانیش تەنیا توانیویانە بوونی خۆیان بپارێزن. بەرامبەر بەمەش رووسەکان ئەو قەومە بوون کە لەسایەی ئایینی کریستیانیدا سوودمەندی هەرەمەزن بوون. بەرامبەر بەرووسەکان، تورکەکان، تەتەرەکان، مەغۆلەکان تەنانەت چینییەکانیش لایەنی هەرە زەرەرمەندبوون.

ب ـ هۆزەکانی ئەوروپا لە رێگای ئایینی کریسیتیانییەوە زیان و دەستکەوتەکانی خۆیان هاوسەنگ کردووە. لەکاتێکدا بەهۆی بیروباوەڕی هاوبەشەوە پێشکەوتنێکی رێژەیی لەناسنامەکانی قەومدا بەدیهات، ئەرستۆکراسی راهیبەکان و ئەو دەرەبەگانەی لەدوایانەوە هاتن لەبواری لەدەستدانی بەشێکی گرنگ و بزۆکی کلتووری کۆندا بەکاریگەربوون. بەرامبەر لایەنە باڵاکانی نیولیتیکیش فشار پەیڕەوکراوە، ئاسیمیلاسیۆنیان بەسەردا سەپێنراوە. بەڵام ئەمەش راستییەکی مێژووییە کە یەکەمین فاکتەرەکانی نەتەوەیی لەم قۆناخەدا بەشێوەیەکی هەمیشەیی سەریان هەڵداوە.

ج ـ خەڵکە خۆجێییەکانی ئەفریقیا، ئەمریکا و ئوستراليا کلتووری خۆیان نەپاراستووە، بۆماوەیەکی درێژخایەن بەرامبەر بە کریستیانی تاڕادەیەکیش بەرامبەر موسڵمانێتی، ناسنامەی خۆیان لەدەستداوە. کلتووری هیندیش لەبەرەی دۆڕاواندا بووە. بەرامبەر بەم ئایینانە چین بوێری پەلهاوێشتنی نەبووە.

شارستانی چاخی ناوین، یانیش بەگووتەی خۆم دووەمین قۆناخی شارستانی، کاتێک لەجیاتی چارەسەرکردنی قەیران، رێگای لەپێش ئەنجامێک کردەوە کە زیاتر قووڵ ببێتەوە، رەوشی ئەوروپا بەیەکلابوونەوەیەکی ستراتیژی گەیشت. رەوشێکە: ئەگەر ئەوروپا شەڕی شارستانی لەدەست بدات هەمووشتێک وندەکات، ئەگەر سەریش بکەوێت باڵابوونی ستراتیژی مسۆگەر دەکات. بێگومان شەڕی شارستانی شەڕێکی نێوان دوو هێزی ستراتیژی چاخی ناوینە، شەڕی

ئیسلام و کریستیانە لە ئەوروپا و لەسەر ئەوروپا. رەوش لەوە ئاڵۆزترە کە مەزەندە دەکرێت.

کاتێک گەیشتە سەدەی پازدەهەم کریستیانی لەتەواوی ئەوروپادا پەلهاوێشتنی خۆی تەواوکردبوو، لەقۆناخی پادشایەتی پیرۆز و دەرەبەگایەتیدا دەژیا. ئیمپراتۆرییەتی رۆما - جێرمەن بانگەشەی درێژەدان بەمیراسی رۆما دەکات. بەڵام هەندێک رکابەر نارەزایی دەردەبڕن. پادشایەتی فەرەنسا لەسەرووی ئەمانەوە دێت. بنەماڵەی هابسبۆرک لە نەمسا کە وەک هێزێکی نوێ لە هەڵکشاندایە بانگەشەیەکی هاوشێوەی هەیە. لەمێژە قەیسەری رووس خۆی وەکو لایەنی سێیەم راگەیاندووە (دوای کەوتنی ئەستەنبوڵ). پادشایەتی پۆڵەندا کە کلتوورێکە تازە بووە بەکریستیان، بەڕادەیەک لەپێشەوەیە نایەوێت پیرۆزی بکەوێتە دەست هیچ لایەنێکەوە. ئینگلتەرا - فەرەنسا لەناو شەڕی سەد ساڵیدان. کرستیانەکانی ئیسپانیا و بەلقان لەڕەوشی بەرگریدان. شارەکانی ئیتاڵیا بەرەو سەرمایەداری دەڕوات، لەلایەکی دیکەشەوە پێشەنگایەتی رێنسانس دەکات. چاوەڕوانی ئەوەی لێناکرێت، وەک رۆما شارێکیان هەڵکشێت و یەکێتی ئیتاڵیا بەدەست بێنێت و بۆ ئەوروپاش ببێت بە نموونە. تا قوڕگ لەگەڵ یەکتری لەناو کێبڕکێی بازرگانیدان. کێشمەکێشی نێوانیان دژوارە. تاکە رۆڵ و کۆمەکیان، لە دووسەد ساڵی دواییدا لەبواری ئاواکردنی شاردا پێشەنگایەتیان بۆ ئەوروپا کردووە و سەرمایەداری بازرگانیان بۆ ئەوروپا گواستۆتەوەو بەمجۆرەش دەرفەتێکی ستراتیژیان بۆ ئەوروپا رەخساندووە. شیمانەی بەهێز ئەم دەرفەتە ستراتیژییە دەبێتە گرنگترین شانسی ئەوروپا. سەدەی شازدەهەم ئەوە دەسەلمێنێت. شەڕەکانی خاچپەرستیش وەک چاوەڕواندەکرا ئەنجامگیر نەبوو. دیارنییە کە ئەوروپا دەبێت بەچی.

تەواو لەم کاتەدا عەرەبە موسڵمانەکان وەک هەڕەشەیەکی ستراتیژی سەر ئیبریک - ئیسپانیا درێژە بە مەترسییەکانیان دەدەن. تەنیا جارێک کەوتبوونە فەرەنساوە، بەزەحمەت کردبوویانە دەرەوە. لە حاڵەتێکدا ئەم بەرەیە (سەنگەرە)شیان لەدەستبدایە، ئەوروپای کریستیان دەبوو

بە جۆرێک لە کۆڵۆنی و لەناو دەچوو. ئیمپراتۆرە عوسمانییەکان لە ڕێگای بەلقانەوە بەخێرایی برووسک گەیشتوونەتە نەمسا۔ هەنگاریا و تا سنوورەکانی پۆڵەندا ڕۆیشتوون. ئەگەر نەوەستێنرانایە، هەروەکو ڕۆما هەبوونی کلتووری و سیاسی ئەورووپا کۆتایی پێدەهات. تورکە عوسمانییەکان و عەرەبەکانی ئەندەلوس دەزانن ئەگەر سەرکەوتنی یەکجاری بەرامبەر ئەورووپا بەدەست نەهێنن، مسۆگەر یەک بەدوای یەک دەکەونە قۆناخی ژێر کەوتنەوە. دەوڵەتی 'ئاڵتون ئۆردو' کە بەردەوامی مەغۆلەکانە دەشێت هەرساتێک لە ڕێگای باکووری دەریای ڕەشەوە هێرش بکاتە سەر ئەورووپا.

ئەورووپا چەند تایبەتمەندێتییەکی دیکەشی هەیە کە لە قووڵاییەوە دێت. نەریتی دیموکراسی تیرەکان هێشتا تازەیە. گەلان بەقووڵایی لەناو سیستەمی شارستانی کۆیلەداریدا نەژیاون. تێگەیشتنیان لەکریستیانی ئادوارادە رووکەشیانەیە. زهنییەتیان بەتەواوی فەتح نەکراوە. بەتایبەتیش هێڵی باکووری بەمجۆرەیە. پەیوەندییان بەژیانی سروشتییەوە بەهێزە. لەناو قۆناخی هەرە خێراو تازەی ئاواکردنی شاردا دەژین. لەبەرئەوەی شارەکان ئاشنای پادشایەتی و ئیمپراتۆریەتەکان نەبوون، لایەنی دیموکراسییان لەپێشە. لەهەموویاندا بەڕێوەبەرایەتی نیو دیموکراتیانە جێگای باسە، لەنێوان ئەم بەڕێوەبەرایەتیانەشدا پەیوەندییەکی کۆنفیدراڵیانە ئاواکراوە. بەئاسانی دەسەڵاتی جیاوازتر، یاخود دەسەڵاتێکی دەرەوەی ئیرادەی خۆیان ناناسن. تەواوی پادشایەتی و دەرەبەگایەتییەکانی ئاواکراون تازەن. بەهرەو ئەزموونی نوێنەرایەتیکردنی ئەورووپایان کەمە. لەهێرشەکانی خاچپەرستیدا هەموویان یەک بەیەک پارچەبووە.

بەرامبەر بەمە شارستانی ئیسلام بە ئەزموونە. دونیای شارستانی کۆنی لەپشتە. باشتر ئاگاداری پرسیارەکانی دەسەڵاتە. متمانەیان بەخۆیان بەرزە. لەبەرئەوەی نوێنەرایەتی دوا ئایین و دوا پێغەمبەر دەکەن زۆر دۆگماتیکن. هەروەکو چۆن لەیەکەمین پەلاماری خاچپەرستەکاندا ژێرنەکەوتن، ڕێگاکانی بازرگانیش هێشتا لەژێر کۆنترۆڵیاندایە. هێشتا لەبواری بازرگانییەوە بالادەستن.

کاتێک لەناو راستینەی ئەم هەلومەرجانەوە تەماشابکرێت: دەبینرێت کە ئەورووپا لەناو قووڵترین قەیرانی شارستانیدا دەژیا. مەترسی ئیسلام، واتە هەڕەشەی تورک و عەرەبەکان رۆژبەڕۆژ گەورە دەبێت. قوستەنتین پۆلیس (ئەستەنبوڵ) لەدەست دراوە، سوڵتان محەمەد فاتح سەربازی گەیاندۆتە باشووری ئیتاڵیا. ئیسلام وەک ئایین و ئەو قەومانەی لەگەڵ خۆیشی دەیبردن، بۆ ئەورووپا تەواو وەکو دێوەزمەیەک بوو. کریستیانی شێوەیەکی شارستانی ئەوتۆ نییە بتوانێت بەرەنگاری ئەم دێوەزمە ببێتەوە. بەردەوام ژێردەکەوێت. ڤییەننا وەک تاکە هێڵی بەرەنگاربوونەوە لەسەر پێیان بوو. ئەویش بکەوتبایە وەستاندنی ئیسلام و تورکەکان ئاستەم بوو.

لە رەوشێکی بەمجۆرەدا خۆپێچانی نائاساییانەی شارەکانی ئیتاڵیا لە سەرمایەداری بازرگانی و خستنەڕووی رێنسانس، واتایەکی زۆر لەخۆ دەگرێت. هەردوو بزووتنەوەش لەهەمان کاتدا مەسەلەی مان ونەمانن. لەم سۆنگەیەوە ئەوەی لەنیمچە دوورگەی ئیتاڵیادا روودەدات چارەنووس دیاری دەکات.

هەردوو هێزی کریستیانی و ئیسلام کە بە بانگەشەی رزگارکردنی مرۆڤایەتی لە تاریکایی هەرەسهێنانی رۆما و گەیاندنی بە رزگاری و رۆشنگەری سەریانهەڵدا، چ لەناو خۆیاندا و چ بەرامبەر بەیەکتری قەیرانیان قووڵترکردۆتەوە، سەرلەنوێ رێگایان لەپێش پرسیاری رزگاری و رۆشنایی کردۆتەوە. ئەورووپا یان ئەو قەیرانە چارەسەر دەکات کە هەردوو هێزی نوێنەری دووەمین قۆناخی شارستانی پێشیانخستووە یاخود وەک رۆما نوقمی قووڵاییەکەی دەبێت.

ئەو "سەرمایەداری"یەی لێیپێچینەوە لەسەر لەدایکبوونەکەی لەسەدەی ١٦دا دەکەین، تەواو لەخاڵێکی بەمجۆردا بەشێوەی پرسیارێکی وەک ئایا دەبێتە رێگەچارەیەک بەهەموو قورساییەکەیەوە کەوتۆتە رۆژەڤەوە. لەوانەیە خەسڵەتەکانی لەدایکبوونی سەرمایەداری شانسێکی چارەسەرکردنی ئەو قەیرانانە بڕەخسێنێت کە کریستیانی و ئیسلامی چاخی ناوینی درەنگ سەرچاوەیانە. بەراستیش ئەزموونی

سەدەی شازدەهەمی هۆڵەندا و ئینگلتەرا رۆشناییان دەخستە سەر شانسی چارەسەری. بەلام کاتێک لەنزیکەوە توێژینەوە لەبارەی ئەم خەسلەتانەوە بکەین، هەروەک هەولماندا بیخەینەڕوو، ئەمجارە مەترسی قەیرانی سێیەمین قۆناخی شارستانی لە رووی قولبوونەوەی زیاتر و بلاوبوونەوەی بەتەواوی جیهاندا لە قەیرانی هەردوو قۆناخەکەی پێشتر کەمتر نییە. کاتێک سەرمایەداری کە پشت بەشێوەی پاوانی ئابووری، سیاسەت و شەڕ دێتە مەیدانەوە، فاکتەری قەیرانی سەرەکی تەواوی مێژووی شارستانییە. هەم بەرهەمی قەیرانە، هەم دروستکەرێتی. دەتوانێت قەیرانەکان بۆ کات و شوێن بەجێبهێلێت. بەلام ئەمە نابێت بەچارەسەری. ئەو بوویەرانەی لە سەدەی شازدەهەمەوە تا سەدەی بیست و یەکەم روویانداوە بەزیادیشەوە گووتەکانمان دەسەلمێنێت.

هەردوو سەرە دێڕی لەمە دواتر دەولەت ـ نەتەوە و پیشەسازی دەبێت. ئەم ئامرازانەی کە بۆ یەکەمین جار لەمێژوودا شارستانی وەک کۆلەکە سەرەکییەکانی چارەسەرکردنی کێشە کۆمەلایەتییەکان خستییە گەڕ، لێپرسینەوەیان لەبارەوە دەکەین، لەبەشی ئەنجامیشدا هەولدەدەم گفتوگۆ و داوەرییەکانم دەرهەق بە رژێمی قەیران، شارستانی قەیران، واتە دەرهەق بە سەرمایەداری بەئەنجام بگەیەنم.

کاتێک بۆ بەزاراوەکردنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری، لە ئابوورییەوە دەست بەکاربین ئەم هەوڵەمان هەم ناتەواوە، هەم لەبواری ڕێبازەوە ڕێگا لەپێش داوەری و ئەنجامێک دەکاتەوە کە تێگەیشتن لە ناوەڕۆک و پەیوەندییەکان دوور دەخاتەوە، چەواشەکردن و ناڕوونی لەگەڵ خۆیدا دێنێت. ئەو پێناسەو شیکارانەی تا ئێستا سەبارەت بە سەرمایەداری هەوڵی پێشخستنیمانداوە، سەلماندوویەتی کە لەبواری ئابووریدا هێزێکی پاوانخوازە کە لەدەرەوە دەسەپێنرێت. کەواتە لەبواری ناوەڕۆکدا لەجێگایەکی دیکە گەڕان بەشوێنیدا، دەشێت لە ڕووی پەیڕەو (میتۆد) یشەوە ڕێگا لەپێش دۆزینەوەو پێدراوی ڕاستتر بکاتەوە. لەو شوێنەی کە لەبنەڕەتدا دەیشارێتەوەو هەوڵی دەمامکدانی دەدات، واتە لە گۆڕەپانی دەوڵەتدا درێژە بە گەڕانەکەمان دەدەین.

کارل مارکس کە لە گۆڕەپانی ئابووریدا بەدوای سەرمایەداریدا گەڕا، بەو هەموو ئامادەکارییەی لەبواری میتۆد، فەلسەفی، مێژوویی و کۆمەڵناسییەوە ئەنجامیدابوو، ئاماژەی بۆ پێکهاتە پاوانخوازەکەی دەکرد کە لەمیانەی سیستەمێکی خەستی قەیرانەوە خۆی کارەکتەریزە کردووە و ئەمیش بە ئەرێنی دەبینێت. زاڵبوون بەسەر ئابووریدا، بەواتای ئابووری نایەت. سەپاندنی پێکهاتەش بەسەر ئابووریدا، ئابووری نییە. لەبواری کۆمەڵناسییەوە دەسەڵات نەبێت ناشێت و ناتوانرێت لەبازاڕدا یاری بەنرخەکان بکرێت، و ئامرازەکانی پارە هەمەڕەنگ بێت و لەکۆکردنەوەی قازانج ـ سەرمایەدا بەکاربهێنرێت. تا دەسەڵاتی سیاسی و کارەکتەری توندوتیژی بەهەموو ئاکامەکانییەوە شیکار نەکرێت، تاوتوێکردنی زاراوەی سەرمایە لەمیانەی شیکردنەوە ئەبستراکتەکانی

ئابووری ـ سیاسی و بەردەوام بەمجۆرە گواستنەوەو جێگیرکردنی لەهزردا، بە ئەنقەست بێت یان بەنیازی باشە بەقوربانیکردنێتی بۆ هەڵەی میتۆدو جیهانبینی سەرمایەداری. ئاگادارم کە رەخنەکردنی کارل مارکس لەرێگای تێزی رووکەشی و هەرزانەوە بەبێ ئەنجامدانی شیکاری بەرفراوان چ مەترسییەکی لێدەکەوێتەوە. بە تایبەتیش بانگەشە دووبارەو وەڕسکەرەکانی ئەو دۆگماتیک و پۆزێتیڤیستانەی خۆیان بەمارکسیست دادەنێن و موریدایەتی تەریقەتیان تێپەڕنەکردووە، گفتووگۆکان بەرەو پێشەوە نابات. لە ئاکامی ئەزموونی تیۆری ـ پراکتیکی سەد و پەنجا ساڵی رابردووەوە بەسەدان جار سەلمێنراوە کە "سەرمایە" رۆڵی تەوتەمێکی[1] نوێ دەبینێت و هیچ بەکەڵکی کرێکاران نایەت. من هۆکاری سەرەکی ئەمە بۆ ئەو هەڵەدا چوونەدا دەگێڕمەوە: سەرباری ئەوەی سەرمایەداری ئابووری نییە، بەڵام لە ئابووریدا بەدوایدا دەگەڕێن، ئەوانەی ئابووری نین وەک بابەتی سەرەکی ئابووری دەبینرێن. سەرباری خەسڵەتەکانی سیاسەتی دەوڵەتی پاوانخواز کە هەمووی لەدەرەوەی ئابوورییە، بەڵام لەگۆشەی سەرەکی ئابووری جێگیر دەکرێت، ئەمە وەک تێکچوونێکی سەرسوڕهێنەرانەی زهن دەبینم، لەبواری سیاسی ـ ئایدیۆلۆژیشدا وەک شێواندنێکی "رۆشنبیریانە"ی دەبینم کە ئەنجامی تراژیدی و جەرگبڕ لەگەڵ خۆیدا دێنێت.

سەبارەت بە هیگڵ و مارکس پسپۆڕ نیم. هێندەش نەمخوێندوونەتەوە. جگە لە رامانێکی گشتی هێندە ئاگادارنیم. لەو بڕوایەدام کە هێندە پێویست نییە. بەڵام گرنگی پێدەدەم و لەوبڕوایەدام کە مافی شرۆڤەکردن ئەرکێکی ئازادیخوازییە. لەبەرئەوەی هەرە زێدە کاریگەرییان کردۆتە سەر کۆمەڵگای مۆدێرنیتەی سەرمایەداری، لەم سۆنگەیەوە راڤەکردنیان بەئەرکی ئازادی و یەکسانییەوە دەبەستمەوە. مارکس و ئەنگلس کاتێک فەلسەفەی ئەڵمانیان وەک یەکێک لە سەرچاوەکانی سۆسیالیزمی زانستی دەستنیشانکرد، دیارە کە 'هیگڵ'یان رەچاو دەکرد کە هەرە زێدە پێی کاریگەربوون. دەشێت لە رەخنەکانیاندا ئەمە دەستنیشان بکرێت.

---

١ تەوتەم: ناوی یەکەمین شێوەی بڕوا و ئایینە کە سیمبۆلی پەرستراو و رێورەسمی پەرستنی هەبووە و بۆ ١٥٠٠٠ ساڵ لەمەوبەر دەگەڕێتەوە.

لە بواری ئایدۆلۆژیدا هیگڵ لووتکەی میتافیزیک و نوێنەرە هاوچەرخ و هەرە گەورەکەی دیالیکتیکە. فەیلەسوفێکی راستەقینەی ئەڵمانە. مەبەستم لە باوکایەتییەتی بۆ فکری میللیگەرایی ئەڵمان. مارکس و ئەنگلس کاتێک ئاستی دواکەوتوویی سەرمایەداری ئەڵمانی، لە بورژوازی ئەڵماندا تاوتوێ دەکەن، پێگەی بۆرژوازیش لە فەلسەفەی ئەڵمانیدا دەخەنە رۆژەڤی خۆیانەوە، بەمجۆرە لەسەر رێگایەکی باشن. لەسەرەتادا رەخنەکردنیان لە حقوقی فەلسەفەی هیگڵ، ئەم هەڵوێستانەیان نیشاندەدات. لەدوای ئەمە هەوڵەکانی یانە (لیگ)ی کۆمۆنیستەکان و مانیفیستۆی کۆمۆنیستی لەبواری کرداریدا پێگەکەیان جێگیر دەکات. کاتێک لە شۆڕشەکانی ١٨٤٨ هیواکانیان بەدینەهات، بەبڕوای من رێگا لەپێش یەکێک لە شکانە بنەڕەتییەکەیان دەکاتەوە و یەکەمین نیشانەکانی لادانیان بەرەو ئابووری لەم قۆناخە بەدواوەیە. گفتوگۆ لەو بارەیەوە ناکەم کە بۆچی رۆڵی لەپێشینەیان بە ئابووریداوە. هەروەها ناڵێم کە لێکۆلینەوەی ئابووری پێویست نییە. توێژینەوە لە "سەرمایە"ش بۆ ئەوە رەخنە ناکەم کە هەڵەیە. ئەو خاڵە سەرەکییەی رەخنەی دەکەم، تەواو ئەو خاڵەیە کە هیگڵیان لەسەر رەخنەکردووە. ئەویش ئەوەیە: بۆچی رۆڵی لەپێشینەی بە دەوڵەت و حقوق بەخشیوە. بەگوێرەی من هیگڵ لە خاڵی هەرە پێویستدا هزری خۆی پێشدەخات. لەو شوێنەوە دەست پێدەکات کە پێویستە. ئەوەی هەڵەی مێژوویی کردووە خودی مارکس و ئەنگلسە. واتە بەلاڕێداچوونی ئابووری هەڵەی مێژووییە. ئەم لادانە هۆکاری سەرەکی بەدەست نەهێنانی سەرکەوتنی چاوەڕوانکراوی تێکۆشانی کۆمەڵگای دیموکراتی، ئازادی و یەکسانی سۆسیالیزمی سەدوپەنجا ساڵە بوو.

بۆ ئەوەی بەهەڵە تێنەگەن دووبارەی دەکەمەوە. کاتێک دەڵێم ئەوەی هیگڵ راست بوو، بەو واتایە نایەت کە هێڵێی تیۆری ـ پراکتیکی هیگڵ پەسەند دەکەم. کە دەڵێم راستە، مەبەستم لەشوێنی دەست پێکردنی کارەکەیەتی.

کێشەکە لە ئەوروپا گشتییە. پەیوەندی بەکێشەی دەسەلاتی ئەوروپاوە هەیە کە ئیتر دەوڵەتی تێدا ئاواکرابوو. لێڤی ئەتهانی هاوچەرخ چۆن شێوە

دەگرێت؟ ئەوەی تۆماس هۆبز و گراتسی ئاماژەیان پێکردووە، پێویستی رەها بە دەوڵەت و ناوەندیبوونێتی. ئەوەی ئەنجامیانداوە تیۆریزانی موتڵەقگەرایییە. موتڵەقگەرایی مۆدێرن وەک مۆدێلی دەوڵەتی قۆناخی راگوزاری لە (سەردەمی دەرەبەگایەتییەوە بۆ سەردەمی سەرمایەداری) لە ئامرازی سەرەکی دەرچوون و چارەسەری دەبینن. بەڵام ئەم ئامرازەی چارەسەری، قەیرانەکە بەتەواوی چارەسەر ناکات. کێشەی دەوڵەت بەهەموو قورساییەکەیەوە بەردەوام دەبێت. کاتێک لەهۆڵەندا و ئینگلتەرا سەرمایەداری رۆڵی پێشەنگایەتی دەبینێت، هەژموونگەرایی خۆیان پێشدەخەن، فەرەنسا و ئەڵمانیا دەهەژێنێت، کاریگەرییان لێدەکات. فەرەنسا ئەو تێکۆشانەی دۆڕاند کە لەپێناو هەژموونگەراییدا بەڕێوەی برد. ئەڵمانیاش هێشتا لەو دۆزەدا سەرنەکەوتبوو کە "یەکێتی نەتەوەیی" پێ دەگووترا. تەواوی پالێوراوەکانی دیکەی دەسەلات کە لە ئەوروپا چاوەڕوانی داهاتوویان لێدەکرا، لەناو کێشەکانی دەوڵەتۆچکەدا نغرۆ بوو بوون. پادشایەتی و موتڵەقییەت ئەم کێشانە بەتەواوی چارەسەر ناکەن. نموونەی فەرەنسا لەبەرچاوانە. موتڵەقگەرایی پادشای خۆر، لویسی چواردەهەم بەرامبەر بەهاوپەیمانی هۆڵەندا ـ ئینگلتەرا سەرناکەوێت، لەناوەوەش کێشەکانی دەوڵەت بەردەوام گەورە دەبێت. ئیتر ئەوانی دیکە چیان پێدەکرێت؟ رەوشی کلتووری ماددی و مەعنەوی و ناکۆکییەکانی بەرژەوەندیخوازی رێگایان پێنادات مۆدێلی دەوڵەتی ئینگلتەرا ـ هۆڵەندا بگرنەبەر.

ئەو بوویەرەی بە شۆڕشی فەرەنسا دەناسرێت بەرامبەر بەم هەلومەرج و کێشانە تەقیوەتەوە، ئەو بەرئەنجامەی دەرکەوتووە جگە لە گرفتەکانی دەوڵەت کێشەکانی شۆڕشیشی هاتۆتە سەر. لینین لەخۆڕا نالێت "دەوڵەت و شۆڕش". مەسەلەی دەسەلات تەواو لە حاڵەتی قەیراندایە. هەژموونگەرایی سەرمایەداری کە بە ئامانجی چارەسەرکردنی قەیرانی دەرەبەگایەتی پێشکەوت، قەیرانی قووڵترکردۆتەوەو کردوویێتی بە قەیرانێکی گشتی. موتڵەقییەت دەڕووخێت، کۆمار رادەگەیەنرێت، قۆناخێکی سەرسوڕهێنەری تیرۆر دەست پێدەکات، دواتریش ئیمپراتۆرییەت و

ئیمپراتۆریکی هار هەروەکو بڵێی لە ئاسمانەوە دابەزیوەتە سەر زەوی تەواوی ئەورووپا دەپێچێتەوە. بەشێوەیەک کە چاوەڕوانی نەدەکرا فەرەنسییەکان دەورووبەریان بەقسە و کردار، ناسکتر بڵێین بەتیۆری و شەڕ خنکاند. لەچاو ئەمانەدا گیۆتین چییە؟

ئەو شرۆڤەیەی هیگڵ کردوویەتی نایابە. سەبارەت بە دەوڵەت لەکەسایەتی ناپلیۆندا ئەمە دەڵێت: "**دۆخی خوداوەندێک کە دابەزیوەتە سەر زەوی**". ئەمە شێوازێکی روونکردنەوەیە کە سوودم لێی بینیوەو منی خستۆتە ژێر کاریگەری ئەفسوونی خۆیەوە. دۆزینەوەی رستەیەکی بەمجۆرە ئاستەمە کە بەشێوەیەکی بەرکەماڵ هەم دەوڵەتی کۆن، هەم دەوڵەتی نوێ روون دەکاتەوە. ئەقڵی بەسەر ئەوەدا شکاوە ئەوەی بەهەزاران پەرتووکی پیرۆز و عەلمانی خواستوویانە بیڵێن ئەو بەیەک رستە بیڵێت. بەراستیش فەلسەفەی کردووە. دەتوانم ئەوە بڵێم: ئینگلیزەکان کاری ئابووری، فەرەنسییەکانیش کاری کۆمەڵگا، ئەلمانییەکانیش کاری فەلسەفە باش دەزانن. بەڵام ئاماژە بەو خاڵەش بکەم، دروستکردنی سەنتێزی ئەمانە زۆر مەترسیدارە.

ناپلیۆن بۆ ئەوەی بڵاوە بەموتڵەقگەراییەکەی دەورووبەری بکات مەزەندە دەکەم ساڵی ١٨٠٢ باسی مۆدێلێک دەکات کەدەشێت "**دەوڵەت - نەتەوە**"ی پێبگووترێت. خوازیارە سەرتاسەری فەرەنسا ببێتە دەوڵەتێک، لەگەڵ هەڵسانە سەرپێ ئەورووپاش بێنێتە سەر رێگا. سەرکەوتووش دەبێت. ناپلیۆن لایەنگری شارستانی دەرەبەگایەتی نییە. هەربۆیە خوازیارە لەسەر بنەمای شۆڕش لەناو باهۆزدا بیخنکێنێت. لاسایی ئیمپراتۆرەکانی رۆما، قەیسەر و ئەسکەندەر دەکاتەوە. بەڵام قۆناغ بۆ ئەمە لەبار نییە. زەمینەی کلتووری ماددی و مەعنەوی ئیمپراتۆریکی بەمجۆرە لەئارادا نییە. هەرچی ئینگلتەرایە بەشێوەیەکی وردو فێڵبازانە هونەری هەژموونگەرایی "**ئابووری - سیاسی**" وەستایانە لەبەرامبەریدا بەکاردێنێت. هەروەکو بڵێی بەرامبەر ئەم رەوشە ناپلیۆن شێت دەبێت. هیچ پەندێکی لەدوورخستنەوە بۆ دوورگەی ئەلب وەرنەگرتووە. پەندیشی وەرگرتبێت دیسان ناپلیۆنێکە کە بەشێوەیەکی سەرسامانە

دەجەنگێت، بەڵام لە واتەرلۆ تێکدەشکێت و ئیتر پەرێشانە. دوای پێنج ساڵ لە دوورخستنەوە بۆ دوورگەی ساینت هەلەن کە دەکەوێتە زەریای ئەتڵەسییەوە، کاتێک لە ساڵی (١٨٢١) کۆچی دوایی کرد دواگووتەکانی **"فەرەنسا، سوپاکان و ژۆزفین"** بوو. ئەمانە گووتەیەکن بەشێوەیەکی بەرکەماڵ پوختەی چالاکوانێکی دەوڵەت ـ نەتەوە نیشاندەدات.

ئەڵمانەکان تیۆرییەکەی پێشدەخەن، هیگڵ دەروازەی هەستانە بەمکارە. بەمجۆرە ئایدیۆلۆژیایەکی تەواو پێکدێت. لەخۆڕا ئایدیۆلۆژیای ئەڵمان بەناوبانگ نییە. لەبواری کرداریشدا هەنگاو بەهەنگاو دەوڵەتی بروسیا ئاوادەکرێت، لەهەڵکشاندایە. بۆ دواخستنی دەوڵەتەکانی نەمسا و فەرەنسا، ئینگلتەرا پشتگیری بروسیا دەکات. لەدوای سەرکەوتنی سیدان لە ساڵی ١٨٧٠ و فەراهەمکردنی یەکێتی ئەڵمانیا، بروسیا وەک دووەمین هێزی هەژموونگەرایی دێتە بەرامبەر ئینگلتەرا. لە دابەشکردنی ناعادیلانەی جیهان نارەحەتە. داوای بەشی خۆی دەکات. لەشەڕەکانی یەکەم و دووەمی جیهانیدا ژێردەکەوێت و وەک فەرەنسا بانگەشەی هەژموونگەرایی لەدەست دەدات.

لەشۆڕشی فەرەنساوە تا ساڵی ١٩٤٥سەلمێنراوە کە قەیرانی سەرمایەداری (بەردەوام نەک بەخوول) چەندە قووڵە. ڕێبەری ئەڵمانیا لە دووەمین جەنگی جیهانیدا هیتلەرە. بەخاچی نووشتاوە نوێنەرایەتی دەکرێت. چەندین شیکار لەبارەی فاشیزمەوە کراوە. ئەوەی لەسەرووی هەموویانەوە لەلایەن مارکسییەکان، لیبڕاڵ، مەحافەزەکار و ئەنارشیستەکانەوە کراون هەموویان خەڵەتێنەرن. هیچ یەکێکیان ئەو هێزە یاخود نیازەیان نییە بەشێوەیەکی دڵسۆزانەو تێروتەسەل ڕووداوەکان ڕوونبکەنەوە. ڕۆشنبیرە یەهودییە سەرسامەکانی کە بوونەتە قوربانی کۆمەڵکوژی لەم خەڵەتاندنەدا ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینن. چونکە هتلەر 'پیسایی' ڕۆشنبیرییەکەیان و 'ڕشانەوەی' هاوبەشی پراکتیکی سیاسیانە. دەڵێن: **'ژیشک گوتوویەتی بەچکەی کەس وەک هی خۆم نەرمونۆڵ نییە'** بۆچی هیچ یەکێکیان لەبواری ئایدیۆلۆژی و کردارییەوە دەڵێت: **'ڕشانەوەکەم پیساییە'**؟

داوەرییەکەی فەیلەسوفی ئەڵمانی بە ڕەچەڵەک یەهودی تیۆدۆر ئەدۆرنۆ بە گرنگ دەزانم، هەرچەندە وەک ئەو گووتەیەی من نەبێت، بەڵام بەکورتی هەمان واتا دەبەخشێت: باسی یەکەمین داوەریم کردبوو. سەبارەت بە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری گووتە واتادار و قووڵەکەی "ژیانی چەوت، بەراستی ناژێندرێت" جێگای باسە. دووەمین گووتەی، لەبارەی کامپەکانی کۆمەڵکوژییەوە، واتاکەیانی شیکارکردووە و گووتویەتی: "بەناوی تەواوی ئیلاهی و پیرۆزییەکانەوە مافی قسەکردنی مرۆڤ نەماوە" دەبێت بەهەڵەشدا چووبم، بەڵام ناوەڕۆکەکەی بەمجۆرە شرۆڤە دەکەم. دەڵێت هیچ ڕوونکردنەوەیەک نابێتە بەهانە بۆ ئەنجامدانی کۆمەڵکوژی. دەمامکی شارستانییەکەمان کەوتووە. مافی قسەکردن نەماوە. قوتابخانەی فەلسەفی فرانکفۆرت بەدوای شوێنپەنجەی ڕاستییەکاندا دەگەڕێت. بەڵام کڵۆڵی تیۆەگلانی تاوان و دان پێدانانەکانیان لە قووڵاییدا نیگەرانی کردوون و دڵشکاون. دان پێدانان و تێگەیشتنی بنیامین و ئەدۆرنۆ لەبارەی ڕۆڵی ئایدیۆلۆژی یەهودییەوە لەم ڕەوشەدا گرنگە. ئەم ڕەوشەی ئێستای یەکێتی ئەورووپا بزاوتی پەردەپۆشکردنی ئەم پیساییەیە. باوەڕناکەم ژێرەکەیان پاک کردبێتەوە. قووڵایی قەیران بەردەوامە.

سێیەمین گەورە هەڵمەتی جیهانگیری (جیهانگیری چاخی فینانس) کردارێکە لەمیانەی بەقووڵی هێشتنەوەی قەیران بۆ کات و شوێنی دیکە هەوڵی کۆنترۆڵکردنی دەدات. لەساڵی ١٩٨٩دا بەشێوەیەکی فەرمی پەرتەوازەبوونی سیستەمی سۆڤێت دانپێدانانە هەم بۆ ناوەڕۆکی دەوڵەت ـ نەتەوە، هەم ئەو ڕۆڵەی لە قەیرانە بەردەوامەکاندا هەیانبوو. وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا کە هێزی نوێی هەژموونگەرایی دوای ساڵی ١٩٤٥ە وەک لایەنی سەرکەوتووی شەڕی سارد، ڕۆژهەڵاتی ناوینی وەک ناوچەی شەڕی ستراتیژی ڕاگەیاندووە کە ماوەیەکی درێژە گۆڕەپانی سەرەکی قەیرانی بەردەوامی سیستەمە. لەسێدارەدانی سەددامی سەرۆک دەوڵەتی ئێراق کە وەک شازدەهەمین لویسی دەوڵەت ـ نەتەوەی ڕۆژهەڵاتی ناوینە بەشێوەیەکی سیمبۆلی گوزارشت لە چی دەکات؟ ئەمە پێویستی بە گفتوگۆیەکی بەرفراوان هەیە.

## أـ پەرەسەندنی نەتەوە، دیاردەی نەتەوە

دابەشبوونی کۆمەڵگاکان لەناوخۆیاندا بەشێوەی کۆمۆنەی سەرەتایی، کۆمەڵگای دەوڵەتی و کۆمەڵگای دیموکراتی دەگەڕێتەوە بۆ جیابوونەوەی چینایەتی و کێشەکانی بەڕێوەبەرایەتی. هەرچی دابەشبوونە لەسەر بنەمای راستینەی نەتەوەیی، زیاتر لە رێگای پێشکەوتنەکانی زمان، کلتوور، حقوق و سیاسەتەوە دەست نیشاندەکرێت. لەجیاتی یەک چەشنی نەتەوە، باسکردنی شێوە جیاوازەکانی نەتەوە واتادارترە. دەشێت باسی ئەو نەتەوانە بکەین کە لەجیاتی هەمان بنەما، لەسەر بنەمای جیاواز ئاواکراون.

کاتێک واتا بە پۆلێنی نەتەوە دەبەخشین، بەردەوام رەچاوکردنی دیاردەیەکی گشتی کۆمەڵایەتی ئەزموونبەخش دەبێت. تەواوی جڤاتەکان و لەسەرووی هەمووشیانەوە کلانەکانی، هەموویان کێشەی بوون بەخودی خۆیانەوە هەیە. من چۆن کۆمەڵگا یان جڤاتێکم؟ ئەمە جۆرێکە لە گەڕان بەدوای ناسنامە. هەروەکو چۆن هەر مرۆڤێک ناو و ناسنامەی خۆی هەیە، سەبارەت بە هەر جڤاتێکیش باسکردنی پێویستی ناو و ناسنامەیەک ناچارییە. ئەگەر چەندین دیاردەی کۆمەڵایەتی زەق هەن کە لە ناوەڕۆکی جیاواز پێکهاتوون، ناسنامە و گوزارشتکردنی ناسنامەکەیان سروشتییە. لە رەوشێکی پێچەوانەدا بە واتای پەیوەندی بەستنی نێوان ئەندامانی خێزانێک دێت بەبێ ئەوەی ناسنامە و ناوی یەکتر بلێن، کە تەنانەت لە جڤاتی کلانیشدا شتێکی بەمجۆرە جێگای باس نییە. کاتێک یەکێک بۆ سادەترین شت بانگی یەکێک بکات بلێت وەرە، بەبێ ناو نابێت. کەچی بەبێ ئەوەی ناو لە هەزاران خەسڵەت بنرێت، جیاوازی کۆمەڵگاکان ببینرێت و هیچ سیفەتێکیان پێوە بلکێنرێت، باسکردنی واتاپێدان، پەیوەندی

بەستن، پێشخستنی زانست، ئەنجامدانی چالاکی کۆمەلایەتی و پێشکەوتن شتێکی نابەجێیە. لەرەوشێکی بەمجۆرەدا کۆمەڵگایەکی بێ زمان (لاڵ) بەبیری مرۆڤدا دێت، کە تەنانەت لەناو ئاژەڵەکانیشدا ڕێگای تێناچێت. ئەوانیش زمانی ئیشارەتیان هەیە. دەشێت فرە زمانی، فرە کلتووری و هەمەرەنگی سیاسی و حقوقی هەبێت. بەڵام لەتەواوی ئەم تۆڕانەی پەیوەندی بەستندا دیسان ناوو ناسنامە مەرجە. دەشێت نەتەوەیەکی دوو زمان، دوو کلتوور، دوو سیاسەت و حقوقی هەبێت، بەڵام ئەمە پێویستی ناوو ناسنامە پووچ ناکاتەوە بۆ پێکەوە ژیان. فرە کلتووری و بەیەکەوە بوونی جیاوازییەکان پێویستی بەهەڵبژاردنی پەیڕەوێکی ڕاست هەیە. هەڵبەتە کۆمەڵگاکان بەجۆرێکی دیکە پێکنایەن و بەڕێوە نابردرێن.

لەم سۆنگەوە کاتێک کلانێک لەرێگای تەوتەمەکەیەوە گوزارشت لە مەنسوبییەتی خۆی دەکات، دەسەلمێنێت کە ئەم ڕاستییە چەندە کۆنە. بەواتا هەرە ساکارەکەی تەوتەم ناسنامەی خودی کلانە. تائێستا لەهەندێک کلان و تیرەدا ئەم پەیوەندییە دەبینرێت.

کۆمەڵگای سۆمەریش کاتێک لە ڕێگای ناسنامەی پەرستگاوە گوزارشت لەخۆی دەکات، ئەو پەیوەندییە دەخاتەڕوو کە لەنێوان ناولێنان و باوەڕیدا هەیە. پەرستگا تۆڕی پەیوەندییە خەیالییەکانە. واتا پێدانی کۆمەڵگا بەخودی خۆی، ئاستێکی بەرزتری ئەنالیتیکی بەدەست هێناوە. سەیرکردنی تەواوی پەیوەندییەکانی پەرستگا، واتە تەماشاکردنی ناسنامە، بەو واتایە دێت کە تاڕادەیەکی مەزن ئەم کۆمەڵگایەت ناسیوە. هەر وەک ڕۆژگاری ئەمڕۆمان زۆری و بەرفراوانی ناوو نازناوی ئەبستراکت (مجرد) و سیمبۆلی ڕادەی مەزنی هەبوونی کۆمەڵگا پیشاندەدات. پەرستگا، خوداوەندە ژن و خوداوەندە پیاوەکانی شار، ئەو سەرە داوانەش دەدەن بەدەستەوە کە کۆمەڵگا خاوەن کامە زاراوە و هێز بووە. تاکو ئێستاش ڕێز پیشاندان بەرامبەر شوێنە پیرۆزەکان، هۆیەکەی بۆ بەهای ناسنامەکەی دەگەڕێتەوە. بەمجۆرە خۆیان دەدۆزنەوە. ئەمەیە ئەو ڕووداوەی بە هۆشیاری خود (الوعي الذاتي)ی ناوی دەبەین. ناسنامە بوویەری هۆشیاربوونەوەی خۆیەتی. ڕووداوی بەهێزترین زاراوەی

تێگەیشتنە دەربارەی هەبوونی خود.

لە ئایینە تاکخوداییەکاندا ناسنامەی کۆمەڵگا، خودی ئایین و خوداوەندە. کۆمەڵگایەکی جیا لە ئایین، هێمای ئایینی جیا لە کۆمەڵگا شیانی بوون نییە. وەک ئەنجامێکی ئەم پەیوەندییەش دەشێت ئایین و خوداوەندەکەی وەک بوویەری هۆشیاری کۆمەڵگا سەبارەت بەهەبوونی خۆیشی پێناسە بکرێت. دەشێت کۆمەڵگا ئیسلامییەکان لەچوارچێوەی ئەو هۆشیارییە ئایینییەوە بناسین کە تارادەیەکی مەزن پەسەندیان کردووە. مەنسوبییەتی دیکەشیان هەیە. بۆ نموونە ناسنامەی رەگەزی، سیاسی، خێڵەکی، چینایەتی و ناسنامەی رۆشنبیری. بەڵام تەواوی ئەمانە مۆری ناسنامەی ئایینییان پێوەیە کە ناسنامەیەکی گشتییە.

ئەسینا و رۆما سەربەخۆ بۆ خۆیان ناسنامەن. باسی چاخی کۆن دەکەم. هاوولاتێتی ئەسینا و رۆما بژاردەترین ناسنامەیە. هەروا بە ئاسانی بەهەمووکەسێک نادرێت. ئەمەش نیشانیدەدات کە شار چەندە خاوەن کەسایەتییە و بەکەرامەتە. هێشتا ناسنامەی گریک و ئیتالی زۆر لاوازن.

لەچاخی ناویندا قەوم پێشدەکەوێت. لەم بارەیەوە ئایینەکان رۆڵێکی گرنگ دەبینن. بۆ نموونە ئیسلام لە هەمان کاتدا هۆشیاری و شکۆداری عەرەبەکانە. موساگەرایی هاوواتای یەهودییە. کریستیانیش بۆ ئەرمەنی، سریانی و گریکەکان کە هەر زوو بوون بە مەسیحی، گوزارشت لە ناسنامەیەکی گرنگی قەومیش دەکات. دوولایەنە یەکتری پێشدەخەن. گرنگترین رۆڵی ئایینە تاکخوداییەکان تێپەڕکردنی ناسنامەی تیرە و خێڵە. هەرچەندە بەئەندازەی هۆشیاری و ناسنامەی نەتەوەش نەبێت، بەڕادەیەکی مەزن هۆشیاری قەومیش پێکهاتەیەکی کۆمەڵناسی رۆژهەلاتی ناوینە کە لە چاخی ناویندا تاکخودایی رێگای لەپێش کردۆتەوە. کاتێک پەیوەندی ئایین لەگەڵ قەوم ببەسترێت، ئەو کاتە دەشێت بە نموونەی سەرەتایی میللیگەرایی (نەتەوەپەرستی) بەناوبکرێت. لای تورکەکان ئایین ئامرازێکی گرنگی ناسنامەیە. ئەگەر موسڵمانێتی نەبوایە شیمانەیەکی بەهێزە کە قەومەکانی تورک و عەرەب لە رۆژهەلاتی ناویندا لاوازتر دەبوون. بۆ

نموونە دەتوانین ئەم راستییە لە رەوشی تورکە موسەوییەکانی قەزوین و عەرەبە کریستیانەکاندا ببینین. پەیوەندی ئایین، بۆ هەر گەل و قەومێک رۆڵی جیاوازی بینیوە.

پەلهاوێشتنی کریستیانی لە ئەورووپای چاخی ناویندا تارادەیەکی مەزن لەگەڵ پەرەسەندنی قەوم لەناویەکتردا بووە. هەروەکو لەتیرە تورک و عەرەبەکاندا بینرا، لەجڤاتی تیرەکانی پێشووتری ئەورووپاشدا هۆشیاری هاوبەشی قەوم زۆر لاوازبووە. کریستیانی رۆڵی فاکتەرێکی هۆشیاری قەومی پێش مۆدێرنیتەی بینیوە. هەڵبەتە بەو واتایە نا کە ئەو جڤاتەی بۆی چووە، پێی گووتبن "ئێوە فەرەنسی یان ئەڵمانن". بەلام بەوەی هۆشیاری هەمان ئایینی داوە بە تەواوی تیرە فەرەنسییەکان یان ئەڵمانەکان، لەبواری ناسنامەی هاوبەش، لەبواری پەرەسەندنی قەومدا هەنگاوێکی مەزنە. هەنگاوی دووەم ئەو پێشکەوتنە سیاسییەیە کە لەشێوەی میرنشینی (پادشایەتی)یەکاندایە. جیاواز لە ئایینی هاوبەش ئاوابوونی پادشایەتی هاوبەشی تیرەکان بووە بەدواترین هەنگاوی مەزن بەرەو بوون بە نەتەوە. بۆ فەرەنسا ئەم رەوشە نموونەییە.

لەمیانەی زۆربوونی ئەو پەیوەندییە کۆمەلایەتییەی لەگەڵ پێشکەوتنی بازاڕ بەدیهات دەتوانین باس لە سەرهەڵدانی نەتەوە بکەین. لە ئەورووپا نەتەوەکانی سەرەتا بەگوێرەی ئەم مۆدێلە لەدایکبوون. لە دۆخێکی بەمجۆرەدا نەتەوە بریتییە لە کۆی هۆشیاری تیرە + هۆشیاری ئایینی + دەسەلاتی سیاسی هاوبەش + دیاردەیەکی کۆمەلایەتی یان پەیوەندییەک کە لە دەوروبەری بازاڕدا پێکدێت. رەنگە ناوبردنی بەکۆمەڵگای نەتەوە واتادارتر بێت. نەتەوەبوون لەگەڵ بوون بەخاوەنی دەوڵەت هەمان شت نییە. بۆ نموونە پادشایەتی فەرەنسا بشرووخێت، نەتەوەی فەرەنسی وەکو خۆی دەمێنێتەوە و بەردەوام دەبێت. بەستنەوەی نەتەوە بە پێناسەیەکی گشتی یەکینەکانی زمان و کلتوورەوە دەشێت ئەزموونبەخش بێت. بەلام ئەگەر بگووترێت تەنیا زمان و کلتوور نەتەوە دەستنیشان دەکەن، ئەمە هەڵوێستێکی تەسک و ناتەواوە. چەندین سەرچاوە هەن کە نەتەوەیان کردووە بە نەتەوە. سیاسەت، حقوق، شۆڕش، هونەرەکان، بەتایبەتیش

ئەدەب، مۆسیقا، ئابووری و بازاڕ هەموویان لە ئاواکردنی نەتەوە (نەتەوەبوون)دا ڕۆڵ دەبینن. نەتەوەکان پەیوەندی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ سیستەمە سیاسی و ئابوورییەکاندا نییە.

نەتەوە بابەتێکی تا دواڕادە تەماوییە. هاوسەنگی و وریایی سەبارەت بەم بابەتە بایەخێکی زۆری هەیە.

کۆمەڵگاکانی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان زۆربەیان گەیشتوونەتە نەتەوەبوون. لەوانەیە هەندێک گروپی مارژینالیش جێگای باس بن کە نەبوون بە نەتەوە، بەڵام زۆربەی زۆریان کۆمەڵگای نەتەوەن. هیچ تاکێک نەماوە نەتەوەی نەبێت. بوون بەخاوەن نەتەوە، دەبێت وەکو دۆخێکی سروشتی کۆمەڵگا ببینرێت. بەدرێژایی مێژووی شارستانی نەتەوە وەک فەیرانێک تەنیا لە سیستەمی سەرمایەداریدا بۆتە جێگای بایەخ. ڕاستتر بڵێین ئەو قەبلاندن ودەلالییە ترسناکانەی بەناوی نەتەوەوە ئەنجامدراون کارەساتی گەورەیان لێکەوتۆتەوە.

جەختکردنەوەیەکی زێدەڕۆییانە لەسەر ئەو فاکتەرانەی نەتەوەیان پێکهێناوە بووە بەسەرەتای کارەساتەکان. بۆ نموونە، پەیوەندی سیاسەت ـ نەتەوە فاکتەری سەرەکی پێکهاتنی ئایدیۆلۆژیای میللیگەراییە. دوا وێستگەی سیاسەتی نەتەوەیی دەسەلاتێکی فاشیزمانەیە. ئەو نەتەوەپەرستییەی ئابووری، ئایین و ئەدەب فوو لێ بکات و دنەی بدات بۆ هەمان ئاراستە دەڕوات. پاوانخوازی سەرمایەداری ئەوەی لێکداوەتەوە کە لەژێر ناوی چارەسەرکردنی قەیراندا چۆن بە ئاسانترین ڕێگا ببێتە بەهێزترینی هەموو نەتەوەیەک، ئەو ڕێگایەش: پەیڕەوکردنی ئەوپەڕگەرییە لە بەنەتەوەیی کردنی سیاسەت، ئابووری، ئایین، حقوق، هونەر، وەرزش، دیپلۆماسی، نیشتمان پەروەری و.. هتددا کە فاکتەری پێکهاتنی نەتەوەن، لێرەشەوە گەیاندنیانە بەیەکپارچەییەکی سیستەماتیک، بەمەش نەهێشتنەوەی تاکە ئەندامێکی کۆمەڵگایە کە نەکەوتبێتە ناو دەسەلاتەوە. ئەنجامەکانی ئەمە زۆر سامناک بووە. ئەورووپای کرد بە دەریای خوێن و ڕێگای لەپێش شەڕی جیهانی کردەوە، بەمجۆرە ئەنجامێکی لەگەڵ خۆیدا هێنا کە لە مێژوودا هاوتایەکی تری نییە. ئەم

کرداره نەتەوەبوون نییە: کردنی نەتەوەیە بە ئایین. ئەمەش ئایینی نەتەوەپەرستییە. بەواتا کۆمەڵناسییەکەی نەتەوەپەرستی بۆخۆی ئایینە. ئەم بابەتە لەسەرەدێڕی پەیوەندیداردا تاوتوێ دەکەم.

تەنانەت ئایینەکانیش لەبەرئەوەی ئاگاداری مەترسییەکانی قەومپەرستین هەڵوێستێکی سەنگین و ئەنتەرناسیۆنالیستیانەیان نیشانداوە. لەبارەی ئەم بابەتەوە سەردەمی سەرمایەداری چەپەڵترین قۆناخی مێژووی شارستانی بووە.

بەپیترین (بەرهەمدارترین) مۆدێلی نەتەوەکان، نەتەوەی دیموکراتە. بەبایەخەوە پێویستە دەرکی پێبکرێت کە کۆمەڵگای دیموکراتی سەبارەت بە بابەتی نەتەوە، دیموکراسیانەترین جۆری کۆمەڵگایە کە چارەسەری و پێشکەوتن لەگەڵ خۆیدا دێنێت. نەتەوەکان بە باشترین شێوە لە سیستەمەکانی کۆمەڵگای دیموکراتیدا پێکدێن و دەتوانن پێشبکەون. لەجیاتی ئەوەی ببنە ئامرازی شەڕوپێکدادان، دەتوانن لەناو مۆزایکی کلتووریدا بەیەکەوە بژین، تەنانەت دەتوانن قۆناخێکی مێژوویی بەوجۆرەش فەراهەم بکەن، ببن بە نەتەوەی نەتەوەکان (نەتەوەی سەروو). لەجیاتی ئەوەی نەتەوەکان سەربەخۆ ببن بەفاکتەری شەڕ، لەمیانەی سیستەمی دیموکراتیدا لەناو هاوکاری و مۆزایکی کلتووریدا دەتوانن ببنە فاکتەری ئاشتی و برایەتی. بەهۆی گرنگی بابەتەکەوە ئومێدەوارم لەشوێنی خۆیدا بەفراوانی تاوتوێی بکەین.

نکۆڵی نەکردن لە نەتەوە، زێدەڕۆیی نەکردن لە بەنەتەوەیی کردنی ئەو فاکتەرانەی نەتەوەیان پێکهێناوە، پەیڕەونەکردنی میتۆدی بچووککردنەوەی نەتەوە بۆ فاکتەرە پێکهێنەرەکانی، بەتایبەتیش بەسیاسی نەکردنی و ڕێگە نەدان بەوەی بکرێتە ئامرازی بونیادی دەسەڵاتە میللیگەراییە توندڕەوەکان، بەرامبەر بەمەش پێشخستنی هۆشیاری و پراکتیکی نەتەوەی دیموکرات ڕێگای چارەسەرکردن و ڕزگاربوونە لە کێشەکانی نەتەوە.

## ب ـ پێناسەکردنی دەوڵەت

دەوڵەت زاراوەیەکە لە مێژوو و رۆژگاری ئەمڕۆشماندا هەرە زێدە بەکاردەهێنرێت. بەڵام لە هەمان کاتدا زاراوەیەکە هەرە کەم دەناسرێت و پێناسەکراوە. زاراوەیەکە لەناو تاریکییەکی مەزندا ماوەتەوە. نەزانییەکی مەترسیدار سەبارەت بەچییەتی دەوڵەت جێگای باسە. بۆ شیکارکردنی مێژوو و رۆژی ئەمڕۆمان و تێپەڕکردنی رەوشی قەیراناوی کۆمەڵگا، راست پێناسەکردن و شرۆڤەکردنی دەوڵەت تائێستاش مەسەلەی هەرە سەرەکییە. رەوشی هەرە خراپیش ئەوەیە، ئەوانەی خۆیان بەکەسانی ناو دەوڵەت دادەنێن نازانن ئەو ئامرازەی سواریبوون چ جۆرێکە، هەرچی ئەوانەن کە لە دەرەوەی دەوڵەت ماونەتەوە (ئەگەر کەسانێک هەبن کە لە دەرەوەی دەوڵەت مابنەوە) پێناسە چەوتەکانیان (بەتایبەتی ئەوانەی سۆسیالیزمی بونیادنراو) دیالۆگی کەڕ و لاڵەکانی لەگەڵ خۆیدا هێناوە، بەو پەشێویە دەچێت کە دوای کەوتنە خوارەوەی تاوەرەکەی بابل بەسەر ئەو جڤاتانەدا هاتەئاراوە کە بە ٧٢ زمان قسەیان دەکرد. لەلایەن زۆرینەوە دەوڵەت وەک گۆڕەپانی چارەسەرکردنی کێشەکان دەبینرێت. جێگرتن لە دەوڵەتدا وەک رزگاربوون لەتەواوی کێشە و گرفتەکان دەبینرێت. هەنگاوێکی بەرەوپێشتری ئەمە بینینی دەوڵەتە وەک دەوڵەت ـ خوداوەند.

تێگەیشتنێکی قووڵی کۆمەڵناسیانە نیشانیدەدات کە بەدرێژایی مێژوو ئیلاهیبوون و دەوڵەت بەناویەکداچووە. رۆڵ و کۆمەکی راهیب لە ئاواکردنی دەوڵەتدا، هۆکاری سەرکەوتنی پێشکەوتنی بەتێکەڵبوونی دەوڵەت ـ خوداوەندە. کاتێک راهیبەکان دەوڵەتیان ئاواکردووە، بەتایبەتیش لەناسنامەی پەرستگای سۆمەردا پەنتائۆن (ئەنجوومەن)

ی خوداوەندەکان کە وەک فاکتەرێکی ئایدیۆلۆژی بۆتە جێگای باس مسۆگەرە وەکو دەمامکی ئایدیۆلۆژی بۆ بەڕێوەبەرایەتی سیاسی بەکارهێنراوە. هەنگاوێکی بەرەوپێشتری پادشای راهیب، پادشای خوداوەندە. تا سەردەمی ئیمپراتۆریەتی رۆما پادشا ـ خوداوەند بەکارهێنراوە کە چاوگەکەی بۆ پەرستگای سۆمەر دەگەڕێتەوە، هەروەها زاراوەی ئیمپراتۆریش بەکارهێنراوە. ئایینە ئیبراهیمییەکان ئەم زاراوەیەیان بۆ پلاتفۆرمی خوداوەند ـ پێغەمبەر یاخود خودا ـ پەیامبەر کەمەندکێش کردووە، خواستوویانە تۆزێک شێوەی مرۆیی تێکەڵ بکەن. سەرکەوتنیشیان بەدەست هێناوە.

رەوشێکی زۆر سەیر جیاوازی نێوان مرۆیی و ئیلاهیبوونە لە میتۆلۆژیای یۆنان (سێیەمین ڤێرسیۆنە کە لە سۆمەرییەکان وەرگیراوە) دا. ئەو پانتائۆنەی بەگوێرەی ئاستی هۆشیاری هیسۆدۆس پێشخراوە، هەروەکو بڵێی بەستنەوەی بە مرۆڤەوە قەدەخەدەکات. بەشوورەیی دادەنرێت. بەپێداگرییەوە پەیوەندی نێوان خواوەندە ژن و خوداوەندە پیاوەکان وەکو چینێک دەهێلرێتەوە. براهمانەکانی هیندستان کە دۆخێکی لاوازی پادشاـ خوداوەندە، چینێکی زۆر وشکترە. بەئاسانی پەسەند ناکەن خوداوەند ببێت بەمرۆڤ، یان مرۆڤ پەیوەندی لەگەڵ ببەستێت. ئەگەر وەریگێڕینە سەر زمانی زانست، هەرگیز لە ئاستی ئایدیۆلۆژیدا پەسەندی ناکەن کە دەوڵەت بەدەستی مرۆڤ بونیادنراوە (لە میتۆلۆژی و ئایینەکاندا زەقە، لە فەلسەفەشدا تاڕادەیەک دەبینرێت). لەناو باوەڕییەکی وشکدا هەوڵی پاراستنی دەوڵەت دەدەن بۆ ئەوەی بە ئیلاهی و لەژێر پەردەدا بمێنێتەوە. زاراوەکانی لەجۆری دەوڵەت شکۆدارە، پیرۆزە، ئامرازی سەرەکی رزگارییە و .. هتد لە راستیدا سەرچاوەکەی بۆ راهیبەکانی سۆمەر دەگەڕێتەوە کە یەکەمین دامەزرێنەری دەوڵەتن. هەروەکو پێشتریش بەفراوانی هەوڵی شیکارکردنیمدا دەوڵەت لە منداڵدانی پەرستگادا ئاواکراوە.

کاتێک هەڵسەنگاندنەکەی هیگڵ بۆ دەوڵەت ـ نەتەوە کە بە ناپلیۆن دەست پێدەکات و بەشێوەی "دابەزینی خوداوەند بۆ سەر زەوی"

دەینرخێنێت، هەروەها لەکەسایەتی ناپلیۆندا وەک "رۆیشتنی خوداوەند" دەیکات بە سیمبۆڵ، لەژێر رۆشنایی روونکردنەوەی سەرەوەدا تەماشای بکەین، تا دواڕادە ئەزموون بەخشە. دەوڵەت ـ نەتەوە دواترین شێوەی دەوڵەتی ـ خوداوەندە. لە هەمان کاتدا مەترسیدارترین شێوەی دەوڵەتە.

هەرچی شرۆڤەی زانستی کۆمەڵناسییە، تازە بەتازە هەوڵی پێناسەکردنی ئەم گلۆڵەیەی پەیوەندییەکان (دەوڵەت) دەدات. ئەم بابەتەی ماوەیەکی درێژە لەبارەیەوە قاڵدەبمەوە، لە رێی پێشکەشکردنییەوە گفتوگۆکردنی قاڵبوونەوەکانم لەگەڵ هەمووان، وەک ئەرکێکی سەرەکی دەبینم. ئومێدەوارم ناوەڕۆکێکی رۆشنکەرەوەی هەبێت. پێناسەکردنی دەوڵەت گرێدراو بەدەسەلاتەوە دەشێت سەرەتایەکی باش بێت. تەواوی ئەو دەسەلاتانەی شێوەی یاسا (حقوقی)یان وەرگرتووە دەشێت بە دەوڵەت ناو ببرێن. ئەو دەسەلاتەی خراوەتە ناو چوارچێوەیەکەوە، رێساکانی دەستنیشانکراوە و لەناو یەکگرتوویی دەزگاکاندا قاڵبۆتەوە، لەبواری حقوقییەوە زۆرباش دەوڵەت پێناسە دەکات. بەلام تێرناکات و بەس نییە. لە یەکخستنەوەی روشنکردنەوەی ناوەڕۆکەکەی لەگەڵ شێوەکەیدا واتا لەناو یەکگرتوویی شێوەو ناوەڕۆکدا تاوتوێکردنی، تێڕوانینێکی تەواوکارتر دەبێت. کاتێک ئەم تێڕوانینە لەگەڵ پێشکەوتنێکی مێژوویی ـ کۆمەڵایەتیدا بکەین بەیەک، ئەوا دەتوانین بەهای واتاو باسکردنی بە پێناسەیەکی بەرفراوانتر بگەیەنین.

ئاگاداری چەندین پێناسەی دەوڵەتم. دووبارەکردنەوەی ئەو کلێشانەی ماوەیەکی درێژ لەلایەن هەردوو کامپی لیبراڵ و سۆسیالیستییەوە ئەزبەرەکرابوون سوودمەند و ئەزموون بەخش نییە. پێش هەموو شتێک پێویستە دیاری بکەم دەوڵەت چی نییە.

اـ کپکردن یان لە هاوسەنگیدا هێشتنەوەی پێکدادانە چینایەتییەکان نییە. زاراوەی 'ئامرازی فشاری چینایەتی'یە کە وەک لایەنی لەپێشی ئاماژەی پێدەکرێت، هێندە رۆشنکەرەوە نییە.

ب ـ هەرگیز کۆتایی هێنان بە دۆخی کائیوس نییە. بانگەشەکانی: 'مایەی رێکوپێکی ئاسایشە' زۆر لە گوزارشتکردنی راستییەوە دوورە.

ج - بەهیچ جۆرێک گۆڕەپانی چارەسەرکردنی کێشە و ئامانجەکان نییە. بەپێچەوانەوە پلاتفۆرمێکە کێشەکان کەڵەکە دەکات و دەیانکاتە کانگرێن، دەیانخاتە ناو قەیران و درێژەیان پێدەدات.

د - هەرچی پەیوەندییەکانێتی بە ئیلاهی و پیرۆزییەکانەوە تەنیا میتۆلۆژی و ئایدیۆلۆژییە.

هـ - لەبواری هێزی بەڕێوەبەر و خولقێنەری کلتوور، ئایین و نەتەوەدا گوزارشت لەهیچ شتێک ناکات.

تەواوی ئەم خاڵانەی دەتوانین چەندینی دیکەی لێ زیادبکەین، هەریەکەو پڕوپاگەندەیەکە. دەوڵەت بەم ڕەوشانەوە خەریک دەبێت کە باسمانکرد. بەڵام مێژوو نیشانی دەدات کە تەواوی دەوڵەتەکان جگە لە گۆڕینی دەوروبەر بۆ قەسابخانە، تواندنەوە، خولقاندنی کۆمەڵگایەکی تەمبەڵ و گۆڕینی مرۆڤ بۆ گێلێکی ئەقڵی گریمانەیی (قەبلاندن) بەولاوە هیچ ڕۆڵێکی دیکەیان نەبینیوە. نکۆڵی لە پێگەی دەوڵەت ناکەم لەبواری بەڕێوەبردنی کۆمەڵگاوە. پێناسەیەکی لەجۆری ئانارشیستەکان و شێوەی بێدەوڵەتی واتادار و قابیلی پەیڕەوکردن نابینم. ئەو ڕاستییەش لەبەرچاوە کە سۆسیالیستەکانیش، بەپراکتیکی سەدوپەنجا ساڵەیان سەرکەوتنیان بەدەست نەهێناوە. درکاندنی چەندین ڕاستی، هەڵوێستە چەوتە بنەڕەتییەکانیان بەلاوە نانێت. هەرچی ئەو ڕەوشەیە کە لیبراڵەکان بە "کەمترین ڕادەی دەوڵەت" ناوی دەبەن، لەلایەنێکەوە واتادارە. دەرکیان بەو ڕاستییە کردووە کە دەوڵەت سەپاندنێکی پاوانی ئابوورییە. بەڵام کاتێک شێلگیرانە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە سەرمایەداری بەپێتترین ئابوورییە، تەواوی پێناسەکانیان لەبارەی دەوڵەتەوە بەلاوە دەنێت و ئاشکرا دەبێت کە گەورەترین درۆزنن.

پێناسەکردنی دەوڵەت وەک پاوانێکی ئابووری کە لەسەر زێدە - بەرهەم و زێدە - بەها ئاواکراوە ڕۆشنکەرەوەترە. دەوڵەت بۆ ئەوەی زێدە - بەرهەم و زێدە بەها لەکۆمەڵگا بدزێت، لە ئامرازە ئایدیۆلۆژییەکانەوە تا ئامرازەکانی توندوتیژی، وەک سەرخانێکی سەرووی کۆمەڵگا خۆی ڕێکدەخات و دەیخاتە ژێر پاوانی خۆیەوە. ئەگەر لەژێر ڕۆشنایی

ئەم پێناسە تەسکەدا تەماشای دەوڵەت بکەین دەبینین کە سیاسەت و سیاسەتمەدارێتی دەوڵەت لە دوا شیکاردا هونەری بەڕێوەبەرایەتییەکە کە سەرپەرشتیاری فەراهەمکردنی زێدە ـ بەرهەم و بەهاکانی دەکات. ئەگەر بەقەباترین فۆرمێلەی ببەستینەوە دەتوانین بڵێین دەوڵەت =زێدە بەرهەم و بەها + ئامرازە ئایدیۆلۆژییەکان+ ئامێرەکانی توندوتیژی+ هونەری بەڕێوەبەرایەتی. ئەگەر لەناو تەواوی مێژووی پێشکەوتنیدا هەڵیسەنگێنین، ئەوکاتە کە دەڵێین دەوڵەت ئەم فاکتەرانە دەبینین. لەدەرەوەی ئەم فاکتەرانە، نەبەشێوەیەکی گشتگیر، نە دانەدانە پێناسەکردنی هەر ئامرازێک وەک دەوڵەت، دەرفەت بەشیکارکردنی ئەو گلۆلەیەی پەیوەندییەکان نادات کە بەدەوڵەت ناودەبرێت.

١ـ ئەگەر بڵێین دەوڵەت واتای زەوتکردنی زێدە ـ بەهایە، راستە، بەڵام پێناسەیەکی زۆر ناتەواوە.

٢ـ لەرووی ئایدیۆلۆژییەوە، پێناسەکردنی دەوڵەت وەک ئیلاهی، پیرۆز یاخود وەک سێبەری خودا (ظل الله) لەسەر زەوی، واتە پێناسەکردنی وەک رەوشی بەرجەستەی خوداوەند، لە دۆزینەوەی دەمامکی ئایدیۆلۆژی بۆ هەموو جۆرە ستەمکارییەک بەولاوە هیچ ئەنجامێکی دیکەی لێناکەوێتەوە.

٣ـ گووتەی "دەوڵەت زۆردارییە" لەبەرئەوەی فاکتەرەکانی دیکە بەلاوە دەنێت، بەها زانستییەکەی زۆر لاوازە، لە داوەرییەکی ئەخلاقی بەولاوە تێپەڕنابێت.

٤ـ ئەو چەمکانەی دەوڵەت وەک ئیدارەگەرایی و هونەری بەڕێوەبەرایەتی شرۆڤە دەکەن، لەبەرئەوەی بەلانی کەم هێندەی شرۆڤە ئەخلاقییەکان فاکتەرە ژیانییەکانی دیکەی پشتگوێ خستووە، مەترسییەکی مەزنی لەجۆری پەردەپۆشکردنی رووی راستەقینەی دەوڵەت لەخۆوە دەگرێت.

بێگومان هەر فاکتەرێکی ئاماژەپێکراو جێگایەکی ژیانی لەهەبوونی دەوڵەتدا هەیە، بەڵام بەتەنیا وەک دەوڵەت پێناسە ناکرێت. ئەو پێناسانەی ئەنجامدراون بەگوێرەی ئەوەی زۆربەیان هەریەکە و فاکتەرێکی

دەرخستۆتە پێش، لەیەکتری جیاوازن و ڕێگا لەپێش هەڵسەنگاندنی ناتەواو دەکەنەوە.

دەشێت دەوڵەت بەدرێژایی مێژوو بەگوێرەی بەشی جیاواز پۆلێن بکرێت.

ا ـ سەبارەت بەوچینە کۆمەلایەتییانەی زێدە ـ بەهاو زێدە ـ بەرهەمیان زەوتکراوە:

**١ـ دەوڵەتی کۆیلەداری:** شێوەیەکی دەوڵەتە کە بەرامبەر سکتێرکردنی مرۆڤ تەنیا بە ڕەنجەکەی نا، بەڵکو بەهەموو هەبوونییەوە وابەستەی دەوڵەت و خاوەنە تایبەتەکانین. سەرەکیترین شێوەی داگیرکاری چاخی یەکەمینە. کۆیلەکانیش ئامرازی سەرەکی بەرهەمهێنانن.

**٢ـ دەوڵەتی دەرەبەگایەتی:** شێوەی نەرمکراوی کۆیلەدارییە. جیاوازی بەندە لە کۆیلەی جاران ئەوەیە مافی دروستکردنی خێزانی هەیە. هەرچەندە جێبەجێکردنی لەبواری کرداریدا زەحمەت بێت و گرێدراوی مەرجێکی زۆر بێت، بەلام لەبەرئەوەی دەرفەتێکی زیاتر بە زێدە ـ بەرهەم و بەها دەدات شێوەیەکە لەشارستانی چاخی ناویندا تاقیکراوەتەوە.

**٣ـ دەوڵەتی سەرمایەداری:** شێوەیەکی دەوڵەتە چینێکی کۆمەلایەتی بە بناخەدەگرێت کە ناوی کارکەرـ کرێکاری لێنراوەو لە بازاڕ ڕەنجی خۆی وەک موڵک (کالا) دەفرۆشێت. لەجیاتی ناوبردنی بە "شێوە"یەکی دەوڵەت کاتێک بە بەش یاخود بونیاد ناوببرێت گونجاوتر دەبێت. دەوڵەتی چاخی شارستانی سەرمایەدارییە.

ب ـ شێوازێکی دیکەی دابەشکردن، ئەوەیە کە سەبارەت بە هەبوونی ئەتنیکیانەی توێژی بەڕێوەبەرکراوە:

**١ـ دەوڵەتی ڕاهیب:** لەبەرئەوەی مۆری گروپی ڕاهیبەکان (یەکەمین دامەزرێنەرانی دەوڵەت) لەخۆوە دەگرێت ئەم ناوەی لێنراوە. زاراوەکانی لەجۆری دەوڵەتی پەرستگا، دەوڵەتی پیرۆز یاخود دەوڵەتی ـ خوداوەند گشتیان سەر بەم پۆلێنەن.

**٢ـ دەوڵەتی خانەدان:** بەگوێرەی ئەو خانەدانە پێناسە دەکرێت کە جێگای خۆی لە بەڕێوەبەرایەتییەکەیدا گرتووە. دەشێت بە دەوڵەتی

بنەماڵەش ناو ببرێت. شێوازێکی بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەتە کە کاریگەرییەکی بەرفراوانی لەسەر تەواوی دەوڵەتەکانی چاخەکانی شارستانی تەنانەت دەوڵەتەکانی رۆژگاری ئەمڕۆشمان هەیە. ئەو دەوڵەتەیە کە خێزانێک یان بنەماڵەیەک گروپی سەرەکی بەڕێوەبەرایەتییەکەی پێکدێنن.

**٣ـ دەوڵەتی قەوم یان خێڵ:** ئەو دەوڵەتەیە کە زیاتر لەژێر کاریگەری خێڵێک یان قەومێکدایە. بەتایبەتی لە چاخی ناویندا دەبینرێت کە هۆشیاری خێڵ یاخود قەوم سەریهەڵداوە. لەچەندین ئایین و قەومی لەجۆری ئیسلام، یەهودی ، هیندی، چین .. هتد دا. رەوشی دەوڵەت رێگا بە پێناسەیەکی بەمجۆرە دەدات. لێرەدا ئایین رۆڵی ئاواکردنی قەوم دەبینێت.

**٤ـ دەوڵەتی نیشتمانی:** دەوڵەتێکە ئەو کۆمەڵگایانە بناخەکەی پێکدێنن کە بوونەتە نەتەوە. دەوڵەتی چاخی نوێیە (بە واتا تەسکەکەی چاخی سەرمایەداری). تەنیا هی چاخی سەرمایەداری نییە، بەڵکو چاخی دیموکراتیش بەبنەمای دەگرێت، یاخود راستتر بڵێین لەگەڵیدا رێکدەکەوێت (دەوڵەت + دیموکراسی) و جێگای خۆی لە بەڕێوەبەرایەتیدا دەگرێت. کاتێک هەردووکیان بەیەکەوە بن، واتە کاتێک رژێمی دەوڵەت + دیموکراسی جێگای باس بێت دەشێت بەدەوڵەتی نیشتمانی ناوببرێت. لە دەوڵەت نەتەوە جیاوازترە. چونکە لەدەوڵەتێکی نیشتمانیدا دەشێت چەندین نەتەوە جێگای خۆی تێدا بگرێت.

**٥ـ دەوڵەت ـ نەتەوە:** ئەو دەوڵەتەیە کە تەنیا یەک نەتەوە پێکهاتەکەی پێکدێنێت، تەواوی ئەندامانی نەتەوەش لە رێگای ئایینی میللیگەرایی (نەتەوەپەرستی)ەوە لەگەڵ دەوڵەت ئاوێتە دەبن. هەروەک بڵێی نەتەوە و دەوڵەت کراون بەیەک. شێوەی سەرەکی دەوڵەتی شارستانی سەرمایەدارییە. لەبەرئەوەی ئەو دەوڵەتەی بە فاشیست ناودەبرێت شێوەی دژە شۆڕشی دەوڵەت ـ نەتەوە یاخود شێوەیەکە لەسەردەمی رژێمی قەیران (سەرمایەداری)دا وەریگرتووە، ناتوانرێت هەردووکیان لەیەکتری جیابکرێتەوە.

ج ـ دەتوانرێت شێوازێکی دابەشکردنیش بەپێی هەڵبژاردن یاخود دامەزراندن، شێوەی پشتاوپشت یان بەتوندوتیژی دەستگرتن بەسەر

بەڕێوەبەرایەتیدا، بکرێت.

١ـ دەوڵەتی مۆنارشی: ئەو دەوڵەتەیە کە تەنیا کەسێک نوێنەرایەتی بەڕێوەبردنی دەکات. لێرەدا تاکڕەویتی لە بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا جێگای باسە. دەشێت ئەم کەسە سوڵتان، پادشا یاخود ئیمپراتۆرێک بێت. لە ڕێگای پشتاوپشتکردنی دەسەڵاتەوە یاخود بەکارهێنانی توندوتیژییەوە دەشێت هەنگاو بۆ بەڕێوەبەرایەتی مۆنارشی بهاوێژرێت. لە تەواوی سەردەمەکانی شارستانیدا بینراوە. لاوازی دەزگابوونی دەوڵەت نیشاندەدات.

٢ـ کۆمار: دۆخێکە گرووپی سەرەکی بەڕێوەبەرایەتی لەڕێگای هەڵبژاردنەوە دێتە سەردەسەڵات. دەشێت کەسێک یان هەزار کەس هەڵبژێردرێت، جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە. ئەگەر جیاوازیش هەبێت ناوەڕۆکەکەی ناگۆڕێت. هەندێک جار کۆمارو دیموکراسی تێکەڵ بەیەک دەکرێن. ئەمە هەڵەیەکی مەترسیدارە. کۆمار شێوەیەکی دەوڵەتە. هەڵبژاردن بۆ بەڕێوەبەرایەتی دەزگاکانی دەوڵەت ئەنجامدەدرێت کە بەشێوەیەکی بەهێز ئاواکراون. ئەم هەڵبژاردنە بۆ دیموکراسی ئەنجامنادرێت کە بە واتای بەڕێوەبەرایەتی گەل دێت. دیموکراسی سیستەمێکی زۆر جیاوازترە. شێوەیەکی بەڕێوەبەرایەتییە کە هەرگیز وەک شێوازی دەوڵەت نییە. هەڵبەتە دیموکراسیش دەزگای خۆی هەیە. بۆ ئەم دەزگایەش هەڵبژاردن دەکرێت. بەڵام دیموکراسی و دەوڵەت لەبواری ناوەڕۆکەوە لەیەکتر جیاوازن. بە مارکسیستەکانیشەوە تەواوی رۆشنبیرەکانی رۆشنگەری ئەم رەوشەیان تێکەڵکردووە. تەنانەت لای لینینیش تێکەڵی جێگای باسە. جیاوازییەکی چۆنایەتی لەنێوان رەوشی دیموکراسی و شارستانی فەرمیدا هەیە کە دەوڵەت ناوکەکەیەتی.

لەم سۆنگەوە تێکەڵنەکردنی بەڕێوەبەرایەتی دیموکراتی و بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەت (بەهەڵبژاردن بێت یاخود نا) بایەخێکی مەزنی هەیە. کەچی لەڕاستیدا خودی دەوڵەت نەریتێکی بەڕێوەبردنە. بەڕێوەبەرایەتییەکی خاوەن دامەزراوەی هەزاران ساڵییە. رۆڵی هەڵبژاردنەکان لە بەڕێوەبەرایەتیدا تا دواڕادە سنووردارە. ئەوەی لەڕێگای

هەڵبژاردنەکانەوە ئەنجام دەدرێت، هێزە پاوانخوازە هەمەجۆرەکانی ناو دەوڵەت (هێزی پاوانخوازی کشتوکاڵی، بازرگانی، هێزی پیشەسازی یاخود فینانس) بەگوێرەی ئاستی هێزەکانیان بالادەستی بەرامبەر یەکتر بەدەست دێنن. بەهێزترینیان هەڵدەبژێردرێت. ئەگەر نا رەوشێکی لەجۆری دیموکراسی یان سەرکەوتنی دیموکراسی جێگای باس نییە.

لەهەموو دیموکراسییەکدا رەوشێکی بەمجۆرە لە ئارادا نییە کە مسۆگەر پێویستە هەمووکەسێک لە ڕێگای هەڵبژاردنەوە ئەرکدار بکرێت. ئەوانەش کە هەڵنەبژێردراون لە دیموکراسیدا دەتوانن لە بەڕێوەبەرایەتیدا رۆڵ ببینن. بەلام ئەوەی بەبنەما دەگیرێت، بۆ ئەوەی بەڕێوەبەرایەتی کۆمەڵگای دیموکراتی پشت بە شانسی بەرهەم و پێشکەوتنی جیاواز، بەدیهێنانی خولقکاری، ماف، ئازادی و یەکسانی ببەستێت، دەبێت لە ڕێگای هەڵبژاردنە ناوبەین کورتەکانەوە دەست نیشانبکرێت.

د ـ شێوەیەکی دیکەی دابەشکردن ئەو جۆرەیە کە لەسەر بنەمای گروپە زەوتکارەکانی زێدە ـ بەهاکراوە:

**١ـ دەوڵەتی کشتوکاڵی:** یەکەم دەوڵەتی ئاواکراوە، لەبەرئەوەی بەشێوەی بەڕێوەبەرایەتی زەوتکردنی زێدە ـ بەرهەم ڕێکخراوە، پێناسەیەکی بەمجۆرە چەندەی بلێی رۆشنکەرەوەیە. بەدرێژایی مێژوو دەتوانرێت بەگوێرەی رادەی هێزی دەسەلاتی کشتوکاڵی باس لە دەوڵەتی کشتوکاڵی بکەین.

**٢ـ دەوڵەتی بازرگانی (دەوڵەتی مارکانتیلیست):** ئەو دەوڵەتەیە کە بەڕێوەبەرایەتییەکەی زەوتکردنی زێدە بەها و زێدە ـ بەرهەم لە ڕێگای ڕێکخستنی بازرگانییەوە ئەنجامدەدات. بۆ نموونە لە مێژوودا دەوڵەتی فینیقی و ئاشووری، لەرۆژی ئەمڕۆشماندا چەندین دەوڵەت هەن کە دەسەلاتی بازرگانییان زۆر بەهێزە.

**٣ـ دەوڵەتی فینانس:** ئەو دەوڵەتەیە کە پشت بەهێزی پارە (دراو) دەبەستێت. وەک نموونە دەتوانین ئاماژە بە سویسرا بکەین. لەوەش گرنگتر، لەبەرئەوەی دوا قۆناخی سەرمایەداری جیهانگیری وەک چاخی فینانس هەڵدەسەنگێنرێت، دەتوانرێت بگووترێت کە پاوانخوازی فینانسی

دراو لە رۆژگاری ئەمڕۆمان لەتەواوی دەوڵەتەکاندا زۆر بەهێزبووە و قورساییەکی بەرچاوی لەسەر بەڕێوەبەرایەتی هەیە.

٤ـ دەوڵەتی پیشەسازی: بە تایبەتی لەگەڵ شۆڕشی پیشەسازی، لەبەرئەوەی بەرهەمی پیشەسازی رۆڵێکی سەرەکی لە ئابووریدا بینی، چەندین دەوڵەت بەگوێرەی ئەم چۆنایەتییە ناوبران. بوون بە دەوڵەتی پیشەسازی، لە سەدەی نۆزەدەهەمدا نموونەی لە پێشینە بوو. پیشەسازی و دەوڵەمەند بوون هەمان واتایان هەبوو. ئامانجی تەواوی دەوڵەتە ئاواکراوەکان ئەوەبوو، هەرچی زووترە ببن بە دەوڵەتێکی پیشەسازی. هەربۆیە بەهێزترین پاوانی دەوڵەتی لە پیشەسازیکاران (کارسازان) پێکدەهات. لە سەدەی هەژدەهەمدا بازرگانە گەورەکان (مارکانیلیزم)، سەدەی نۆزدەهەم پیشەسازیکاران (ئیندوستریالیزم - پیشەسازی پەرستان )، لە سەدەی بیستەمەوە تا رۆژگاری ئەمڕۆمان زیاتر دراوەکان (فیناس کارەکان) هێزی پاوانخوازی سەرەکین کە لەناو دەوڵەتدا هێلانەی خۆیان دروست کردووە. لەبنەڕەتدا ئەمانە گلۆڵەی ئەو پەیوەندییانە بەڕێوە دەبەن کە بە دەوڵەت دەناسرێت.

هـ ـ دابەشکردنێکی دیکەی سەیر سەبارەت بە دەوڵەت ئەو ناولێنانە دروستکراوانەیە کە بۆ شاردنەوە و دەمامککردنی پاوانەکانی دەوڵەتی سەرمایەداری رۆڵی ئامرازی ئایدیۆلۆژی دەبینن. چاوخشاندن بەم مۆدێلانەی دەوڵەتدا کە بریتین لە پێکهاتەی ئایدیۆلۆژی و زاراوەی دەوڵەتیان بەرەوشێک گەیاندووە ناناسرێتەوە، دەشێت ئەزموون بەخشبێت. چونکە زەمینەی رۆژانە لەژێر داگیرکەری ئەم زاراوانەدایە.

١ـ دەوڵەتی لیبراڵ: ئەم زاراوە ئایدیۆلۆژییە گلێنەی چاوی ئابووریزانە سیاسییەکانە. وەرگێڕانەکەی بە واتای دەوڵەتی ئازاد دێت، لەکاتێکدا کە نەک بەیەکگەیشتن بەڵکو دژایەتی لەنێوان زاراوەکانی ئازادی و دەوڵەتدا جێگای باسە. واتا پوختەکەی دەوڵەت: سنووردارکردنی ئازادییەکانە. بەدرێژایی مێژوو یەکێک لە پرسیارە گەورەکان: بەرامبەر بە دەوڵەت پاراستنی ئازادی تاک یان گروپەکان بووە، ئەمە لەسەرووی تەواوی تێکۆشانە سیاسی و حقوقییەکانەوە هاتووە. هەروەها وەک شێوەی

دەوڵەتێک پێناسە دەکرێت کە هەرەکەم دەست لە ئابووری وەردەدات. ئەمە لەکاتێکدا کە هەبوونی دەوڵەت تەنیا لەرێگای پاوانکاری ئابوورییەوە فەراهەم دەبێت. هەربۆیە گووتەی: "دەوڵەتی هەرە کەم دەستوەردان دەکات" تەنیا قسەیەکی پڕوپووچە. ئەم قسە پڕوپووچە لەگەڵ ناوەڕۆک و ناسنامەی دەوڵەت ناکۆکە. لەوانەیە لە رێگای ئەم دەستەواژەیەوە خوازیاربن و هەوڵبدەن رێگا لەپێش پاوانەکانی ئابووری سەرمایەداری بکەنەوە و بەشەکەیان زیاد بکەن.

٢ـ **دەوڵەتی سۆسیالیستی:** ئەم زاراوەیە کە هەرە زێدە لە کامپی سۆسیالیستی بونیادنراودا بەکارهێنرا، بەلایەنی کەم هێندەی دەوڵەتی لیبراڵ قسەیەکی پڕوپووچە. پێش هەمووشتێک سۆسیالیزمی راستەقینە پەیوەندی بە دەوڵەتەوە نییە. بەلانی کەم هێندەی دیموکراسی لەگەڵ دەولەتدا ناکۆکە و دژێتی. دەوڵەت کە کۆی دەسەلاتە پاوانخوازییەکانی ئابوورییە کاتێک لەگەڵ سۆسیالیزمدا تێکەڵ بکرێت کە سیستەمێکی یەکسانییە، ئەمە گەورەترین تاوانی هەلپەرستییە. دەوڵەتی سۆسیالیستی هاوواتای ئەمڕۆی زاراوەی "سۆسیالیزمی فیرعەون"ییە، لەبەرئەوەی کراوەترین شێوەی دەوڵەتی سەرمایەدارییە، زۆر بەفاشیزمی سەرەتاییەوە پەیوەندارە. دەوڵەت ـ نەتەوە کە رکابەرێتی سۆسیالیزمی بونیادنراوە، کارەکتەری راستەقینەی لیبرالیزم و سۆسیالیزمی بونیادنراوە (سۆسیالیزمی دەوڵەت) هەربۆیە هەڵسەنگاندنی پەیوەندییەکەی بە فاشیزمەوە (لەچوارچێوەی تۆتالیتاریزم و سەرەڕۆییدا) بایەخێکی مەزنی هەیە. هەڵسەنگاندنی دەوڵەتی لیبراڵ، دەوڵەتی کۆمەلایەتی (سۆشیال) یاخود دەوڵەتی سۆسیالیستی کە ئاراستەی فاشیزمیان وەرگرتووە وەک فاشیزمی بەرایی ئەزموونبەخش دەبێت.

دەبێت لایەنگرانی سۆسیالیزم ئەو راستییە زۆر باش بزانن: ئاواکردنی سۆسیالیزم لە رێگای دەزگای دەوڵەتەوە کە تەنیا دامەزراوێکی نەریتی چوارسەد ساڵەی سەرمایەداری نییە، بەڵکو دەزگای سەرەکی زەوتکردنی زێدە ـ بەرهەم و بەهای پێنج هەزار ساڵەیە، ئەگەر بە ئەنقەست (بەئاگایی) بەرگری لێبکرێت فاشیزمە، ئەگەر بەبێ ئاگایی بووبێتە ئامراز، غەفلەت و

خیانەتە. ئومێدەوارم لە کۆمەڵناسی ئازادیدا بەشێوەیەکی بەرفراوان ئەم بابەتانە تاوتوێ بکەین.

**٣ـ دەوڵەتی فاشیستی:** زاراوەیەکە مانایەکی ئەوتۆی نییە. دەوڵەت ـ نەتەوە و فاشیزم لە ناوەڕۆکدا یەکشتن. پێشخستنی پێناسەیەکی بەمجۆرە گوایە فاشیزم رەوشێکی شازە شتێکە لەدەرەوەی سەرمایەداری بەسەر سیستەمدا زاڵ بووە، گەورەترین بێنەوایی ئەو رۆشنبیرانەیە کە خۆیان بە سۆسیالیست و لیبراڵ دادەنێن. سەرمایەداری هەم وەک شارستانی هەم وەک دەوڵەت گوزارشتی سیستەماتیکانەی ئامادەباشی دەوڵەت ـ نەتەوە و فاشیزمە. فاشیزم رێسایە. ئەوەی شازە (رێزپەڕە) ناچاری رێککەوتنە لەگەڵ بونیادی دیموکراتیدا!

**٤ـ دەوڵەتی دیموکراتی:** چەندین جار ئاماژەمان پێکرد کە بۆچی نابێت. لەبەرئەوەی زهنییەت، بونیادی کۆمەڵگا و شێوازی کارکردنی دەوڵەت و دیموکراسی لە رووی ناوەڕۆکەوە لەیەکتر جیاوازن دەوڵەتی دیموکراتی نابێت. بەڵام بەدرێژایی مێژوو، بەتایبەتیش لە رۆژگاری ئەمڕۆمان، وەک هۆکارێکی بنەڕەتی، بەهۆی پێکهاتە قورسە قەیراناوییەکەی شارستانی سەرمایەداری، پێویستی رێککەوتنی لەگەڵ سیستەمی شارستانێتی دیموکراتیدا وەک ناچارییەک سەریهەڵداوە. واتە بە تەنیا دەوڵەتی پێ بەڕێوەنابرێت. بە رەوشێک گەیشتووە ناچارە لەگەڵ هێزە دیموکراتییەکاندا بەڕێوەی ببات. هەربۆیە رێککەوتن رێگای تێدەچێت. لەمێژووشدا چەندین نموونەی بەمجۆرە روویداوە. ئەگەر دەوڵەت (هەرچی شێوەیەکی بێت) بۆ هاوبەشێتی لەگەڵ پرەنسیپ و بونیادە دیموکراتییەکاندا ئامادە بێت، بەواتای کرانەوە بۆ دیموکراسی دەشێت زاراوەی دەوڵەتی دیموکراتی واتای هەبێت. بەگوێرەی من راستترین پێناسە دەوڵەت + دیموکراسییە. پێشتر ئاماژەم پێکردبوو کە راوەستەکردن لەسەر شێوەکانی دەوڵەت بە پەلەترین ئەرکی فەلسەفەی سیاسییە. چونکە ناشێت لە رێگای لۆژیکی کلاسیکی دەوڵەتەوە کۆمەڵگاکانی رۆژی ئەمڕۆمان بەڕێوە ببردرێت. هەر لەم پێناوەشدا رێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی خراونەتە گەڕ. بەڵام ناتەواون. ئەم رێکخراوانە بەم رەوشەی ئێستایانەوە ناتوانن بۆشایی

بەڕێوەبەرایەتی پڕبکەنەوە و هاوبەشێتی بکەن.

ڕێککەوتنی پێکهاتەکانی کۆمەڵگای دیموکراتی کە بەشێوەیەکی رادیکاڵانەتر خۆیان ڕێکخستووە لەگەڵ دەزگاکانی دەوڵەتدا، کە گەیشتوونەتە رەوشێکی بەرهەمهێنەرانە وەک تاکە ڕێگای رزگاری دەبینرێت. لەم قۆناخە مێژووییەی ئەمڕۆماندا (کەس ناتوانێت ماوەکەی دەستنیشان بکات) تەنیا جەختکردنەوە لەسەر شارستانی سەرمایەداری، یان شارستانێتی دیموکراتی یاخود سۆسیالیزم، لەمیانەی ئەو پراکتیکانەوە کە ڕێگایان لەپێش ناسۆری و تراژیدیا کردەوە ئیفلاسیان کردووە. ئەوەی زیانی بەردەکەوێت کۆمەڵگای مرۆڤە. تەنیا تەمەنی ئازار، خوێن و چەوسانەوە درێژ دەکرێتەوە. (ئەم بابەتانە بەشێوەیەکی بەرفراوان لە کۆمەڵناسی ئازادیدا تاوتوێ دەکەین).

هەندێک زاراوەی دیکە هەن. بۆ نموونە لەسەرروویانەوە دەوڵەتی حقوقی جێگای باسە. دەوڵەت وەک پاوانخوازی ئابووری لەبەرئەوەی لە ڕێگای دەست بەسەرداگرتنی زێدە ـ بەرهەمەوە دەژیت لە ناوەڕۆکدا دادوەرانە یاخود حقوقی نابێت. بەڵام وەک پێویستییەکی یاسادانراوەکان بەشێوەیەکی یەکسان رەفتار لەگەڵ مەنسوب و هاوولاتییەکانی دەکات لەبەرئەوەی بەپێی ئەو ڕێسایانە دەجوڵێتەوە کە پێشتر دانراون، بە دەوڵەتی حقوق، یاسا یان ڕێسا ناو دەبرێت. بێگومان بەگوێرەی دەوڵەتی پادشا و سەرەڕۆیانەی کە هەر گووتەیەکیان فەرمانە و رۆژانە یاسا دەردەکەن دەشێت ئەمە ئەرێنی بێت. بەڵام لەبواری ناوەڕۆکەوە نابێت بە پێناسەیەکی دیکەی دەوڵەت. بۆ نموونە دەوڵەتی ئایین: واتایەکی ئەوتۆی نییە. بەهۆی دەوڵەتی راهیبەوە بەدرێژایی مێژوو دەوڵەت لەژێر دەمامکی پیرۆزیدا پێشکەشکراوە. ئەو ناوانەی سەرچاوەیان بۆ ئایین، میتۆلۆژیا، فەلسەفە و تەنانەت "زانستگەرایی" دەگەڕێتەوە کە خۆیان ئامرازی ئایدیۆلۆژی دەوڵەتن، زیاتر دەکەونە چوارچێوەی پڕوپاگەندەوە. دەوڵەتی عەلمانی وەک دژێکی دەوڵەتی ئایینی بیری لێکراوەتەوە، هەربۆیە هەمان واتا دەبەخشێت. روونکردنەوەکانی لەجۆری دەوڵەتی ئایینی یان عەلمانی جگە لە پڕوپاگەندەکردن هیچ ناوەڕۆکێکی دیکەی نییە.

ئەنجام، دەوڵەت ناوکی شارستانی و مێژووی شارستانییە و تا ڕۆژی ئەمڕۆمان زیادی کردووە و بەردەوام بووە. چەندین شێوەی بێژماری بە بەرخۆیدا کردووە و بەردەوام گرنگی بە پەردەپۆشکردنی خۆیداوە. سەرباری تەواوی چەواشەکارییە ئایدیۆلۆژییەکان بۆ یەکەمین جار لەسەردەمی شارستانی سەرمایەداریدا شانسی پێناسەکردنی وەک ڕۆڵە ڕاستەقینەکەی خۆی ڕەخساوە. ئەم پێناسەیەی لە ئاکامی هەوڵی مەزنی زهنی و کردارییەوە بەدیهاتووە، واتادارترین دەسکەوتی تێکۆشانە بەرامبەر بەسەرمایەداری. کێشەی سەرەکی ئەوەیە کە لەژێر ڕۆشنایی ئەم پێناسەیەدا بەپەلە پێشکەوتن و سەرکەوتنی شارستانێتی دیموکراتی لەمیانەی شێوەو ناوەڕۆکی واتادارەوە بەرزبکرێتەوەو هەمیشەیی بکرێت.

## ج ـ ئایدیۆلۆژیای شارستانی سەرمایەداری (مۆدێرنیتە) و کردنی بە ئایین

شارستانییەکان لەماوەی درێژخایەندا و لەسەر بنەمای پێکهاتە ئایدیۆلۆژییەکان پێکدێت. پرسیارەکانی لەجۆری ئایا **"سەرەتا کلتووری ماددی دەردەکەوێت، دواتر کلتووری مەعنەوی پێشدەکەوێت، یان بەپێچەوانەوە؟"** جگە لە ئاڵۆزکردنی بابەتەکە هیچ واتایەکی دیکە نابەخشێت. ئەگەر لە دونیای فیزیادا نموونەیەک بێنینەوە، بابەتەکە روونتر دەبێتەوە. ماوەیەکی درێژ گفتوگۆیەکی بەوجۆرە هەبوو تەنۆکە یان شەپۆل. لە ئەنجامدا هزری هاوبەشی پەسەندکراو ئەوە بوو کە دوالیزمی تەنۆکە ـ شەپۆل لەمیانەی پێکهاتەیەکی دیالیکتیکی (دیالیکتیکی یەکتر لەناوبردن نا، بەڵکو دیالیکتیکی پێشکەوتن) سەرەکییەوە لە ناوەڕۆکی گەردووندا پێشدەکەوێت. لە پێکهاتەی سروشتی جیاوازیشدا، دوالیزمی کلتووریکی ماددی ـ مەعنەوی رۆڵێکی هاوشێوە دەبینن. دژی یەکتر نین، بەڵکو فاکتەرێکن کارلەیەکتری دەکەن. یەکتری دەگۆڕن و دەئافرێننەوە. هەروەکو چۆن هەر تەنۆکە یان کلتووری ماددی رێگا لەپێش شەپۆلێک دەکاتەوە و فاکتەرێکی کلتووری مەعنەوی دروست دەبێت، شەپۆل و فاکتەرێکی کلتووری مەعنەویش تەنۆکە و فاکتەرێکی ماددی دروست دەکات. لە سیستەمی شارستانیدا گومڕاییبوونێکی گشتی زهنی ئەنالیتیکی جێگای باسە. ئەمەش بەهۆی ئەو سیستەمە ئاوانتاژدارەوەیە کە ئاوایانکردووە: خوازیارن دوالیزمی لەجۆری رێسا نەگۆڕەکان، یاسا موتڵەقەکان کە پێویستە هەموو کەسێک گوێڕایەڵی بێت، لەپێشینەیی ئیلاهەکان، پیرۆزی و ئەبەدییەتی دەوڵەت، بەرکەماڵی نموونەکان، کاتیبوونی رووخسارەکان،

ناوەڕۆکی نەگۆڕ و شێوەی هەڵفڕێنەوە بەرژەوەندییەکانیان بکەن بە هەمیشەیی و بە سیستەمێکی بگەیەنن. ئەمە هەڵوێستێکی پێچەوانەی دیالیکتیکی پێکهاتنی گەردوونە.

گفتوگۆکانی لەجۆری سەرخان و ژێرخانی ناو کۆمەڵگا لە نزیکەوە گرێدراوی پێکهاتە گومڕاییەکانی شارستانییە. هیگڵ پێش هەمووشتێک سیستەمی خۆی بە سەرخان دەست پێدەکات، واتە لە دەوڵەت و حقوقەوە دەست پێدەکات. هەروەک چۆن سیستەمی گەردوونیشی بە ژێری موتڵەق (Geist) دەست پێکردووە. هەرچی مارکسە پێشینەیی بە ژێرخان، واتە پێشینەیی بەهێز و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان دەدات. ئەویش هەرچەندە بڵێت دیالیکتیکم "لەسەر پێیەکانی خۆی دانا" بەڵام هەمان لۆژیکی هیگڵی هەیە. ئەویش چییە؟ یەکێکیان دەڵێت فاکتەرێکیان بنچینەییە، ئەویتریان دەڵێت نەخێر فاکتەری دووەمینە یان دواتر دیاری دەکرێت. بەڵام ئەمە هەرچەندە بانگەشەی پێچەوانەکەی بکەن تێوەگلانی لۆژیکی قەبای دوالیزمی سۆبژە ـ ئۆبژەیە. زهنییەتی شارستانی کۆن بەردەوام بووە. پرسیاری بۆچی سۆسیالیزمی مارکس سەرکەوتوو نەبوو لەم لۆژیکەدا شاراوەیە. هەم پێناسەکەی لەبارەی ئابوورییەوە زۆر ئاڵۆزە، هەم لەمیانەی تەواوی ئامرازەکانی واتای شارستانی کلاسیکەوە هەنگاو دەهاوێژێت. چەندە قارەمانێتی بکرێت و گووتەی ڕاست بگووترێت، ئەنجام و واقیعەکە بەگوێرەی شرۆڤەکان نییە.

شارستانی سەرمایەداری کاتێک خۆی بونیاد دەنێت، بەجۆرێک لە ڕاهیبەکانی سۆمەر کارامەتر و پسپۆڕانە پرۆسەی ئاواکردنی ئایدیۆلۆژییان بەڕێوە بردووە، کە بە دۆخێکی سیستەماتیکیان گەیاندووە. تەنانەت دەکرێت بڵێین، سەرەتا لە ڕێگای ئایدیۆلۆژییەوە لەشێوازی دەوڵەتدا مەودایەکی درێژی بڕیوە. هیچ شارستانییەک لە ژێر ڕکێفی تاکە خوداوەندێکدا دەرنەکەوتووە. بەڵام بەمجۆرە خۆی نیشاندەدات و ڕووندەکاتەوە و ڕووندەکرێتەوە. ئەم ڕستانە گرنگن. تەنانەت توێژینەوە سەبارەت بە حەزرەتی محەمەدیش بکەین، دەبینین ئایەتەکانی سەرەتا لەگەڵ ئایەتەکانی کۆتاییدا زۆر لەیەکتر جیاوازن. زاراوەی خوداوەند

بەردەوام پەرەی پێدەدرێت. ئەو خوداوەندەی سەرەتا تەنیا دەڵێت "بخوێنەوە"، دواتر سیستەمی پێشخستووە. سیستەمی ئایەتە پارچە پارچەکانی پێکهێناوە، راستتر بناخەی سیستەمی داناوە. دواتر گشتگیری و تەواوکارییەکی ئایدیۆلۆژی مەزن پێکهێنراوە. ئاواکردنی سیستەم سەدان ساڵی خایاندووە.

تا لەهەموو لایەنێکەوە دەرک بە سیستەم و ئامرازە زهنییەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری نەکەین ناتوانین شیکاری بکەین. مۆدێرنیتەی سەرمایەداری تەنیا بۆخۆی تەواوی زاراوە، گریمانە و کردارەکانی دانەهێناوە. بەڵکو لەسەر میراسی هەزاران ساڵ دانیشتووە. لە ڕێگای ئەم میراسەوە سیستەمێکی بیناسازی و ناوەڕۆکێکی نوێ بە ماڵەکەی دەدات. سەرەتا چینی خۆی، دواتریش یەکێک یان چەندین چینی دەوڵەت کە وەک خۆی ئاواکراون، لە ڕێگای ئاواکردنی ئایدیۆلۆژییەوە دەکات بەیەک. لە مۆدێلەکەیەوە تا فەلسەفەکەی، لە کۆنترۆڵکردنی بەرهەمهێنانەوە تا بەکاربردن و کۆنترۆڵکردنی سیاسەت پێکهاتەکەیان دەکات بەیەک. پاشان لە ئاستی کیشوەر (ئەوروپا) و دواتریش لەئاستی جیهانگیریدا ئەمە ئەنجامدەدات. ئەگەر ریزبەندییەکی قەبای بۆ بکەین بەمجۆرەیە:

١ـ دامەزرێنەرانی ئایدیۆلۆژی لەسەرووی هەمووشیانەوە دیکارت و فرانسیس باکۆن پرەنسیپەکانی لۆژیکی نوێ و یۆتۆپیاکان ئاوا دەکەن کە پێکهاتەکانی سەدەی شازدەهەم کردوویانن بە پێویستییەک. هەرچەندە زۆر ساکاریش ببینرێت، بەڵام بەرۆژەڤکردنی دوانەیی ڕۆح ـ جەستە، دوالیزمی سۆبژە ـ ئۆبژە لەگەڵ خۆیدا دێنێت، وەک کاردانەوەیەکی زنجیر ئاسا ئەو هزرانەی دواتر ئاواکراون تا پێشەنگایەتی "سەرمایەداری، بورژوازی"بەرەو ترۆپکە دەچێت. بە ئەندازەی دابڕان لە لۆژیکی دەرەبەگایەتی، لۆژیکێکی نوێ ئاوا دەکرێت. ئەمەش لەپێناو چینێکی نوێ و هەمووجۆرە چالاکییەکانیتی. لەوەش جیاوازتر و گرنگتر، لە ڕێگای ئەم بونیادە ئایدیۆلۆژیانەوە لەپێشینەییەکانی ئەو چینە نوێ و کۆنانە دادەڕێژێت کە بەڕێوەیان دەبات. گەمەیەکی کۆنە، بەڵام بەشێوەیەکی نوژەنکراوە یاری دەکرێت. ناوە نوێیەکەی چینی ڕاهیب، فەیلەسوف

و زاناکانن. بەردەوام زاراوە و تیۆری نوێ لە قوتووی ئایدیۆلۆژی دەرەبەگایەتی، تەنانەت کۆیلەداریش وەردەگیرێت. بەگوێرەی ڕەوش یان پینە دەکرێت، یان مۆدێلێکی نوێ (بەڵام پرەنسیپەکان هی جارانە) پێکدەهێنرێت.

تەنانەت ئەگەر تەنیا شیکردنەوەیەک لەبارەی دیکارتەوە بکەین، ناشێت هەست بە فاکتەرە بەکاریگەرەکانی بونیادی ئایدیۆلۆژی نەکەین. سەرەتا گومان لە هەمووشتێک دەکات. شیکاری جفرەکەی: دەخوازێت بڵێت "پێویستە قەڵغانی ئایدیۆلۆژی فیوداڵی، دواتریش دەسەڵاتەکەی تێپەڕبکرێت". بە ئاشکرایی بیڵێت، ئەنگیزاسیۆن لەبەرامبەریدا هەیە. مەترسی سووتان دەیتۆقێنێت. لەم سۆنگەوە ناچارە لە ئاستێکی ئەبستراکت (مجرد)دا فەلسەفە بکات. دواتر دەڵێت: "**بیردەکەمەوە، کەواتە من هەم**". ئەمەش هێمایەکە بۆ پیشاندانی ئامادەکاری ئایدیۆلۆژی و خستنەگەڕی یەکە یەکەی فاکتەرەکان. بەهەمووکەسێک دەڵێت: "**گومان لە هەمووشتێک بکەن، تەنیا لەڕێگای هزری بەهێزەوە دەتوانن هەبوونی خۆتان بسەلمێنن**". بەمجۆرە کردنەوەی جفرەکانی هێندە زەحمەت نییە، شێوازی ژیانێک کە دەرەبەگایەتی دەیسەپێنێت هیچ بەهایەکی نییە، لە ڕێگای هزرە بەهێزەکانتانەوە دەتوانن ژیانی نوێ ئاوابکەن. لە ڕێگای دوالیزمی جەستە ـ ڕۆحەوە، بەشێوەیەکی سووک گرنگی ئەم دونیایەش بەبیر خوداوەند و دونیای دیکە دێنێتەوە. دوای ئەوەی خوداوەند تاوی یەکەمی پێدا، ئیتر گەردوون بەردەوام لەخۆیەوە بەشێوەیەکی میکانیک لەناو جووڵەدا دەبێت. ئەگەر جفرەی ئەم ڕستەیە بکەینەوە: لەگەڵ ئەوەی خوڵقێنەرانی شارستانی کۆن بنچینەیین، بەڵام شارستانییەکی نوێ کەوتۆتە جووڵە، بۆخۆی دەتوانێت شارستانییەکی نوێ ئاوابکات. ئەگەر وەریگێڕینە سەر زمانی چینایەتی، چینێکی نوێ لەدایک دەبێت. هێزی بیرکردنەوەی هەیە. لە ڕێگای یاساکانی جووڵە و چالاکییەکانییەوە دەتوانێت دونیای خۆی ڕێک بخات.

ئەگەر کورتە شیکارێکی فرانسیس باکۆنیش بکەین، دەبینین کە تاقیکردنەوە مەرجێکی لۆژیکەکەیەتی. ئەوەی تاقیکردنەوە دەیسەلمێنێت

گشتگیری دەکات. دەڵێت: "**هزرێک تاقینەکرێتەوە، نابێت بەزانست و بێ بەهایە**". جفرەکەی بەمجۆرەیە: "**هەمووشتێک لە رێگای پراکتیک و چالاکییەوە فێر دەبین. باوەڕی بە قسە پرووپوچە کۆنەکان مەکەن. زانست هێزە. تەنیا ئەو هزرانەی لە رێگای تاقیکردنەوەو چالاکییەکانتانەوە بەدەستتان هێناوە، یان ناچارن بەدەستی بێنن، دەتوانێت بەهێزتان بکات**". جفرە چینایەتییەکەی ئەوەیە کە بەو هێزە نوێیانەی لەمیانەی پەیڕەوی پاوانخوازی سەرمایەدارییەوە لەسەر زێدە ـ بەهاوە پێکهاتوون پێیان دەڵێت: "**لەجیاتی زهنییەتی کۆنی کلاسیک، لە رێگای رێنمایی دەسکەوتەکانتانەوە هەمووشتێک تاقی بکەنەوە، ئەنجامەکانی پێشبخەن و گشتگیری بکەن؛ لە رێگای زانیارییەوە بەهێز دەبن و ماڵ و دونیای خۆتان ئاوا دەکەن**".

هەڵبەتە هەڵسەنگاندنی ئەو سوپای زانست و فەلسەفەیەی کە لەسەدەی شازدەهەمدا هەنگاو بەهەنگاو گەورە دەبوو، وەک هێزی پێشەنگی پاوانخوازی سەرمایەداری راست نییە. تەنانەت ئاگاداری ئەو راستییەشین کە زۆرینەی بەشداربووانی هەرسێ بزووتنەوە مێژووییەکە (رێنسانس، ریفۆرم و رۆشنگەری) لە رووی ناوەڕۆکیشەوە بەزۆری داناکانی زهنییەتی ئازاد و ئەخلاقناسەکان بوون، نەفرەتیان لە دەسەڵاتێک و شێوازێکی ژیان دەکرد کە ئاکامێکی وەکو سەرمایەداری لێدەکەوێتەوە. بەڵگەنەویستە شۆڕشی هزری کە لە ئەورووپا تەقییەوە بەهایەکی مرۆڤایەتی تەواوی جیهانە. بەشێکی هەرە زۆریان مرۆڤپەروەر بوون. لە ئایین و میللیگەرایی دوورەپەرێزبوون. هەڵبەتە کاری زانست و فەلسەفە بۆخۆی شۆڕشێکە. ئەگەر بکرێتە موڵکی چینێکی کۆمەڵایەتی، هیچ گومانێکی تێدا نییە کەسانێکن لایەنگری ئەوانە نین کە لەگەڵ بەهاکانی شارستانی کۆندا بوونەتە یەک، بەڵکو لایەنگیری ئەوانەن کە هەرە زێدە پێویستیان بە ئازادی، یەکسانی و دیموکراسی هەیە.

تەنانەت کاتێک ئەم دێرانەش دەنووسین سوپاسگوزارییان دەکەین. کێشەکە ئەمانە نین. بەڵکو ئەوانەی کە هەروەک چۆن زێدە ـ بەرهەمییان لە خاوەنەکانیان زەوتکرد و وەک هێزی بەڕێوەبەری چینێکی نوێی

کۆمەڵایەتی لە بونیادنانی خۆیاندا بەکاریان هێنا، بەهەمان شێوە دەست بەسەردا گرتنی زێدە ـ بەرهەم و بەهای زهنی و بەکارهێنانی لە ئاواکردنی زهنییەتی خۆیاندا بەکاریان هێناوە. بەدڵنیاییەوە دەتوانین ئەم کردەوەش بە دزینی "زهنییەت" ناو ببەین. توانیان لەهەموو لایەکەوە مۆدێرنیتەی نوێ بەگوێرەی بەرژەوەندییە چینایەتییەکانی خۆیان ئاوابکەن. دەبێت زۆرباش ئەم خەسڵەتەی دەسەڵاتە پاوانخوازییەکانی دەوڵەت بناسین. لەو شوێنەی قازانجی زۆری تێدا بێت، تۆزێک دەبەخشن **"شوێنێک دەسکەوتەکەی قاز بێت مریشک دەبەخشن"**. بەشێوەیەکی شارەزایانە زەحمەتییەکانی (زەحمەتی ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی) زاناو فەیلەسوفەکانیان بەکارهێناوە و خستوویانەتە بەرژەوەندی خۆیانەوە، هەروەکو چۆن توێژە خوڵقێنەرەکانی ئابوورییان بەکارهێنا، توانیان ئەمانیش بەکاربێنن. چەندین هونەرمەند، زانا و فەیلەسوفیان خستە ژێر کۆنترۆڵی خۆیان، تەنانەت خستیانە ناو دەزگاکانی دەسەڵاتەوەو بەمجۆرە بەکاریان دەهێنان. دەیانزانی چۆن بەهەمان پەیڕەوی ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە ئەوانەش بێکاریگەر بکەن کە بەرامبەریان بەرخۆدان دەکەن. ئاگادارین کە چییان بە سەر هاوشێوەکانی ئاراسموس، گالیلۆ و برونۆدا هێناوە.

هەروەکو چۆن لە رێگای پاوانخوازی دەوڵەتەوە سەرلەنوێ دەستیان بەسەر ئابووریدا گرت، بزاوتی پاوانی ئایدیۆلۆژیش بەهەمان شێوە کاریگەر بوو. هەم لە گۆڕەپانی ئایدیۆلۆژی، هەم ئابووری، هەم سیاسیدا یاخیبوونەکان لە رێگای چالاکی بەرفراوانەوە سەرکوتکرا. لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا نەک تەنیا لەبەرەی پاوانی ئابووری (پیشەسازی) دا، بەڵکو لەبەرەی سیاسی (شۆڕشی فەرەنسا) و ئایدیۆلۆژی (میللیگەرایی و دەوڵەت ـ نەتەوە)یشدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا. ئەوانەی ژێرکەوتن کریستیانە کاسۆلیکەکان، مۆنارشی شێوازی کۆن، ئیمپراتورەکان و مرۆڤپەروەری (هیومانیزم)ی بوو. هەروەکو چۆن ئابووری لەلایەن رکابەرەکانییەوە واتە لەلایەن پاوانکارەکانەوە قووتدرا، بزووتنەوەو نەتەوە دیموکراتەکانیش لەلایەن دەوڵەت ـ نەتەوە و میللیگەراییەوە

خرانە ناو پرۆسەی قووتدانەوە. ئەوەی دەکەوتە سەر ئەرستۆکراسی و کڵێسای کاسۆلیک و تەنانەت تەواوی ئاینی کریستیانی، هەرچەندە کیانی جارانیشیان نەمابێت، لەسەر بنەمای بەرژەوەندییەکان رێککەوتن بوو لەگەڵ خاوەنە نوێکان تا بۆشیان بلوایە ئەنجامدانی رێککەوتن بوو بە مەرجی گونجاو. کەواتە تا سەدەی نۆزدەهەم تەنیا سەرکەوتنی پاوانە ئابوورییەکان (بازرگانی، پیشەسازی، دارایی) جێگای باس نییە. بەلانی کەم سەرکەوتنی ئایدیۆلۆژیش بەو ئەندازەیە گرنگ بوو و سەرکەوتنی تێدا بەدەست هێنابوو.

٢ـ ئیتر شێوازی ئاواکردنی ئایینیانەی شارستانی دەرەبەگایەتی هەڵوەشابۆوە. پرۆتستانتی ئەنجامێکی ئەمەبوو. کڵێسای کاسۆلیک پێگە شکۆدارەکەی خۆی لەدەست دابوو. هەڵبەتە ماکس ویبەر لە رێگای تێزە بەرکەماڵەکەیەوە بۆ هەمووکەسی پیشاندا کە ئەخلاقی پرۆستانێتی بەگوێرەی سەرمایەدارییە. عەلمانییەت کە زاراوەیەکە پێویستی بە شیکار هەیە، یەکێک لە سەرکەوتنە ئایدیۆلۆژییەکانی ئەم قۆناخەیە. کاتێک ئەوروپا هێشتا زۆربەیان تیرەی ئازاد بوون جیهانی کریستیانی لەمیانەی دۆگماتیزمێکی ئەوپەڕکەرییەوە لە زهنی گەلانی ئەوروپادا جێگیر ببوو. ناکۆکیەکەی لەگەڵ جیهان روون و ئاشکرابوو. کاتێک قورسایی سیاسی و ئابووری خۆیشی لەدەستدا، چاوەڕوانکردنی بەلاوەنانی ئایینی کریستیانی لەبواری ئایدیۆلۆژیشەوە هێندە زەحمەت نەبوو. گرنگتر ئەو سەمەرەیە بوو کە عەلمانییەتی پێدەڵێن. وەک وشە هەرچەندە بەواتای "بەدەر لە ئایین" بێت، بەلام چەندە لەناو ئاییندایە، چەندە لە دەرەوەیەتی یەکێک لەتاریکترین بابەتەکانە. خۆی لەو دیاردەیە پێچا کە بە پۆزیتیڤیزم ناو دەبرێت. بەگوێرەی ئەوەی پۆزیتیڤیزم خۆی وەکو ئایینی نوێی جیهان راگەیاند، چەندە دەشێت عەلمانییەت لەدەرەوەی ئایین بێت؟ ئایینی نوێ بە واتای چی دێت؟

پۆزیتیڤیزم ناوەڕۆکی ئایینی خۆی لە دیاردەگەراییەوە وەردەگرێت. لەبواری ناوەڕۆکەوە دیاردە سەرەکیترین راستینەی پۆزیتیڤیزمە. هەرشتێک دیاردەیی نەبێت بە "راستی" دانانێت. کەچی توێژینەوەو

فەلسەفە نیشانیدەدەن کە دیاردەو هەست هەمان شتن (واتە دیاردە = هەست). هەرچی هەستیارییە، سادەترین کاری زهنییە. لە ئەنجامی رووکەشانەترین چاودێریکردنی ئۆبژەکانەوە پێکدێت و پەیڕەوێکی قەبای بەدەستهێنانی زانیارییەکانە (جۆرێکی زانیاری بەهەڵەداچووە، زانست نییە). کاتێک دیاردە بەدۆخی دیاردەگەرایی دەگەیەنرێت، رۆڵی راستەقینە بەئۆبژە دەبەخشرێت. هەمان هەڵوێست لەبناخەی پاگانیزم (بتپەرستی)یشدا هەبوو: ئۆبژە کرابوو بە بابەتی پەرستن. لە رەوشێکی بەمجۆرەدا پۆزێتیڤیزم چەندەی بخوازێت با هێرشی میتافیزیک بکات، لەسەرووی هەمووشیانەوە هێرش بکاتە سەر ئایین، خۆشی لەبەرئەوەی بتپەرستییەکی ئۆبژێکتیڤیستە بووە بە ئایینێکی ماتریالیستی هەرە قەبە: واتە جۆرە نوێیەکەی بتپەرستی ماددییە لە مۆدێرنیتەدا، نوێنەرە میتافیزیکەکەیەتی. جۆرە هەرە رووکەشیەکەیەتی. نیچەش لەهەمان بڕوادایە. لەکۆمەڵناسی ئازادیدا ئەم بابەتە بەفراوانی تاوتوێ دەکەم.

بەلانی کەم هێندەی تیۆلۆژی چاخی ناوین، پۆزێتیڤیزمیش زهنییەتی دووچاری تێکدان و شێواندن کردووە. تەنانەت هەستی بە دونیای مەزنی مەعنەوی کۆمەڵگاکانی مرۆڤ نەکرد. بانگەشەی کۆتایی هاتنی دونیای میتافیزیکی کرد، توانستی ملیۆنان ساڵ، واتە پیرۆزییەکانی مرۆڤایەتی فڕێدایە ناو سەبەتەی زبڵەوە. تەواو بزاوتێکی نەزانی (جەهالەت) بوو. ئەو گووتەو سیفەتەی حەزرەتی محەمەد بۆ ئەبو جەهلی بەکارهێنا تەواو بۆ پۆزێتیڤیستەکان لەجێگای خۆیدایە: ئەبو جەهلە هاوچەرخەکانی بواری زانستی کۆمەڵگان. دەبێت زۆرباش دەرکی پێبکرێت کە بەدەری لە ئایین (عەلمانییەت) و دیاردەگەرایی (ئایین یان فەلسەفەی پۆزێتیڤیست) و ماتریالیزمی قەبە (**"زهنی مرۆڤ تەنها وەک ئاوێنەیە کەوێنەی شتەکان تێیدا رەنگدەداتەوە"**) بەیەکەوە تۆڕی ئایدیۆلۆژین کە لەنزیکەوە گرێدراوی پاوانەکانی سەرمایەدارین. تەواو زیاتر لەچوارسەد ساڵە لە رێگای ئەم سێ جۆرە ئایدیۆلۆژییەوە بزاوتێکی تیرۆر و خراپەکاری لەسەر کۆمەڵگای نوێ بەڕێوە دەچێت: لەسەر دونیای مەعنەوی کۆمەڵگا بەڕێوە دەچێت.

تا ئەو کۆمەڵگایە هەڵنەوەشایەوە کە هەزاران ساڵە بەکاریگەری کلتووری مەعنەوی، واتە بەکاریگەری ئەخلاق بوونی خۆی پاراستووە، ئەوا سەرکەوتنی کلتووری ماددی سەرمایەداری مەحاڵ بوو. لەبەرئەم هۆکارە فەتحی ئایدیۆلۆژی پێویست بوو. دژایەتیکردنی ئایینیش، سەرچاوەی خۆی لە رەهەندی ئەخلاقی ئایینەوە دەگرت. ئەم سێ فەلسەفەیە کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر رووخانی ئەخلاقی کۆمەڵگا هەبووە. ئەو کۆمەڵگایانەی لەبواری ئەخلاق خاڵیبوونەتەوە یان گومرا دەبن، یان بەسانایی خۆیان بەدەستەوە دەدەن. هەرئەمەش روویدا. عەلمانییەت، لە رێگای بێ دینییەوە رەوشت بەرزی ئەخلاقی ئایینی رووخاند. پۆزێتیڤیزمیش لە رێگای دیاردەگەراییەوە رێگای بتپەرستی نوێی کردەوە (هاربوونی لە رادەبەدەری کۆمەڵگا لە بەکاربردندا و تامەزرۆیی خاوەندارێتیکردنی شتومەک بەشێوەیەک وەک بڵێی دەیپەرستێت، دەشێت وەک بتگەرایی هاوچەرخ پێناسە بکرێت). داڕووخانی سەرسوورهێنەرانەی ئەخلاقیش لەم رێگایەوە ئەنجامدراوە.

دژایەتیکردنی میتافیزیک یەکێک لە جاهیلانەترین پەلامارەکانێتی. میتافیزیک لەو سەردەمەی پێکهاتووە (لەسەردەمی پێکهاتنی مرۆڤەوە) بۆ مرۆڤایەتی ناچارییەکە. نەک تەنیا بۆ ئەو شارستانییانەی لەدەوروبەری دەوڵەتدا پێکهاتوون، بۆ تەواوی مرۆڤەکان، تەنانەت بۆ ئەو ئاژەڵانەش پێویستییە کە زهنیان تا رادەیەک پێشکەوتووە. هیچ مرۆڤێک بە زانست و زانیاری تەواو، یان ئەگەر بەزمانی پۆزەتیڤیستەکان بیڵێین بە زانستگەرایی تەواو، نە لە رابردوو نە لە رۆژی ئەمڕۆماندا توانای تەیاربوونێکی تەواوی نییە. ئەگەر ئەمە مەحاڵیش نەبێت، هێزی زهنی مرۆڤ بەشناکات. ئەگەر دونیای میتافیزیکی لێ بسەنن یاخود بیڕووخێنن، بەمردوویی لەناو دەستاندا دەمێنێتەوە. یاخود هەندێک مرۆڤی هار سەرهەڵدەدەن کە هیچ یاسایەک ناناسن (کۆمەڵگای رۆژئاوا بۆتە شاهێدی ئەم دیاردەیە). ئەوەش کە روویداوە هەرئەمەیە. لە راستیدا دیاردەکانیش لایەنی ئەرێکراوی گشتی راستی پێکدێنێت، نەک هەموو شتێکی.

کوانتەم و گەردوونناسی هێشتا دوا گوتەی خۆیان نەگووتووە.

هەرچی ژیانە هیچ شیکارنەکراوە، تەنانەت دەرک بە نهێنییەکەشی نەکراوە. هەربۆیە شایستەی گووتەی جەهالەتی هاوچەرخە. (مەبەست پۆزیتیڤیزمە) ماتریالیزمی قەبە لەو جیاوازتر نییە. پرسیارەکانی ژیان و زهن کە هەرگیز لەمیانەی تیۆری ئاوێنەوە روون ناکرێتەوە، پەرەسەندنێکن تەنانەت تاکو ئێستاش زانست رۆژانە رووبەڕووی پەڕجووە نوێکانی دەبێتەوە. ژیانی کۆمەلایەتی لەوانیش ئالۆزترە. کاتێک دەرک بە راستییەکەیان کرا کە ئەمانە بزاوتی زوو دەرکەوتووی جەهالەتن و ناتوانن ببنە ناوەندێکی واتاداری سەرنجراکێشان، ئەم جارە دوو سەنتێزی شاراوەتری ئەم سێ فەلسەفەیان خستەگەڕ: میللیگەرایی و ئەنتەرناسیۆنالیزمی بورژوایان خستە گەڕ، کە لە رووخساردا ناکۆک دیارن، بەلام لەناوەڕۆکدا یەکتری تەواو دەکەن.

٢ـ ئەنتەر ناسیۆنالیزمی بۆرژوا یاخود جیهانگیرییەکەی: لەمێژووی شارستانیدا دامەزرێنەرانی ئایدیۆلۆژیا رەچاوی دووشت دەکەن: ئەوانەی لە نهۆمی سەروو نیشتەجێن و بەها سیمبۆلییە هاوبەشەکان. ئەمانە بریتین لە گوزارشتی سیمبۆلیانەی بەرژەوەندییە هاوبەشەکان. هەموو کاتێک ئایدیۆلۆژییەکان ناوەڕۆکێکی سیمبۆلییانەیان هەیە. ئەوەی گرنگە سیمبۆلێک چی و بەرژەوەندی کێیە. کۆنسەی (ئەنجوومەنی) خوداوەندەکانی سەرووترین نهۆمی زەقورە (زیگۆرات) کان رەمزێک بوون. ئەن، ئەنلیل و ماردۆخ رەنگدانەوەی دەستەی بالای ئەو پلەدارییە بوون کە تازە هەلکشابوو و بە دەزگابوو. نازانین کە ئەم سیمبۆلیکردنە چەندە بە ئاگایی بووە و چەندە لەخۆیەوە پێشکەوتووە. بەلام نەریتێکە کۆنە و تایبەتمەندێتی گشتیش لەخۆوە دەگرێت. ئەم سیمبۆلانە تا گەیشتۆتە رۆژگاری ئەمڕۆمان ئالۆزترکراوە، وەرچەرخێنراوەو بەمجۆرە وەرگیراوە. بۆ ئەوانەی نهۆمی هەرە خوارەوەش سیمبۆلەکانی بەندایەتی و کۆیلایەتی پێشدەخرێت. بۆئەوەی ئەنجوومەنی خوداوەندە پیرۆزەکان لەگەلیاندا تێکەل نەکرێن هێلی تیژ و مسۆگەر دادەنرێت. بەندە دەبێت پێویستییەکانی بەندێتی خۆی جێبەجێ بکات، هەرگیز نابێت خۆی تێکەلی کارەکانی خوداوەند بکات. پرسیارێکی بەمجۆرە بە ئەقلی مرۆڤدا

دێت **"لە ڕێگای ئەم جۆرە مەتەڵانەوە کۆمەڵگا چ زیانێکی بەرکەوت، دەسکەوتەکەی چی بوو؟"**.

کۆنسەی نهۆمی سەرووی ڕۆژی ئەمڕۆمان بەشێوەیەکی ڕێکوپێک لە داڤۆس[1] کۆدەبنەوە. بەنهێنی یان بە ئاشکرا. بەڵام ئەمەش مسۆگەرە: ئەم نیشتەجێیانەی بەرزترین نهۆمی زەقورە بەدۆخی رووت و بێ دەمامکیانەوە ناوەناوە دەچنە نێو خەڵک (هەرچەندە ئەمانە خەڵکانی چینی سەروو بن). لەم کۆبوونەوانەدا لەلایەن ڕاهیبە پسپۆڕەکانەوە دەستنیشان دەکرێت کە پێویست ناکات خەڵک (مرۆڤەکان) لێیان بترسن، هەرگیز نابێت بیر لە دۆڕاندن بکرێتەوە و ڕەوشەکە لەژێر کۆنترۆڵیاندایە، ئامادەکاری و یەدەگی پێویستی شەڕیان هەیە، بەمجۆرە ئەنجامی خێردار بۆ هەموو کەسێک هەڵدەهێنجرێت. لەچەندین شوێن ڕاهیبە هەڵبژێردراوەکان لە ڕێگای کەناڵە پێشکەوتووەکانی میدیاوە ئەم ئایدیۆلۆژیا ئەنتەرناسیۆنالیستییە بەشێوەیەکی چڕ و بێ هاوتا لە زهن و سۆزی مرۆڤدا جێگیر دەکەن. ئیتر زانکۆ، مزگەوت و کڵێساکان لە دواوەن. سەردەمی گەیاندن، چاخی جیهانگیریشە. بەکاربردن و ڕابواردنیان چۆن بەگوێرەی دوا سەردەمی شارستانییەکان پێویست بێت بەمجۆرە بەردەوامە. تەنانەت لەکاتێکدا بۆ یەکەمین جارە بەڕاستی دەورووبەر و ژینگە لەناو دەچێت، ڕێنادەن سەبارەت بە دونیا بونیادنراوەکەیان پێیان بگوترێت بەری چاوتان کلی پێوەیە. سەرباری ئەوەی کۆمەڵگا، شار، لادێ و دیموگرافیا ئیتر زەنگی بەردەوامنەبوون لێدەدەن، وەکو پێویستییەکی ئایدیۆلۆژیا ئەنتەرناسیۆنالیستەکەیان چاوەکانیان کوێر و گوێچکەشیان کەڕ بووە. لەمێژە لەناوەوە خاڵیکراوەتەوە، هیچ ئۆجاخێکی کۆمەڵگا نەماوە هاریتی سێکس ـ سپۆر ـ هونەر سڕی نەکات.

٤ـ میللیگەرایی (نەتەوەپەرستی): هەرچەندە وەکو پێچەوانەی ئەنتەرناسیۆنالیستیش دیاربێت، ئامرازی ستراتیژی ئایینی "پەرتکە و زاڵبە"ی نوێیە کە ئەنتەرناسیۆنالیستەکانی نهۆمی سەروو بۆ سڕکردنی

---

١ـ داڤۆس: لوتکەیەکە ساڵانە لەنێوان دەوڵەتە دەوڵەمەندەکان بۆ کاروباری ئابووری دەبەسترێت. لەساڵی ١٩٧٠ ئەم کۆمەڵە لەسویسرا دامەزرا، ناوەکەشی بۆ شوێنی دامەزراندنەکەی دەگەڕێتەوە. وەک مونتەدای ئابوری جیهانی دەناسرێت: سەرۆکی ولاتان و بڕیار بەدەستەکان بەشداری تێدا دەکەن.

نهۆمەکانی خوارەوەی کۆمەڵگا بەهەرچوار پەلیان خۆیان لێی ئاڵاندووە. هەم بۆ بەلاوەنانی کەموکورپییەکان، هەم ئەو کێشانەی ئامرازە ئایدیۆلۆژییەکانی لەجۆری پۆزێتیڤیزم، عەلمانییەت، ماتریالیزمی قەبە و زانستگەرایی لەگەڵ خۆیاندا هێناویانە، میللیگەرایی بە کاریگەرترین ئامرازی ئایدیۆلۆژییە کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بە بێ ئەو ناتوانێت. پێش هەمووشتێک تاکە ئایینی بەکاریگەری دەوڵەت - نەتەوەیە. هەر سەردەمێکی شارستانی باوەڕییەکی بەگوێرەی خۆی هەیە. ئەم باوەڕیانە نەبێت ناتوانن هەنگاویکیش بهاوێژن. میللیگەرایی بەکاریگەرترین قاڵبی باوەڕی مۆدێرنیتەیە. ئاواکردنی تادوارادە ئاسانە: هەر فاکتەرێک کە نەتەوە پێکدێنێت، دەکەین بە پیرۆزییەکی باوەڕی. لەتەواوی قوتابخانە، سەربازگە، مزگەوت، کەنیسە، خێزان و چالاکی کۆمەڵەکانی دیکەدا لەگەڵ ناموسدا هێماو هاوواتای دەکەین، بەمە تەنانەت بێ ئاگاترین تاکیش دەوروژێنیت، هێندە بەکاری دێنیت تا دەبێتە یەکێکی شەڕانگێز و هێرشکار. ئەمەش بە واتای خوڵقاندنی بەکاریگەرترین ئایین دێت. بەپێچەوانەی مەزەندەکانەوە، ئایین بۆ باوەڕهێنان بە ئاخیرەت و ئامادەکاری بۆ دونیای دیکە نە ئافرێنراوە. ستراتیژی و بەرنامەی سیاسییە. عیبادەتیش ئامرازی پەروەردەی رۆژانەیە.

سەرباری داپۆشینی بە پەردە ئەستوورەکانەوە، پێشخستنی ئەم شێوازانەی شیکاری ئایین، ئەرکی سەرەکی کۆمەڵناسییە. لە دۆخێکی پێچەوانەدا لەرەوشی لقی خوارەوەی زانستپەرستی رزگاری نابێت. ئەمە لەکاتێکدایە کە ئایینەکانیش پیرۆزی خۆیان هەیە و زۆر بایەخدارە. خستنەڕووی ئەمانەش ئەرکی کۆمەڵناسییە. ئەگەر خیانەت لە پیرۆزییەکانیش کرابێت (ئاشکرایە خیانەتی لێکراوە) و ئایین بۆ قەبەترین ئامرازی ئایدیۆلۆژی گۆڕابێت، ئەوکاتە بەتایبەتی لەلایەن واعیزەکانییەوە خراوەتە دۆخێکی نوێوە کە رۆڵی موونافیقی دەبینێت. بەکورتی ئایینیش ئامرازێکی میللیگەرایی رۆژی ئەمڕۆمانە کە هەرە زێدە پەنای بۆ دەبات: ئامرازی ئامرازە. لەبەرئەوەی لەهەردوو بابەتی دواتردا لەنزیکەوە رێڕەوی پێکهاتن و بەکارهێنانی ئایین تاوتوێ دەکەین، لێرەدا تەنیا

پێناسەمان کرد.

رزگارکردنی زهن و هزر لێرەشەوە رزگارکردنی کردەی ئازادی لەژێر کاریگەری پاوانی ئابووری مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و ئامرازە ئایدیۆلۆژییەکانی سەدان ساڵە زەحمەتە، بەڵام سەرەکیترین ئەرکی مۆدێرنیتە (شارستانێتی)ی دیموکراتییە. هۆکاری ئەو هەموو رەخنانەی دەرهەق بە ئەنارشیستەکان، یۆتۆپیاگەرەکان، تەریقەتە هەمەجۆرەکانی برایەتی، تەنانەت سۆسیال ـ دیموکرات و جوڵانەوەکانی رزگاری نیشتمانی لەسەرووی هەمووشیانەوە ئاراستەی مارکس و مارکسیستەکانم کرد، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە پێکهاتەیەکی ئایدیۆلۆژی بەکاریگەری مۆدێرنیتەی دیموکراتییان ئاوا نەکرد. ئاشکرایە کە مارکس و مارکسیستەکان خوازیاربوون راوەستەو بەرخودانێک بەرامبەر پاوانی سەرمایەداری هەڵکشاو نیشانبدەن. مەیلی دیموکراتیانەی ئەوانی دیکەش بچووک ناکرێتەوە. بەڵام کاتێک لەگەڵ رۆژی ئەمڕۆماندا بەراورد بکرێت، دەبینرێت کە چەندە ناتەواو بوون، هەڵەبوون و بێ چالاکی ماونەتەوە؛ ئەگەر مۆدێرنیتەی سەرمایەداری سەرباری ئەوەی لەناو قوڵترین قەیراندا دەژی، بەردەوام رێگا لەپێش کارەساتەکانی ژینگە دەکاتەوە، پەراوێزکردنی کۆمەڵگا و بێکاری و هەژاری لەگەڵ خۆیدا دێنێت، ئاسوودە و ئارامترین قۆناخی تەختی خۆی بەسەر دەبات زۆرچاک ئەم وتانەمان پشت راست دەکاتەوە.

لە رێگای چاوپێداخشاندنەوەی میراسی تەواوی چاخەکانی رابردووی بەرەی شارستانێتی دیموکراتییەوە و وەرگرتنی ئەوەی پێویستی پێی هەیە، بەتەواوکردنی کەموکوڕییەکانیشی لە رێگای ئانالیزی رۆژانەوە و بەمەش هەڵمەتی ئایدیۆلۆژیانەی خۆی جێبەجێ بکات، ئەمە ئەرکێکە لە هەموو کارێک پیرۆزتر و بەپەلەترە.

## د ـ بەیادی کۆمەڵکوژی یەهودییەکان ـ چیرۆکی هۆزی عیبرانی ـ

تەرخانکردنی بەشێکی بەوشێوەیە پێدەچێت سەرسوڕهێنەر بێت. بەڵام لەو باوەڕەدام کە بە تەواوەتی لەجێی خۆیدایە و پێویستە. پەیوەندی دەرچوونم بۆ دەرەوەی وڵات، دەستگیرکردنم و کۆمەڵکوژی یەهودی بە میللیگەراییەوە کە ئایینە نوێکەی سەرمایەدارییە، تا ئەو ئاستە بیانوێکی گرنگە کە ئەم چیرۆکە دەکاتە رۆژەڤ. هەروەها هەڵوێستی ناتەواوی رۆشنبیران، بەتایبەتیش پێشنەخستنی رەخنەدانێکی دڵسۆزانە لەلایەن ئایدیۆلۆژیای یەهودییەوە سەبارەت بە بابەتەکە یان ئەگەر هەشبێت لەبەرئەوەی من نەمبینیوە و نەمخوێندۆتەوە باسکردنی ئەم بابەتەی وەکو بەشێکی زۆر گرنگی بەرگرینامەکەم کردووە بە پێویستییەک. وەکو وردەکاری لێدوانەکانی بابەتەکە لەبەرگی چوارەم و پێنجەمدا کە بە ناوەکانی: "**دیموکراتیزەکردنی کلتووری رۆژهەڵاتی ناوەڕاست**" و "**ئاواکردنی مەدەنییەتی دیموکراتی لە کوردستاندا**" ئامادەم کردووە لە نرخاندنیدا قسەیان لەسەر بکەم.

**١ـ یەهودیەکان و شارستانی:** هەر رۆشنبیرێک کە بە مێژووی شارستانیەتەوە سەرقاڵ بێت کتوپڕ دەرک بەوەدەکات کە بێ ئەوەی رۆڵی یەهودییەکان لەبەرچاوبگرێت، ناتوانێت نرخاندنێکی بەکاریگەر پێشکەش بکات. لەبەرئەوەی لەبەرگرینامەکانی رابردوومدا بەهۆی ئەو زانیارییە سنووردارەی لەمبارەیەوە هەمبوو شوێن شوێن بەشێوەی گەڵاڵەبابەتێک ئاماژەم پێکرد و ناچاربووم زۆر بەکورتی ناوەڕۆکەکەی باس بکەم.

هەموو نیشانەکان ئاماژە بەوە دەکەن ئەو ناسنامەی بە ئیبراهیم (وەکو باوکی هەموو ئایینەکان پەسەندکراوە. ئەو زانیاریانەی سەبارەت بە ناسنامەی حەزرەتی ئیبراهیم، حەزرەتی عیسا و موسا هەیە، بەگشتی

بە لایەنی میتۆلۆژیا داپۆشراون، بۆ دەرکەوتنی راستی زیاتر بەڕوونی دیاربێت پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی سۆسیۆلۆژیانەی بەرفراوان هەیە) بەناوکراوە لەگەڵ یەکێک لەنەمرودەکانی بابل (وەک والی هەرێمێک وابووە) کە بەرێوەبەری ئەو ناوچەیە بووە کە ئەمڕۆ ئورفای پێدەڵێن، لەناو ناکۆکییەکی پارادیگماییدا بووە، یان لەبەر هەر هۆکارێکی دیکەش بێت رەنگدانەوەیەکی بەوشێوەیە نیشاندراوە. بەگوێرەی چیرۆکە میتۆلۆژییەکەی حەزرەتی ئیبراهیم بۆئەوەی نیشانی بدات کە ئەو پەیکەرە بتانەی لە پەرستگاکەن نابنە خودا، بتەکانی شکاندووە، و دواتریش کاتێک لەسەر ئەمە فڕێ دەدرێتە ناو مەنجەنیقەکانی قەڵای ئورفاوە کە بەدار ئاگردراون، ئاگرەکە دەبێتە ئاو، بەمجۆرە گۆلی ماسیدار[1] (باڵکلی گۆل)ی رۆژی ئەمڕۆمان دروست دەبێت.

بەشیمانەیەکی گەورەوە هێڵی ئورفا ـ قودس، لەسەردەمی شکۆداری هەردوو هێزی شارستانی خانەدانی نوێی میسر و خانەدانی حامورابی بابلی سۆمەرییەکاندا ناوچەیەکی تامپۆن[2] بووە. یەکەمجارە لە مێژوودا بازرگانی وەک کەرتێکی ئابووری بەرەو هەڵکشان بچێت. دوور نییە بازرگانی لەنێوان هەردوو شارستانییەکەدا رۆڵی لەسەر سیاسەت هەبووبێت. هاتووچۆی بازرگانی خێراتردەبێت. قۆناخی هەڵکشانی بازرگانی ئاشوورییەکانیش بەرئەم قۆناخە کەوتووە. هەروەها ئورفا ـ قودس ـ شام ـ حەلەب هەر لەچاخە سەرەتاییەکانەوە (پێش زایین لەدایکبوونی نیولیتیک و سەردەمی دامەزراندنی یەکەمین شار) هێڵێکی گرنگی کۆچ، بازرگانی، داگیرکردن و دەست بەسەرداگرتن، لەهەمووشی گرنگتر هێڵی ئاڵوگۆڕی ئایین بووە. رێککەوت نییە کە شوێنی دەرکەوتن و یەکەمین کۆچی حەزرەتی ئیبراهیم بووە. بەشێوەیەکی بەرچاویش دەزانرێت کە یەکەمین هێڵی هەنگاونانی کریستیانی و ئیسلامییەت بووە. حەزرەتی ئیبراهیم (شیمانە دەکرێت ئەم ناوە لەلایەن میسرییەکانەوە

١ـ لەناو مزگەوتی حەزرەتی ئیبراهیمدا لە شاری ئورفای باکووری کوردستان ئەو گۆلە بەرچاو دەکەوێت، لەناو گۆلەکەدا ژمارەیەکی زۆری ماسی بەرچاو دەکەوێت. خەڵکی ناوچەکە بەچاوێکی پیرۆز سەیری ئەو ماسییانە دەکەن و بۆ خواردن بەکاریان ناهێنن.

٢ـ ئەو ناوچانەی کە لەنێوان دوو لایەن یان دوو هێزدا وەک ناوچەیەکی بەتاڵ دەهێڵرێتەوە و سەربەهیچ لایەکیان نییە. یان (الأرض المحرمة)ی پێدەڵێن.

وەکو ناوتیشانێک پێی درابێت. دەتوانرێت شیمانەیەکی بەوشێوەیە بکرێت. میسرییەکان بەوانەی لەدەشتی سیناوە تێپەڕبوون لە ئەنجامی ئەو تۆز و خۆڵەی بەسەریانەوە بووە پێیان گووتوون "ئابیرۆ"کان. پێدەچێت دواتر ناوەکان گۆڕابن بۆ جۆری عیبرانی و ئیبراهیم ) سەرەتا ویستویەتی لە قودسی ئیسرائیل ـ فەلەستینی ئەمڕۆ نیشتەجێ بێت. حاکمە خۆجێییەکان بە ئاسانی رێگا نادەن. وەک باس دەکرێت لەبەرئەوە مۆڵەتێکی بچووک دەکرێت و هەر لەوێش کۆچی دوایی دەکات. چیرۆکەکانی بە سارا، هاجەر، ئیسماعیل، ئیسحاق، یاقوب دەست پێدەکات، بە چیرۆکەکانی حەزرەتی موسا، عیسا، محەمەد و سەدان پێغەمبەری نێوانیان بەردەوام دەکات، ئەوەی خوازیار بێت دەتوانێت لە کتێبە پیرۆزەکاندا (عەهدولقەدیم، عەهدولجەدید و قورئاندا) بەدواچوونی بۆ بکات. بەهەزاران پەرتووکی تری چیرۆکی لاوەکی و رۆمان دەکرێت فێرکەر بێت. زۆر بەگشتی چەند سەردەمێک بۆ وێنا کردنی ئامانجەکەم بەسە.

اـ چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیم لە ئورفا و دەرکەوتنی. شیمانە دەکرێت قۆناخی ١٧٠٠ـ١٦٠٠پ.ز. سەرۆکی قەبیلە و بازرگانە.

ب ـ قۆناخی دیلییەکەیان لە میسر (١٦٠٠ـ١٢٠٠پ.ز)

ج ـ دەرکەوتنی حەزرەتی موسا وەکو رێبەرێک (١٣٠٠ـ١٢٥٠پ.ز)

د ـ نیشتەجێبوون لە خاکی پەیمان پێدراودا (الأرض الموعودة) ١٢٥٠ـ١٢٠٠پ.زقۆناخی (فەرماندار و پێغەمبەر یەشوع)

هـ ـ قۆناخی رێبەر و حاکمەکان ١٢٠٠ـ ١٠٠٠پ.ز. قۆناخی رێبەرایەتی (کاهن)ە ئایینی و عەلمانییەکان کە هێشتا نەبوونەتە بە پادشا و پێغەبەر، تا دەرکەوتنی یەکەمین پادشا ساوڵ بەردەوام دەبێت.

و ـ قۆناخی پادشاکانی یەهودی و ئیسرائیل. ١٠٠٠ـ٧٠٠پ.ز. بە ساوڵ، داود و سلێمان دەستی پێکرد و بە حەزەقیل (دەست بەسەرداگرتنی ئاشوورییەکان) کۆتایی هات.

ی ـ قۆناخی دەستبەسەرداگرتن، داگیرکردن، حوکمداری، بەرخودان و تاراوگە (منفی). ٧٠٠پ.زـ٧٠.ز. (قۆناخی دەستبەسەرداگرتن و حوکمداری ئاشوور، بابل، ئەسکەندەر، رۆمایییەکان).

لەم قۆناخەدا پادشایەتی یەهودی یان ئیسرائیلی دەڕووخێت. لەجێگەی ئەوە لەسەر بنەمای بەرخودان و کرێگرتەیی دوو گرووپی دیار دێتە کایەوە. کرێگرتەکانی بەتایبەت لەسەر بنەمای لایەنگیری گریک و فارس وەکو دووگرووپی سەرەکی دەردەکەون. لەپاش ئورفا و میسر سێیەمین قۆناخی نەفی (دوورخستنەوە)، لەقۆناخی پادشایەتی بابل نەبوخزنەسر بە بەدرێژایی چل ساڵ بەردەوامدەبێت (٥٣٥-٤٩٥پ.ز). ئەو فەرمانە ئاشکرایانەی کە بە زەردەشتییەکان کاریگەربوون و لە کتێبی پیرۆزیشدا جێگە دەگرێت لەم قۆناخەدا گواستراونەتەوە. زۆر شەیدای فارسەکان بوون. چونکە کۆتاییان بەدوورخستنەوەی چل ساڵەیان هێنابوو. یەکەمین کۆپییە نووسراوەکانی تەوراتیش لەم قۆناخەدابوو. واتە لەپێش زایین بە ٧٠٠ ساڵ کۆکراوەتەوە. نزیکەی ٦٠٠ ساڵ (١٣٠٠-٧٠٠پ.ز) هیچ نوسخەیەکی نووسراوی کتێبێکی پیرۆز لەدەستدا نەبوو. کەواتە بەشەکانی هەر سێ کتێبە پیرۆزەکە، پشت بەگێڕانەوەی زارەکی ٦٠٠ساڵ دەبەستێت. ئیلیادە و تیۆلۆژییەکانی هۆمیرۆس و هیسیۆدۆسیش کە هی **"هەمان قۆناخە"** هەر بەنووسین کردنی ئەو گێڕانەوانەیە. ڕۆماییەکان لەدەوروبەری (٧٠پ.ز-٧٠ز.)دا دووجار پەرستگاکانی سولێمان دەڕووخێنن، ئەمەش ڕێگەی لەپێش بەرخودانێکی گەورەکردۆتەوە. کریستیانی نەریتی بەرخودانی چینی هەرە هەژارە. بەرخودانییەکانی چینی ژووریش ناوبانگی هەیە بۆ نموونە موقابییەکان.

کۆچ، واتە دەرکەوتنی هۆز یان قەوم بۆ دەرەوەی وڵات و پەرتەوازەبوونی لەدوای ساڵی ٧٠ز زیاتر چڕ بۆوە. هەروەکو لە کلتووری ئاشووری، ئەرمەنی و گریکدا ڕوویدا پەرتەوازەبوون لەهەردوو گۆڕەپانی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆما و ئێران لە دوو هەرێمدا چڕ دەبێتەوە. ئەم قۆناخە درێژە لە هەمان کاتدا قۆناخی نووسەرانیشی پێدەگووترێت. واتە بەردەوام تەورات کۆدەکرێتەوە و شرۆڤە دەکرێت. پێغەمبەریش دەردەکەوێت. بەڵام نووسەری گرنگییەکی زیاتر بەدەست دێنێت. کەواتە ئاستی بەرزی ڕۆشنفکری کلتووری یەهودییەت پشت بە نەریتێکی مێژوویی گرنگ دەبەستێت. پیشەیەکی دیکەی گرنگ پێویستە کاری پارە

و بازرگانی بێت. لەبەرئەوەی لەسەر زەویوزاری کشتوکاڵی بە ئاسانی گوزەرانیان نەدۆزیوەتەوە، بەهەموو توانایەکەوە لەسەر بازرگانی و ئامرازە بەکاریگەرەکەی (پارە) قووڵبوونەتەوە، ئەمەش لەنزیکەوە پەیوەندی بە پێگەکەیانەوە هەیە. لەبەرئەمەش دەتوانرێت بگوترێت شوێنی ئاشوورییەکانیان گرتەوە، ئیتر لە رۆژهەڵاتی ناویندا پاوانی پارە و بازرگانیان گرتە دەست. لە کاتێکدا ئەو پێگەیەیان لەشارەکانی چاخی ناوین، لەندەن و ئەمستردامی لانکی سەرمایەداری ئەوانی بەکاریگەر کردووەو بوون بە خاوەن دەسکەوت، لە هەمان کاتدا ئەمەش نیشانیدەدات بوونیان بە سەرمایەداری گەورە پشت بە نەریتێکی مێژوویی دووردرێژ دەبەستێت. شیمانە دەکرێت کەم لەدەوروبەری قودس بووبن، بەزۆری لە تاراوگە پەرتەوازە بوون. لە ئاکامی چیرۆکی پەرتەوازەبوونی ئەم قەومە وەک دوو تاراوگەی رۆژئاوا و رۆژهەڵات دوونەریتی کلتووری دەردەکەوێت.

ت ـ لەگەڵ بڵاوبوونەوەیان لە تاراوگە لە دۆخی یەک هۆز دەردەکەون، هەروەها بەگوێرەی ئەوەی سیستەمی هۆزایەتی تێپەڕ دەکەن و لەگرووپی کلتووریدا چڕبوونەتەوە، ئیتر ناولێنانی یەهودییەکان بە "قەوم" لە جێگای خۆیدا دەبێت. بەتایبەتیش دەبینرێت کە لەدەڤەرەکانی عەرەبستانی سعودیە، ئێران، کوردستان، میسر و هێلینستان چڕبوونەتەوە، لە ناوچەکەدا بوونەتە کلتووری خۆجێیی گرووپی یەهودی. دەبنە گەلێکی خاوەن دوو کلتوور: کلتووری بنەڕەتی عیبرانی و کلتووری ئەو کۆمەڵگایانەی کە تێیدا جێگیربوون. ئەم پێگەیەش کاریگەری زۆر گرنگ و ئەرێنی لەسەر توانای رۆشنبیریان دەکات. چونکە لەگەڵ تەواوی کلتوورە دێرینەکانی مێژوو لە پەیوەندیدان.

لەگەڵ دەرکەوتنی ئیسلامدا قۆناخێکی دیکەی تراژیدی دەستپێدەکات. دەبوایە عەرەبەکان لە رێگای ئیسلامەوە بەرەو شارستانی بازرگانی هەنگاوبنێن. بەڵام پاوانی بازرگانی و پارە بەزۆری لەدەستی بازرگان و سەرافە یەهودییەکانی ناوچەی عەرەبستانی سعودییەدا بوو. لەم سۆنگەیەوە لەسەر زمانی حەزرەتی محەمەد گێڕانەوەی فەرموودەی

"با یەهودییەکان لە عەرەبستانی سعودییەدا نەمێنن" گوماناویش بێت، پێویستە واتادار ببینرێت. دوژمنایەتی عەرەب ـ یەهودی بۆ قووڵایی مێژوو دەگەڕێتەوە. هەناردنی هاجەر و ئیسماعیلی کوڕی وەک دووکەسی نەخوازراو بۆ دەڤەری مەککە، پەیوەندی بە ناکۆکی نێوان هۆزەکانی ئەو سەردەمەی یەهودی و عەرەبەکانەوە هەبوو. لەو سەردەمەوە ناکۆکی لەنێوان بەرژەوەندی شێخ و بازرگانە عەرەبەکان و یەهودییەکاندا جێگای باسە، ئەمەش تا شەڕی عەرەب ـ ئیسرائیل، فەلەستین ـ ئیسرائیلی ڕۆژی ئەمڕۆمان هاتووە. ئەم ناکۆکییەی ریشەکەی بۆ ٣٥٠٠ ساڵ دەگەڕێتەوە، لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا تەواو گۆڕاوە بۆ پێکدادنی شارستانییەکان.

ئاساییە کە رکابەرایەتییەکی دژوار لەناوچەکەدا لەنێوان پاوانخوازیەکانی بازرگانیدا رووبدات، لەبەر ئەم هۆکارە زیاتر دەرکی پێدەکرێت کە بۆچی ئیسلامییەت گرنگی بە بازرگانی دەدات و ماهییەتی پەیوەندی نێوان خەدیجە و حەزرەتی محەمەدیش زیاتر روون دەبێتەوە. لەئەنجامدا یەهودییەکان یان خۆیان دەگونجێنن و ئاسیمیلەدەبن و وەکو نۆکەرە سوودبەخشەکانی عەرەبەکان (مهتدین) لەناوچەکە دەمێننەوە، یان بەدوورخراوەیی لەوناوچانە بڵاو دەبنەوە. هەردوو رەوشەکەش دێتە کایەوە. بەشێکی گرنگی ئەو کۆچە زیاتر چڕدەکەنەوە کە لەکاتی ئیمپراتۆرییەتی رۆما بەرەو ئەوروپا دەستی پێکردبوو جیادەبنەوە، ئەوانەش کە دەمێننەوە، بەشێوەی موهتەدی یان نیو ـ دیل بە باج (جزية)وە دەبەسترێنەوە و بەمجۆرە دەژین. لەچاخی ناوینی شارستانی ئیسلامدا، بەتایبەت لە دەڤەرەکانی ئێران و ئەندەلوس (ئیسپانیا) رۆڵی مێژووییان (واتە کاتبی، بازرگانی، سەرافی) زیاتر پێشدەخەن و بەناوبانگ دەبن. لەگەڵ زۆر لە هێزە سیاسییەکاندا دەرفەتی کار بەدەست دێنن. ناونیشانی گەلی رۆشنبیر و بازرگان ـ سەرافییان یەکلایی دەبێتەوە. لەبەرئەم هۆکارە دەبنە ئامانجی نەفرەتی گەورەی رۆشنبیر و بازرگانەکانی کۆمەڵگای ئەو ناوچانەی تێیدا دەژین. کەواتە ئەو دوژمنایەتییەی بە درێژایی مێژوو بەرامبەر یەهودییەکان جێگای باس بووە هۆکاری زۆرگرنگی ماددی، کلتووری و مێژوویی هەیە.

١ـ کاتێک پێ دەنێینە نێو سەرەتای چاخی نوێوە، لەبەرئەم هۆکارانە بەخێرایی شەپۆلی نەفرەت و فشار و دوورخستنەوە لەبەرامبەر یەهودییەکان زیاتر دەبێت. چونکە سەرمایەداری شارستانییەکە لە منداڵدانی پاوانی بازرگانی و پارەدا لە دایک بووە. هەرچی لەمەدا زەرەرمەند یان بەرژەوەندی هەبێت رۆشنبیر، بازرگان و سەڕافە یەهودییەکان وەک ئاستەنگ دەبینێت. یەهودییەکان رووبەڕووی پارادۆکسێکی مەترسیدارن. پاوانخوازی سەراف و نەتەوەکانی دیکە کە بەرژەوەندییەکانیان لەگەڵ پێشکەوتنی سەرمایەداریدایە، یەهودییەکان بە کۆسپ دادەنێن. کشتیار و پیشەکارانی نەتەوەی کۆنیش کەوا بەرژەوەندییەکانیان لەگەڵ پێشکەوتنی پاوانی سەرمایەداریدا ناکۆکە بەئاسانی دەتوانن یەهودییەکان بکەن بەمەترسییەکی شاراوە. رۆشنبیرانیش وەکو پێویستییەکی وابەستەییان بەسیستەمەوە هاوشێوەی قوتووی پاندۆرا[1] یەهوودییەکان وەکو سەرچاوەی هەموو خراپەکارییەک نیشان دەدەن، ئەمەش پێویستییەکی بەرژەوەندییەکانیانە. لەژێر باری ئەم فاکتەرانەدا هەروەک پێشتریش روویدابوو، دیسان سەدەکانی ١٥ـ١٦ بۆ یەهودییەکان بوو بە سەرەتای شارستانییەکی نوێ کە سەرلەنوێ دوورخستنەوە و پۆگرۆمکردن (پاکتاوکردنی یەهودییەکان)ی تێدا دژوار بوو.

لایەنی سەیری ئەم کارە ئەوەیە: هەروەکو چۆن هێزی رۆشنبیر، بازرگان - سەڕافی یەهودی لە ئاواکردنی ئەم شارستانییە نوێیەدا فاکتەری زۆر گرنگ بوون، لە هەمان کاتدا لەهەموو کەس زیاتر دەکەونە بەر غەزەبەکەی. ئەمەیە پارادۆکسەکە. لەساڵی ١٤٩٢دا لە ئیسپانیا تەنیا موسلمانەکان دەرنەکران، بەکۆمەڵ یەهودییەکانیشیان دەرکرد. ئەگەر هیچ نەبێت خۆ ئەوانن کە عیسایان لەخاچ داوە. بیانوو ئامادە و بەکاریگەریشە. بەڵام هۆکاری سەرەکی ئەوانەن کە ئاماژەمان پێکردن. لە پۆلەندا و لەسەردەمی روسیای قەیسەردا قۆناخی بەوشێوە جێگای

١ـ لە میتۆلۆژیادا دەگێڕنەوە کاتێک زیۆس لە پرۆمۆتۆس تورەبوو کە ئاگری لە ئاسمان بۆ مەرۆڤان دزیبوو، فەرمانی بە خوداوەند دا کە ژن بخولقێنێت و وەک دیاریەکی یۆنانی پێشکەشی پیاوی بکات،ناوی لەم ژنەنا پاندۆرا، زیۆس پێشکەشی براکەی پرۆماتۆسی دەکات، براکەی دەستەمۆی جوانیەکەی دەبێت. پرۆماتۆس یش سەندوقێکی سەیری پێشکەش براکەی کردبوو: پێی گوتبوو نابێت بیکەیتەوە؛بەڵام کە پانادۆرا سەندوقەکە دەکاتەوە و دەهەزار جۆری خراپەی لێ دێتە دەرەوە، تەنیا هیوا لەناو سەندوقەکەدا دەمێنێتەوە.

باس بووە. لەرەوشێکی بەمجۆرەدا هۆڵەندا و ئینگلتەرا لەسەرووی ئەو وڵاتانەوە دێن کە تازە خۆیان کۆکردۆتەوە. سەرجەم بازرگان، سەرِاف و رۆشنبیرە یەهودییە بەکاریگەرەکان شەپۆل شەپۆل روو لەو وڵاتانە دەکەن. بەشێکیان روو لە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی دەکەن کە لەگەڵ مۆنارشی ئەورووپادا لەنێو شەرِدایە، تەنیا بە پەسەندکردنیانەوە بۆ بینینی رۆڵێکی بەکاریگەر لە پاوانی بازرگانی و سەرِافی سوڵتانەکاندا ناوەستن، بەڵکو بانگیشیان دەکەن. ئیتر هێواش هێواش بەرەو کیشوەری ئەمریکا کۆچیان دەست پێکردووە. لە پاوانی رۆشنبیر، بازرگان و سەرِافەکانی شارە نوێکانی ئەڵمانیادا لەگەڵ تێپەرِبوونی رۆژدا پێگەکەیان بەهێز دەکەن. لەم وڵاتەدا نیشتەجێبوونێکی ریشەیی و دوو رەگی (تێکەڵ) جێگای باسە.

ئەگەر هەندێک لە رۆشنبیران سەرمایەداری بە یەهودیەتیشەوە ببەستنەوە، ئەوە بانگەشەیەکی زێدەرِۆییە. کاریگەریان هەیە. هەلومەرجی کۆمەڵگا نیشتەجێکان ریشەی دیارکەرن. بەڵام رۆڵی کەمینە وریاکەرەوەکانیش بچووک ناکرێتەوە. لەهۆڵەندا و ئینگلتەرادا چ لەبواری پێشکەوتنیانەوە وەک ناوەندێکی رۆشنبیری و چ دەرکەوتن وەکو هەژموونگەرایی سیستەمی نوێی سەرمایەداری، کاریگەری بانکدار، بازرگان و فەیلەسوفەکانی یەهودی بێ ئەندازە گرنگە. سپینۆزا گرنگترین سیمای دەستپێکردنی چاخی نوێیە لەبواری زهنیدا. یەکێکە لە یەهودییە عەلمانییە یەکەمینەکان. (عەلمانییەت زیاتر بۆ ئەو کەسانە بەکاردێنن کە لە دەرەوەی سیناگۆک (پەرستگای جولەکە)کانن یان دەرخراون). یەکێک لەبیرمەندە گەورەکانی ئازادیشە. فەلسەفەی "تێگەیشتن ئازادییە" لە زۆر شتدا قەرزداری ئەوە. ئەو قەرزانەی کە یەهودییە بانکدار و بازرگانەکان داویانە بە ئینگلتەرا و هۆڵەندا لەسەرکەوتنی شەرِەکان و بەهێزبوونی دەوڵەتەکانیاندا رۆڵێکی مەزن دەبینێت. لە کیشوەری ئەمریکا، بەتایبەتیش لە ئەمریکای باکوور لەشەرِی سەربەخۆیی هەرێم (ئەیالەت)ەکانی ئینگلتەرادا رۆڵ دەبینن. باش دەزانرێت یان پێویستە باش بزانرێت کە لەپێکهاتەی ئەمریکای رۆژگاری ئەمرِۆماندا لەسەرووی هەموویانەوە

هێزی بنەڕەتی بەکاریگەری ڕۆشنبیر، بازرگان و بانکدارە یەهودییەکان هەیە.

**٢ـ ئایدیۆلۆژیایی یەهودی:** با لەسەرەتاوە زۆر بەڕوونی ئەوە بڵێم کە هێشا ڕێبەرایەتی ئایدیۆلۆژی لەسەر ئاستی جیهاندا لەدەستی ڕۆشنبیرە یەهودییەکاندایە. ئەم ڕێبەرایەتییە ڕیشەیەکی مێژوویی قووڵی هەیە.

اـ لەسەرەتای دروستبوونی کلتووری یەهودیدا شوێن پێی دوو کلتووری گەورەی سۆمەری و میسری بەقووڵی هەیە. عەهدی کۆن (تەورات)، ڕەنگدانەوەی بەرجەستەی ئەم دوو کلتوورەیە لە زمان و ویژدانی هۆزی عیبرانیدا، ڕەنگدانەوەکەی زۆر ئاشکرایە. لەیەکەمین ڤێرسیۆنەکانی ئەم دوو کلتوورەیە: لەچیرۆکی ئادەم ـ حەواوە تا دەگاتە خولقاندنی دونیا بەحەوت ڕۆژ، لەدەستەواژەی (ئەڵلا)وە تا دەستەواژەی پێغەمبەرایەتی. نابێت لەبیری بکەین کە تۆفانی حەزرەتی نوحیش ئەفسانەیەکی سۆمەرییە. ئەفسانەکانی پێغەمبەر ئەیوب و ئیدریسیش بەوشێوەیە! بۆ یەکەمجار لەمیسر لەسەردەمی فیرعەون ئەخناتووندا خواستوویەتی دەستەواژەی ئایینی تاکخوادیی وەکو ڕیفۆرمێکی گەورە تاقی بکاتەوە. هەروەها ئورفا لە ناوەندە هەرە کۆنەکانی کلتووری نیولیتیکە. لەم سۆنگەوە مسۆگەر نابێت کاریگەری وەرچەرخانی ئایدیۆلۆژیای نیۆلیتیکیش پشتگوێ بخرێت. سەرچاوەیەکی دیکەی گرنگە. دوو گروپی گەورەی زمان و کلتووری لەپشتە: ئاریانەکان و سامییەکان. ناتوانرێت لە کلتووری هۆزی عیبرانیدا ڕۆڵی ئەم دوو سەرچاوە سەرەکییە لەبەرچاو نەگیرێت.

ب ـ لەیەکەمین قۆناخەکانی دووەرخستنەوەدا کاریگەری کلتوورەکانی بابل و زەردەشت (پارس ـ ماد) زەق و بەرچاوە. زۆر چیرۆک لەم کلتوورانەشەوە وەرگیراوە.

ج ـ کلتووری گریک ـ ڕۆما سێیەمین سەرچاوەی گەورەیە. بەتایبەتی لە پێشخستنی فەلسەفەی ئایینیدا کاریگەری قۆناخی گریک ـ ڕۆما دیارکەرە. واتا ئەو کلتوورەی لەچاخی ناویندا لە بە فەلسەفەکردنی ناوەڕۆکی ئایینی کریستیانی و ئیسلامی، لە بەئایینکردنی فەلسەفەدا، پشت

بە بنەماکانی قوتابخانە فەلسەفییەکانی سەردەمی هێلینییەکان، لەسەرووی هەمووشیانەوە ستۆگەراکان، ئەرەستۆ و ئەفلاتون دەبەستێت.

د- ئاشکرایە کە کریستیانی و ئیسلام، وەک دوو مەزهەبی ئایینی عیبرانی موسەوین کە، بەگوێرەی پێویستی کۆمەڵگاکانی گریک ـ رۆما و عەرەب گونجێنراون. ئاشکرایە لەهەمان سەرچاوەوە تێر دەکرێن. ناکۆکی ئەم دوو مەزهەبە لەگەڵ موسەویەتدا، سەرچاوەی خۆی لە خەسڵەتی قووڵی هۆزایەتی موسەوی وەردەگرێت. موسەوییەت لەسەرەتای خۆیدا وەک ئایینی هۆزی عیبرانی، لەسەرەتاکانی چاخی ناوینیشەوە (لەگەڵ کۆچکردندا) وەکو ئایینی میللی قەومی یەهودی شێوەی گرتووە. راستییەکەی، لەبەردەمماندا هاوشێوەبوونێکی ئاشکرا هەیە: هۆزی عیبرانی = ئایینی عیبرانی = قەومی عیبرانی یان یەهودی. هەر لەسەرەتاوە ئایدیۆلۆژیای یەهودی خاوەن گەوهەرێکی ئایینییە، ئەویش بەتەواوی خاوەن ناوەڕۆکێکی قەومی و هۆزایەتییە. هەرچی ئیسلام و کریستیانییە بەگوێرەی پێداویستی ماددی و مەعنەوی جڤاتی ئەو قەومانە ئاواکراوە کە پەیوەندی و ناکۆکی ریشەییان لەگەڵ یەهودیدا هەیە. لەم سۆنگەیەوە هەم زۆر پێی کاریگەربوون، هەم بەردەوام لەنێو پێکداداندابوون.

هـ- ئایدیۆلۆژیای یەهودی لە هەمان کاتدا ئایدیۆلۆژیایەکە کلتوورێکی ماددی قووڵ شێوەی پێداوە. بینیمان کە ئەم کلتوورە ماددییە شارستانییەتەکانیان چۆن پێناسەکردووە. لەم سۆنگەیەوە ئایدیۆلۆژیای یەهودی ئایدیۆلۆژیایەکی شارستانییە کە لەگۆڕەپانی پێکهاتنی تەواوی شارستانییەکانی رۆژهەڵاتی ناویندا لە سەردەمی سۆمەرییەکانەوە شێوەی گرتووە. پێشخستنی فۆرمێلێکی بەمجۆرە دەشێت فێرکارانە بێت: ناوەڕۆکی ئایدیۆلۆژیای یەهودی سەنتێزی هەموو شارستانییەکانی هەڵگرتووە. هێزەکەشی لەم ناوەڕۆکەوە وەرگرتووە. لەمەدا ئەو رۆڵەی پێغەمبەرو نووسەرە یەهودییەکان بەدرێژایی مێژوو گێڕاویانە دیاریکەرە. دیسان لەبەرئەم هۆکارە چەندە کۆمەڵگاکان لەگەڵ شارستانییەکانیان لەناو پەیوەندی و ناکۆکی دابن، بەهەمان رادە لەگەڵ یەهودییەکانیش

لەنێو پەیوەندی و ناکۆکیدان. ئەنجامێکی دیکەی بەدەست بخرێت ئەوەیە: یەهودییەت تەنیا ئایین و قەوم نییە، بەڵکو دەتوانرێت وەکو شارستانیەکی سەنتێزی شارستانییەکان (دەتوانرێت بگووترێت خستنە سەریەکیانە) پێناسەبکرێت. کاتێک رۆڵی ئایدیۆلۆژیای یەهودی لە بەهێزکردنی پێکهاتە رۆشنبیرییەکاندا لەبەرچاوبگیرێت، ئەوا باشتر تێدەگەین بۆچی هێشتا لەسەر ئاستی جیهاندا رۆڵی پێشەنگایەتی دەبینن.

و ـ ئایدیۆلۆژیای یەهودی لەگەڵ چاخی نوێدا پارچەبووە. بۆ دوو کەناڵی سەرەکی ئایین و عەلمانییەت پارچە بووە. سپینۆزا (١٦٣٢-١٦٧٧) سەرۆکی کەناڵی عەلمانییە. چەندین فەیلەسوفی دیکەی بەڕەگەز یەهودی بەردەوام کەناڵی عەلمانی تێردەکەن. هەروەها عەلمانییەت چەندە ئایینێکی نوێیە و چەندە لەدەرەوەی ئایینە بابەتێکە قسەوباس هەڵدەگرێت. پێش هەمووشتێک دەبێت ئاماژە بەوە بکەم کە داهێنانی فکری ئایینی یان دەرەوەی ئایین وەک کارێکی ئایدیۆلۆژی کۆمەلایەتی نابینم. ئەو جیاکارییەی کە پێویست بوو بکرایە ئەمە نەبوو. ئەمە سەرەڕای ئەوەی بەهای رۆشنگەری و فێرکاری زۆر سنووردارە، چەندە بڵێی تایبەتمەندی چەواشەکاری و گومرایی لەخۆوە دەگرێت. هەریەکە لە جۆرەکانی زانیاری میتۆلۆژی، فەلسەفی و جۆرەکانی زانیاری زانستی بەرامبەرێکی کۆمەلایەتی خۆی هەیە. مەگەر بەکارێکی سۆسیۆلۆژی رۆڵەکەیان، پەیوەندی و ناکۆکییەکانیان لەگەڵ بنەما کۆمەلایەتی و سیاسییەکان پێکەوە ئاشکرا ببێت.

ی ـ لە ئایدیۆلۆژیای رۆشنگەریدا کاریگەری یەهودییەکانی باڵی عەلمانی گەورەیە. ئەم ئایدیۆلۆژیایەی دەتوانین وەکو "زانستگەرایی" ناوی ببەین لەراستینەی فەلسەفیدا یەکسانە بە پۆزیتیڤیزم. ئەم رەوتە ئایدیۆلۆژییەی کە مۆری خۆی لە چاخی نوێ دابوو، لەسەرناوی زانستگەرایی یان پۆزیتیڤیزم بەتێپەڕبوونی کات بوو بە باوەڕی ئایینی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری. دەبێت بەگرنگییەوە ئاماژە بەوخاڵە بکەم کە پۆزیتیڤیزم بەجیاوازی کراسەکەی بەریەوە هەمان ئایینە کۆنەکەیە. باخود دیوی ئاوەژووی هەمان کراسە ئایینیەکەیە. یەکێتی زهنییەت

لەنێوان چەمکی یاسای زانستگەرایی و چەمکی یاسایی ئایینەکاندا هەیە. نە وەک مەزەندە دەکرێت ئایین چەمکێکی 'ئاخیرەت'ە، نەعەلمانییەت، سکۆلاری چەمکێکی 'دونیایی'یە. جیاوازییەکی دروستکراو جێی باسە. سەرجەم ئایینەکان بەمەسەلە دونیاییەکانەوە پەیوەندیدارن، گرێدراوی کۆمەڵگابوونن. ئەو چەمکانەی کە پێیان دەگووترێت دونیایین، نەک دونیا بەڵکو سەرەتا پەیوەندییان بە کۆمەڵگاوە هەیە. زاراوەکانی ئاخیرەت و دونیایی هەم ناکۆکییەکی جددی دادەپۆشێت، هەم خزمەت بە بەردەوامکردنی ململانێکان دەکات کە بە داپۆشراوی بەڕێوەدەچێت. ئایدیۆلۆژیای ڕۆشنگەرایی کاتێک وەکو زانستگەرایی و دیاردەگەرایی (پۆزیتیڤیزم) بەسیستەمبوون گەیشتن، بوون بە ئایدیۆلۆژیای فەرمی دەوڵەت ـ نەتەوەی نوێ. ئەمەش بە واتای گۆڕانێکی خێرا بۆ ئایدیۆلۆژیایی میللیگەرایی دێت.

**٣ـ میللیگەرایی یەهودی:** توێژی باوی بازرگانی و سەڕافی یەهودی لەسیستەمی سەرمایەداریدا وەکو چینی بۆرژوا سیفەتێکی مۆدێرنی بەرچاوتریان بەدەستهێناوە. بۆرژوازی وەکو چینێکی نوێی کۆمەڵایەتی، ئایدیۆلۆژیای فەرمی خۆی لە پۆزیتیڤیزمدا دەبینێتەوەو چەمکی دەوڵەتیش میللیگەرایی دێنێتە ئاراوە. هەم وەک داهێنەری نەتەوە، هەم ئایدیۆلۆژیا نوێکەی ئەو رەوشە زیاتر بەهێز دەکات. دوای ئەوەی هەموو ئەو فاکتەرانەی نەتەوە پێکدەهێنن دەکرێن بەنەتەوەیی، لە کەناڵی پاوانی دەوڵەتەوە خۆگەیاندنیان بە پاوانی دەسەڵاتی ئابووری زەحمەت نییە. ئەو پاوانخوازییەی کە لە ئەوروپا لە ناو هەر نەتەوەیەکدا بەخێرایی پێشدەکەوێت، تەنیا دەکرا لە ڕێگای میللیگەراییەوە دەرخواردی نەتەوە بدرێت. ڕووبەڕووی پێکهاتەیەکی هاوشێوەی ئەو سەرکەوتنەین کە ئایدیۆلۆژیای سۆمەرییەکان بەدەستی هێنا. نەتەوە وەکو یەکەی هەرە گەورە (خوداوەندی هەرە کۆن یان لەجێگەکەی دادەنیشێت) رادەگەیەنرێت. دەوڵەتی ناو ئەو نەتەوەیە ژیانی ماددی دەخاتە ژێر پاوانی خۆیەوە. دەبێتە هێزی هەرە گەورەی کۆمەڵگا. کە هەردووکیان یەک بگرن، وەکو دەوڵەت ـ نەتەوە، دەبێتە دۆخی نوێی دەوڵەتی خوداوەندی کۆن،

بۆئەوەی بکرێتە موڵکی کۆمەڵگاش پێویستیان بەمیتۆلۆژیا هەیە، لەچاخی سەرمایەداریدا بۆئەمە پێویستیان بەفەلسەفە و هەموو شێوەکانی ڤۆلکەر (بە ئاستێکی دەگەیەنێت کە خیتابی سۆزی سووک، قەبە و سادەکان بکات) هەیە. میللیگەرایی ئەم پێویستییە بێ کەموکورتی جێبەجێدەکات. کۆمەڵگا ئەوروپییەکان دوای لێکەڕینێکی چوارسەد ساڵەی ئایدیۆلۆژیانە وەک کۆمەڵگای نەتەوەیی بەم گوزارشتە فەرمییە دەگەن. نەتەوە کار لە میللیگەرایی دەکات، میللیگەراییش کار لە نەتەوە دەکات، هەردووکیان کار لە دەوڵەت دەکەن، دەوڵەتیش پاوانی ئابووری تێردەکات و بەمجۆرە جیهانی نوێ مسۆگەر دەبێت. هەڵبەتە لەناو زەمەنێکی کاتی تایبەت بەخۆیدا. کاتێک لەهەموو شوێنێک چاخی جیابوونەوەی سەرسوڕهێنەرانەی نەتەوە و میللیگەراییەکی ئاگرین بەمشێوەیە پێش دەکەوێت، هەڵبەتە ئایدیۆلۆژیایی یەهودیش هەم کاریگەرییەکی چڕی دەبێت، هەم پێی کاریگەر دەبێت.

لەم سۆنگەیەوە هەر لە سەرەتاوە پەیوەندی بابەتیانەی ئایدیۆلۆژیای یەهودی بە قەوم و هۆز، قەومگەرایی و هۆزایەتییەوە مەسەلەیەکە بە ئاسانی دەرکی پێدەکرێت. ئەگەر لە رووی میللیگەرایی قەوم و قەبیلەوە تەماشای بکەین ئەوا ئایدیۆلۆژیای یەهودی خاوەنی خەسڵەتێکی سروشتی و بنچینەیی کۆنترین میللیگەراییە. یەکێکە لەو ئایدیۆلۆژیانەی لە قۆناخی بورژوازیدا بە ئاسانترین شێوە بەوەرچەرخاندا تێپەڕیوە. دیسان رووبەڕووی پارادۆکسێکن. هەم باوکێتی بۆ ئایدیۆلۆژیایی میللیگەرایی دەکەیت، هەم نەوە نوێیەکانت تۆ رەتدەکەنەوە. هەروەکو لە گۆڕەپانی ماددیدا، لە گۆڕەپانی مەعنەوی ـ ئایدیۆلۆژیشدا ئەم پارادۆکسە پێشدەکەوێت. تەواوی میللیگەراییەکان ددانیان لە باوکیان تیژکرد (هۆکاری ناچاری ماددی، هەڵبەت سەبارەت بە سەرمایەداری ناچارییە). ئیتر میللیگەرایی هەر نەتەوەیەکی ئەوروپا یەهودییەکانیان بە بەرپرسیاری کێشە و ئاستەنگییەکانی پێش خۆیان دەدیت (وەکو ئایدیۆلۆژی، کلتووری ماددی و نەتەوە ـ قەوم). ئەمەش هاوشێوەی رەوشی کریستیانی و ئیسلامییەتە. سەرباری ئەوەی ریشەکەیان موسەوییە، بەڵام یەهودییەت

وەکو ئاستەنگی هەرە بنچینەیی دەبینن. لێرەدا خەسڵەتێکی شاراوەی بناخەی شارستانی ڕۆڵ دەگێڕێت و تێزەکەی منیش پشتڕاست دەکاتەوە. ئەویش ئەوەیە کە وەکو کاکڵی شارستانییەت، دەوڵەت پاوانخوازییەکی ئابوورییە. هەروەها لە هەر شوێنێکدا ئاواکردنی دەوڵەتی نوێ جێگای باس بێت پێکدادان و شەڕ لەنێوان پاوانخوازە کۆن و نوێکاندا مسۆگەر دەبێت. تا یەکێکیان لەناو دەچێت و تەسلیم دەبێت یاخود بە ئاستێکی زۆر بێ نرخ دەگات ناچارە ئەم شەڕە بەردەوام بێت.

چۆن ٣٥٠٠ ساڵ پێش ئێستا بۆ هۆزە یەهودییەکان مەسەلەی "**خاکی پەیمان پێدراو**" جێگای باس بوو، لەچاخی نەتەوەو میللیگەرایی ئەورووپاشدا ئەم پێویستییە بەتوندی هەستی پێدەکرێت. نەتەوەیەکی یەهودی نوێ، بەواتای خاکێکی نوێ دێت. بەگوێرەی ئەوەی ئەورووپا هەمیشە لەدژی بووە، بەپشت بەستن بە "**خاکی پەیمان پێدراو**"ی کۆن ڕەوتێک مسۆگەر دەبێت. ئەو میللیگەراییە بۆرژواییەی یەهودی کە بەزایۆنیزم ناودەبرێت بەمشێوەیە لەدایک دەبێت: دەبێتە نموونەیەکی بەکاریگەری سەدەی نۆزدە کە چاخی میللیگەراییەکانە.

چیرۆکەکە لەمەودوا دەچێتە ناو مێژووەوە. دەبێت زۆر بەکورتی ئاماژەی پێبکرێت، پێویستی بەهەردوو دەوڵەتی بەهێزی ئەم قۆناخە هەیە: ئەڵمانیا و ئینگلتەرا، فەرەنساش کەوتۆتە پلەی سێیەمینەوە. میللیگەرایی یەهودی لە هەردوو قۆڵیشەوە زۆر کاردەکات. دەزانرێت چۆن دەوڵەتەکانی ئینگلتەرا و هۆڵەندایان بەهێز کرد. سەرمایەداری یەهودی لە ئەڵمانیاشدا ڕۆڵێکی بەوشێوەیە دەبینێت و دەست بەکارە. ڕۆشنبیرە یەهودییەکانیش لە ئاواکردنی سەرمایە ڕۆشنبیرییەکەیاندا (ئایدیۆلۆژیای ئەڵمانیا) خاوەن ڕۆڵ و کۆمەکێکی زۆرن. ئیمپراتۆری ئەڵمانیا لەپای ئەم هاوکارییە دوو جار دەچێتە قودس و تەنانەت دۆستایەتی خۆی بۆ بزووتنەوەی نیشتمانی نوێ دیاردەکات. ئەگەر لەشەڕی یەکەمی جیهانیدا سەرکەوتوو بوونایە، لەسایەی پاراستنی ئەڵمان و عوسمانیدا (باڵی هەرەبەهێزی ئیتحاد و تەرەقی لایەنگرانی ئەڵمانیا بوون، گرێدانی بە یەهودی و سەرمایەدارەکانی سیلانیکەوە هەبوون) ئەوا یەهودی زووتر

و لەسەر بنەمایەکی بەهێزتر بۆ فەلەستین یان خاکە کۆنەکان دەگەڕانەوە. هەروەها لە باڵی لەندەنیشدا قورساییەکی باویان هەیە.

بامێژووی سیاسی لەلایەک دابنێین کە بابەتێکی بەرفراوانە. لەدۆڕانی ئەڵمانیادا مسۆگەر هیتلەر یەهودییەکان بەرپرسیار دەبینێ. زۆرباش دەبینێت کە: "**باڵابوونی لەندەن، لە ئایدیۆلۆژیا و میللیگەرایی یەهودی دابڕاو نییە. ئەڵمانیا تووشی خیانەتێکی گەورە هاتووە، بەرپرسیار یەهودییەکانن**". لەهەر نەتەوەیەکدا کە کێشەی بەوشێوەیەی هەیە دژە ـ یەهودییەت (لەفەرەنسادا ڕووداوی دریفوس) بەمجۆرە پێشدەکەوێت. بە بەڵگەوە دەتوانرێت بسەلمێنرێت مەسەلەکە بەمجۆرە نییە. بەڵام بۆچی تائێستا لەسەر ئاستی جیهاندا ئەم بانگەشانە هەر دەکرێت؟ بۆ نموونە هەرە دوایی لەلایەن ئەحمەدی نەژادی سەرۆک کۆماری ئێرانەوە؟ ئەمە پەیوەندی بە ڕۆڵی ئایدیۆلۆژیا و میللیگەرایی یەهودی لەجیهاندا هەیە. هێشتا ئایدیۆلۆژیایەکی پێشەنگە. هەروەک چۆن لەبواری پاوانەکانی سەرمایەشدا بەمجۆرەن.

هەرگیز نابێت پاراستنی ڕێبازی هیتلەر بکرێت. کۆمەڵکوژی گەورەترین تاوانی دژی مرۆڤایەتییە. ئەمانە ڕاستییەکی مرۆیی و کۆمەڵایەتین و تەنانەت گفتوگۆش هەڵناگرن. ناتوانرێت پێگەی ڕۆشنبیرە یەهودییەکان لە تێکۆشانی ڕەسەنی کۆمەڵگای دیموکراتی، ئازاد و یەکسانی مرۆڤایەتی بچووک بکرێتەوە. پێغەمبەرەکان لەولاوە دابنێین، تەنیا لە چاخی نوێدا لە سپینۆزاوە دەستپێبکات، تا دەگاتە مارکس، فرۆید، ڕۆزا لۆکسەمبۆرگ، ترۆتسکی[١]، ئەدۆرنۆ، حەناە ئارێندت[٢] و ئەنشتاین

١ـ ترۆتسکی: یەکێکە لە دامەزرێنەرانی یەکێتی سۆڤێت لەنێوان ساڵانی (١٨٧٩ـ١٩٤٠)ژیاوە، کوڕی پیاوێکی جوتیاری یەهودییە، ناوی ڕاستەقینەی "داڤیۆڤیچ برۆنستێن"ە: بەڵام لە ساڵی ١٨٩٨دا بەهۆی پەیوەندی بە بزاڤە شۆڕشگێڕەکانەوە دوور دەخرێتەوە بۆ سیبریا و دواتر لە ١٩٠٢دا بە پاساپۆرتێکی ساختە و بە ناوی ترۆتسکیەوە ڕادەکات بۆ سوێد و لەوەوە بە ترۆتسکی دەناسرێت. بەچاوی خەلیفەی لینین تەماشاکراوە، بەڵام لەگەڵ نەخۆشکەوتنی لینین و مردنیدا وردە وردە لە مەکتەبی سیاسی پارتی کۆمۆنیست و ئەندامێتی پارتەکە بەلایەنگرەکانیشیەوە دەردەکرێت و لە ڕوسیاش دوور دەخرێتەوە، دوای گەڕان و دوورخستنەوەیەکی زۆری تر لە وڵاتانی تریشدا لەمەکسیک نیشتەجێ دەبێت و دواجار لە ١٩٤٠دا لەلایەن سیخوڕێکی ئیسپانی پارتی کۆمۆنیستەوە بەچەقۆ دەکوژرێت.

٢ـ بیرمەندێکی ئەڵمانی بەڕەسەن یەهودی بواری زانستی سیاسییە. لەنێوان ساڵانی (١٩٠٦ـ١٩٥٧)دا ژیاوە. زۆر کەس بە فەیلەسوفیش ناویان بردووە، بەڵام خۆی لەبەرئەوەی چوارچێوەی کارەکانی تەنها تاکی مرۆڤ نا، بەڵکو تەواوی مرۆڤایەتی جیهانی پەیوەندیدار کردووە، سیفەتی فەیلەسوفی ڕەتکردۆتەوە و خۆی بەبیرمەندی زانستی سیاسی ناسیوە. کارەکانی لەسەر دەسەڵات، تۆبژەکانی سیاسەت، دەسترۆیی و تۆتالیتاریزمن. زۆربەی کارەکانی لەسەر هاوواتایی چالاکی

رەوشی ژمارەیەکی زۆری رۆشنبیر و شۆڕشگێڕان دیارە. ئاگاداری ئەوەشم کە لایەنی دیموکراتی و سۆسیالیستی رۆشنبیرە یەهودییەکان زۆر بەهێزە. داوەریەکەی ئەدۆرنۆ دووبارە ناکەینەوە. بەلام کەی رۆڵی بابەتیانەی یەهودییەت لەجینۆساید (هەم لەڕووی کلتووری ماددی، هەم مەعنەوییەوە) بەرەخنە ـ رەخنەدانێکی پێویستدا تێپەڕدەکرێت کە بکاتە ئەنجامێکی سیاسی و شیکاری و پراکتیزەی بکات؟ وەک هێزێکی ئایدیۆلۆژی و هەم بە هۆی پێگەی پێشەنگایەتییان تا بەشێوەیەکی راست شیکار نەکرێت، نە بەشێوەیەکی شایستە یادەوەری جینۆسایدکردنەکەیان دەنرخێنرێت، نەدەتوانرێت پێش لە جینۆسایدو کۆمەڵکوژییەکی نوێ بگیرێت. میللیگەرایی یەهودی میللیگەرایی نەتەوەیەکی بچووک نییە، میللیگەرایی جیهانە. باوکی گشت میللیگەرایی و دەوڵەت ـ نەتەوەکانە. چەندە بەئێشە، کە گەورەترین قوربانی بێ هاوتای ئەمەش لە مێژوودا، یەهودییەکان خۆیان بوون.

وەکو کێشە یەهودییەت گفتوگۆی زۆری لەبارەوەکراوە. بەتایبەتیش لەلایەن رۆشنبیری یەهودی لەپێشی وەک مارکس و فرۆیدەوە، بەلام ئەو پرسیارە بێ وەلام دەمێنێتەوە: چۆن هێنرایە ئاستی جینۆساید؟ بەگوێرەی ئەوەی وابەستەبوون بە یادی جینۆسایدکردنەکەیانەوە تەنیا بە رێگریکردن لە دووبارەبوونەوەی کۆمەڵکوژی دیکە دەبێت، بەلام ئەمە چۆن پێکبێت؟

ئەو ئەنجامانەی لە بەرگرینامەکەمدا لەسەر بنەمای نموونەی یەهودی پێی گەیشتم دەتوانم بەمجۆرە فۆرمیلەی بکەم:

هۆزی یەهودی لاسایی شارستانی سۆمەر و میسری کردەوە. لە ئەنجامدا دوورخرانەوە. هۆزە بچووکە لاسارەکە (وەکو بلێی پێشەنگایەتی داخوازی گشت هۆزەکان دەکات) بەهۆی ئیرەییەکەیەوە ئایدیۆلۆژیای قەبیلەکەی خۆی (ئایینەکەی)ئاواکرد. پادشایەتی قودسی دامەزراند. دواتر رووخا. ئەمجارە لاسارییەکی زیاتری کرد. لەدونیادا بلاوبوویەوە. سەرەتا

هەرەوەزانەی سیاسی نێوان یەکسانەکان لەگەڵ زاراوەی سیاسیدا چڕبۆتەوە. دژ بەو دەستنیشانکردنە بووە کە پێی وایە "شوێنێک سیاسەتی لێنیبێت، ئازادی جێی نابێتەوە" و داکۆکی لەسەر ئەوەکردووە کە زاراوەیەکە پشت بە جەماوەری و یەککرتووی دەبەخشێت. هەروەها لێکۆڵینەوەی لەسەر پەیوەندی نێوان نازیزم و کۆمۆنیزم و پەیوەندی هەردووکیان بە ئاستی سیمیزمەوە کردووە. گرنگترین بەرهەمەکانی "رەوشی مرۆڤایەتی" و "ریشەکانی تۆتالیتاریزم".

بۆ قەبیلەکەیان دواتر بۆ قەومەکەیان بەدوای شوێندا گەڕان. شوێنیان پێنەدان. دووبارە دوورخرانەوە. تەنیا بۆئەوەی تێکنەشکێن تا ئاستی ئەتۆم داکەوتن، تا ئاسمان رۆشتن. ئەمجارەیان بە دەوڵەت ـ نەتەوە بچووکەکەیان هۆزەکە رۆڵی رێبەرایەتی شارستانی دەبینێت. لەوانەیە بتوانێت گشت دەوڵەت و شارستانی رۆژهەلاتی ناوین تەنانەت جیهانیش بڕوخێنێت کە مامانێتی بۆ کردووە. بەلام ئەو کاتە خۆشی نامێنێت. چونکە شارستانی بچووکی یەهودی، گەوهەری شارستانی دونیایە. شارستانی دونیا نەبێت، شارستانی یەهودی نابێت، شارستانی یەهودی نەبێت شارستانی دونیا نابێت. ئەمە گەورەترین وانەی کۆمەڵکوژی یەهودییە.

لەبەرئەوەی جێگای گرنگی پێدانە هەمیشە بیری لێدەکەمەوە. وەکو تێکڕای هاوشێوەکانی لەمێژە پێشەنگەکان گوتوویانە: **"ئاگر بەئاگر ناکوژێنرێتەوە"**. بەوەرگرتن و داگیرساندنی ئاگری شارستانی بچووک (دەوڵەت ـ نەتەوە، بەگشتی پاوانخوازیەکان) لە ئاگری شارستانییەوە لێی رزگار نابین. رێبەری سەرجەم هۆز، هەژارەکانی قەوم، ستەملێکراوو کۆیلەکانە کە بەدرێژایی مێژوو لەبەرامبەر هێزە شارستانییەکان شەڕیان کردووە، یان کوژراون یان سەرکەوتوون. یادەوەری کوژراوەکان لەبیرناچێتەوە. بەلام یەکەم کاری سەرکەوتووەکانیش، ئەوەبووە کە خۆیان کردووە بە شارستانی چونکە جۆرێکی دیکەیان نەزانیوە. تەنانەت رێبەرەکانی سۆسیالیزمی زانستیش کە سەرکەوتن لە بوونە نموونەی قەفەسی ئاسنینی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری خۆیان پێ رزگار نەکرا. قوربانیانی کۆمەڵکوژییەکە هیچ کاتێک بیریان لێ نەکردبۆوە کە شتێکی وەهایان بەسەردا بێت، بەلام روویدا.

بێگومان لەم خاڵەدا دڵم زۆر زیاتر لەو کەسانەی خۆیان بە دژە ـ جینۆساید دادەنێن، لەقوربانیانی جینۆساید تێدەگات. بۆچی بە ئەندازەی ئەوەی من تێدەگەم، هیچ یەهودییەک تێنەگەیشتووە؟ چونکە هەمان سیستەم منیشی خستبووە ناو ئەم چەرخەوە. هەڵبەتە دیسان هێزی یەهودی بوو سیستەمەکەی هەڵدەسوڕاند. ئەگەر شەڕی دەسەلاتی ئەم ئایدیۆلۆژییانە، هێزی ئاواکردنی شارستانی نەبوایە و کریستیانی نەبوایە

بە کرستیانی ئایا هیتلەر پەیدا دەبوو؟ ئەو میللیگەراییەی ئەڵمان کە هیتلەری خوڵقاند هەروەک چۆن ریشەکانی لە ئایدیۆلۆژیای ئەڵمانی و لە ئایدیۆلۆژیای رۆشنگەری (پۆزێتیڤیزم و بایۆلۆژیزم)ییەوە دێت لەگەڵ رۆڵی ئایدیۆلۆژیای یەهودی لە رۆشنگەریدا و میللیگەرایی یەهودیدا (ریشەی هاوبەشی رۆشنگەرایی) لەنێو پەیوەندییەکی دیالیکتیکیدایە. واتە چۆن قەبیلە و قەومگەرایی یەهودی، ریشەی میللیگەرایی یەهودی پێکدێنێت، قەبیلەگەرایی و قەومگەرایی ئەڵمانیش، ریشەی میللیگەرایی ئەڵمان پێکدێنێت. لەناو یەکتردا پێشکەوتنیان لە ئەڵمانیا، بەهۆی پاوانخوازی ئابووری و سیاسییەوە، پەیوەندی بەگرفت لەنێوانیاندا هاتۆتە کایەوە. هەموو ئەو پێشکەوتنە مێژوویی ـ کۆمەڵایەتیانە بەشێوەیەکی ئاشکرا پەیوەندی نێوان هەردوو میللیگەراییەکە پیشاندەدات. تا هەردوو میللیگەراییەکە تێپەڕنەکرێت، بەشێوەیەکی واتادار یادی کۆمەڵکوژی ناکرێتەوە و لە جۆرەکانی رزگار نابین.

دەتوانرێت بەراوردێکی هاوشێوە لەنێوان ئایدیۆلۆژیاو مللیگەرایی عەرەب لەگەڵ ئایدیۆلۆژیاو میللیگەرایی یەهودی بکرێت. ئەنجامی دیالیکتیکی سەرنجڕاکێشیشی دەبێت. ئەو "یەهودی" نەبوایە، ئیسلام نەدەبوو. ئیسلامیش نەبوایە ئایاحەزرەتی محەمەد دەبوو؟ ئەو (یەهودی) نەبوایە، بەعس نەدەبوو، بەعس نەبوایە سەددام نەدەبوو؟ لەوانەیە بڵێن تۆتۆلۆژی دەکەیت. بەڵام تەواوی گوتەکانم لە بێژنگی راڤەکانم سەبارەت بەشارستانی دراون. وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا هێزی جیهانە. هەژموونگەرایە. تەنانەت دەتوانێت ببێتە ئیمپراتۆرییەت. ئێستا لە رۆژهەڵاتی ناویندا لەپێناو ئیسرائیل شەڕ دەکات. بەڵکو سبەینێ لەگەڵ ئێرانیشدا شەڕبکات. بۆچی دیسان مەترسی کۆمەڵکوژی هەیە؟ ئەمجارەیان بۆمبای ئەتۆمیش بەکاردێت. شەڕی ناوکی بەشەڕی ناوکی بەربەست دەکرێت! ئەمە مەترسییەکە لەبەر دەرگایە کەس ناتوانێت نکۆڵی لێبکات. خۆی لەخۆیدا هیرۆشیمایەکی تر بەسە! راڤەکردنەکەی من راستە. کاتێک شارستانی ئاواکرا دەیانگووت لەژێرسایەو پاراستنی خوداوەندەکانی ئاسماندایە. کاتێکیش دەڕووخێت پەنا بۆ ئەتۆم دەبات.

هەزار جار هێندەی راستییەکەی ساختەکەی هەڵدەبژێردرێت. باسی پادشای رووت و خوداوەندە بێ دەمامکەکان دەکەم کەلەسەر رووی زەوی دەڕۆن، باسی بروسکەی ئەتۆمەکانیان دەکەم.

من لەو کەسانەم کە خوازیارن وەکو مرۆڤی زۆر زانا یەهودییەکان لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا خاوەن شوێن بن. بۆ دیموکراتیزەکردنی کلتووری رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئیسرائیل ـ فەلەستینێکی کۆنفیدرالیزمی دیموکرات، لەرێی ئەو 'لیڤی ئەتهان'ەوە بەدی نایەت کە وەکو دێوێکی جیهانگیری لێهاتووە. ئەم جانەوەرەی کە خودی یەهودییەکان باوکی ناوەکەین، سەرچاوەی راستینەی جینۆسایدە.

چارەسەری لە شارستانێتی دیموکراتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دایە. وەک چۆن رۆژهەڵاتی ناوین بەبێ یەهودی وێرانەیە، یەهودییەکانیش بەبێ رۆژهەڵاتی ناوین هەمیشە چارەنووسیان دوورخستنەوە (نەفی) و کۆمەڵکوژییە. مێژوو بەپێی پێویست پڕە لەوانە. رۆشنبیرە یەهودییەکان هەردەچێت باش هەست بە کێشەکانیان دەکەن: واتە هەست دەکەن کە بوونە بەکێشەی جیهان. پێویستە لەڕۆژهەڵاتی ناویندا لە شوێنی چارەسەری بگەڕێت. رۆژهەڵاتی ناوینی دیموکراتی خەیاڵێک نییە، بەڵکو نابێت لەبیربکرێت کە هێندەی نان و ئاو پێویستییەکی رۆژانەیە. پێویستە یەهودییەکان بزانن یادکردنەوەی کۆمەڵکوژییەکەیان و بەشێوەیەکی ئەبەدی بەربەستکردنی کۆمەڵکوژییەکی نوێ، رێگاکەی بەشارستانێتی دیموکراتی رۆژهەڵاتی ناویندا تێپەڕدەبێت: پێویستە سەرجەم گەلانی رۆژهەڵاتی ناوینیش بزانن بەبێ یەهودییەکان رۆژهەڵاتی ناوین دیموکراتی نابێت و تەنیا رێککەوتنێکی دیموکراتی رێگای چارەسەرییە، لەم چوارچێوەیەشدا ئەرکی ئاواکردنی کۆمەڵگای دیموکراتی جێبەجێ بکەن و لێیەوە بئاڵێن.

### هـ ـ دەسەڵات لە مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا

زاراوەکانی شارستانی، دەسەڵات و دەوڵەت لەناو خۆیاندا بێت یاخود لەچوارچێوەی بەناویەکداچوونی یەکتردا، پۆلێنی ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیانە پێکدێنن کە شیکارکردنیان زەحمەتە. شارستانی مەسەلەیەکە تا ئێستا گفتوگۆ لەبارەی بابەتی پێناسەکردنییەوە بەردەوامە. دەسەڵات لە کوێ دەستی پێکرد، لەکوێ کۆتایی پێهات، کەی و چۆن پێکهات و کۆتایی پێدێت، پێناسەیەکی ئاڵۆزترە. سەرباری ئەوەی لە ئاوی خواردنەوەو هەناسەدان زیاتر رۆژانە ناوی دەهێنرێت، بەڵام لەسەرووی ئەو بابەتانەوە دێت کە لەبارەی پێناسەکردنییەوە هەرەکەم بە بۆچوونی هاوبەش گەیشتوون. تەنیا لەبەرئەوەی بابەتی پڕ لە نهێنی و ئاڵۆزن بەمجۆرە نییە، بەڵکو لەبەرئەوەی خۆیان خوازیارن بۆیە بەمجۆرەیە، بەم ئامانجەش خەباتێکی ئایدیۆلۆژی فراوان بەڕێوە دەبەن. بۆ ئەوەی ترس لە شتێک هەبێت، یەکەمین مەرج ئەوەیە لەناو نهێنی و ئاڵۆزیدا بمێنێتەوە. ئەگەر رووی راستەقینەیان ئاشکرا بێت، دەبنە گاڵتەجاڕی هەمووکەسێک، ئیتر نابێت بە فاکتەری ترساندن. بەمجۆرە هیوای گروپە بەرژەوەندی پەرستەکانیش مایەپووچ دەبێت کە پەردەپۆشکرابوون. سەبارەت بەم بابەتە چەندین چیرۆک لەناو گەلدا دەگێڕدرێتەوە.

سەرەتا شارستانی بەچیرۆکە میتۆلۆژییە (ئەفسانە)کانی خۆیەوە دەست پێدەکات. لە رێگای ئەم چیرۆکانەوە نەبێت، دەسەڵاتەکانی داهات یاخود پاوانەکانی زێدە ـ بەرهەم لەمیانەی زۆرداربییەوە تەنیا چەند جارێک دەتوانن تالانکاری بکەن. بۆ ئەوەی هەمیشەیی بێت و پەسەند بکرێن، مسۆگەر پێویستییان بە میتۆلۆژیا، ئایین و حقوق هەیە. هەرچی لە رۆژگاری ئەمڕۆماندایە شانبەشانی تەواوی ئەم فاکتەرانە هونەر، سێکس و سپۆر فووی تێدەکرێت، دنەدەدرێت، لە رێگای میدیاکانەوە

پێشکەش دەکرێت، لەبواری زهن و سۆزەوە کۆمەڵگاکان ئاراستە دەکەن، بەمجۆرە هەوڵی هەمیشەییکردنی دەدەن و خوازیارن پەسەندکردنەکەی مسۆگەر بکەن.

لەسەرەتادا مێژووی شارستانیم بۆ سێ قۆناخی سەرەکی دابەشکرد و هەوڵمدا لە ڕێگای گەلاڵەنامەیەکەوە ناوەڕۆکی هەریەکەیان بخەمەڕوو. بەتایبەت ئاماژەم بەم خاڵە کرد کە متمانەیەکی ئەوتۆم بە پەیڕەوەکانی زانستپەرستی نییە، لەوانەیە بەشێوەیەکی سنووردار سوودی هەبێت، بەلام کە دۆگماتیک کرا هەڕەشە لە شانسی ژیانی ئازاد دەکات.. گرنگیم بە پراکتیزەکردنی پەیڕەوی شرۆڤەی کۆمەڵناسی دا بەبێ ئەوەی (لە ڕێگای زانستپەرستی و پۆزێتیڤیزم) بیکەم بە دۆگما. شرۆڤەکانم بەهێڵە گشتی و نموونە زۆرەکانییەوە بەشێوەیەک پێشکەشکراوە کە بۆ هەموو جۆرە گفتوگۆیەک کراوەیە. سەربارى ئەوەی زۆرجار کەوتوومەتە ناو دووبارەکردنەوەوە، جگە لەو شوێنانەی زۆر پێویستە، هەوڵدەدەم خۆم لەم خووەش دووربگرم.

شانبەشانی ئەوەی هەولمدا مۆدێرنیتەی (لەگەڵ شارستانی و مەدەنییەت هەمان واتایان هەیە) سەرمایەداری وەک مۆدێرنیتەیەک شیکار بکەم کە فەرمییەو سەرکەوتنی بەدەست هێناوە، بۆئەوەی تەواوی سەردەمەکەمان بەمولکی سەرمایەداری لەقەڵەم نەدرێت ، سەبارەت بە بابەتی دژە ـ مۆدێرنیتەیی ڕەخنەی بەرفراوانم پێشخست. لەگەڵ ئەوەی پێناسەکەی کۆمەڵناس ئەنتۆنی گیدنس لەبارەی هاوچەرخییەوە لەجێگای خۆیدا دەبینم، ئاماژەم بەو خاڵەش کرد کە سەبارەت بە شرۆڤەکانی دەرهەق بە "سێ نابەردەوامەکە"تەواو هاوفکرنیم لەگەڵیدا. هەرسێ نابەردەوامەکە: سەرمایەداری، دەوڵەت ـ نەتەوە و پیشەسازیبوون. لە ڕێگای نموونەو شرۆڤە بەرفراوانەکانەوە خستمەڕوو کە هەرسێکیان بەهۆی سەرچاوەکەیانەوە لە سەرەتای شارستانییەوە لەناو گەشەدابوون، لە ڕێگای مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییشەوە بە بەهێزترین دۆخی خۆیان گەیشتوون. ئەوەی لەم بەشەدا زیاتر هەوڵی ئەنجامدانی دەدەم، سەبارەت بەچۆنییەتی بەرجەستەبوونی شێوەگرتنی پەیوەندی مۆدێرنیتەی فەرمی

(ئەو مۆدێرنیتەی فەرمی نییە، بەمۆدێرنیتەی دیموکراتی، شارستانێتی یاخود هاوچەرخی ناویدەبەم. هەموویان هەمان واتایان هەیە) بە دەسەلات و دەوڵەتەوە دەبێت.

١ـ کۆمەڵناسە پۆزیتیڤیستەکان (ئەنتۆنی گیدنس و هاوشێوەکانی) لە هەر قۆناخێکی مێژووی شارستانیدا خۆیان بێ هاوتا دەبینن و لەو بڕوایەدان کە بەشێوازی تاکانەیی نموونەی توێژینەوە خەباتی کۆمەڵناسییان کردووە. بۆ نموونە بۆئەوەی شارستانی و دەوڵەتی ئینگلیز وەک نموونەیەکی بێ هاوتای مێژوو پێناسەو شیکار بکەن، لە ئەنجامدانی هەزاران توێژینەوەی شەخسی تایبەت بەخۆیان دوو دڵی ناکەن. لم لە دەریاکان، توێژینەوەش لای ئەوان زۆرە! لە راستیدا ئەو خەباتەی بە زانست ناو دەبرێت، شێواندنێکە زۆر زراڤانە ئەنجامدەدرێت. ئەگەر لێکچوونێک بکەین، هەروەکو ئەوەیە بەهۆی دارەکانەوە رەوشێکی وەها دروستبکرێت کە دارستان نەبینرێت. دارستان بەوە پێناسە ناکرێت کە ملیۆنان درەخت بکرێتە بابەتی توێژینەوە. هەر لە سەرەتاوە دیارە ئەم پەیڕەوە ئەنجامی راستی لێناکەوێتەوە. بەڵام لەژێر ناوی پەیڕەوکردنی ئەم جۆرە کۆمەڵناسییەدا بەکارهێنانی دەیان هەزار لاو بۆ ئەوەی ناوەڕۆکی راستەقینەی سیستەم نەبینن، سیاسەتێکی زۆر وریاو فێڵبازانەیە. بەمجۆرە زانستە کۆمەلایەتییەکان یان بەناوە گشتییەکەی کۆمەڵناسی ناوەڕۆکەکەی خاڵیدەکرێتەوە و بێواتا دەکرێت.

راستییەکەی ئەوەیە شارستانی، دەسەلات و دەوڵەتی ئینگلیز یەکێک لە نوێنەرە هەژموونگەراکانی ئەو پێشکەوتنەی رووباری سەرەکی شارستانی کە پێنج هەزار ساڵە تایبەتمەندییە پۆڵێنبەندەکانی دیارە ( دەوڵەت وەکو پاوانی ئابووری ـ شار ـ چین) لە سەدەی دەیەمەوە جارێکی دیکە ئەم پێشکەوتنە بووژایەوەو لە دەوروبەری شارەکان پەرەی بە چینەکاندا، سەرەتا بەشێوەی پادشا و ئەرستۆکراتەکان، لە سەدەی شازدەهەمیش بەدواوە وەک بۆرژوازی بەشێوەی پاوانەکانی دەوڵەتی ئابووری کۆبوونەوە، لێک کۆبوونەوە، لە رێگای پەروەردەی ئایدیۆلۆژی هەمەجۆرەوە خۆیان کرد بە نهێنییەکی شاراوە، یاخود بۆ

ئەوەی تێگەیشتن لێیان ئاستەم بێت خۆیان بە سەدان بەهای رەمزی داپۆشی و تا رۆژگاری ئەمڕۆمان هاتوون. لەوبڕوایەدام ئەم پێناسە یەک رستەییە لە دەیان هەزار توێژینەوە زیاتر و باشتر کۆی پەیوەندییەکانی ئینگلیز روون دەکاتەوە. لە ناوەڕۆکدا ( ئەو شتە یان بەرژەوەندی کە دەیشارنەوە) جیاوازییەکی ئەوتۆ لەنێوان شرۆڤەی هەزاران تابلێتی سۆمەرییەکان دەرهەق بە کۆمەڵگا کە پاڵپشت بەجوولەی ئەستێرەکان ئەنجامیانداون، لەگەڵ ئەو شرۆڤانەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا نییە کە لەلایەن هەزاران راهیبی زانستەوە ئەنجامدراون. تەنیا پەیڕەوەکانی تۆژینەوەو کات و شوێنەکەیان جیاوازە.

بەبایەخەوە روونمان کردەوە کە جیاوازی کات و شوێن، بەشێوەیەکی گەردوونی بە واتای ئەو گۆڕانکاری و گەشەیە دێت کە هەبوون دێنێتە کایەوە. گرێدراو بەجیاوازی کات و شوێن کومەڵگاکانیش دەگۆڕێن و گەشە دەکەن، هەندێک جاریش بەرەو دواوە دەڕۆن. دۆخی تایبەتێتی رەخنە ناکەم، هیچ پەرەسەندن و گۆڕانکارییەک لە گەردووندا نییە تایبەتێتی نەبێت. هەر گۆڕانکارییەک بە واتای تایبەتێتی دێت. دووبارەبوونەوەی هەمان شت وەکو بیروباوەڕییەکی دۆگماتیکە. لە تەواوی رووداوەکانی سروشتدا "دووبارەکردنەوەی هەمان وشەیە" یارییەکی بێواتای زمانە.

هەڵبەتە لەم چوارچێوەیەدا مۆدێرنیتەی سەرمایەداریش لایەنی گرنگی تایبەت بەخۆی هەیە. بەگوێرەی پێناسەی ئەنتۆنی گیدنس ئەم تایبەتبوونە لەسێ گۆڕەپانی گرنگدا فەراهەم بووە. لەم چوارچێوەیەدا ناوبردنیان بەزاراوەی 'نابەردەوامی' دەشێت ئەزموون بەخش بێت. لەبەرئەوەی سەرمایەداریمان لەناو تایبەتیبوونی خۆیدا لە رێگای خەسڵەتێکەوە شرۆڤەکرد و وەک نموونە ئاماژەمان پێکرد دووبارەی ناکەمەوە. بەڵام لەبواری زاراوەی دەسەڵات و بابەتی دەوڵەت ـ نەتەوەوە کە گوزارشتە بەرجەستەو حقوقییەکەیەتی، پێشکەشکردنی پوختەیەک پێویستەو ئەزموونبەخش دەبێت.

٢ـ هەروەکو گووتمان زانستە کۆمەڵایەتییەکان زۆر باسی دەسەڵات دەکەن، بەڵام لەسەرووی ئەو بابەتانەوە دێت کە بۆ چەواشەکردنی

ناوەڕۆکەکەی لەگەڵ یەکتردا پێشبڕکێ دەکەن. ئەو ڕەخنەیەم تەنیا مەرامیان پەیوەندیدار ناکات. لەپێشترین لایەنە تایبەتەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ئەوەیە، بەهرەیەکی ئەوتۆی هەیە کە هیچ شارستانییەک بەوشێوەیە تێیدا سەرکەوتوو نەبووە: وا دەکات هەر تاکێک خۆی بەدەسەڵات دابنێت، بە دۆخێکی بەمجۆرەی دەگەیەنێت. ئەمە ئەو بابەتەیە کە پێویستە هەرە زێدە هەڵوەستەی لەبارەوە بکرێت. هەروەها ئەو بابەتەیە کە کۆمەڵناسی فەرەنسی میشێل فۆکۆ هەرە زێدە مێشکی خۆی پێوە ماندووکردو تەواو وەڵامیشی نەدایەوە. لینین لە پەرتووکی "دەوڵەت و شۆڕش"؟دا هەوڵی پێناسەکردنی دەوڵەتی داوە. هێشتا لە ژیاندا مابوو ئاشکرابیوو کە ئەو خاڵەی هەرە زێدە لەبارەیەوە بەهەڵەدا چووە دەوڵەتە. هەرچی دەسەڵاتە خوازیاری ناسینیشی نەبوو. لینینیش ئەم "**تەلیسمە ئەفسوونییەی**" بەکارهێنا کە پیاوی بەهێز و فێلباز دەمامکە هەمەجۆرەکانی شارستانی پۆشیوەو تا ڕۆژی ئەمڕۆمانی هێناوە، دەرکی بەو ڕاستییە نەکرد تێکۆشانێکی سەرەکی کۆمەڵگا کە پێویستە لەمیانەی مۆدێرنیتەی دیموکراتییەوە ئاوابکرێت، لە ڕێگای "**دەسەڵاتی سۆسیالیستییەوە**" هەر لە سەرەتاوە مایەپووچ کراوە.

گووتەیەکی باکۆنین زۆر واتادار دەبینم کە بەم مانایە دێت: "**تاجی دەسەڵات لەسەری دیموکراتترین پیاو بنێن، لەناو بیست وچوار کاتژمێردا دەبێتە چەپەڵترین دیکتاتۆر**" یاخود "**ئەخلاقی دەشێوێنێت**". پێشخستنی کۆمەڵناسی دەسەڵات، تا ئێستاش وەک زانستیترین ئەرک پێویستی بە شیکارکردن هەیە. بە ئەندازەی چییەتی دەسەڵات، چەندە پێویستە یان پێچەوانەکەی، بابەتێکە کە هەرە زێدە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە نازانرێت. بەگوێرەی هەندێک زهنییەت و گروپە بەرژوەندی پەرستەکانی خۆیان لە ژێریدا شاردۆتەوە دەسەڵاتی ڕەها بە واتای چارەسەری ڕەهادێت. دەبێت بۆچوونی ئاشوور تەواو ئەمە بێت: ڕۆح کێشانی ئامانجەکە بە تەواوەتی. هەندێک کەسیش هەن کە دەسەڵات بە تەواوی وەک دۆخێکی نەخۆشی دەبینن. بەتایبەتیش ئەنارشیست و پاسیفیستەکان[1].

١ ـ پاسیفیستەکان: ئەوانەن کە داکۆکی لەبیرۆکەی پاسیفیزم دەکەن، کە ئەویش بریتییە لە ڕەتکردنەوەی پەنابردنە بەر

بەگوێرەی ئەمانە هاوشێوەی راکردن لەپەتا، دەبێت لەهەموو جۆرە هێزو دەسەڵاتێک دوور بکەویتەوە. لە راستیدا ئەمە شێوەی بابەتیانەی چەمکی تەسلیمبوونە بە دەسەڵات.

ئەو پێناسەو رێگەچارانەی سیستەمی شارستانێتی دیموکراتی لەگەڵ خۆیدا هێناوە لە رووی ناوەڕۆکەوە جیاوازە. مافی بەرگری هەر گروپێکی کۆمەڵایەتی پیرۆزە. هەبوونی هێزی بەرگری بەرامبەر هەر هێرشێکی دەکرێتە سەر هەبوونی گروپەکە یان ئەو بەهایانەی گرێدراوی هەبوونەکەیەتی، نەک تەنیا مافێکی ژیانی و دەست لێبەرنەدراوە، بەڵکو هۆکارێکی هەبوونێتی. لەو بڕوایەدام کە بە واتا کلاسیکییەکەی هێزی بەرگری بە دەسەڵات ناو نابرێت. ناوبردنی بە هێزی بەرگری دیموکراتییانە یان دەستڕۆییەکەی گونجاوتر دەبێت. کاتێک ئەمە بێنینە بەرچاوان کە وەک رووەکێک گوڵیش دەخوازێت لە رێگای دڕکەکانییەوە خۆی بپارێزێت، خوازیارم ئەم جیهانبینییەی دەستڕۆیی دیموکراتی بە "تیۆری گوڵ" ناو ببەم.

ا- لەچوارچێوەی شارستانیدا هەڵسەنگاندنی دەسەڵات وەک هەموو جۆرە کردەوەیەکی کۆمەڵایەتی کە ئامانجی بەدەستهێنانی زێدە - بەرهەم و زیادکردن و دەست بەسەردا گرتنێتی، گونجاوترین پێناسەیە. لە کردە ئایدیۆلۆژییەکان تا کردارە سەربازییەکان، لە مەتەڵەکانی سرکردنەوە تا کۆمەڵکوژی، لەیارییەکانی رابواردنەوە تا دەگاتە مەراسیمە ئایینییەکان هەرچالاکییەکی لە دوا شیکاردا بەکەڵک زەوتکردنی زێدە - بەرهەم و بەها کۆمەڵایەتییەکان بێت، دەشێت بە کردەوەکانی دەسەڵات ناویان ببەین. لەم لایەنەوە دەسەڵات گۆڕەپانێکی بەرفراوانی چالاکی کۆمەڵایەتییە. بەتایبەتی لە کۆمەڵگا شارستانییەکاندا دەسەڵات بەردەوام لەناو مەیلێکی بەمجۆرەدایە کە لە بوارەکانی قووڵی و بەرفراوانییەوە رادەی زێدە -

---

توندوتیژی و شەڕ جا چ بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان بێت یان لەپێناو نابینکردنی کۆمەڵێک بەرژەوەندیدا بێت. لەبەرئەوەی پێیان وایە کە دەکرێت کێشە نێونەتەوەییەکان بەشێوازی ئاشتیخوازانە چارەسەربکرێت، بۆچوونێکی فراوانە سەبارەت بە: هەڵگرتنی دامودەزگاکانی شەڕ و سەربازی؛ دژایەتی کردنی رێکخستنی کۆمەڵگا لە رێگای دەوڵەتەوە؛ رەتکردنەوەی بەکارهێنانی توندوتیژی لەپێناو هەر ئامانجێکی تاکەکەسی، کۆمەڵایەتی یان ئابووریدا بێت، مەحکومکردنی هەموو جۆرە بەکارهێنانێکی هێز ئەگەر بۆ هەندێک رەوتی زۆر پێویست نەبێت لەپێناوی ئاشتیدا دژەری کردنی توێژینەوەی لەهەموو رەوشێکدا تەنانەت بۆ خۆ پاراستنیش!

بەرهەم زیاد بکات.

ئەگەر زاراوەکانی زێدە بەرهەم و بەها روون بکەینەوە، ئەوکاتە باشتر دەرک بە ماهییەتی دەسەڵات دەکرێت. بەکارهێنانی هێز کرداری دەستبەسەرداگرتنی تەواوی بەها کلتووری و دەسکەوت و داهێنانە ماددی و مەعنەوییەکانی تاک و گروپەکان کاتێک بە ئاستی دەزگابوون دەگات وەکو "هونەری دەسەڵات" ببینرێت، ئەوکاتە بەشێوەیەکی بەرجەستە ئاشکرا دەبێت کە "زەوتکراو" و "زەوتکار" چین. دەسەڵات هونەرو کرداری، بەردەوام لە ڕێگای هێزەوە هەوڵدانە بۆ دەستبەسەرداگرتنی شتێک، کە موڵکی ئەو نییەو بەهی خۆی لەقەڵەم دەدات، ئاسیمیلەی دەکات، دەیکات بە موڵکی خۆی، ماڵی وڵاتی خۆی، لە ڕەوشێکی پێچەوانەشدا دیسان لە ڕێگای توندوتیژییەوە فڕێی دەدات، دووری دەخاتەوە، بێ نیشتمانی دەکات، بێکارو بێ موڵکی دەکات، بەشێوەیەکی گشتی لە رووی ماددی و مەعنەوییەوە بێبەهای دەکات. تەنیا سنووردارکردنی ئەم ڕەوشە بە زێدە ـ بەرهەمی ئابووری و بەهاکانییەوە هەڵوێستێکی زۆر بەرتەسکە. لەم بارەیەوە زەوتکردن ئامانجی ڕاستەقینەیە. بەڵام لەم ڕێگایەوە بەهەزاران بەهای دیکە لەلایەن هێزەکانی دەسەڵاتەوە دەستی بەسەردا دەگیرێت، کاتێک کۆی ئەمەش بە دەسەڵات ناو ببرێت واقیعیتر دەبێت.

هەرچی ڕۆڵی سەرەکی دەسەڵاتی دیموکراتییە: پاراستنی ئەو بەها ماددی و مەعنەوییانەیە کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ گرێدراوی هەبوونی گروپ و کەسی پەیوەندیدارە، (بەمەش لەوانەیە کە بەهاکانیان زەوتدەکرێت) ڕێگا بە زەوتکردنیان نادات، ئەگەر زەوتکرابن، هەوڵی سەندنەوەیان دەدات. لەهەموو لایەکەوە پەیوەستی ڕەوشی ئەرێنی، مافداری و ئەو دۆخانەیە کە ژیانی و دەست لێبەرنەدراون. دەسەڵاتی دیموکراتی هونەری چالاکییەکە کە لەسەر بنەمای ئەم ناوەڕۆکەوە ئەنجام دەدرێت. ئەگەر بڵێین لە ناوەڕۆکدا هێزی بەربەستکردنی دەستبەسەرداگرتن و چالاکی هونەرەکەیەتی ڕاستترە. لەنێوان زەوتکردنی وڵات و بەربەستکردنی زەوتکرنیدا، لەڕووی شارەزایی بەکارهێنانی هێز و هونەرەکانی (سوپا ـ شەڕ)یەوە جیاوازییەکی ئۆنتۆلۆژیانە هەیە.

دوو زاراوەی دژبەیەکن. ئەم رەوشانە لەناو کۆمەڵگا لەمیانەی چەندین زاراوەی دوالیزمی سەرەکی لەجۆری باش و خراپ، گوناح ـ پاداشت، راست ـ چەوت، مافدار ـ بێ ماف و جوان ـ ناشیرینەوە گوزارشتیان لێدەکرێت.

ب ـ دەکرێت لە زۆر لایەنەوە دەسەڵات بەگوێرەی روانگەکانیان دابەش و پۆلێن بکرێن.

**١ـ دەسەڵاتی سیاسی:** شێوەیەکی دەسەڵاتە کە هەرەزێدە بەکاردەهێنرێت. بریتییە لە بەڕێوەبردن و جێبەجێکردنەکەی دەوڵەت و شوێنکەوتووەکانی (نموونەی ئەو پارتی و کۆمەڵە مەدەنیانەی دەوڵەت بە بنەما دەگرن) دەیگرنەبەر. شێوەیەکی دەسەڵاتە کە بە درێژایی مێژوو هەرە زێدە راوەستەی لەسەر کراوە، زۆر بەکاریگەرە و بەکارهێنراوە.

**٢ـ دەسەڵاتی ئابووری:** گوزارشت لەو هێزە پاوانکارانە دەکات کە کرداری زەوتکردنی زێدە ـ بەرهەم و بەهاکان بەڕێوە دەبەن. بەدرێژایی مێژوو چەندین شێوەی جیاجیای هەبووە.

**٣ـ دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی:** گوزارشت لە نەریت و کردەی هێزی ئەو توێژە کۆمەڵایەتییە سەرەکیانە دەکات کە بەسەر یەکتریدا دەسەپێنن. چەندین جۆری جیاوازی وەک ئەتنیک، رەگەز، چین و خێزانی هەیە. پێویست دەکات هەندێکیان بەشێوەیەکی جیاواز تاوتوێ بکەین. لەخێزاندا باوک، لەجیابوونەوەی چینایەتیدا زەوتکاری زێدە ـ بەها، لە رەگەزدا پیاو، لە ئەتنیکدا چەوسێنەر، واتە ئەتنیکی زاڵ نوێنەرایەتی ئەم دەسەڵاتە دەکەن.

**٤ـ دەسەڵاتی ئایدیۆلۆژی:** بەواتای زهنییەتی بەڕێوەبەر دێت. ئەو کەس و گروپانەی لە پەیوەندییەکانی کلتوور و زانستدا بەهێزن پێگەی دەسەڵاتی ئایدیۆلۆژییان هەیە.

**٥ـ دەسەڵاتی سەربازی:** دەزگایەکە لەهەمووان زیاتر یەکسانە بەدەسەڵات. زێدەڕۆییترین، دژە ـ کۆمەڵایەتی و دژە مرۆڤانەترین شێوەی دەسەڵاتە. دایکی گشت دەسەڵاتەکانە، راستتر باوکیانە.

**٦ـ دەسەڵاتی نەتەوەیی:** گوزارشت لەو دەسەڵاتە ناوەندییە دەکات

کە لە ئاستی نەتەوەدا پراکتیزە دەکرێت. گرنگی بەوە دەدات کە ببێتە گوزارشتی یەکێتییەکی پارچە نەبوو. بەسەروەریی نەتەوەییش ناودەبرێت.

**٧ـ دەسەڵاتی جیهانگیری:** گوزارشت لە هەیمەنە یاخود ئیمپراتۆرییەتی مۆدێرنیتە یان شارستانی زاڵ دەکات. لە رۆژگاری ئەمڕۆمان مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بە رێبەرایەتی ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا ئەم دەسەڵاتە لە رێگای پاوانی ئابووری جیهانگیری و دەوڵەت ـ نەتەوەکانەوە بەکاردێنێت. دەشێت ئەم جۆرە دابەشکردنانە زیاتریش بکرێن.

٣ـ دەسەڵات کۆی پەیوەندییە مێژوویی ـ کۆمەڵایەتی و دەزگاکانە. لەسەر ژیانیترین شانە و گۆڕەپانەکانی پێشکەوتنی کۆمەڵگا و مێژوو جێگیر دەبێت و هەوڵدەدات ببێت بەنەریتێک. نەریت واتای دەزگابوونیش لەخۆوە دەگرێت. دەسەڵات ئەو گۆڕەپانەی پەیوەندی کۆمەڵایەتییە کە هەرە زێدە بە دەزگابووە، گرنگی تایبەتی پێدەدرێت و تەنانەت بە پرۆتۆکۆلەوە گرێدراوە. لەبەرئەوەی لەلایەن پەیوەندیدارەکانەوە زۆر کاراکراوە، بەشێوەیەکی باش بەستنەوەی دەزگابوون و شێوەگرتنەکەی بە پرۆتۆکۆلەکانەوە، سەبارەت بەهەمیشەیی بوون و نوێنەرایەتییەکەیەوە ژیانییە. بۆ نموونە ئاواکردنی دەسەڵاتی سوڵتانەکان، دەور و تەسلیم گرتن و دەستبەسەرداگرتنەکانیان، لە رێگای رێوڕەسم، رەمز و پرۆتۆکۆلە سەرسوڕهێنەرەکانەوە رێکخراون. لە جلوبەرگەکانیانەوە تا خوداوەندەکانیان، لە پرۆسەی هاوسەرگیرییەوە تا دەگاتە مردنیان هەرپەیوەندییەکیان شێوەیەکی نەریتی هەزاران ساڵەی خۆی هەیە. لەبەر ئەم هۆکارانە هەمووکەس بەوهێزەی هەیەتی و وەک هیواخوازە نابێت بەدەسەڵات. دەڵێن بووە بەجەردە یان ستەمکار. خۆی لە راستیدا جەردەیی و ستەمکاری گوزارشت لە ناوەڕۆکی ئاشکرا و راستەقینەی دەسەڵات دەکەن. بەڵام دەزگای دەسەڵاتی پیرۆز و شکۆدارکراو، بۆ ئەوەی نەڵێن **"کڵاوەکەی کەوت، کەچەڵ ئاشکرابوو"** دژایەتیکردنێکی توندی ئەم شێوە ئاشکرایانەی دەسەڵات بۆ هەمیشەییکردن و قورسایی دەزگاکەی خۆی وەک ناچارییەک دەبینێت. زۆرباش ئاگادارە کە تەنیا لەمیانەی ئەم نەریت

و سیمبۆلانەوە رادەیەکی گرنگی رەوابوون (مەشروعییەت)ی بەدەست هێناوە.

دەبێت پێکچوونێکتان بەبیر بێنمەوە کە پێشتر لەبەرگریناکەمدا ئاماژەم پێکردووە. دەسەڵات کە کۆی پاوانەکانی داهاتە و گەوهەرێکی مێژوویی کۆمەڵگاکانی شارستانی وەرگرتبوو دەتوانرێت بەو تۆپە بەفرینە بچووێندرێت کە لەسەر لووتکەی شاخ خلۆر دەبێتەوە چەندە دێتە خوارەوە گەورەتر دەبێت. لەمێژوودا سیستەمی لێشاوێکی بەمجۆرەی هەیە.

٤ـ ئەگەر دەسەڵات بە نەخۆشییەکی درم بچوێنین باشتر دەرکی پێدەکرێت. واتە دەسەڵات درمە. ئەو نەخۆشییە کۆمەڵایەتیەی سەرەتا بەتەنیا لەلایەن "پیاوی بەهێز و فێڵباز"ەوە بۆ راوکردنی ئاژەڵ و دواتر لەسەر دایک ـ ژنە بەتواناکان بەڕێوەچوو: لەلایەن سێیانەی سیستەمی پیاوسالاری پلەدارییەوە راهیب (کەسی خاوەن واتا) + بەڕێوەبەر (بەئەزموونی خۆی کۆمەڵگا بەڕێوە دەبات) + فەرماندەی سەربازی (هێز لەژێر پاوانیدایە) کراوە بەدەزگا. لەگەڵ ئاواکردنی شار و چین بوو بە دەوڵەت. بەلام دەبێت ئەوەش بزانرێت کە لەگەڵ ئاواکردنی دەسەڵاتی دەوڵەتدا سیستەمی پیاوسالاری پلەداری پیاوی بەهێز و فێڵباز کۆتایی پێنەهات. ئەمجارە دەتوانین بەم شێوەیە فۆرمێلی دەسەڵات پێشبخەین:

دەسەڵات = پیاوی بەهێز و فێڵباز + پلەداری پیاو سالار + دەوڵەت.

ئەم سێ دەزگا سەرەکییە گوزارشت لە کۆمەڵگای دەسەڵات دەکات. لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری پێکهاتەکانی نهۆمی سەروو و خواروویدا، وەک پۆلێنێکی گشتی ئەم سیستەمە بەشارستانی ناودەبەین. لە نهۆمی ژێر زەمیندا ئابووری جێگیرە، نهۆمی سەرووش کۆنسەی خوداوەندەکان. سۆمەرییەکان بەمجۆرە شارستانیان ئاواکرد. شێوەکەی گۆڕانکاری بەسەر داهات، بەلام ناوەڕۆکەکەی بەردەوام لە زیادبووندا بوو و مانای خۆی پاراست. بە درێژایی مێژوو کۆیلە، بەندە و کرێکاران، واتە ئەو کەرەستانەی (مرۆڤ) لە زێدە ـ بەرهەمدا بەکاردەهێنرێن جێگای خۆیان لە نهۆمی ژێر زەمیندا دەگرن. ئەو توێژانەی بە پیشەکار، جووتیار

و خاوەن پیشە سەربەستەکان ناودەبرێن بەشێوەیەکی سەرەکی کارەکانیان لەم زەمینەدا ئەنجامدەدەن. خوداوەندە میتۆلۆژییەکان، تاکخوداکان (هەندێ جار سێبەرەکانیشیان واتە سوڵتانەکان یاخود پەیامبەرەکانیان، پێغەمبەرەکان، شامان و راهیبەکانیش دادەنیشن)، یاسا و هزرە بەڕێوەبەرەکان (بانگەشەکەی ئەفلاتون) جێگای خۆیان لە نهۆمی سەرووودا دەگرن.

لە کاتێکدا لە چاخەکانی یەکەم و ناویندا دەسەڵات زیاتر لە رێگای ئەم دەزگا سەرەکیانەوە، بەتایبەتیش بەشێوەی دەوڵەت پراکتیزە دەکرا، لەسەردەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا تەواوی کۆمەڵگا لەدەسەڵاتەوە گلێنراوە. بەگووتەیەکی دیکە تەواوی کۆمەڵگا لە نەخۆشی خۆ بەدەسەڵات زانینەوە گلێنراوە. هەرچەندە بڵاوکردنەوەی دەسەڵات لە رێگای دەزگاکانی "نابەردەوامی" یەوە کە ئەنتۆنی گیدنس بە گرنگی دەزانی، دۆخی نەخۆشی بێت، لە بنچینەدا تایبەت بە مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە. هەندێ ئایدیۆلۆژیا و دەزگا سەبارەت بەم بابەتە رۆڵی دیاریکەر دەبینن. لەبەشی دواتردا ئەم خاڵانە ئاماژە پێدەکەم.

بێگومان تێوەگلانی تەواوی کۆمەڵگا لەدەسەڵات، تەنیا بە واتای بەهێزبوونی دەسەڵات نایەت. لە هەمان کاتدا بە واتای بێچارەیی، کڵۆڵی و گەیشتن بە دوا دۆخ و خێرایی قۆناخی هەڵوەشاندنەوەش دێت. هەر شتێک بە دوا دۆخی خۆی بگات، دووشت روودەدات: کەس یان لایەنی پەیوەندیدار شتی پێویست بەرامبەر دوا دۆخەکە دەکات: یاخود پەیوەندیدارەکە هیچ ناکات و ئەو شتەی لە دوا دۆخدایە دەڕزێت. بۆ نموونە سێوێک کاتێک پێدەگات و سوور دەبێت، کارێک کە بکرێت لێکردنەوەیەتی. ئەگەر لێنەکرێتەوە، ماوەیەکی دیکەی بەسەردا تێپەڕێت سێوەکە دەڕزێت: کرمێ دەبێت، پارچە دەبێت و کۆتایی پێدێت. لێکچواندنەکە قەبەیە، بەڵام بۆ دەسەڵاتیش لەجێگای خۆیدایە. لەکاتی ئاواکردنیانەوە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و دیاردەی دەسەڵات رەوشێکی نەخۆشی بوون، ئێتر بە قۆناخی رزین گەیشتوون. بۆنیان کردووە.

بەگووتەی باکۆنین، هێندە رزیوە، تەندروستانەترین، بە ئەخلاقترین

پیاو تێوە بگلێت نەخۆشی دەکات. لە راستیدا ئەم داوەرییە بەمشێوەیە بوو: "**تاجی دەسەلات لەسەری پیاوی هەرە دیموکرات بکرێت، لەناو بیست وچوار کاتژمێردا دەیکات بە چەپەڵترین دیکتاتۆر**". راستە. دەسەلاتی رزیوو وەک تاجێک لەسەری چەوساوەترین ژنیش بنێن، ئەویش لەماوەی بیست وچوار کاتژمێردا دەبێت بە دیکتاتۆر. تاکە رێگای بەربەستکردنی ئەم نەخۆشییە بە ئاواکردنی سیستەمی مۆدێرنیتەی دیموکراتیدا تێپەڕ دەبێت.

## و- مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و دەوڵەت ـ نەتەوە

زاراوەی دەوڵەت ـ نەتەوە بەو ئەندازەیەی لە تاریکیدا بەشاراوەیی ماوەتەوە، لەسەرووی ئەو زاراوانەشەوە دێت کە هەرە زێدە چەواشەکراون. بەسووربوونەوە لە دیارکردنی رۆڵە سەرەکی و راستەقینەکەی رادەکەن. دەتوانین بڵێین زیاتر بە ئامانجی پروپاگەندە بەکاردەهێنرێت. بەتایبەتیش بایەخێکی زۆر بەشاردنەوەی پەیوەندییە ئۆنتۆلۆژییەکەی بە فاشیزم و میللیگەراییەوە دەدەن. بەوێنەی پشتگوێخستنی پەیوەندی خانەییانەی فاشیزم و میللیگەرایی بە مۆدێرنیتەی فەرمییەوە. ئەمە تەنیا هەڵوێستێکی تایبەت بە بورژوا لیبراڵەکان نییە. تەنانەت سۆسیالیستەکانیش سەبارەت بە بابەتی دەوڵەت ـ نەتەوە یان وەکو پارێزەر خۆیان پیشاندەدەن، یان هەروەکو بڵێی زۆر بێ بایەخە بەچەند رستەیەک تێپەڕی دەکەن. کەچی یەکێک لەو زاراوانەیە کە لە تێگەیشتن و گۆڕانی سەردەمەکەماندا رۆڵی کلیل دەبینێت. هەرچەندە ئەنتۆنی گیدنس کەموکوڕیشی هەبێت، بەهۆی خستنەڕووی گرنگییەکەیەوە سەبارەت بەم بابەتە رۆشنکەرەوەیە.

ئەو بابەتانەی تاکو ئێستا خستمەڕوو، لەلایەنێکەوە دەتوانرێت وەک ئامادەکاری بۆ رۆڵ و پێناسەی دەوڵەت ـ نەتەوە هەڵسەنگێنرێت. تا هۆکارەکانی لەدایکبوونی سەرمایەداری، زاراوەکانی مۆدێرنیتە، دەسەڵات، نەتەوە و دەوڵەت تەنانەت ئەگەر لەئاستی گەڵاڵەیەکیشدا بێت پێناسە نەکرێن، دەستنیشانکردنی رۆڵی دەوڵەت ـ نەتەوە هێندە شیکەرەوە نابێت. هەوڵەکانم بۆ خستنەڕووی مەسەلەی یەهودییەکان بەشێوەی گەڵاڵە و سەرە دێڕێکی سەرەکی، لە نزیکەوە پەیوەندی بەم بابەتەوە هەیە. هەروەکو چۆن بۆ شیکارکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکانی رۆژگاری ئەمڕۆمان، شیکارکردنی دەوڵەت ـ نەتەوە زاراوەیەکە رۆڵی کلیل دەبینێت، بۆ شیکردنەوەی بابەتی دەوڵەت ـ نەتەوەش، لەچوارچێوەی شارستانیدا وەک بابەتێکی مێژوویی ـ کۆمەڵایەتی بەلانی کەم لە ئاستی پێناسەکردندا تاوتوێکردنی مەسەلەی یەهودییەکان، ئەزموون بەخشە و

نموونەیەکی بەهادارە. تا دەوڵەت ـ نەتەوە و مەسەلەی یەهودییەکان شیکار نەکرێت، واتا بەخشین بە کۆمەڵکوژی یەهودییەکان زۆر ناتەواوە و هەڵەیە، تەنانەت زۆر چەوتە. تراژیدیای ئەمڕۆی رۆژهەڵاتی ناوین بەڵگەی سەلمێنەری ئەم شیکارانەن کە خرانەڕوو.

١ـ دەوڵەت ـ نەتەوە فۆرمێکە کە پاوانخوازی سەرمایەداری ئافراندوویەتی. فۆرمی ئەو دەوڵەتەی لەسەدەی شازدەهەمەوە لە هۆڵەندا و ئینگلتەرا بۆ شکاندنی هیوای ئیمپراتۆرییەتی ئیسپانیا و فەرەنسا پێویست بوو جۆرێک لە دەوڵەت ـ نەتەوەی بەرایی بوو. میرنشینی هۆڵەندی و پادشایەتی ئینگلتەرا بەرەو دەوڵەت ـ نەتەوە دەگۆڕان و هەوڵی بالآبوونیان دەدا. کاتێک لە ئاکامی رێککەوتنی ١٦٤٩ی ڤێستفالیا فاکتەری نەتەوە لەنێوان دەوڵەتەکان دەرکەوتە پێش، پێشکەوتنەکان بە ئاراستەی دەوڵەت ـ نەتەوە خێرابوون. کاتێک لەبواری سیاسەتی ـ ئابووررییەوە دەوڵەتەکان مارکانتیلیزمیان بە بنەما گرت، دەرخستنەپێشی فاکتەری بازاڕی نەتەوەیی، بوو بە فاکتەرێکی دیکەی بەهێزی و خێراکردن. ئیتر خەباتی زمان، هونەر و مێژووی نەتەوەیی لەژێر پاوانی دەوڵەتدا زیاتر جێگیربوو. ئیتر شەڕ و ناکۆکییە هەمەجۆرەکانی نێوان نەتەوەکان، دەسەلاتی لەجۆری دەوڵەت ـ نەتەوە و میللیگەرایی نەبوایە بەڕێوە نەدەچوو. شەڕەکانی ناپلیۆن رۆلێکی پێشەنگی لەمەدا بینی. تا فەرەنسا نەبوایە بەدەوڵەت ـ نەتەوە شەڕ بەڕێوە نەدەبرا. ئایدیۆلۆگە ئەڵمانەکانی لەنزیکەوە چاودێری پرۆسەکەیان دەکرد، لە کەسایەتی ناپلیۆندا تەواوی سەرەداوەکانیان دۆزییەوە کە بۆ میللیگەرایی و دەوڵەت ـ نەتەوەی ئەڵمان پێویست بوو. میللیگەرایی ئەڵمانی کە بەخێرایی پەرەی پێدرا، ساتێک زووتر بۆ یەکێتی ئەڵمانیاو ئاواکردنی ئەو دەوڵەتەی مۆدێرنیتە لێی دەگەڕا رۆلی سلینگی بینی. لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا یەکەمین هەنگاوی ئەو پرۆسەیە هاوێشترا کە دواتر هیتلەری لێکەوتەوە.

لە راستیدا بابەتەکە زۆر لەوە قووڵترە. پەیوەندی بە بنەماکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە هەیە. ئەم بزاوتەی لێکەڕینەکانی سەرکەوتنی پاوانی ئابووری لە سەنتەری خۆیدا هەڵدەگرێت تەنیا

پێشکەوتنی نەتەوەیی نەدەشێواند: ناچاربوو تەواوی ئەم فاکتەرانەی نەتەوە دەکەن بەنەتەوە بکاتە فاکتەری میللی. تا ئایین نەکرێت بە نەتەوەیی، زاڵبوونی پاوانی ئابووری بەسەر بازاڕدا زەحمەت بوو. بەنەتەوەییکردنی کلتوور و هونەرییش گرێدراوی پێگەی پاوانخوازییەکی هاوشێوەیە. بەنەتەوەییکردنی شەڕەکان، دواترین و گرنگترین فاکتەربوو. بە نەتەوەییکردنی تەواوی ئەم فاکتەرانە ڕۆحی نەتەوەیی دەخوڵقاند، ئەویش بە میللیگەرایی ئەنجامگیر دەبوو. کار و خەباتی ئایدیۆلۆگەکان لەبواری نەتەوەوە لەمێژبوو بنەما فکرییە پێویستەکانی ئامادە کردبوو. زۆر ئاشکرایە کە تەواوی ئەم فاکتەرانە بازاڕی نەتەوەیی و سەرمایەداری پاوانخوازە کە شەڕێکی مەزن لەسەر ئەم بازاڕە دەکات و تا مردن خۆی دەسەپێنێت.

٢ـ شۆڕشی پیشەسازی تاوی بەتەواوی ئەم قۆناخانە داوە. ئەو پیشەسازییەی دوای بازرگانی مەزن هاتە ئاراوە و زێدە ـ بەرهەمێکی زیاتری بەدەست دەهێنا، بەم ناوەڕۆکەیەوە دەبووە بابەتی سەرەکی نەتەوەییبوون. پیشەسازی نەتەوەیی لە ئاستی نەتەوەدا بۆ تەواوی سەرمایەدارەکان بە واتای قازانجی هەرە زۆر دەهات. لەم سۆنگەوە سەدەی نۆزدەهەم دیاریکەرە. وەک ئایدیۆلۆژیای پیشەسازی پەرستی (ئێندوستریالیزم) لەنزیکەوە گرێدراوی نەتەوەیی بوونە. ناکرێت دابڕاو لە پیشەسازی بیر لە دەرکەوتنەپێشی میللیگەرایی بکەینەوە، کە بووە بە ئایدیۆلۆژیای بەرچاوو چالاکوانی سیاسی سەدەی نۆزدەهەم. بۆرژوای بازرگانی لەبواری قەبارەوە بە تەنیا ناتوانێت نەتەوەیەک هەڵگرێت. مارکانتیلیزم لە ناوەڕۆکی پاوانی ئابوورییەک دوورە کە بەتەنیا بتوانێت نەتەوە بەڕێوەببات. بۆرژوازی کە لە ڕێگای پاوانی پیشەسازییەوە لەبواری قەبارەوە فراوان بووە، ئیتر مافی ئەوە بۆخۆی دەبینێت بەناوی تەواوی نەتەوەوە قسەبکات. سەرلەنوێ مێژووی خۆی نووسیەوە. مەیلی فەلسەفی خۆی ڕوونکردەوە. کلتووری نەتەوەیی کرد بەپارچەیەکی مێژووەکەی. مۆری خۆی لە سوپا و پەروەردەی نەتەوەییدا. لە ڕێگای بورژوازی پیشەسازی نەتەوەییەوە دەسەڵات و

سەرکەوتنی سەرمایەداری لە ئاستی نەتەوەییدا ئیتر هەمیشەیی بوو.

ئەو زاراوەیەی بەشۆڕشی بۆرژوا ناو دەبرێت کاتێک تەواوی ئەم قۆناخە لەناواخنی خۆی بگرێت واتایەکی دەبێت. ئەگەرنا بەتەنیا شۆڕشی فەرەنسا، ئینگلیز یان هاوشێوەکانی بەپێچەوانەی مەزەندەکان شۆڕشی پلانکراوی بۆرژوا نین. ئەوەی بۆرژوا ئەنجامیداوە، ئەم شۆڕشانەی بۆخۆی بەکارهێناوە. بینینی شۆڕشی پیشەسازی وەک سەرکەوتنێکی چینی بۆرژوا هەڵەیە. ئەم شۆڕشەش ئەنجامێکی کەڵەکەبوونی توانا مەزنەکانی مێژووە.

هەروەکو لە هەر گۆڕەپانێکدا پەیڕەوی کردووە، کاتێک بۆرژوازی خۆویست و پاوانخواز دەستی بەسەر ئەم گۆڕەپانەشدا گرت، ئەوەی جێگای باس بوو، سەپاندنی خۆی و قازانجەکانی بوو. چۆن ئابووری گۆڕەپانێکی کۆمەڵایەتییە کە وەکو چین پێویستی بە بۆرژوازی نییە، پیشەسازیش بوارێکی ئابوورییە کە پێشوەخت پێویستی بە بۆرژوازی پیشەسازی نییە. ئەوەی پاوانەکانی بازرگانی کردیان، دەستبەسەرداگرتنی ئەم گۆڕەپانە بوو کە بەگوێرەی بازرگانی قازانجێکی زۆر زیاتری بەدەست دەهێنا. بۆرژوا خاوەنی راستەقینەی هیچ شۆڕشێک نییە. نە لەبواری تیۆری، نە پراکتیکی، بۆرژوا جێگای خۆی لە ئامادەکارییەکانی شۆڕشی پیشەسازیدا ناگرێت. پیشەسازی یەکێک لە گرنگترین قەڵەمبازەکانە کە ئابووری لەچوارچێوەی رەوتی مێژوویی ـ کۆمەڵایەتیدا ئەنجامیداوە. هەروەکو شۆڕشی کشتوکاڵی چاخی نیولیتیک. بەرهەمی ئابووری کە لە هەر قۆناخێکی مێژووییدا گەشە دەکات، دەوڵەت و بەکرێگیراوەکانیان کە گەوهەرەکەیان پاوانخوازییە، دەیکەن بەپاوانێکی نوێ بۆ دەستبەسەرداگرتنی گۆڕەپانە نوێ و بەپیتەکانی بەرهەمهێنان، ئەمانە چاوکوێرانە دەکەونە جووڵە، تەنانەت کە پێویست بکات هێزیش بەکاردێنن. لەبنەڕەتدا دەوڵەت ـ نەتەوە بنەما ماددییەکانی خۆی لەم پاوانانەدا دەدۆزێتەوە. ئەگەر نەیدۆزێتەوە بۆخۆی ئاوایدەکات.

٣ـ ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم یەکێک لەخاڵەکانی وەرچەرخانی مێژووە: یان ئەوەتا دەوڵەت ـ نەتەوەی ناوەندی بۆرژوازی سەردەکەوت،

یاخود بزووتنەوەی کۆنفیدراڵی دیموکراتی کە پێکهاتبوو لە تەواوی ئەو توێژانەی کۆمەڵگا کە لە دەرەوەی ئەم پاوانخوازییە نوێیە و ئەرستۆکراتەکان بوون. هەرچەندە جیاوازییەکی زەق لەنێوان هێزەکانی شۆڕشی فەرەنسای ساڵی ١٨٧٩ و شۆڕشی ئینگلیزەکانی ساڵانی ١٦٤٠ و ١٦٨٨ دا نەبێت، ئەم دوو مەیلە رۆڵی سەرەکییان دەبینی. لە شۆڕشی فەرەنسا لایەنگرانی کۆمۆنە، لە شۆڕشی ئینگلیزەکانیش لیڤێلەکان نوێنەری مەیلی دیموکراسی بوون. دواتر پاکتاوکران. شۆڕشی ١٨٤٨ بە واتای وشە شۆڕشی گەل بوون. هەوڵەکانی یانە (لیگ) و مانیفیستۆی کۆمۆنیستی مارکس و ئەنگلس تا ١٨٤٨ لە جێگای خۆیدا بووەو هەنگاوێکی مێژوویی بوو. کاتێک لە ئاکامی خیانەتی بۆرژواکان و رێککەوتنیان لەگەڵ هەموو جۆرە هێزێکی کۆنەپەرست شۆڕش دووچاری شکست بوو، بوو بەیەکەمین زیانی ستراتیژی. بەهاری گەلان کورتخایەن بوو، دیسان زستانی سەخت گەڕایەوە. شۆڕشگێڕێتی بۆرژوازیش گرێدراوی بەرژەوەندییە ساتەوەختەکانی بوو. ئەگەر سەرکەوتوو بوایە پێشوەخت دەیتوانی پاوانی سیاسی بۆ پاوانی ئابووری بگۆڕێت. لەجیاتی ئەوەی هەمووشتێک لەدەست بدات، زانی کە ئەوانەی بەردەستی بپارێزێت و بەدەسکەوتێکی سنوورداریش رازی بێت. لایەنگرانی پادشایەتی کۆن و ئەرستۆکراسی هیواکانیان بەدی نەهاتبوو. وەک جۆرێک لە هێزی هاوسەنگی دەوڵەت ـ نەتەوە لەم قۆناخەدا بەهێز دەبوو. رێککەوتنی پاوانە ئابووری و سیاسییەکان لەسەر دەوڵەت ـ نەتەوەی ناوەندی قۆناخی دواتری دەست نیشان دەکرد. ساڵی ١٨٦١ و ١٨٧٠ راگەیاندنی فەرمی دەوڵەت ـ نەتەوەی ئیتاڵی و ئەڵمانی بوو. ئیتر نۆرەی راگەیاندنی دەوڵەت ـ نەتەوەکانی دیکە دەهات.

کاتێک شەپۆلی شۆڕش بەپێی هیواو چاوەڕوانییەکانیان ئاراستەی نەگرت، مارکس بۆ لەندەن پاشەکشێی کرد. پەرتووکی سەرمایە خرایە ژێر لێکۆڵینەوەوە. ئەزموونی ئەنتەرناسیۆنالی خەباتی کۆمەڵەیەک بوو. کاتێک کۆمۆنیستە ئەڵمانەکان (مارکس و ئەنگلسیش لەناودا) دەوڵەت ـ نەتەوەی ناوەندییان بە بنەماگرت، بەشێوەیەکی بابەتی شکستیان پەسەند

دەکرد. ئیتر لە ڕێگای تیۆرییەکانی قەیران و وانەکانی بەرنامە، ڕێکخستن، ستراتیژی و تەکتیکەوە کە بەگوێرەی کەوتنی سەرمایەداری دانرابوون، لەناو هەمان قاڵبەکانی مۆدێرنیتە (ڕەوا بینینی پیشەسازی و دەوڵەت ـ نەتەوە)دا لەگەڵ سەرمایەداری ڕێککەوتن و بوون بە بزووتنەوەیەک کە بەدوای وەرگرتنی بەشی خۆیانەوە بوون لەو پاوانخوازییەی بە ئابووری دەناسرێت. ئابووری پەرستی(ئیکۆنۆمیزم) بەواتای پەسەندکردنی بەرنامەی دەوڵەت ـ نەتەوە و ئابووری پاوانخوازیيە پیشەسازییەکان دێت. شۆڕشی سۆڤێتیش وەکو ئەوانەی پێش خۆی لەبوون بەئامرازی سەرمایەداری دەوڵەتی پاوانخواز + بەرنامەی دەوڵەت ـ نەتەوە ڕزگاری نەبوو. هەڵبەتە دوای کێشمەکێشێکی زۆر شۆڕشی چینیش لەسەرهەمان ڕێڕەو لە ئاکامی ڕێککەوتنی دەوڵەت ـ نەتەوەی چین + سەرمایەداری پاوانخوازی چین+ پاوانی جیهانگیری لەهەمان چارەنووس ڕزگاری نەبوو.

ئەو پۆلێنەی بە شۆڕشی ڕزگاری نیشتمانی ناومان دەبردن شۆڕشێک بوون زیاتر گرێدراوی زهنییەتی مۆدێرنیستی بوون، پیشەسازی و دەوڵەت ـ نەتەوەیان وەک دوا بەرنامە و ئامانجی خۆیان دەست نیشانکردبوو. هەرچەندە چەندین نموونەی سۆسیالیزمی بونیادنراو لە ناویشیاندا هەبێت، بەڵام بەرنامەی هاوبەش هەمان شت بوو. ئەو بزووتنەوە سەدوپەنجا ساڵییەی لەژێر ناوی سۆسیالیزمی زانستی بەڕێوەبراوە، هۆکاری سەرەکی سەرنەکەوتنەکەی: مۆدێرنیتەی ڕۆشنگەری تێپەڕنەکرد، ئەو هێزەشی نیشان نەدا لەبواری تیۆری، بەرنامە، ستراتیژی و تەکتیکەوە مۆدێرنیتەی دیموکراتی پێک بێنێت و لەبواری کرداریدا پراکتیزەی بکات. ڕاستتر، تەنانەت نیازێکی بەمجۆرەشی نەبوو. تەواوی نیشانەکان لەوەدا یەکدەگرنەوە کە ئەم بزووتنەوە خاوەن کارەکتەرێکی وردە بۆرژوازییە، کورت بینە، بە ئەندازەی ئەوەی سەرکەوتنی هەرزوو سەرخۆشی کردووە بە ئاسانیش تەسلیم بە سیستەم بووە.

ئانارشیستەکان ئەم قۆناخەیان پرۆتستۆ کرد، بەڵام بەتایبەتی ڕەخنە گرنگ و پێشنیازەکانی باکونین، پرۆدۆن و کرۆپۆتکین سەبارەت بە بەرنامە،

لەبەرئەوەی خۆیان ڕێک نەخست، لەبواری ئایدیۆلۆژیدا بەرتەسک بوون و بەشێوەیەکی رووکەشانە کۆمەڵگایان پێناسە کرد، هەروەها بەهۆی چەمکی چالاکی تاکە کەسییان نەیانتوانی ببن بە ئەڵتەرناتیڤێکی سیاسی. دەستوەردانیان بۆ پرۆسەی مێژوویی سەرکەوتنی چاوەڕوانکراوی بەدەست نەهێنا. لاوازی بنەڕەتی هەردوو رەوتیش ئەوەبوو، فەلسەفەی رۆشنگەرییان وەک خۆی پەسەندکرد و گرێدانێکی دۆگماییانەیان بە زانستگەرایی پۆزێتیڤیستەوە هەبوو. سەرنەکەوتنیان زیاتر وابەستەی هۆکاری ئایدیۆلۆژییە.

مورای بۆکین[1] کاتێک دەڵێت: "تا سالانی ١٨٥٠ لە ئەورووپا **مەیلی کۆنفیدراسیۆنی دیموکراتی زەحمەتکێشان و رەنجدەرانی شار و گوندەکان زۆر بەهێزبوو، بەڵام کاتێک سۆسیالیستەکان تەسلیم بە چەمکی دەوڵەت ـ نەتەوەی ناوەندیبوون ئەم شانسە بە تەواوی لە دەست چوو**" هەروەکو بڵێی دەستنیشانکردنەکانی سەبارەت بە رووداوە کۆمەڵایەتییەکان زیاتر لە راستییەوە نزیکە.

٤ـ فەیلەسوفی گەورە نیچە (ناساندنی وەک بەهێزترین پێغەمبەری رکابەری چاخی سەرمایەداری، لەجێگای خۆیدا دەبێت) یەکەمین کەس بوو کە هەستی بەمەترسی گەورەی راگەیاندنی دەوڵەت ـ نەتەوەی ئەڵمانی کردبوو لە ساڵی ١٨٧٠دا. لەکاتێکدا بەسۆسیال ـ دیموکراتەکانیشەوە سەرجەم رۆشنبیران چەپڵەیان بۆ لێدەدا، ئەو زیانێکی مەزنی مرۆڤایەتی لەمەدا دەبینی. ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم ناوەڕۆکی شرۆڤەکانی بەمجۆرە بوو: **"دەوڵەت بە ئیلاهی کراوە، رەنجدەران و تاکیش کراون بەمێروولە،**

---

١ـ مورای بوکین: نووسەر، وتاربێژ، فەلسەفەگەرێکی سیاسەت، سۆسیالیستێکی ئازادیخوازی ئەمریکی بەڕەچەڵەک یەهوودییە. لەنێوان سالانی (١٩٢١ ـ ٢٠٠٦)دا ژیاوە. دامەزرێنەری بزووتنەوەی ئیکۆلۆژی کۆمەڵایەتییە. لایەنی سەرنجڕاکێشی سەنتێزیکردنی ئانارشیستی (رەتکردنەوەی هەموو جۆرە سیستەمێکی دەسەڵات) و تێگەیشتنی هاوچەرخی ئیکۆلۆژییە. دژبەری سەرمایەدارییە و وەک شێرپەنجە و نەخۆشییەکی کۆمەڵگا وەسفی دەکات. تەنها بەمەوە ناوەستێت بەڵکو پێی وایە کە سەردەست بوونی مرۆڤ بەسەر مرۆڤەوە هاوتەریب لەگەڵ سەردەست بوونی مرۆڤ بەسەر سروشتەوە دەستی پێکردووە. ئەمەش بەیەکێک لە بنەماکانی پێچەوانە بوونەوەی ژیانی مرۆڤ لەگەڵ یاساکانی سروشتدا لەقەڵەم دەدات. بۆ رزگارکردنی سروشت لە سەردەستی مرۆڤ بەپێویستی دەزانێت سەردەستی مرۆڤ بەسەر مرۆڤەوە نەمێنێت. بەم مەبەستەش رەتکردنەوە و هەڵگرتنی دەوڵەت وەک ئەو دەزگایەی بۆتەمایەی ئەم سەردەستییە بە پێویستییەکی دەست لێبەرنەدراو دەزانێت. بۆ ئەمەش دروستکردنی رێکخستنی کۆمەڵایەتی لەدەرەوەی دەوڵەت کەبوون بە دەوڵەت ناکەنە ئامانجی سەرەکی دەبینێت. بۆکین لە بوارەکانی فەلسەفە، سیاسەت، مێژوو، ئیکۆلۆژی و کێشەکانی شاردا خاوەن چەندین بەرنووکە گرنگترین بەرهەمەکانی "ئانارشیزم دوای بێ دەرەتانییەکی زۆر" و "ئیکۆلۆژی ئازادی" و "شۆڕشی سێهەم".

کۆمەڵگاش کراوە بە ژن و خەسێنراوە".
رەخنەکانی پرۆدۆن لەبارەی هاوولاتییەوە بەکاریگەرترە. هەروەکو بڵێی زۆر پێشوەخت تاکی رۆژگاری ئەمرۆمانی دیوە. ماکس ویبەریش کۆمەڵگای ژێر کاریگەری مۆدێرنیتە وەک "کۆمەڵگای بەندکراو لەناو قەفەسی ئاسنیندا" پێناسە دەکات. پێناسەی سامناکتر لەجیهانی رۆمادا پێشخراوە. کاتێک کۆمەڵگا بە تەڵەزگەی دەوڵەت ـ نەتەوەوە دەبێت شرۆڤەی هاوشێوە زیاد دەبێت. بەڵام تەواوی ئەم رەخنە و پێشبینیانە لە چارەسەرییەکی بەرجەستەو بەرنامەیەکی ئازادی کۆمەڵگا دوورە. لەسەدەی شازدەهەمەوە تا کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم گەلان و رۆشنبیران بەرخودانێکیان کرد کە لەگەڵ هیچ قۆناخێکی مێژوودا بەراورد ناکرێت. چەندین سەرکەوتنی کاتیشیان بەدەستهێنا. لەکاتێکدا هەژموونگەرایی جیهانگیری سەرمایەداری سەردەمی پاوانخوازی فینانس بەهەموو هێزی خۆی بەردەوامەو لەسەر پێیانە، کەموکورییە مەزنەکانی مەیلی مۆدێرنیتەی دیموکراتی لەبواری شیکارکردنەوە نیشانیدەدات کە لە هەڵەو کەموکورییەکانی هێڵی بەرنامە، ستراتیژ، رێکخستن و چالاکی رزگاریان نەبووە.

٥ـ بەهەمان قورساییەوە شیکارکردنی هەرسێ فاکتەرە سەرەکییەکەی مۆدێرنیتە، لەسەر ئەم بنەمایەش لەمیانەی هەموو جۆرەکانی بزووتنەوە کۆمەڵایەتی، رۆشنگەری و رۆشنبیری مەزنەوە، بەرەوپێشبردنی فاکتەرە سەرەکییەکانی مۆدێرنیتەی دیموکراتی وەک ئەڵتەرناتیفێک، ئەرکێکی دەست لێبەرنەدراو و بەپەلەی هەر قۆناخێکی شارستانییە. دوای ئەوەی راست یان هەڵە لە رادەبەدەر سەرمایەداری رەخنەکرا، پێویستە سەری رمەکە ئاراستەی دەوڵەت ـ نەتەوە بکرێت و بە رەخنەکردنی ئیندوستریالیزم تەواو بکرێت، ئەم ئەرکانە لە سێیەمین چاخی پاوانکاری فینانسدا، بەقورساییەوە گرنگیان لە تێکۆشانی کۆمەڵگای دیموکراتی، یەکسان و ئازادیخوازدا بەردەوام دەبێت. بەو ئەندازەیەی دەکەوێتە سەرشانمان، پێشکەشی دەکەین.

چیتر دەستنیشانکردنی ئەو راستییە زەحمەت نییە کە بەهەموو جۆرێک

لە ئاواکردن و تەنانەت بەردەوامکردنی دەوڵەت ـ نەتەوەدا میللیگەرایی ڕۆڵی کەتیرەی بینیوە. لێرەدا سەرنج ڕادەکێشمە سەر ئەو خاڵەی لەم ڕەوشەدا میللیگەراییمان وەک فاکتەرێکی ئایدیۆلۆژی هەڵسەنگاندووە کە ڕۆڵێکی تایبەتی هەیە. ئەگەر بڵێین بە ئاینکردنی ئایدیۆلۆژیای پۆزێتیڤیست ـ عەلمانییە گونجاوتر دەبێت. لە قۆناخی ئاواکردنی سیستەمدا هەرچەندە هەڵوێستە پۆزێتیڤیست و عەلمانییەکان زۆر دووری زهنییەتی مۆدێرنیتەی دیموکراتی بن، بەڵام لە تێپەڕکردنی دۆگماتیزمی نەریتی باودا ڕۆڵێکی ئەرێنییان بینی. ڕۆڵیان لە پێشکەوتنی شۆرشەی زانستی هەبوو. بەڵام لەبەرئەوەی لە لایەکەوە سیستەم لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە سەرکەوتنی سیاسی و ئابووری بەدەست هێنا، لەلایەکی دیکەشەوە بەهۆی بەردەوامی هەڕەشەی مەیلی دیموکراتییەوە، هەروەکو لەتەواوی شارستانیدا بینراوە، لەلایەنی ئایدیۆلۆژییەوە بەرەو ئایین خزاوە. میللیگەراییش بە زیادەوە ئەم پێویستییەی جێبەجێ دەکرد.

دوای ئەم ڕوونکردنەوەیەی بە ئامانجی چاوڕوونی دەرهەق بە دەوڵەت ـ نەتەوە ئەنجامماندا، لەسەر بنەمای گرنگی بابەتەکە تاقیکردنەوەی شیکارێکی بەرجەستەو وردتر ئەزموون بەخشەو پێویستییەکە.

ا ـ ئەگەر بەشێوەیەکی فراوانتر پێناسەی بکەین، دەتوانین چوارچێوەی یەکێتی حقوقی تاکەکان (هاووڵاتی) و ئامێرەکانی دەسەڵات کە لە قۆناخی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا لەناو تەواوی کۆمەڵگادا بڵاوبوونەتەوە بە دەوڵەت ـ نەتەوە ناو ببەین. لێرەدا زاراوەی دیاریکەر دیاردەی دەسەڵاتە کە لەناو تەواوی کۆمەڵگادا بڵاوبۆتەوە. مەشروعییەتی تەواوی دەوڵەتەکانی پێشووتر بە دەزگا و کادیرەکانی خۆیانەوە سنوورداربوو. لە دەوڵەت ـ نەتەوەدا ئەم سنوورە دەبەزێنرێت. ئەوەی بە هاووڵاتی ناو دەبرێت یاخود ئەو تاکانەی خوازیارە بەگوێرەی بەرژوەندییە ئایدیۆلۆژی، دامەزراو و ئابوورییەکانی خۆی ئاوایان بکات، هەروەکو بڵێی ئەندامێکی ماف و ئەرکەکانی دەوڵەتن، دەکرێن بەموڵکی دەوڵەت، ئەمەش ناوەڕۆکی دەوڵەت ـ نەتەوەیە. ئاواکردنی هاووڵاتیتی لە سەرووی ئەو بابەتانەوە دێت کە دەوڵەت ـ نەتەوە گرنگییەکی زۆری پێدەدات. لەم پێناوەشدا

هەوڵدەدات سوود لە چەندین فاکتەری وەک ئایدیۆلۆژی، سیاسی، ئابووری، حقوقی، کلتووری، رەگەزی، سەربازی، ئایینی، پەروەردە و میدیا وەربگیرێت.

١ـ میللیگەرایی (نەتەوەپەرستی) بەکاریگەرترین ئامرازی ئایدیۆلۆژییە. بەهای ئایینێکی نوێی هەیە. میللیگەرایی پیرۆزییەک بە دەوڵەت ـ نەتەوە دەبەخشێت کە لە شێوەی "دۆخی خوداوەند لەسەر زەوی" دایە. خۆبەختکردن و مردن لە پێناویدا، وەک بالاترین بەها پەسەند دەکرێت، ئەمەش پێویستییەکی ئایینە نوێیەکەیە.

٢ـ بەشێوەیەکی بەردەوام هێزی کاریگەری و سەرنج راکێشی دەسەلاتی سیاسی بەکاردەهێنرێت بۆ ئەوەی تاک بکرێت بە هاوولاتی. بە تایبەتی پارتە سیاسییەکان بۆ ئەم ئامانجە رۆل دەبینن. جێگرتن لە دەسەلات و گووتەی: " دەوڵەتی خۆم" بۆ تاک کورت ترین رێگای متمانە و ئارامییە.

٣ـ لەبەرئەوەی خەسلەتی پاوانخوازی ئابووری دەوڵەت لە رێگای شۆرشی پیشەسازییەوە بەرفراوانتر بوو، پاوانکاری پیشەسازیش زۆر گەشەی کرد، تەنانەت نیوەی کۆمەڵگا وەک کرێکار ـ فەرمانبەر لە دەزگاکانی دەوڵەتدا دەخرێنە خزمەتەوە. بە تەنیا ئەم رەوشە بەشی هەرە زۆری کۆمەڵگا دەخاتە ناو پێشبرکێوە بۆ ئەوەی ببنە ئەندامی دەوڵەت ـ نەتەوە، واتە ببن بە هاوولاتی. زەحمەتە پاوانەکانی (بەناو) تایبەت لەگەڵ پاوانەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە لەیەکتر جیابکرێنەوە. رەوشێکی بەهێزی یەکێتی و هاوبەشی لە نێوان هەردووکیاندا جێگای باسە. زەحمەتە جیاوازییەکی بەمجۆرە بکرێت: پاوانەکانی دەوڵەت لە کوێ دەستپێدەکات و لەکوێ تەواو دەبێت، لەکوێ لە پاوانی تایبەت جیا دەبێتەوە. لەکاتێکدا پاوانی تایبەت نیوەی زیاتری قازانج دەداتە دەوڵەت، دەوڵەتیش وەک جۆرێک لە ئیلتزاماتی هاوچەرخ لە بەرامبەردا ئاسانکارییەکی بێ سنوورییان بۆ دەکات. لەم سۆنگەوە لەبواری گۆرینی تاک بۆ هاوولاتی هەندێک جار پاوانی تایبەت زۆر لە دەوڵەت کۆنەپەرست ترە. چونکە بەبیانووی بێکارییەوە زۆر بەئاسانی دەتوانێت بەپێی داخوازییەکانی خۆی

پەروەردەی بکات. مەحافەزەکاری سەندیکاکان لەم قۆناخانەی دواییدا و گۆڕانیان بۆ نەتەوەپەرستی دەوڵەتی گرێدراوی ئەم گۆڕانکاریانەیە. لە ڕێگای سۆسیالیزمی بونیادنراوەوە کرێکاران دەکرێنە ملیتانی دەوڵەت ـ نەتەوە.

٤ـ پەیوەندی حقوق بە هاوولاتێتیەوە زۆر دیارو لەبەرچاوە. هەرتاکێک بخوازێت کاری مەیسەر بێت ناچارە خاوەن ناسنامەی دانیشتوان (نفوس) بێت. ناسنامە بۆخۆی بە واتای هاوولاتێتی دەوڵەت دێت. گوزارشتێکی ڕەمزی ئەندامێتی دەوڵەتە.

٥ ـ هۆشیاری دەوڵەت و دەسەلات کە بەدرێژایی مێژوو بە زیندوویی هێلراوەتەوە، واتە نەریتەکەی کۆمەکێکی گرنگ پێشکەش بە شێوەگرتنی هاوولاتێتی دەکات.

٦ ـ کاریگەری ڕەگەز سەرچاوەکەی ئەو تێگەیشتنەیە کە لە ئۆجاخی خێزاندا باوک وەک نوێنەری دەوڵەت دەبینێت. لەماڵەوە هەرپیاوێک لەبەرامبەر ژندا بە واتای دەوڵەت دێت. ئەم تێگەیشتنە سەبارەت بە تەواوی کۆمەڵگا جێگای باسە. دەوڵەت ـ نەتەوە ئەم تێگەیشتنە زیاتر پەروەردە دەکات و هەوڵدەدات بەگوێرەی خۆی بیگونجێنێت.

٧ ـ دەزگای سەربازی وەک سەرەکیترین بەهای دەوڵەت ـ نەتەوە لەمێشک و سۆزی ناسنامەی تاکدا نەخش دەکرێت و لەسەرووی دەزگاکانی دەوڵەتەوە دێت کە سەرلەنوێ پێدەگەیەنرێت. هەر دەزگایەکی دەوڵەت ـ نەتەوە ڕۆڵێکی هاوشێوەی هەیە. بەلام هیچ یەکێکیان بە ڕۆڵی دەزگای سەربازی ناگات.

٨ـ ئایین ئامرازێکە کە لە قۆناخی دەوڵەت ـ نەتەوەدا هەرەزێدە میللیگەرایی بەکاریهێناوە، ڕاستەوخۆ کراوە بە ئایینی دەوڵەت ـ نەتەوە. ئایین هەم دەکرێت بە نەتەوەیی، هەم دەکرێت بە نەتەوەپەرستی، بەمجۆرە لە قۆناخی دەوڵەت ـ نەتەوەدا وەک دەزگایەکی کۆمەلایەتی بەرەوشێک دەگات کە هەرەزێدە لەگەڵ ناوەڕۆکە ئەخلاقییەکەی خۆیدا ناکۆکە. توێژەکانی کۆمەڵگاکە لەدەرەوەی نەتەوەپەرستی عەلمانی دەمێنێت، لەمیانەی نەتەوەپەرستی ئایینەوە دەیانکات بە بەندە نوێکانی

خوداوەندی کۆن و بەمجۆرە دەیانکات بەیەک، بەمشێوەیە جۆرێک لە خیانەتی ناوخۆش ئەنجامدەدات. پێکدادانی نێوان ئایین ـ عەلمانییەت لە نزیکەوە گرێدراوی ئەم خیانەتەیە.

٩ـ پەروەردە لە خوێندنی سەرەتاییەوە تا دەگاتە زانکۆ بەکاریگەرترین دەزگای مۆدێرنیتەیە بۆ ئەوەی تاک بکات بە هاوولاتی. سەبارەت بەم بابەتە لەگەڵ دەزگا سەربازییەکاندا لەناو پێشبڕکێدایە. ئامانجی لەپێشینەی ئەم دەزگایانە ئەوەیە هاوولاتییەکی گەمژە بۆ مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پێبگەیەنن، ئەمەش بەوەی بەها هەمەجۆرەکانی تەواوی قۆناخەکانی مێژووی کۆمەلایەتی لە پالاوتگەی ئایینگەرایی و نەتەوەپەرستیدا دەپالێون، واتا لە بۆتەی ئایدیۆلۆژیای فەرمیدا دەیان شێلن. سەبارەت بەم بابەتە سۆفتاگەرێتی[1] چەندین میل باوەڕییەکانی چاخی ناوینی لە دواوە جێهێشتووە.

١٠ـ میدیاکان بەکاریگەرترین ئامرازی مۆدێرنیزمە بۆ شووشتنەوەی مێشک و دڵ. ئەم ئامێرانە لە ڕێگای سوود وەرگرتن لە تەکنۆلۆژییەکانی گەیاندنەوە ئاسانکارییەکی مەزن پێشکەشی دەوڵەت ـ نەتەوە دەکەن بۆ پێگەیاندنی ئەو هاوولاتییەی مەبەستێتی. بە تایبەتیش سێکس، سپۆر و هونەر فوویان تێدەکرێت و لە ناوەڕۆکی خۆیان خاڵیدەکرێنەوەو پێشکەش بەکۆمەڵگا دەکرێن، بەمجۆرەش میدیا رۆڵێکی سەرەکی دەبینێت لە ئاواکردنی هاوولاتییەکی گەمژە، پووچ و سڕکراودا.

لە ڕێگای ئەم پەیڕەو و ئامرازانەوە کە وەک سەرەدێر ئاماژەمان پێکردن و دەتوانین زیاتریشی بژمێرین، جۆرێکی هاوولاتی پێگەیەنراوە کە لەهیچ قۆناخێکی مێژوودا نەبینراوە. ئامانجی سەرەکی ژیانی ئەوەیە ببێتە خاوەنی ئۆتۆمبیل + خێزان (دۆزینەوەی ژن یان مێرد و ببێتە خاوەنی چەند منداڵێک) + خانوو، ببێتە بەرخۆر(مستهلک)ێکی هەمیشەیی و رۆژانە. لەپێناو هەرزانترین  ئارەزووە تاکڕەوێتییەکانیدا زۆر بە سانایی دەستبەرداری واتای کۆمەڵگابوون دەبێت. لەبەرئەوەی لە یادگا بێبەشکراوە، لەمێژوو دابڕاوە. ئەوەی بەمێژووی دادەنێت کلێشە

[1] سۆفتاگەرێتی: باوەڕکردنە بە بۆچوون یان باوەڕییەک بەشێوەیەکی کوێر و موریدانە.

نەتەوەیی میللیگەراکانە. بێ فەلسەفەیە. یاخود بەدەر لە بچووکترین سوودمەندبوونەکانی هیچ باوەڕ بە هەبوونی فەلسەفەیەکی تری بەختەوەری نییە. لە رووخساردا هاوچەرخە. لە ناوەڕۆکیشدا تاکی **"میگەلی هاوولاتیان"**، **"کۆمەڵگای جەماوەر"**ێکە کە پووچە، بێ ناوەڕۆکە، بۆ کەوتنە شوێن فاشیزم ئامادەکراوە. راستتربڵێین نەبوونی بە تاک جێگایە باسە.

چەندین رۆمانی هێژا لەبارەی رۆڵی ئەم چەشنە هاوولاتییەوە نووسراوە کە بەرەو فاشیزم ئاراستە دەگرێت. سەبارەت بەم بابەتە چەندین نووسەری بەناوبانگ هەن. بەتایبەتیش ئەو رۆمانانەی پشتیان بە شیکارکردنی کۆمەڵکوژییەکان بەستووە زۆر هێژان و ئەزموون بەخشن. ئەو رەخنانەی بەم دواییانە لەژێر کاریگەری پۆست مۆدێرنیزمدا دەرهەق بە **"هاوولاتی"** کراوە چەندەی بڵێی رۆشنکەرەوەیە.

دەوڵەت ـ نەتەوە و کۆمەڵگاکەی کە ئەم جۆرە هاوولاتییەیان بەرهەمهێناوە لەسەرووی ئەو کۆسپانەوەن کە لە بەردەم مۆدێرنیتەی دیموکراتیدان. لەم سۆنگەیەوە یەکێک لە ئەرکە سەرەکییەکانی دیموکراتیزە بوون، دوای شیکردنەوەی کۆمەڵگا و خودی دەوڵەت ـ نەتەوە کە ئەم جۆرە بە تاک نەبوونە (چونکە لە راستیدا تاک بەنەبوو لە قەڵەمدەدات)ی خولقاندووە، پێگەیاندنی تاکی دیموکرات، یەکسان و ئازادیخوازە(هاوولاتی ئازاد) کە شارستانێتی دیموکراتی ئاوا دەکات.

ب ـ بینینی پەیوەندی ئۆنتۆلۆژیانەی نێوان دەوڵەت ـ نەتەوە و فاشیزم زۆر بایەخدارە. یەکێک لەو هەڵە سەرەکییانەی سەبارەت بە فاشیزم کراوە، یان پەیوەندییەکەی لەگەڵ سیستەمی دەوڵەت ـ نەتەوە هیچ نەبینراوە و روون نەکراوەتەوە، یان کاتێک وەک رۆژی نیوەڕۆ ئاشکرابووە بەچەند دەمە قەڵەمێک خواستوویانە تێپەڕی بکەن. ئەمە لەکاتێکدا کە هەر ئەم شیکارەی بەشێوەی گەلالەیەک پێشکەشمان کردووە توانیویەتی خزمایەتی رەچەڵەکیانەی فاشیزم لەگەڵ ئایدیۆلۆژی رۆشنگەری (بە ئایدیۆلۆژییە پۆزیتیڤیستە عەلمانییەکانیشەوە) بخاتەڕوو. شێوەی سەرەکی دەسەلاتی مۆدێرنیتەی فەرمی دەوڵەت ـ نەتەوەیە،

ئایینە نوێیەکەشی میللیگەرایی (نەتەوە پەرستی)یە. ئەو کۆمەڵگایانەی بە پاڵاوتەی نەتەوەپەرستی و دەوڵەت ـ نەتەوەدا تێپەڕ دەکرێن، کۆمەڵگایەکن بەردەوام بۆ بەرهەمهێنانی فاشیزم ئامادەن. مەحاڵە بەبێ دەوڵەت ـ نەتەوە بیر لە فاشیزم بکرێتەوە . هەڵبەتە ناتوانرێت دابڕاو لە گوزارشتی قاڵکراوەی پاوانخوازی ئابووری (بازرگانی + پیشەسازی + فینانس) بیرلە دەوڵەت ـ نەتەوەش بکرێتەوە.

بینینی رەگەکانی فاشیزمی هیتلەر لە ئایدیۆلۆژیای ئەڵماندا زەحمەت نییە. تاکە ریگای هەنگاونان بۆ بۆرژوای ئەڵمان قاڵبوونەوەی پاوانخوازی بوو بەشێوەی دەوڵەت ـ نەتەوە. بەدرێژایی سەدەی نۆزدەهەم ئاواکردنی ئەم جۆرەی دەوڵەت لە بواری ئایدیۆلۆژی و ماددیدا گرنگترین کار و سەرکەوتنی بۆرژوازی ئەڵمان و ئایدیۆلۆگەکانیان بوو. چیرۆکەکەی درێژە، ناتوانم باسی بکەم. هەڵبەتە رۆڵی ئایدیۆلۆگ و سەرمایەی یەهودیش لەمەدا بچووک ناکرێتەوە. هەروەکو چۆن سەدان توێژینەوە سەلماندوویانە کە پەیوەندییەکی دیالیکتیکی لە نێوان یەهود ـ یەهودیگەرایی و میللیگەرایی ـ فاشیزمی ئەڵمانەکان لە ئەڵمانیا هەیە، هەڵوێستە تیۆرییەکەشمان ئەم پەیوەندییەی سەلماندووە.

مۆدێلی ئەڵمانی بووە بە سەرچاوەی ئیلهامی تەواوی بزووتنەوە میللیگەراییەکان و دەوڵەت ـ نەتەوەکانی دواتر. لەسەررووی هەموویانەوە سۆسیالیستەکان، تەواوی دژە فاشیستەکان گەورەترین لاوازییان ئەوە بوو پەیوەندی سیستەماتیکی نێوان دەوڵەت ـ نەتەوە + پاوانەکان (پاوانی دەوڵەت و تایبەت) + فاشیزمیان نەدیبوو. لەمەش بەولاتر بەشێوەیەکی گشتی پەیوەندی ئۆنتۆلۆژیانەی نێوان مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و فاشیزمیان شینەکردبۆوە.

ج ـ دەوڵەت ـ نەتەوە و مەسەلەی یەکێتی سۆڤێت بابەتێکی دیکەیە کە تائێستا گرنگییەکەی خۆی دەپارێزێت و چاوەڕوانی شیکردنەوەیە. کاتێک هەر لەسەردەمی مارکس و ئەنگلسەوە دەوڵەت ـ نەتەوەی ناوەندی ئەڵمانیا وەک چوارچێوەی سەرەکی تێکۆشانی چینی کرێکار پەسەندکرا، ئەمە بوو بە دایکی گشت هەڵەکان. بە کۆنەپەرست لە قەڵەمدانی پێکهاتە

کۆنفیدراڵییە دیموکراتییە بەهێزەکانی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم کە پشت ئەستوور بە یاخیبوونەکانی شار و گوندەکان سەریانهەڵدابوو، هەروەها پشتگیریکردنی دەوڵەت ـ نەتەوەی ناوەندی بە تایبەتی بۆچوونی مارکس و ئەنگلس بوو. لەو بڕوایەدام رەخنە و بۆچوونەکانی باکۆنین و کرۆپۆتکین سەبارەت بەم بابەتە تائێستاش هەنووکەیین. ئەم چەسپاندنەی مارکس و ئەنگلس هۆکاری سەرەکی لەبارچوونی یەکەمین و دووەمین ئەنتەرناسیۆنالیزمە. بەشێوەیەکی بابەتی رێککەوتنێک لەگەڵ بۆرژوازی پیشەسازی ئەڵمانیدا جێگای باسە. ئەم خاڵە بەشێوەیەکی ئاشکرا نووسراوە. ئەنجامەکەی، ئاسیمیلەبوونە لەناو دەوڵەت ـ نەتەوەدا. چیرۆکی سەد و پەنجا ساڵەی مارکسیزم، چیرۆکی بوونە قوربانی ئەم هەڵەیەیە.

ئەزموونی سۆڤێتەکان و چینی رۆژی ئەمڕۆمان نموونەی هەرە سەلمێنەرن. روسیاش بەرلەوەی بگاتە ساڵی ١٩٢٠ پێکهاتەی دیموکراتییانەی سۆڤێتەکان کۆتایی پێهاتووە. ئەوەی مابۆوە لە رێگای، مۆدێلی دەوڵەت ـ نەتەوەوە ئاواکردنی سۆسیالیزم بوو لە تاکە وڵاتێکدا. بەم ئامانجەش تەواوی رکابەرەکان پاکتاوکران، جووتیاران لەناوبراون کە لەسەررووی هێزە دیموکراتییەکانەوە دەهاتن، رۆشنبیرانیش بێدەنگ کران. ئەوەی دەرکەوتە مەیدان سۆسیالیزمی فیرعەونی مۆدێرن بوو. مۆدێرنیتەی دیموکراتی بە ئەقڵیشدا تێپەڕ نەبوو. راستتر بەربەستکرابوو. ئەو دیموکراسیەش دیسان بە رەوشێکی لەبارچوویی لە ساڵانی ١٩٩٠کان بەدواوە دەکەوێتە رۆژەڤەوە. بەراستی نابینم کە بەرامبەر بە فاشیزمی هیتلەر گووتەی فاشیزمی ستالین بەکاربێنم، هەردووکیان دوو بزووتنەوە و دوو کەناڵی جیاوازن. بەڵام سۆڤێت ئەزموونێکی مێژووییە کە بەشێوەیەکی کاریگەر نیشانیدەدات سۆسیالیزم نەبووە، سۆسیالیزمێک شارستانێتی دیموکراتی بەبنەما نەگرێت سەرناکەوێت.

ماو بە دیموکراسییەوە خەریک بووە. رەخنەکردنی بۆ سۆڤێت گرنگە. ئەو شۆڕشە کلتوورییەی بەرپای کردووە بەڵگەی ئەو راستییەیە کە دەرکی بەهەندێک هەڵە کردووە. بەڵام ئاستی تێگەیشتنی ماو، هەروەها

ئەو پەیڕەو و ئامرازانەی پشتی پێبەستووە ئەو هێزەی نەبوو بە هەڵەداچوونی مارکسیستی و ئەزموونی سۆڤێت تێپەڕبکات. چینی ڕۆژی ئەمڕۆمان زۆر شت ڕووندەکاتەوە.

بزووتنەوەکانی ڕزگاری نیشتمانی کە زۆربەیان لەسەر ڕێبازی سۆسیالیزمی بونیادنراو پێشکەوتوون، هەر لەسەرەتادا دەوڵەت ـ نەتەوەیان وەک بەرنامە(ئامانج)ی هەرە بەرزی خۆیان داناوە. کاتێک ئەم خاڵە بێنینە بەرچاوان کە ئەو مۆدێلەی ئاوایانکردووە تەنیا لەمیانەی هاوبەشی و هاوکاری لەگەڵ پاوانە سەرمایەدارییەکانی لەجۆری وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا، یەکێتی ئەوروپا، سەندوقی دراوی نێودەوڵەتی (IMF) و بانکی جیهانییەوە دەتوانێت لەسەر پێیان بوەستێت، ئەو کاتە نابێت بەرامبەر بە پێکهاتە نادیموکراتی و مەحافەزەکارەکەیان واقمان وڕ بمێنێت.

خەمناکترین نموونە سۆسیالیزمی بەعسی سەددامییە. بۆ ئەوانەی خوازیاری تێگەیشتنن ڕووداوێکە، نموونەیەکە لەبەهای زێڕدا.

"**دەوڵەتی خۆشگوزەرانی**" سۆشیال ـ دیموکراتەکان شتێک نییە لە دەوڵەت ـ نەتەوە جیاوازتر بێت. هەروەها سۆشیال ـ دیموکراتەکانی ئەڵمانیا کە سەبارەت بەم بابەتە لە دونیادا ڕێبەرایەتی دەکەن، لەمیانەی ئابوورییەکەیان و ئەو زیانەی هیتلەر بە دەوڵەت ـ نەتەوەکەیانی گەیاند قازانجێکی زیاتریان بەدەست هێناو تاکو ئێستاش شوێنە تۆکمەکەی خۆیان دەپارێزن. بەرامبەرەکەشی یان باجەکەشی 'خەساندنی' بزووتنەوە دیموکراتییەکانی جیهان و کردنیان بوو بە یەدەگی بۆرژوازی خۆیان!

د ـ یەکێک لەو ئەنجامە مەترسیدارانەی دەوڵەت ـ نەتەوە لەگەڵ خۆیدا هێنا، ئەو بزاوتەی پاکتاوکردن، ئاسیمیلەکردن و وێرانکردنەی میراسی کلتووری بوو کە ڕێگای لەپێش کردەوەو هاوتاکەی لە مێژوودا نەبینراوە. یەکێک لە خەسڵەتە هەرە جیاکەرەوەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە ئەوەیە پشت بە نەژاد ـ نەتەوەیەکی سەردەست دەبەستێت، کلتووری هەزاران ساڵەی تەواوی ئەتنیکەکانی دیکە بە نەبوو دادەنێت (یەک زمان، یەک نەتەوە، یەک وڵات و یەک دەوڵەت دروشمی سەرەکی هیتلەر بوو) لەسەر ئەم

بنەمایەش پاکتاویان دەکات، ئاسیمیلەیان دەکات. ئەم بزاوتانەی هیچ هێزێکی ئایدیۆلۆژی و سەرکوتکار لەمێژوودا بەکارینەهێناوە پەیوەندی بە پێکهاتەی دەوڵەت ـ نەتەوەوە هەیە. سیاسەتە بنەڕەتییەکانی کلتوورەکەی لە تاکەکانە و بریتییە لەو دەزگا و هاوولاتیانەی لەیەکتری دەچن، ئامانجیشی خوڵقاندنی چۆڵەوانییەکی یەک رەنگە کە یان رەشێکی تێر یان تەواو سپییە. خواستوویانە داروینیزم، واتە بایۆلۆژیزم لەسەر کۆمەڵگاش جێبەجێ بکەن. یەکێک لە ترسناکترین هەڵەکانی پۆزیتیڤیزم سەبارەت بەم بوارەیە. تواندنەوەی تەواوی کلتوورەکان لەلایەن بەهێزترین کلتوورەوە بە رێسای گەشەسەندن دادەنێت. هەڵبەتە ئەمەش لە رێگای بە نەبوو دانانی گەشەی ملیۆنان ساڵی مرۆڤ یان لەناوبردنییەوە!

ئەگەر لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا هەنگاو بەهەنگاو کلتوور تەنک (کاڵ) بۆتەوە، کاریگەری ئەفسوونی خۆی لە دەستداوە، بە رەوشێک گەیشتووە نهێنی و ئیلهام نابەخشێت، هۆکارەکەی بۆ ئەم کردەوە بلدۆزەرییەی دەوڵەت ـ نەتەوە دەگەڕێتەوە کە لەسەر نەریتی کلتووری بەڕێوەیبردووە. هەزاران زمان، دەیان هەزار تیرە، خێڵ، قەوم، پاشماوەی دێرین و شێوە جیاوازەکانی ژیان، واتە بەهەزاران کلتوور بوونەتە قوربانی سیاسەتی یەک کلتووری کۆمەڵکوژی. هێشتا دیار نییە کە لە کوێ دەوەستێت. کلتووری دەوڵەت ـ نەتەوە، تاکی ـ نەتەوە و کۆمەڵگای ـ نەتەوە کە لە یەک رەنگ پێکدێت تەنیا بە ئافراندنی فاشیزمەوە ناوەستێت، ژیان دەکات بە چۆڵەوانییەک، دەبێتە دڕندەیەک کە تەنیا لە ئامانجێک دەگەڕێت بۆ ئەوەی شەڕی لەگەڵدا بکات. ئەنجامەکەی ئەو شەڕە ئەتنیکی، ئایینی و کلتوورییانەیە کە لەژێر باریان دەرناچین. رۆژگاری ئەمڕۆمان بەم شەڕانە سەرەو ژێرکراوە. هیتلەر سەرەتای ئەم کلتوورەی شەڕە و بەها سیمبۆلیەکەیەتی. رۆژی ئەمڕۆمان بریتییە لەدۆخی بوون بەراستی ئەم سیمبۆلە. دیسان بۆ ئەوانەی دەیانەوێت بزانن و تێبگەن رووداوەکانی ئێراق لەبەرچاوانە.

هەروەکو لە دووەمین شەڕی جیهانیدا روویدا دەوڵەت ـ نەتەوە تەنیا بزاوتێکی شەڕی سیاسی و سەربازی دژ بە دەوڵەتەکان و ئەو کلتوورانە

نییە کە دەرکەوتوونەتە پێش. بزاوتی شەڕێکی کۆمەڵایەتی سەرتاسەرییە بەرامبەر هەر پێکهاتەیەکی نوێی جیاوازی نەریتی مێژوویی ـ کۆمەڵایەتی کە جێگای هیوا بێت. هەبوونی لۆژیکی تاکانەیی لەجۆری یەک نەتەوە، یەک دەوڵەت، یەک زمان و یەک نیشتمان کە هەر لە دامەزراندنیەوە لەناو ئامانجە ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەدا هەیە، هەرچەندە هەندێک جار شاراوەو جارانێکیش ئاشکرا، هەندێک جار خوێناوی و هەندێک جاریش دیماگۆژییانە بووبێت جگە لە هەبوونی شەڕێکی هەمیشەیی بەردەوام لە گشت بەرەکاندا، هیچ واتایەکی دیکە نابەخشێت.

هـ ـ دەوڵەت ـ نەتەوە لە گۆڕەپانی سیاسیشدا گرنگی تایبەت بە یەک جۆری دەدات. جێگا بە ناسنامەی نەتەوەیی جیاواز و پێکهاتەی سیاسی جیاواز نادات. مەبەستی لە دەوڵەتی ناوەندی بە واتایەکی دیکە مەبەستی لە دەوڵەتێکی یەککگرتوو ئەوەیە کە جیاوازییەکان لە مافی سیاسەت بێبەش بکات، کە لە راستیدا یەکێک لە مەرجە سەرەکییەکانی دیموکراتیزەبوونە. ئەمە بە هەڕەشەیەک دەزانێت بۆ سەر یەکپارچەیی دەوڵەت. لەم چوارچێوەیەدا بەگومانەوە تەماشای دانان بە بچووکترین دەسەلاتی بەڕێوەبەرایەتی خۆجێییەکان (شارەوانییەکان) دەکات. بیرۆکراسی ناوەندی هێزی سەرەکی و لاشەی دەوڵەت پێکدێنێت. دەوڵەت ـ نەتەوە، دەوڵەتێکە بیرۆکراسی مۆدێرن ئاوایکردووە. لەناو قەفەسی ئاسنیندا تەواوی کۆمەڵگا دەخاتە ژێر کۆنترۆڵەوە. مەرجە سەرەکییەکانی بۆ پارت و رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی ئەوەیە لەناوەڕۆکدا پێچەوانەی سیاسەتەکانی دەوڵەت نەبن. لەم سۆنگەیەوە بەردەوام پێشکەوتنی رێکخستنە ئابووری، کلتووری، کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان کە پێویستییەکی پرەنسیپانەی دەست لێبەرنەدراوی فرە رەنگی دیموکراسین، وەک هۆکاری هەڕەشە دەبینرێن و دەخرێتە ژێر چاودێرییەوە. رێگای ئاواکردنی بژاری خۆیان پێنادرێت، دەرفەتیان پێنادرێت جێگای خۆیان لەبەڕێوەبەرایەتیدا بگرن. وەک پێویستییەکی بونیادەکەی لەبەرئەوەی دەوڵەت ـ نەتەوە دژی فرەڕەنگی سیاسییە

کەواتە دژە ـ دیموکراسییە. هۆکاری گەشەنەکردنی چەمکی دیموکراسی و سۆسیالیزم (نموونەی ریال سۆسیالیزم) لە چوارچێوەی دەوڵەت ـ نەتەوەدا یان پاکتاوبوونیان، وەکو ئاماژەمان پێکرد بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە یان داکۆکیان لەسەرکردووە یان خۆیان رادەستی کردووە، لە حاڵەتێکدا دەوڵەت ـ نەتەوە و دیموکراسی بەشێوەی دوو یەکینەی جیاواز بەرێککەوتنێکی بە پرەنسیپ بگەن دەشێت باس لە پێکهاتەیەک بکرێت کە بۆ دیموکراسی کراوەیە.

و ـ دەوڵەت ـ نەتەوە تەنیا لە ئاستی تاکدا یەکچەشن (رەنگ)ی ناسەپێنێت، بەڵکو جیهانی سۆزو زهنییەتێکی یەکچەشنی لەتەواوی پێکهاتەکانی کۆمەڵگادا موتوربەدەکات. بەمجۆرە دەسەڵاتی خۆی هەم لەناو تەواوی کۆمەڵگادا بڵاودەکاتەوە، هەم کۆمەڵگای یەکچەشن، کۆمەڵگای دەوڵەت ـ نەتەوە ئاوادەکات. ئامانجی ئاواکردنی کۆمەڵگایەکی کۆرپەراتیڤە (مۆدێلی کۆمەڵگای فاشیزم). نابێت بەهەڵە لە دەسەڵاتدارێتی کۆمەڵگا تێبگەن. پێچەوانەکەی راستە. ئامانجی لەجێگیرکردنی کەسایەتی و دەزگا سیخوڕییەکانی خۆی لە ناو تەواوی خانەکانی کۆمەڵگادا، پەرەپێدانی دەسەڵاتەکەیەتی لەبواری قووڵی و بەرفراوانییەوە. تەنیا لەمیانەی ئەم پەیڕەوەوە کۆمەڵگاکەی بەرقەرار دەبێت. واتە بڵاوبوونەوەی دەسەڵات لەناو کۆمەڵگادا، بە مانای شەڕکردن لەبەرامبەر تەواوی کۆمەڵگا دێت. ئەگەر نا بەواتای دەسەڵاتی کۆمەڵگا نایەت. میشێل فۆکۆ گرنگی بەم خاڵە دەدات. پیاوێتی باڵادەست بەسەر ژنەوە، وەک دەزگایەکی سیخوڕی ئەم رۆڵە دەگێڕێت. کۆمەڵگای رەگەزپەرستی لەرێگای سیاسەتەکانی سێکسەوە وەک نەخۆشییەکی درم رەگەزپەرستی لەناو کۆمەڵگادا بڵاودەکەنەوەو بەمجۆرە لەگەڵ کۆمەڵگادا شەڕدەکەن. بەتایبەتیش ژن لەقووڵاییدا دەکرێت بەکۆیلە. بەئازادی زانین وەک پیاو مامەڵەکردن، ژنێتییەکی دۆڕاوە، تەنانەت قووڵترین شێوەی دۆڕاندنە!

ئیتر رۆڵی سپۆڕ و هونەر لەناو کۆمەڵگادا لەخزمەتی دەوڵەت ـ نەتەوەدایەو کراوە بە دەزگا سیخوڕییە بەکاریگەرەکانی شەڕکردن بەرامبەر بە کۆمەڵگا. بەتایبەتی کلتووری فووتێکراو و بەرنامە وەرزشییەکان

بەشێوەیەکی بەرفراوان بۆ ئەم ئامانجە بەکاردەهێنرێن. بوارەکانی سێکس، سپۆر و هونەر لەلایەن سەرمایەی جیهانگیرییەوە ناوەڕۆکەکەیان خاڵی کراوەتەوەو کراون بە دەزگای سیخوڕی کۆمەڵایەتی هەرە بەهێز، لەم چوارچێوەیەشدا بزاوتی هەرە بەکاریگەری قۆناخی دوایین بۆ شەڕکردن دژ بە کۆمەڵگا. بێگومان کاتێک ئەم هەڵسەنگاندنانە پێشکەش دەکەین وەک هەبوون چالاکی زایەندی، وەرزشی و هونەری مەحکوم ناکەین. بە پێچەوانەوە یەکێک لە ئەرکە سەرەکییەکانی شارستانێتی دیموکراتی ئەوەیە ئەم بوارانە لەسەر بنەمای بەهای ئەخلاقی مەزن بۆ بەختەوەری و خزمەتی کۆمەڵگا بەکاربهێنێت.

لەکاتێکدا وەرزش ئامرازێکی پەروەردەی کۆمەڵگای تەندروستانەیە، لە ئاستی دەوڵەت ـ نەتەوەکاندا کراوە بە ئامرازی شەرەف و ناوبانگی. هەروەکو بڵێی لەناو شەڕدایە، وەرزش خراوەتە ناو مەنگەنەی دوالیزمی دۆڕاندن ـ بردنەوە و کراوەتە ئامرازی شەڕی دەسەڵات. بەتایبەتیش وەرزشی تۆپی پێ وەک پاوانێکی دەسەڵاتی دەوڵەت ـ نەتەوەکان بۆ ئەم ئامانجە بەکاردەهێنرێت. وەرزش هەم کراوە بە موڵکی دەوڵەت ـ نەتەوە هەم کراوەتە گۆڕەپانێکی بەکاریگەری شەڕ لەبەرامبەر کۆمەڵگا.

هونەر دووەمین گۆڕەپانی گرنگی شەڕە لەدژی کۆمەڵگا کە هەم پاوانی تایبەت هەم دەوڵەت خستوویانەتە دەست خۆیان. بەتایبەتی کلتووری پۆپ و ئەرەبێسک[1] ڕۆڵێکی بەهێز دەبینن کە کۆمەڵگا لەلایەن کلتووری رابواردن (کات بەسەربردن)ەوە دیل بکرێت. هەروەک بڵێی سوپایەکی ئەستێرەکان کۆمەڵگایان خستۆتە ژێر ئاگری تیرەکانیانەوە. هونەری کلاسیک لەبەرچاو دەخرێت، کلتووری گەلیش لە ڕێگای پۆپیلاریتییەوە لە ڕۆڵی هەزاران ساڵەی خۆی دوور دەخرێتەوەو کراوەتە ئامرازێک کە بەپێچەوانەوە ڕۆڵ لە پاکتاوکردنیدا دەبینێت. سێکس یان زایەند بەشێوەیەک کراوە بە ئامرازی شەڕی دژ بەکۆمەڵگا کە لە مێژوودا نەبینراوە. هیچ ئامرازێک وەکو سێکس لەشەڕی دژ بەکۆمەڵگا ڕۆڵێکی

---

١ـ ئەرەبێسک: واتە مۆزیک و ڕەقس و هونەری عەرەبی: زاڵکردنی ئەو شێوازە لە هونەرو دوورکەوتنەوە لە هونەری ڕەسەن و خۆجێیی. ئەمە وەکو سیاسەتێک لە تورکیا، سوریا و ئێراقدا بەکارهاتووە، کاریگەری نێگەتیڤیشی لەسەر هونەر و مۆسیقای کوردی زۆرە.

هێندە بەکاریگەر نابینێت.

ئەو بابەتەی کە خوازیارم لەبەشی کائیوس و کۆمەڵناسی ئازادییدا بەشێوەیەکی بەرفراوان تاوتوێی بکەم، وەک تێبینییەک لەناو کەوانەدا ئاماژە بەم خاڵە دەکەم: بۆ هەر پیاوێک چالاکی زایەندی بووە بەچالاکییەکی دەسەڵات. کرداری زایەندی لە رۆڵی بایۆلۆژی خۆی بەدەرنراوە کە بۆ بەردەوامکردنی ژیان و رەگەز پێویستە یاخود شێوێنراوە، لە گۆرەپانی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا بۆ بڵاوبوونەوەو زیادبوونی بێ سنووری دەسەڵاتی پیاوسالاری وەرچەرخێنراوە. کرداری زایەندی بۆ چالاکی دەسەڵات گۆڕاوە. لە تەواوی شێوەکانی پەیوەندی سێکسی لەجۆری هۆمۆ، هێترۆ.. هتد دا پەیوەندی دەسەڵات رۆڵی دیاریکەری تێدا دەبینێت. لەگەڵ ئەوەی بناخە مێژووییەکەی بەشێوەیەکی بەربڵاو جێگای باسە، لەهیچ شێوەیەکی دەوڵەت و کۆمەڵگادا، هێندەی دەوڵەت ـ نەتەوە و کۆمەڵگاکەی بەشێوەیەکی سیستەماتیک و بەرفراوان بە ئامانجی دەسەڵات (هاوکات بە ئامانجی کۆیلەکردن) بەقووڵی و بەرفراوانی برەویان پێنەدراوە و بەکارنەهێنراون. رەگەزپەرستی کۆمەڵگا دیاردەو رووداوی پەیوەندی نێوان دەسەڵاتی سیاسی و کۆمەڵایەتییە.

دەوڵەت ـ نەتەوە لەمیانەی ئەو سیاسەتانەی لەناوەوەو دەرەوەی خێزان بە ئاراستەی زایەندی بەڕێوەیبردووە تەواو رێگای لەپێش لە رێدەرچوونی دەسەڵاتیانە کردۆتەوە. کاتێک ژن خۆی دەکات بەکاڵایەکی سێکسی، پیاویش خۆی دەکات بە ئامرازی دەسەڵاتی زایەندی، نەک هەم خۆیان و هەم کۆمەڵگا دەخەنە ناو قەیرانی ئەخلاقییەوە، بەڵکو دەبن بە قوربانی شەڕی دەسەڵاتیش.

لە هەرسێ گۆڕەپانیشدا میدیا بەکاریگەرترین ئامرازی شەڕە. هیچ ئامرازێک هێندەی میدیاکانی ژێر کۆنترۆڵی پاوانەکان لەشەڕی بەرامبەر کۆمەڵگادا رۆڵێکی وێرانکەریان نەبینیوە. کاتێک لەلایەن شارستانێتی دیموکراتییەوە بەکاربهێنرێت بێگومان دەتوانێت رۆڵی ئامرازێکی بەکاریگەری دیموکراتیزەبوونیش ببینێت.

سیاسەتەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە لەبارەی زیندان و نەخۆشخانەکانەوە

بەبایەخەوە دادەڕێژرێت، رۆڵێکی گرنگ و کاریگەر لە بەهێزکردنی دەسەڵاتەکەی و دیلکردنی کۆمەڵگادا دەبینێت. ئەوانەی دەکەونە سەر رێگای زیندان و نەخۆشخانەکان، بەرامبەر بە دەسەڵات چەندین بەهای ماددی و مەعنەوی خۆیان لە دەستدەدەن.

لەکاتێکدا دەوڵەت ـ نەتەوە تا موولوولەکانی خوێن دەسەڵاتی خۆی بەسەر کۆمەڵگادا دەسەپێنێت، لە راستیدا دان بەوە دا دەنێت کە بەدوایین کۆتایی گەیشتووە. ئەو دەسەڵاتەی بەم رەوشە گەیشتووە لە دوا خاڵدا لەچەقین رزگاری نابێت. ئەوەی پێویستە بکرێت بڵاوکردنەوەو پراکتیزەکردنی چەمکی چالاکی، رێکخستن و دیموکراتیزەکارانەی شارستانێتی دیموکراتییە لە تەواوی گۆڕەپانەکانی کۆمەڵگادا.

ی ـ بەشێوەیەکی بنچینەیی دەوڵەت ـ نەتەوە بۆ چینی ناوین کاردەکات. لە بناخەی چینایەتیدا چینی ناوین بەبنەما دەگرێت. ئەگەر نا بەجۆرێکی دیکە هەرچەندە لە رووی تیۆرییەوە پێشکەوتنی لەباربێت، بەڵام لەبواری پراکتیکییەوە بەدینایەت. دەوڵەت ـ نەتەوە خوداوەندی هاوچەرخی چینی ناوینە. بە خەیاڵی ئەوەوە دەژیت کە لە زهنییەت و حەسرەتەکانیدا بەو خوداوەندە دەگات (ئەرک و بەرژەوەندییەکانی جێبەجێ دەکات). هەروەکو چۆن کۆمەڵگا ئاشنای رووی راستەقینەی خوداوەندەکانی چاخی کۆن نەبوو و دەیپەرستن، چینی ناوینی مۆدێرنی رۆژی ئەمڕۆشمان لە راستیدا خوداوەندی خۆی ناناسێت (پەیوەست بە مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە). بەڵام ئاگاداری ئەم خاڵەشە، لەو زیاتر هیچ بژارێکی دیکەی نییە. ئەرک وەرگرتن لە بیرۆکراسییەکەی یان پاوانەکانی (وەک پێویستی بوونە خاوەن پیشە)دا بە واتای رزگاربوون دێت. کۆمەڵگا لەخۆیدا دەبینێت. چینێکی زۆر خۆپەرستە. لیبراڵەکان چینی ناوین بە یەکێک لە مەرجە سەرەکییەکانی دیموکراسی دادەنێن. پێچەوانەکەی راستە. چینەکانی ناوین نەک دیموکراسی، ئەو کۆمەڵگایەیە کە فاشیزم کەرەستەکانی خۆی تێدا کۆکردۆتەوە. هەروەکو چۆن پەیوەندی نێوان فاشیزم و دەوڵەت ـ نەتەوە بونیادیانەیە، پەیوەندی فاشیزم و چینی ناوینیش بونیادیانەیە. هەبوونی پەیوەندی بونیادیانەی نێوان فاشیزم و پاوانی سەرمایەداری،

ئەم داوەرییەی دەرهەق بە چینی ناوین ناگۆڕێت. هەبوونی نموونەی ڕێزپەڕ (شاز) تەنیا پشتڕاستکردنەوەیەکە بۆ مەیلە سەرەکییەکە.

لەکاتێکدا دیموکراسی لیبراڵەکان ڕۆڵی چینی ناوین دەبینێت، ئامانجیان ئەوەیە لە گەورەترین گەمەی دیموکراسیدا باڵادەستی بەسەر هێزە راستەقینەکانی کۆمەڵگای دیموکراتیدا بەدەست بێنن و ناوەڕۆکی دیموکراسی خاڵی بکەنەوە. بۆرژوازی لیبراڵ و دیموکراسی لیبراڵ تەنیا لەزەمینەی پێشکەوتنی دیموکراسی بەهێزدا وەک ڕەوتی چەپ دەشێت ئەرێنی بێت. ئەوەی پێویستە لەبەرامبەریدا زۆر ئاگاداری بین، لەڕێ دەرچوونەکانی چینی ناوینە. سەرمایەداری ئەزموونێکی گەورەی بەدەست هێناوە بۆ بەکارهێنانی چینی ناوین لەبەرامبەر تێکۆشانی دیموکراتیزەبوونی کۆمەڵگادا. لە ڕێگای بەخشینی قەرەبوو، دروستکردنی خەیاڵ، ترساندنی بەردەوامی زەمینی ژێرەوەی کۆمەڵگا، بەڕێوەبردنی سیاسەتی ناوخۆ بە بنەما دەگرێت. لەم لایەنەوە دەوڵەت ـ نەتەوە شەڕی چڕکراوەی چینی ناوینە. دیسان لەم چوارچێوەیەدا دەوڵەت ـ نەتەوە خوداوەندی شەڕی چینی ناوینە. بەمجۆرەی تێدەگات، خەیاڵی دەکات و هەر بەمجۆرەش دەیپەرستێت. بەرامبەر ئەم خوداوەندەو ئەو شەڕانەی خەستی کردوونەتەوە، هێزە دیموکراتەکان جگە لە ئافراندنی زهنییەت و چالاکی خۆیان هیچ بژارێکی دیکەیان نییە. بەرامبەر بەم خوداوەندەش تاکە بژار ئەوەیە، ژیانی ئازاد خۆی بکات بە پیرۆزترین بژار!

م ـ کاتێک دەوڵەت ـ نەتەوە هەڵدەسەنگێنین، بەراوردکردنی لەگەڵ هەندێ شێوەی دیکەی دەوڵەت و ناسینی مۆدێلە جیاوازەکانی ناوخۆی ڕۆشنکەرەوە دەبێت. گرنگە دەوڵەت ـ نەتەوە وەک زاراوە و دەزگا لەگەڵ کۆماردا وەک یەک نەبینرێت. هەموو کۆمارێک دەوڵەت ـ نەتەوە نییە. تەنانەت دەشێت پادشایەتییەکانیش دەوڵەت ـ نەتەوە بن. دەشێت هەندێک لە کۆمارەکان بۆ دەوڵەت ـ نەتەوە بگۆڕێت. کۆمار زیاتر بۆ دیموکراسی کراوەیە. پەیوەندییان لەگەڵ کۆمەڵگا بەشێوازی دەوڵەت ـ نەتەوە نییە. بەرامبەر پاوانەکان مەودایەکی زیاتری هەیە. کۆمار ڕژێمی ڕێککەوتن و سازشکارییە، دەوڵەت ـ نەتەوە ڕژێمی داسەپاندنی یەکلایەنەو ئاواکردنی

کۆمەڵگایە بەپێی مەرامەکانی خۆی. کۆمار ڕێککەوتن و هاوسەنگییەکانی کۆمەڵگا ڕەچاو دەکات، دەوڵەت ـ نەتەوەش هەموو جۆرە ڕێککەوتن و هاوسەنگییەک تێکدەدات، ئامانجی گەیاندنە ترۆپکی دەسەڵاتی ناوەندییە: تواندنەوەی جیاوازییە سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابوورییەکان و چەمک و بەها کلتوورییەکان بەبنەما دەگیرێت. دەشێت هاوبەشێتی لە کۆماردا بکرێت. چەندین بۆچوون، کلتوور، ئەتنیک و پێکهاتەی سیاسی جیاواز، بەڕێوەبەرایەتییە خۆجێیی و هەرێمییەکان دەتوانن لەژێر چەتری کۆماردا جێگا بگرن، دەوڵەت ـ نەتەوە وەکو زهنییەت و پێکهاتە دژی ئەم جیاوازیانەیە.

لەمۆدێلەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە بەردەوام باس لە سێ نموونە دەکرێت:

نموونەی فەرەنسا یەکەمین مۆدێلی دەوڵەت ـ نەتەوەیە. فەرەنسا شوێنی لە دایکبوونی دەوڵەت ـ نەتەوەیە. خوڵقکارو خوداوەندەکەی ناپلیۆنە. ناسنامەی سیاسی بە بنەما دەگرن. لەبواری سیاسی و حقوقییەوە بەهێز دەکرێت، بۆ ئەوەی بەرەو فاشیزمێکی لەجۆری ئەڵمانیا نەچێت هەڵوێستێکی نەریتی باوییان هەیە. سەبارەت بە نەژادو ئەتنیکی دەسەڵاتدار دەمارگیر نین. هەر کەسێک لە زمان و کلتووری فەرەنسیدا هاوبەشێتی بکات دەتوانێت جێگای خۆی لە دەوڵەت ـ نەتەوەی فەرەنسیدا بگرێت. تورکەکان ئیلهامیان لەم مۆدێلە وەرگرتووە. لە دونیا شوێنکەوتووانی ئەم مۆدێلە زۆرە.

مۆدێلی ئەڵمانی کلتوور بە بنەما دەگرێت. کلتووری تایبەت بە نەتەوەی ئەڵمان مەرجی هاووڵاتێتی و دەوڵەت ـ نەتەوەیە. مەیلی زیاتری بۆ فاشیزم دەگەڕێتەوە بۆ پێشکەوتنی لەسەر ئەم بنەمایانەوە. کاریگەری لە جیهان کردووە. تورکەکان کەوتوونەتە ژێر کاریگەری ئەم پێکهێنانەشەوە. ئەڵمانەکان ئەم مۆدێلەیان تێپەڕ کردووە.

نموونەی ئینگلیز مۆدێلی هەرە نەرمە. ئینگلیزەکان نەوەک فەرەنسییەکان یەکێتی سیاسی، نەوەک ئەڵمانەکان یەکێتی کلتووری، هیچ یەکێکیان بە بنەما ناگرن. مۆدێلیکی دەوڵەت ـ نەتەوە پێشکەش دەکات کە

بۆ پێکهاتەی سیاسی و کلتووری جیاواز کراوەیە.

ن ـ تاوتوێکردنی دەوڵەت ـ نەتەوە لەبواری زەمەنەوە بۆ تێگەیشتنی گۆڕانکاری و پێشکەوتنەکەی بایەخدارە. بەبێ ئەوەی لەناو مێژووی پێشکەوتنیدا تاوتوێ بکرێت، تەنیا بەوەی جەخت لەسەر ئەوە بکرێتەوە کە فۆرمی سەرەکی دەوڵەتی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە تەواو دەرک بە رۆڵەکەی ناکەین.

لێکەڕینەکانی هۆڵەندا و ئینگلتەرا بۆ دەوڵەتێکی بەکاریگەر بە ئامانجی شکاندنی هیواکانی ئیسپانیا و فەرەنسا لەبارەی ئیمپراتۆرییەتەوە شێوەی دەوڵەت ـ نەتەوەی خستۆتە رۆژەڤەوە. هەم لەبواری دارایی و سیاسییەوە، بە تایبەتیش لە رووی سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی سوپاوە، لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا بالابوونی خۆی بەرامبەر پێکهاتەی سیاسی و سەربازی کۆن سەلماند. سەرەتا بالابوونی دەریاییان بەدەست هێنا. لە کۆتاییەکانی سەدەی شازدەهەمدا زاڵبوون، واتە هەیمەنەی دەریایی کەوتبووە دەست هۆڵەندا و ئینگلتەرا. لەشەڕەکانی سەدەی حەڤدەهەمیش کە لە ئیسپانیا لەسەر خانەدانێتی لەگەڵ فەرەنسا کەوتنە شەڕەوە لە بواری زەمینیشدا بالابوونی خۆیان سەلماند. بەڵام خانەدانەکانی نەمسا و فەرەنسا بەهیچ جۆرێک دەستبەرداری هیواکانی ئیمپراتۆرییەت نەبوون. ئەمەش زۆر گران لەسەریان کەوت. ئیتر شانسی دەوڵەت ـ نەتەوەیان لەدەستدەدا. هەروەها پێکهاتەی دەوڵەتەکانیشیان لەبواری داراییەوە بارگرانییەکی مەزن بوو.

هۆڵەندا و ئینگلتەرا بەرامبەر بە هیواکانی ئیمپراتۆرییەت بەشێوەیەکی سیاسی پشتگیرییان لە ئاواکردنی دەوڵەت ـ نەتەوە کرد. بە تایبەتیش دەرخستنە پێشی دەوڵەتی بروسیا بەشێوەی دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی بەهێز بەرامبەر نەمسا و فەرەنسا سیاسەتێکی بەکاریگەر بوو. سیاسەتێکی دیکەی بەکاریگەر تەواوی رکابەرەکانی ئەورووپا، بەتایبەتیش بەردەوام پشتگیرییان لەوانە دەکرد کە لێکەڕینەکانیان لە بارەی دەوڵەت ـ نەتەوەوە بوو، بەمجۆرە دوژمنەکانی خۆیان لە پەلوپۆ خست. چونکە بەرەنگاربوونەوەی دەوڵەت ـ نەتەوەکان تاڕادەیەک ئاستەم بوو.

ڕێککەوتننامەی ڤێستفالیا ئەنجامێکی ئەم گۆڕانکارییانە بوو. ئەورووپای دەوڵەت ـ نەتەوە بەرامبەر ئەورووپای ئیمپراتۆرییەت هەنگاو بەهەنگاو زەمینەکەی بەهێزتر دەبوو و باڵادەبوو. لەکاتی شۆڕشی فەرەنسادا، ئامانجی ئینگلتەرا ئەوەبوو، پادشا بخات کە ئامادە نەبوو سازشی لەگەڵدا بکات، دیسان رکابەرەکانی بخاتە رۆژەڤەوە. پشتگیری لەهەموو ئەوانە دەکرد کە ناکۆکیان لەگەڵ پادشادا هەبوو. تا رادەیەکیش شۆڕش پلانگێڕییەکی (بەتەواوی نا) ئینگلتەرا بوو. بەڵام دواتر هەنگاونان بۆ کۆمار و لە ڕێگای ناپلیۆنەوە گوزەرکردنی بۆ دەوڵەت ـ نەتەوە حیسابەکانیانی تێکدا. ئینگلتەرا زۆر بەزەحمەت لە دەستی ناپلیۆن رزگاری بوو. هەروەها سیاسەتی بروسیاش ڕووبەڕووی ئەنجامێکی هاوشێوە بۆوە.

نموونەیەکی هاوشێوەی ناپلیۆن لە ئاواکردنی کۆماری تورکیادا دەبینین. کاتێک بەرامبەر بە ئیتحادییەکانی لایەنگرانی ئەڵمان ئینگلتەرا پشتگیری لە ئۆپۆزیسیۆنەکانی لایەنگیری خۆی کرد، هەروەکو بڵێی نموونەی ناپلیۆن دووبارە دەبێتەوە، مستەفا کەمال پاشا توانی لەم نێوانەدا دەربکەوێت. لایەنگرانی ئینگلیز و ئەڵمان دۆڕاندییان. ئینگلتەرا چەندین ئەزموونی سیاسی هاوشێوەی هەیە. پێویستی بە توێژینەوەیەکی ورد هەیە. دەبێت ئەوەش لەبیر نەکەین کە لەگەڵ ماسۆنییەکان بەیەکەوە سیاسەت بەڕێوە دەبەن.

سەرکەوتنی دەوڵەت ـ نەتەوە لەسەر ئاستی ئەورووپا شانبەشانی یەکێتی نەتەوەیی و لەدایکبوونی دەوڵەت ـ نەتەوەکانی ئیتاڵیا ١٨٦١ و ئەڵمانیا ١٨٧١ مسۆگەر بوو. ئەمجارە شەڕی هەژموونگەرایی کەوتە نێوان ئینگلتەرا و ئەڵمانیاوە. ماوەی چل و پێنجساڵی نێوان ١٨٧٠ـ١٩١٤ بۆ هەردوو لایەنیش قۆناخێکی گەڕان بوو بە دوای هاوپەیمانێتیدا. یەکەمین شەڕی جیهانی گورزێکی قورسی لە هیواکانی هەژموونگەرایی ئەڵمانیا وەشاند. دووەمین شەڕی جیهانی جۆرێک لە شەڕی تۆڵە سەندنەوە بوو. ئەنجام ڕووخانە پڕئێشەکەی دەوڵەت ـ نەتەوەی ئەڵمان بوو.

لە ئاکامی شۆڕشی ١٩١٧دا ڕوسیا خوازیاربوو بۆشایی هەژموونگەرایی ئەڵمانیا پڕبکاتەوە. هەربۆیە بەخێرایی سۆڤێتەکان بۆ

دەوڵەت ـ نەتەوە گۆڕان. بەڵام ڕێککەوتنی ئینگلتەرای بە ئەزموون لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەروەکو فەرەنسا و ئەڵمانیا هیواکانی هەژموونگەرایی روسیاشی پووچەڵ کردەوە. هەڵوەشانەوەی فەرمی سۆڤیێت لە ساڵی ١٩٨٩دا بە واتای دەستبەرداربوونی لە بانگەشەی هەژموونگەرایی دەهات. هەژموونگەرایی سێسەد ساڵەی ئینگلتەرا لە ساڵی ١٩٤٥ رادەستی ئەمریکا کرا، بەمەرجێک ئینگلتەرا وەک هاوپەیمانێکی بچووک بمێنێتەوە. سیاسەتی سۆڤیێت بۆ پشتگیریکردنی بزووتنەوەکانی رزگاری نیشتمانی ١٩٤٥ـ١٩٨٩ بەرامبەر هەژموونگەرایی ئەمریکا، ئەنجامێکی شەڕی سارد بوو. شەڕی ساردی نێوان وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیێت قۆناخی زێڕینی دەوڵەت ـ نەتەوەکان بوو. گرژی نێوانیان لە دایکبوونی قارچک ئاسای دەوڵەت ـ نەتەوەکانی ئامادەکرد. پرۆسەی قۆناخی دەوڵەت ـ نەتەوە کە تا ١٩١٤ لە ئەوروپا تەواو بوو، لەسەرەتاکانی ١٩٧٠کانیشدا بەشێوەیەکی سەرەکی لە ئاستی جیهانیشدا تەواو بوو. دووەمین شەڕی جیهانی یەکەمین قەیرانی جددی دەوڵەت نەتەوەی ئەوروپا بوو. یەکێتی ئەوروپا وەک بەرهەمێکی ئەم قەیرانە لەدایک بوو.

بابەتێک کە پێویستی بە رۆشنکردنەوە هەیە: بۆچی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دەوڵەت ـ نەتەوەی وەک مۆدێلێک پێشخست؟ لەگەڵ ئەوەی تەواوی باسەکەمان هۆکارەکانی ئەمە ڕووندەکاتەوە، بەڵام ئەگەر خاڵێکی دیکەی کورتی بخەینەسەر، لەبەرئەوەیە کە ئەم مۆدێلە بەئاسانی دەرفەتی بەگۆڕانکارییەکانی لەشێوەی ئیمپراتۆرییەت نەدەدا. ئەگەر ئیمپراتۆرییەت سەرکەوتنی بەدەست بهێنایە، شانسی پاوانەکانی سەرمایەداری دووبارە وەکو چاخەکانی ناوین دەبوو. لەم سۆنگەیەوە رۆحی خۆیان خستۆتە سەردەستیان، رووبەڕووی هەرچوار هیوا گەورەکەی ئیمپراتۆرییەت بوونەتەوە. تەنیا لە ڕێگای سیاسەتەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەوە توانراوە هیواکانی ئیمپراتۆرییەتی ئیسپانیای ساڵانی ١٥٠٠ـ١٦٠٠، فەرەنسا ١٦٠٠ـ١٨٧٠، ئەڵمانیا ١٨٧٠ـ١٩٤٥ و روسیای ١٩٤٥ـ١٩٩٠ پووچەڵ بکرێتەوە (پێویستە ئیمپراتۆریەتەکانی عوسمانی

و نەمساشی بخرێتە سەر).

هەرچەندە سیفەتی بورژوازی نەتەوەیی بە دەوڵەت ـ نەتەوەکان دەدرێت، بەڵام ئەو راستییەی ئاشکرابووە ئەوەیە، کاریکی پاوانە سەرمایەدارەکانە کە لە بنەڕەتدا بەدوای سیستەمێکی ـ جیهانی نێودەوڵەتیدا وێڵن. تەنانەت نموونەی تورکیا کە وەک توندڕەوترین نەتەوەپەرست دەناسرێت لەرێگای ئەرێکردنی لەلایەن ئینگلتەرا و هاوپەیمانێتی ئەمریکاوە بەڕێوەدەچێت. ئەگەر سیستەمی سەرمایەداری نێودەوڵەتی نەبێت، ناشێت بیر لە لەدایکبوون و پەرەسەندنی دەوڵەت ـ نەتەوە بکرێتەوە. بێگومان بە دەوڵەت ـ نەتەوەکانی سۆڤێت و چینیشەوە. باشترین وەڵامی سیاسی گەرەنتیکردنی قازانجی سەرمایەداری لەسەرووی هۆکارەکانی ئاواکردن و لەسەرپێ مانەوەیەوە دێن. کەی ئەم خەسڵەتانەی خۆیان لەدەستدا، ئەو کاتە پەیتا پەیتا گۆڕان و سەرەتا لەژێر هەژموونگەرایی ئینگلتەرا، دواتریش وڵاتە یەککرتووەکانی ئەمریکادا هەوڵی بەردەوامکردنی هەبوونی خۆیاندا. سیاسەتی سیستەمی ـ جیهان (مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و هەژموونگەراییەکەی) نەبێت، هیچ دەوڵەت ـ نەتەوەیەک ماوەیەکی درێژ لەسەر پێیان نامێنێتەوە. چونکە ئەمە لەگەڵ لۆژیکی سیستەمدا ناکۆکە. ئەوەی ناکۆکە زۆر بە زەحمەتی دەژێت یاخود دەڕووخێت. تەنانەت رادەی بەپێویست بینینی رێکەوتن لەگەڵ وڵاتە یەککرتووەکانی ئەمریکادا لەلایەن چین و سۆڤێتەوە، بۆ خۆی نموونەیەکی دیکەی سەلمێنەری بابەتەکەیە.

لەرەوشێکی بەمجۆرەدا دەتوانین باشتر دەرک بە کۆتاییە تراژیدییەکەی سەددام حوسێن بکەین. سیستەمی نەناسی، یاخود نەیخواست بیناسێت. بۆ لەسەرپێ مانەوە تەنیا شانسێکی هەبوو ئەویش ئێراقی بۆ سیستەمێکی دیموکراتی بەرفروان وەربچەرخاندایە. بەهۆی باوەڕییە بەهێزەکەی بەخوداوەندی دەوڵەت ـ نەتەوەوە ئەم شانسەی بەکار نەهێنا. لەکاتێکدا بەر لە لەسێدارەدانی قورئانی بەدەستەوە گرت کە فەرمایشتەکانی خوداوەندی کۆنی تێدا نووسراوە، بەشێوەیەکی خەمناک ئاشکرابوو کە بەرامبەر خوداوەندە نوێیەکەی سیستەم فریای نەکەوت

و هێزەکەی بەشی رزگارکردنی نەکرد. بەڵام خوداوەندی سیستەم، واتە لیڤی ئەتهانیش لەناو زەلکاوی ئێراقدا دەگەوزێت. تەواوی جوگرافیای رۆژهەلاتی ناوین لە رەوشێکی زەحمەتدایە.

ئەوروپا بەدوای خوداوەندێکی نوێدا دەگەڕێت. شیمانە دەکرێت خوداوەندێک بۆخۆی بئافرێنێت کە ئاشتیخوازترەو شوێن بە حقوق دەدات. هەوڵدەدرێت یەکێتی ئەوروپا وەک بەرپەرچدانەوەیەک بەرامبەر بەرابردووی شەڕانگێزی خۆی پێشبخات کە بەدرێژایی چوارسەد ساڵی تەمەنی نەتەوەبوون و مێژووی دەوڵەت ـ نەتەوە لەناو شەڕی مەترسیداردا ژیاو دواترین نموونەشی دووەمین شەڕی جیهانی بوو. لە رێگای پێشخستنی هزر، باوەڕی و دەزگای نوێ لە گۆڕەپانەکانی ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی و مێژوویدا لەسەر بنەمای هاووڵاتیتی نوێی ئەوروپا و پەیڕەوی پەرەسەندنی (پلەپلە) هەوڵی تێپەڕکرنی لایەنە وێرانکارییەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە دەدات. ئەمەیان جۆرێک لە هەڵوێستی رەخنەدانە. قۆناخێکە پێویستە بە وردی سەرنجی بدرێتی، پێشبینی چۆنییەتی ئەنجامەکەی ناکرێت. هەرچی ئەمریکایە لە رێگای رووخاندنی سەددام و رژێمەکەی کە جۆرێک لە لویسی شازدەهەمی (ئەو پادشایەی لەشۆڕشی فەرەنسا بە گیۆتین کوژرا) شارستانی دەوڵەت ـ نەتەوە بوو، هەڵوێستی رادیکاڵانەی خۆی بەرامبەر ئەو دەوڵەت ـ نەتەوەیە پیشاندا کە بەکەڵکی نایەت. لەوانەیە زیاتر بەشێوازی فیدڕاڵ پەیڕەوی سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی دەوڵەت ـ نەتەوە تاقی بکاتەوە.

تەنگەتاوبوونی وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا لەنێوان مەنگەنەی هەژموونگەرایی و ئیمپراتۆرییەتدا، دەیسەلمێنێت کە بە قۆناخێکی زەحمەتدا تێپەڕدەبێت. بەڕێوەبردنی دەوڵەت ـ نەتەوەکان لە رێگای هەیمەنەیەکی لاوازەوە زەحمەتە. بۆ نموونە پەیوەندییەکانی لەگەڵ تورکیا. لە رەوشی ئیمپراتوریەتدا لەوانەیە گۆشەگیر بێت. هەرەسهێنانی رۆما لە یادەوەرییەکاندا ماوە. بەڵام نەبوونی هێزێکی دیکە کە بانگەشەی ئیمپراتۆرییەت بکات بۆ ئەمریکا شانسێکە. هەمووشتێک ئاماژە بە نیشانەکانی بنبەستبوون دەکات. تەنیا لە رێگای هەژموونگەراییەوە

دەوڵەت ـ نەتەوە بەزەحمەتی توانی تا سەرەتاکانی سەدەی ٢١ مین بەردەوامی بە هەبوونی خۆی بدات. یەکێتی ئەورووپا هەنگاوێکی یەکەمینە بەڵام لە قۆناخی ئاواکردندایە. داهاتووەکەی روون و دیارنییە. نەتەوە یەکگرتووەکان وەک ئاوێنەی دەوڵەت ـ نەتەوە بنبەستبوونەکەی نیشاندەدات. شوێنی چارەسەرکردنی کێشە نییە، ئۆرگانی قورسکردنێتی. یەکێتییە هەرێمی و کیشوەرییەکانیش، لەبەرئەوەی چاوەڕوانی بەلاوەنانی کۆسپی دەوڵەت ـ نەتەوەیان لێناکرێت، ئەگەری بوونیان بەچارەسەری زۆر کەمە، یان نییە. هەم لەناوخۆ هەم لەدەرەوە لەمێژە ئیتر دەوڵەت ـ نەتەوە مۆدێلێکی چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکان نییە.

هەرچەندە لەکاتی دامەزراندندا مۆدێلێکی گونجاو بوون بۆ رووبەڕووبوونەوەی داگیرکاری و کۆکردنەوەی سەرمایە، بەڵام لەمیانەی سەدان بوویەر و نموونەوە ئاشکرا بووە کە لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا مۆدێلێکی رێگرن لەپێش چارەسەرکردنی ناکۆکییە نێودەوڵەتییەکان و سەرلەنوێ سەرهەڵدانی کێشە سیاسییە مێژوویی، کۆمەڵایەتی، کلتووری، ئەتنیکی، ژینگە (ئیکۆلۆژی) و فێمینستییەکانیدا کە لەناوەوە سەرکوتی کردوون.

لەم لایەنەوە کێشەی فەلەستین ـ ئیسرائیل پڕە لەکێشەی لەوجۆرە. هەردووکیشیان وابەستەی مۆدێلێکی دەوڵەت ـ نەتەوەی وشکن. بۆئەوەی کێشەی قودس چارەسەر بکەن یان دەبێت شارەکە پارچە بکەن، یان دەبێت تا دوایی شەڕ بکەن و یەکتری لەناوببەن. ناتوانین نموونەیەکی لەوە باشتر بدۆزینەوە کە بەشێوەیەکی روونتر بنبەستبوون و گرێ کوێرەی سیستەممان بۆ روون بکاتەوە. هەروەها رەوشی ئێراق، ئەفغانستان و لوبنان لەبەرچاوانە. شیمانە دەکرێت ئێران و هەندێکی دیکە لە ریزدا بن. رۆژ بەدوای رۆژ زیاتر ئاشکرا دەبێت کە ئەم مۆدێلە عادیل، مرۆیی، سیاسی و دیموکراتی نییە و شانسێکی بەمجۆرەشی نییە.

دەوڵەت ـ نەتەوە دوای ئەوەی لە ١٩٧٠کان گەیشتە لووتکە، بە تایبەتیش لەگەڵ پەرتەوازەبوونی یەکێتی سۆڤێتدا کەوتە ناو قەیرانێکی قووڵەوە. کاتێک هاوشانی قەیرانەکەی، نەیتوانیوە وەڵامی پرسیارەکانی سیستەم

بداتەوەو ئیتر بووە بە کۆسپ، متمانەی جارانی خۆی لای پاوانخوازی سەرمایەداری لەدەستداوە. لە مۆدێلی یەکێتی ئەورووپادا هەوڵدەدرێت بەشێوەیەکی پلە بەپلە (تدریجی) قەیرانەکە دەربازبکرێت، بەڵام ئەمەش هیوایەکی ئەوتۆ نابەخشێت. گرێدراوی قەیرانی جیهانگیری مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە. رۆژهەڵاتی ناوین ئەو ناوچەیەیە کە دۆخی قەیران تێیدا بووە بە کائیوس. رووداوەکان لە ئاستی سێیەمین شەڕی جیهانیدایە. شێوەیەکی یەکێتی ئەورووپا یاخود پرۆژەی رۆژهەڵاتی ناوینی مەزن دوورن لە وەڵامدانەوەی راستینە و واقیعی ناوچەکە. دەشێت رەوشی کائیوس درێژخایەن بێت. لەوانەیە سیستەم لەژێر پەردەی دیموکراسی ساختەدا هەوڵبدات سەرلەنوێ دەوڵەت ـ نەتەوە ئاوابکاتەوە. پێشخستنی شارستانێتی دیموکراتیش گونجاوترین رێگایە کە هێزە دیموکرات، یەکسانیخواز و ئازادیخوازەکان وەڵامی ئەم پێشکەوتنانەی پێبدەنەوە .

لەرێگای ئەو چارەسەرییەی لەژێر ناوی **"کلتووری دیموکراتی لە رۆژهەڵاتی ناوین و مەدەنییەتی دیموکراتی لەکوردستاندا"** لەبەرگرینامەکەمدا هەوڵی پێشخستنی دەدەم، پرۆژەی کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی ناوچەکە تاوتوێ دەکەم.

ع ـ وەک جیهان بینییەکی هەمەلایەن ئەگەر لایەنی ئەبستمۆلۆژیانەی دەوڵەت ـ نەتەوە تاوتوێ نەکەین ئەوە کەموکورییەکی جدییە. ئەو ناوەرۆکەی تاکو ئێستا خستمانەڕوو نیشانیدەدات کە لە دەوڵەتێک زیاتر پشت بەجیهانبینیەکی زۆر جیاواز دەبەستێت. کارەکانی تۆماس کۆهین[1] لەبواری ئەبستمۆلۆژییەوە گرنگی جیهانبینیەکە دەخاتەڕوو. ئەو بابەتەی گرێدراو بەجیهانبینیەوە لێرەدا دەخوازم روونی بکەمەوە، هێزە سەرسوڕهێنەرەکەی چەواشەکاری دەوڵەت ـ نەتەوەیە. روانگەی زانستی تاکێک کە لەناو زەمینەی دەوڵەت ـ نەتەوەدا پێگەیشتووە ٩٠٪

١ ـ فەیلەسوف و زانایەکی بواری مێژووە. ئەمریکییە و بەڕەسەن لەخێزانێکی سامییە، لەنێوان ساڵانی (١٩٢٢ ـ ١٩٦٦)دا ژیاوە. لەبیرۆکە زانستییەکەیدا دوو زاراوەی سەرەکی جێی باسن: پارادیگما و قەیران. فەلسەفەکەی سێ قۆناخییە. قۆناخی یەکەم ئاسایی (کارایی ئاساییانەی زانست)؛ قۆناخی دووەم ئاوارتەیی و نائاسایی کارایی زانست. سێیەمیشیان قەیرانە. یەکەمیان قۆناخی پێکهێنانی پارادیگمایە، دووەمیان قۆناخی دەرکەوتنی ناکۆکییە لەنێوان بیردۆز و دیاردەکاندا و کەوتنە ناو قەیرانی گەڕانە بەدوای چارسەری بۆیاندا و وەک قۆناخێکی راگوزاریشە لەنێوان پارادیگمای کۆن و نوێدا. سێیەمیان قووڵبوونەوەی قەیرانە بەڕادەیەک کە پارادیگما ناتوانێت چارەسەری بۆ ناکۆک هاتووەکان بدۆزێتەوە و پارادیگمایەکی نوێ سەرهەڵبدات. گرنگترین بەرهەمی "The structure of Scietfic Revolution".

(باوەڕی شیمانەیی خۆمە) دژی ڕاستییەکانە. هۆکارە سەرەکییەکەشی، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە پارادیگمای دەوڵەت ـ نەتەوە لە شێوازی ئاواکردنی هاووڵاتێتییەوە تا تەواوی چین و بوارەکانی کۆمەڵگا بەڕێوە دەبرێت، هۆشیاری مێژوویی و کۆمەڵگایی خۆی تێدا جێگیر کردووە. بەتایبەتیش مێژووی دەوڵەت و نەتەوە کە خۆی ئاوایکردووە (لەناویەکدا ئاوایدەکات) هەروەکو چۆن نکوڵی لە مێژووی گشتی دەکات، تاڕادەیەکی مەزن نکوڵی لەمێژووی نەتەوە، دەوڵەت و کۆمەڵگاکانی دیکەش دەکات یاخود دەیشێوێنێت و دەیکات بە ماتریالی مێژووی خۆی.

هاووڵاتییەک بەم جیهانبینییەدا تێپەڕ نەبێت ئەگەری بوونی بە زانا و زانست ئافراندن مەحاڵیش نەبێت، چەندەی بڵێی زانستەکەی شێوێنراو دەبێت، بەوهێزە ناگات کە بتوانێت شرۆڤەی واتادار پێشبخات. یەکەم دەمارگیرە لە ڕوانگەی سوودو بەرژەوەندی دەوڵەت ـ نەتەوەوە سەیری هەمووشتێک دەکات. تەواوی دیاردەکان بە قاڵبە نەتەوە پەرستییەکەیدا تێپەڕ نەبێت هیچ واتایەکی نابێت. ئەگەری تێگەیشتنی لە زانستی کۆمەڵایەتی نییە. هەروەکو چۆن ڕاسپاردەکانی نەتەوەی شۆڤێنی شانسی بەدەستهێنانی زانست زۆر سنووردار دەکات، تەنیا کاتێک لەگەڵ تێڕوانینەکانی گونجاو بێت لێی تێدەگات. کە خۆی نەیەوێت هیچ دیاردە، پەیوەندی و ڕووداوێک ناتوانێت ئەزبەرەکانی تێکبدات. وێرانکارییەکانی میللیگەرایی (نەتەوەپەرستی) بەشێوەی ئایین تەواو لەم خاڵەدا ڕووبەڕوومان دەبێتەوە. ڕاستینەی شتێک کە خزمەتی نەتەوەپەرستییەکەی ناکات، بۆ ئەو بێواتایە. سەرنجی ڕاناکێشێت، ڕەوشی ڕۆحی و زهنی لەبەرامبەریدا داخراوە. ڕاستینەیەکی کۆمەڵایەتین کە لە دەرەوەی دیاردەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە واتا دەبەخشن، هەربۆیە وەکو دژ دەبینرێت. چونکە پێویستە لەبواری ڕاستینەی کۆمەڵایەتیدا هەر شتێک بەگوێرەی تێڕوانینی چاویلکەیی دەوڵەت ـ نەتەوە ڕەنگ بداتەوە. وەک قەمتەر[1] وایە. ئەم چاویلکەیە بەشێوەیەکی بابەتی بیر لە مێژوو و فەلسەفە ناکاتەوە. بۆ تێگەیشتنی زانستیش گونجاو نییە. وشکبوونی

١ـ ئەو چاویلکەیەی لەکرێتە چاوی ئەسپ و تەنها ڕاستەڕێی پێش خۆی دەبینێت و دەورووبەری نابینێت.

زهنیش بۆخۆی بە تەنیا بەربەستێکە.

لەدەرەوەی کۆمەڵگای دەوڵەت ـ نەتەوەی خۆی بیر لە کۆمەڵگاکانی دیکە ناکاتەوە. لەم حاڵەدا مێشک وشکی یان تێڕوانینی بابەتی چەواشە دەکات، یان بەرەو روانگەیەکی دەبات کە هیچ پەیوەندییەکی پێیەوە نییە. ئەو جیهانبینییەی سەیری ئەویدیکەی پێدەکات لە دەمارگیری ئایینەکانیش دەمارگیرترە یان نای بینێت، یان وەک دوژمن سەیری دەکات. لەبەر ئەم هۆکارەیە دونیای دەوڵەت ـ نەتەوە بەردەوام شەڕ بەرهەم دێنێت. نموونەی هیتلەر دەشێت سەبارەت بەم بابەتەش بەکاریگەر بێت. یان جیهان و ئەوروپا بەو جۆرە دەبێت کە ئەو دەیبینێت، یاخود نییە، لەناو دەچێت. هێندە زەحمەت نییە لە رێگای چەندین نموونەوە بیسەلمێنین کە چۆن بۆ فاکتەری توندوتیژی گۆڕاوە.

ئاشکرایە کە شەڕە ئایینییەکانیش گرێدراوی دونیابینی جیاوازترە. هێندە زیادبوونی ئەو شەڕانەی سەرچاوەی خۆیان لە نەتەوە پەرستییەوە وەردەگرن پەیوەندی بەجیهانبینیەکەیەوە هەیە. پەیوەندی بەو تێڕوانینەوە هەیە کە دەوڵەت ـ نەتەوە زاڵی کردووە. بەشێوەیەکی راست دەرک نەکردن بەزانیارییەکان، بەشێوەیەکی سروشتی رێگا لەپێش وەرگرتنی زانیاری چەوت دەکاتەوە. ئەویش بڕیارو پراکتیکی چەوتی لێدەکەوێتەوە.

هەر زانایەک کە خاوەن تێڕوانینی (جیهانبینی) قووڵی دەوڵەت ـ نەتەوە بێت، چاوەڕوانی ئەوەی لێناکرێت سەبارەت بە تەواوی زانستەکان و لەسەرووی هەمووشیانەوە زانستە کۆمەڵایەتییەکان (نابێت لەبیر بکەین کە تەواوی زانستەکانی دیکەش رەگێکی کۆمەڵایەتییان هەیە) خاوەن هێزێکی واتاداری شرۆڤەکردن بێت.

ئەم زهنییەتەی هەوڵدەدات هەرشتێک بکات بە "من"، کاتێک دەڵێت "سنوورەکانی من"، "کۆمەڵگای من" و "وڵاتی من" لەناو خۆپەرستییەکی سەرسوڕهێنەردا دەخنکێت، فوو دەکاتە خۆی و خۆی بەگەورە نیشاندەدات. ئەوکاتە ئاشکرایە کە هیچ بڕیار و پەیوەندییەکی تەندروستانە و هێزی کردار لەم کەسایەتییە دەرناکەوێت. لەبەرئەوەی خۆی لەگەڵ دەوڵەت و کۆمەڵگا، مێژوو، ئاسۆ، بەرژوەندی و حەسرەتەکانی دەوڵەتدا

یەک دەبینێت ناکرێت چاوەڕوانی شانسی ئاشتی و هاوکاری نەتەوەیی و نێونەتەوەیی لێبکرێت.

تا نەچینە دەرەوەی ئەم جیهانبینییەی کە بەشێوەی هێڵی گشتی هەوڵی پێناسەکردنیماندا، ناتوانین زانست، شانسی بڕیار و پەیوەندی ڕاست بەدەست بێنین. تەواوی نیشانەکان پیشانیدەدەن کە زەمینەی دیموکراتی گونجاوترین هەلومەرج بۆ شۆڕشی زانستی پێشکەش دەکەن. لە زانیارییەکانی قۆناخی ٦٠٠٠-٤٠٠٠پ.ز هیلالی بەپیتدا تا ئیۆنا و ئەسینای ٦٠٠-٤٠٠پ.ز و ئەورووپای ڕێنسانس، ریفۆرم و ڕۆشنگەری کە لە سەدەی پازدەهەمەوە دەستی پێکرد تەماشا بکەین دەبینین گرێدراوی ئاستی ئازادی کۆمەڵگاکانە. سەرباری دەستکەوتە مەزنەکانی ئەگەر تاکو ئێستا ئەورووپا لەسەر ئاستی جیهاندا ڕەخنە دەکرێت بەهۆی بەرژەوەندیپەرستی و خۆپەرستی دەوڵەت ـ نەتەوەوەیە. نەدۆزینەوەی چارەسەری کێشەکانی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان لەلایەن مۆدێرنیتەوە بەهۆی سیستەمی دەوڵەت ـ نەتەوەوەیە کە بۆ خۆی بەبنەمای گرتووە. لە هەمان کاتدا هۆکاری تەواوی شەڕە وێرانکارییەکانی ئەم چوارسەد ساڵەی دواییە کە هاوتاکەی نەبینراوە.

تێڕوانینی شارستانێتی دیموکراتی بۆ داهێنانی زانست شانسێکی مەزنە. بەتایبەتیش لەرەوشی قەیران و کائیوسدا هەبوونی زانستێکی نوێ تەنیا لەمیانەی زاڵبوونی پارادیگمای کۆمەڵگای دیموکراتییەوە فەراهەم دەبێت.

بەگوێرەی ئەوەی تا کێشە ئەبستمۆلۆژییەکان چارەسەر نەکرێت، ناتوانرێت چارەسەری پراکتیکی پێشبخرێت، ئەوا بە ڕووخاندنی جیهانبینی دەوڵەت ـ نەتەوە و ئاواکردنی جیهانبینی مۆدێرنیتەی دیموکراتی لە جێگایدا، هێزی چارەسەری پێویست بە دەست دەهێنرێت.

دابەشکردنی مێژووی شارستانی بۆ سێ بەش: چاخی یەکەم، ناوین و نوێ هەڵە نییە. جیاوازییەکان زیاتر سەبارەت بە ناوەڕۆکی پێناسەکانە. لەو بڕوایەدام ئەو ناوەڕۆک و شێوە باسکردنەی لە بەرگرینامەکەمدا پشتم پێی بەستووە ڕۆشنکەرەوەیە. گفتوگۆمان لەوبارەیەوە کردبوو کە تاوتوێکردنی سەرمایەداری وەک شارستانی راستە یان نا. بناغەی گفتوگۆکانم لەبارەی شارستانییەوە بریتییە لەوەی کە شارستانی یەک پارچەیە و خاوەنی سیستەمێکی لێشاویانەی وەک 'ڕووباری دایک'ە لەسەر سێگۆشەی شار، چین و دەوڵەت رادوەستێت یان جموجۆڵ دەکات. ئەو شێوانەی ئەم سێگۆشەیە وەریدەگرێت، شێوەی شارستانیش دیار دەکات. دەشێت شارستانی سۆمەر و میسر وەک یەکەمین شێوەی کلاسیک، قۆناخی گریک ـ ڕۆما، ئیسلام و کریستیانی وەک قۆناخی پێگەیشتن، قۆناخی شارستانی ئەوروپاش وەک هەرەس و کائیوس هەڵسەنگێنین. ڕەهەندێکی دیکە کە ناچارم جیای بکەمەوە ڕەهەندی شارستانێتی دیموکراتییە. لەگەڵ ئەوەی جێگای خۆی لە شارستانێتی ڕووباری دایکدا دەگرێت، بەڵام ناتوانرێت وەکو یەک ببینرێن. چونکە شارستانێتی یەکێتییەکی پڕ لە ناکۆکییە. ناکۆکی سەرەکی لەنێوان شارستانی پاوانخوازی دەوڵەت و شارستانێتی دیموکراتیانەی کۆمەڵگای بێ دەوڵەت (نەبووە بەدەوڵەت)دایە. ناکۆکی نێوان شارستانی دەوڵەتی و شارستانێتی دیموکراسی بەباشترین شێوە لە نێوان هەردوو شاری گریکی چاخی کۆندا دەبینرێت. لەنێوان سپارتا کە لە ڕێگای پادشایەتی بەڕێوە براوە و ئەسینا کە لە ڕێگای دیموکراسییەوە بەڕێوە براوە.

کاتێک شارستانی ئەورووپاش پەرەیسەند ناکۆکییەکی خەستی هاوشێوە سەریهەڵدا. ئەو پێکدادانە خەستانەی لەسەدەی ١٤وە تا ناوەڕاستی سەدەی ١٩ لەنێوان دەوڵەت و دیموکراسییەکانی شار روویدا، لەناوەڕۆکی خۆیدا لەنێوان دەوڵەت و شارستانێتی دیموکراتیدایە.

یەکێک لە گرنگترین کەموکورییەکانی مارکسیزم ئەوەیە کە لە تەوەرەیەکی تەسکی چینایەتییەوە تەماشای ئەم پێکدادانە دەکات. پێکدادانی راستەوخۆی چینەکان گریمانەییە. پێکدادانی کۆنکرێتی لەنێوان جەستە کۆمەڵایەتییەکاندا دەبێت: لەنێوان کۆمەڵگا دەوڵەتی و کۆمەڵگا دیموکراتییەکاندایە. ئەنجامی تێڕوانینە چینایەتییە تەسکەکان دەزانرێت. ئەو چینانەی هیچ کاتێک سنوورەکانیان بە مسۆگەری نەکێشراوەو رۆژانە جێگۆڕکێ بەخۆیانەوە دەبینن، ئەوەی بنەڕەتییە ئەو هۆشیاری و کلتوورەیە کە لەناویدا دەژین. چینێک شارستانی خۆی ئاوانەکات هەڵبەتە لەجێی نەبوو دەبێت. تێکۆشانی چینایەتی بەبێ شارستانی نابێت. لە ئەزموونی سۆڤێتەوە بینراوە کە تێکۆشانی دوو چین لەناو شارستانییەکدا چەندە مەترسیدارە. لەبەرئەوەی قاڵبەکانی شارستانی دەوڵەتی ئەورووپای نەشکاند، شارستانێتییەکی تایبەتی سۆڤێت ئاوانەکراوە. لەبەرئەوەی تاڕادەیەکی مەزن قاڵبەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بە بنەماگرت، لەکۆتاییدا وەک ئەوانی لێهات، لەم رەوشە رزگاری نەبوو. لەمێژوودا چەندین رەوشی هاوشێوەی ئەمە جێگای باس بووە. بەچەکی خەڵکانی دیکە شەڕبکەیت (شێوازی ژیانی شارستانی) وەکو ئەوانت لێدێت. دەرکەوتنی ئەم جۆرە دۆخانە پەیوەندی بەوەوە هەیە کە شۆڕشەکان شێوەی شارستانێتی خۆیان دیار نەکردووە.

لەم چوارچێوەیەدا شارستانی سەرمایەداری زاراوەیەکی تەسکە. بەڵام شارستانییەکی وەک ئەورووپا کە فاکتەری زۆر بەهێزی دیموکراتی لە ناواخنی خۆیدا هەڵدەگرێت، وەها نیشانبدرێت کە شارستانی هاوبەشی دوو چینە (کرێکار ـ سەرمایەدار) واتای زۆر چەوت لەخۆوە دەگرێت. لەجیاتی تاکە شارستانییەکی ئەورووپاش، دابەشکردنی بۆ ئەورووپای سەرمایەداری و ئەورووپای دیموکرات دەشێت ئەزموونبەخش بێت.

یەکێتی ئەورووپای ڕۆژی ئەمڕۆمان، ئەورووپای سازشکردنە لەنێوان ئەم دوو شارستانییەتەدا. ئەزموونێکی سەیری شایستەی لێکۆڵینەوەیە. ناچاری ئەورووپا بۆ هاوسەنگ کردنی شارستانی دەوڵەتیانەی وشک لەمیانەی نەریتە بەهێزەکانی دیموکراسی و هێزی نەرمی لەجۆری حقوق و لۆژیکەوە لەگەڵ پێناسەکەمان (بەناویەکدا چوونی شارستانی لەگەڵ قەیرانەکاندا) لەبارەی دوا قۆناخی شارستانی (دەوڵەتی) لەجێگای خۆیدایە. شەڕە خەستەکانی چوارسەد ساڵ بەڵگەیەکی دیکەی سەلماندنی ئەم پێکهاتە قەیراناوییەیە. دەشێت نموونەی سۆڤێتیش بەنموونەیەکی سەلمێنەری گفتوگۆ فراوانەکان سەبارەت بە سیستەم دابنرێت. تەنیا گفتوگۆکان لەبارەی پێکهاتە(بونیاد) و داهاتووی یەکێتی ئەورووپاوە نیشانیدەدات کە مۆدێرنیتە لەناو دڵەڕاوکێدایەو لە قەیران رزگاری نەبووە.

هۆکاری گەیشتنمان بەم داوەرییە گرێدراوی پێکهاتەی پاوانخوازی سەرمایەدارییە. هەروەکو مارکس لە پەرتووکی "سەرمایە"دا سەلماندوویەتی قەیران پەیوەندی بە سەرمایە، واتە پەیوەندی بە پێکهاتەی پاوانکارییەوە هەیە. کۆکردنەوەی سەرمایە و قازانج بەبێ قەیران سەرکەوتوو نابێت. بەگوێرەی ئەوەی سەرمایە بەبێ قازانج ناوەستێت بەبێ قەیرانیش نابێت. سەرچاوەی بەردەوام جێگرتنی مافەکانی مرۆڤ و شۆڕش و بزاڤەکانی دیموکراسیبوون لە ڕۆژەڤدا، گەڕانە بەدوای وەڵامدانەوەی قەیراندا. تەنیا بەهۆی کێشەکانی ناوخۆیانەوە نییە. بەهۆی ئەو ڕەوشەوەیە کە چیتر جیهان بەڕێوە نابردرێت. سەرمایەی جیهانگیری لەهیچ قۆناخێکی خۆیدا جیهانی بەڕێوە نەبرد. شەڕی لەگەڵ جیهانکرد. بەهۆی ئەو قەیرانانەی لە سروشتەکەیدا هەن شەڕی لە ئاستی جیهاندا بڵاوکردەوە. هەر لە پەیدابوونی شارستانییەوە بەردەوام شەڕ و یەکەمین سوپای پرۆفیشناڵ جێگای باس بوون. شارستانی دەوڵەت وەک پێویستییەکی ناوەڕۆکەکەی، تا بەسەر کۆمەڵگادا زاڵ نەبێت، پێشناکەوێت. هەرچی باڵادەستییە واتای دەسەڵاتە. دەسەڵاتیش بێ حوکمڕانی نابێت. حوکمڕانیش بەبێ توندوتیژی بەدینایەت. لەبەر ئەم هۆکارەیە هیگڵ

مێژوو بە "**قەسابخانەیەکی خوێناوی**" دەچوێنێت.

جیاوازی هەردوو شارستانی پێشتر لەگەڵ سەرمایەداری، پەیوەندی بە چۆنایەتی پێکهاتە(بونیاد)ی چین، شار و دەوڵەتیەوە هەیە. شارەکان بچووکن، چینەکان سنووردارن، دەوڵەتەکانیش بچووکن و ژمارەیان کەمە. هەربۆیە شەڕیش کەم بوو و لەماوەی کورتخایەندا تەواو دەبوون. هەروەها توندوتیژیش گرنگە چونکە خەسڵەتێکی پێکهاتەی شارستانییە. بەڵام لە سەردەمی سەرمایەداریدا هەروەکو چۆن شار، چین و دەوڵەت تەواوی کۆمەڵگای قووتداوە، ژینگەو سەرزەوی و ژێر زەویش قووتدەدات. ڕەوشی کائیوس هەم کۆمەڵگا هەم ژینگە دەپێچێتەوە. والرشتاین پێشداوەرییەکی بەمجۆرەی کردووە: "**لە سالانی ١٩٧٠کانەوە سەرمایەداری کەوتۆتە ناو قەیرانی بونیادیانەوە، ئەم قەیرانەش نزیکەی ٢٥-٥٠ ساڵ بەردەوام دەبێت**". لە دواییشدا کاتێک دەڵێت: "زانست + ڕێکخستن + چۆنایەتی چالاکی ئەنجام دیاری دەکات". تاڕادەیەک ئاماژە بە دیاردەو پەیوەندییەکان دەکات. تائێستاش لەچەمکی قەیرانی خولیانەی هزری مارکسیستی ڕزگاری نەبووە. بەگوێرەی من مەزەندەکردنی هەبوونی قەیران لە سەرتاسەری تەمەنی سەرمایەداریدا ڕاستترە. لەم بەشەدا لە ڕێگای دابەشکردنی کاتەکانی سەرمایەدارییەوە هەوڵدەدەین هەم پێکهاتەکەی، دۆخە قەیراناوییەکەی، هەم کێشەکانی گۆڕان لەچوارچێوەی گەلالەیەکدا تاوتوێ بکەین.

### ا- سەرمایەداری پاوانی بازرگانی

کۆنترین گۆڕەپانی سەرمایە بازرگانییە. دەتوانین لە قۆناخی ٤٠٠٠-٣٠٠٠پ.ز مێژوودا لە دەوروبەری شاری ئوروک باس لەسەردەمی بازرگانی بکەین. هەروەکو دەزانین لە ئەنادۆڵەوە تا دەگاتە هیندستان ئاشوورییەکان کۆڵۆنی بازرگانیان ئاواکردبوو. فینیقییەکانیش یەکەم قەومن کە یەکەمین کۆڵۆنیەکانی بازرگانیان لەهەموولاکانی دەریای سپی ئاواکرد. ئەو ئاسایش و بەرفراوانبوونەی لە ئیمپراتۆیەتی پارسدا بەدیهات لەبواری بازرگانییەوە بەواتای بەرفراوانی بازرگانی جیهانگیری دەهات. لەشارستانی گریک ـ ڕۆمادا بازرگانی درێژەی بە تەواوی کاریگەرییەکانی خۆیداوە. بازرگانی نەبێت ئاستەمە شارە گەورەکان لەسەر پێ بمێنن. شاری گەورە، بە واتای بازرگانی گەورە دێت. شارستانی ئیسلام کە لە چاخی ناویندا هێزێکی جیهانگیر بووە، دوا قۆناخی مەزنی بازرگانی بووە بەرەو ئەوروپا. ئیتر تەواوی ئەو نەریتانەی پێویستن بۆ بازرگانی پێکهاتوون. فاکتەرەکانی لەجۆری دراو، بیمە، بانک، دەستاوێز، بازاڕو گواستنەوە وەک ئامرازی نوێ و کۆن لە شارستانی ئیسلامدا کەرتێک بووە قورسایی هەرە زۆری هەبووە. شارە بازرگانییەکانی ئیتاڵیا بە شێوەیەکی سەرەکی نەریتی بازرگانی ڕۆژهەڵاتی دەریای سپی، ئیسلامی و بێزەنتییان وەرگرتووە.

لە سەدەی ١٣هەمدا بالابوونی بازرگانی لە ڕێگای ئیتاڵیاوە بۆ کیشوەری ئەوروپا دەگوازرێتەوە. شارە بازرگانییەکانی ئیتاڵیا لەماوەی نێوان سەدەکانی ١٣- ١٦ درێژە بە بالابوونی خۆیان دەدەن. لەسەدەی ١٦هەمین بەدواوە بالابوون دەکەوێتە دەست پاوانەکانی شارەکانی هۆڵەندا و ئینگلتەرا. تاڕادەیەکی مەزن لەم سەدەیە بەدواوە سەرکەوتنی سەرمایەداری بازرگانی لە ڕێگای پایتەختەکانی هەردوو وڵاتەوە (لەندەن

و ئەمستردام) بەدیهاتووە. دۆزینەوەی ئەمریکا و باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا لە ریگای گەرووی (رأس الرجاء الصالح)و زەریای ئەتلەسییەوە و بوونیان بە ریگای بازرگانی، یەکێک لە شۆرشە هەرە گەورەکانی بازرگانییە. لەمیانەی ئەم ریگایانەوە حوکمرانی باوی رۆژهەلاتی ناوین بەسەر ریگاکانی بازرگانی رۆژهەلات ـ رۆژئاوا، باکوور ـ باشوور لەسەدەی شازدەهەمدا زەبرێکی بەکاریگەری بەرکەوتووەو گرنگی جارانی نەماوە. بۆ دواوە گەرانەوەی بەردەوامی شارستانی رۆژهەلاتی ناوین لەسەدەی شازدەهەم بەملاوە، لەنزیکەوە گرێدراوی ئەم ریگا بازرگانیانەیە کە تازە کراونەتەوە. لە ریگای شۆرشی پیشەسازییەوە ستراتیژیترین گورزی بەرکەوت و تا رۆژگاری ئەمرۆمان شانس و هێزی خۆ تەیارکردنەوەی بەدەست نەهێناوە.

لەسەدەکانی ١٥ و ١٨ دا کەلەکەبوونی یەکەمین سەرمایەی مەزنی ئەوروپا رۆلی سەرەکی دەبینێت. یەکەمین هەژموونگەرایی خۆی بەسەر کشتوکال و پیشەکاری شاردا دەسەپێنێت کە لە سەدەی ١٠هەم بەدواوە لە هەلکشاندایە. مانیفاکتۆر کە جددیترین بزاوتی پیشەسازییە بوونی بە پاوان، بەربلاوبوون و گەورەبوونی لەبواری قەبارەوە لەنزیکەوە پەیوەندی بە هەژموونگەرایی پاوانخوازی بازرگانییەوە هەیە. کۆمپانیاکانی رۆژئاوا و رۆژهەلاتی هیند کە گەورەترین کۆمپانیای هۆلەندا و ئینگلتەرای سەردەمی خۆی بوو بۆماوەیەکی درێژخایەن بەردەوامییان بە رۆلی پێشەنگایەتی داوە. بانق، دەستاوێژ، بیمە، دراوی کاغەز، ژمێریاری و پێشانگا کە فاکتەرە بەکاریگەرەکانی سەرمایەن لەو قۆناخەدا بۆ دەزگای بەهێز وەرچەرخێنراون.

لەم قۆناخەدا جارێکی دیکە دەبینین یەکێتییەکی بەهێز لەنێوان پاوانەکانی بازرگانی تایبەت و پاوانەکانی دەولەتدا هەیە. لە بنەرەتدا وەکو پاوانخوازی دەولەت نەبێت، ناتوانرێت بەتەنیا باس لە پاوانەکانی بازرگانی بکرێت. لەیەکەمین سەردەمی بازرگانییەوە تا سەردەمی بازرگانی ئەوروپا بەردەوام پاوانکاری دەولەت پێشەنگ بووە. لیبرالیزم بەبێ رەزامەندی دەولەت قسەیەکی پووچە و هیچیتر. واتای سەرەکی

لیبرالیزم ئەوەیە: بە تەواوی دەوڵەت بخاتە ژێر خزمەتی پاوانخوازی ئابووری، دەوڵەتی سیاسی بکات بە دەوڵەتی ئابووری. لیبرالیزمی بێ دەوڵەت وەک باخچەیەکی بێ خاوەنە. لەم قۆناخەدا قورسایی بازرگانی لە سەر دەوڵەت، راستتر پەیوەندییەکانی لەگەڵ پاوانخوازی بازرگانی پێگەیەکی سەرەکی هەیە.

بەهۆی ئەم فاکتەرەوە دەشێت ماوەی نێوان هەردوو سەدەی ١٥ و ١٨ بە قۆناخی مارکانتیلیزم ناو ببرێت. ناوەڕۆکەکەشی خۆ کۆکردنەوەی دەوڵەتە لە رێگای بازرگانی و زیادبوونی بودجەکەیەتی. دەشێت بە میللیگەرایی بازرگانیش ناوببرێت. زیادبوونی فرۆشتن بەرامبەر بە کڕین بەکاریگەرترین رێگای گەیشتنە بەدۆخی دەوڵەتی باڵاتر. وەک قۆناخێکیش دەناسرێت کە دەوڵەتی نەتەوەیی و مۆنارشی لە هەڵکشاندابوون. لەبواری کۆمەڵایەتیشەوە قۆناخێکە کە لەمیانەی هەنگاونانی ئەرستۆکراتی بەرەو بازرگانی، بە ئەرستۆکراتبوون و بازرگان بەناویەکدا چووە، وەک چینێکی نوێی مۆدێرن بۆرژوازی بوو بە خاوەنی یەکەمین نەریت. لە ئایدیۆلۆژیای بۆرژواوە تا دەگاتە شێوازی ژیانی، چەمکی مۆدە و بیناسازی شارەکانی ریفۆرمی ریشەیی جێگای باسە.

ریفۆرماسیۆن و رۆشنگەری لەم سەردەمەدا روویانداوە. بەڵام بینینێ قۆناخی ریفۆرم و رۆشنگەری وەک دوو بزاڤی بورژوازی بەهەڵەداچوونێکی مەزنە. ریفۆرماسیۆن لە ناوەڕۆکدا بە میللیکردنی ئایینە. کردنەوەی هۆبە نەتەوەییەکانێتی. پەیوەندییەکی هۆکارانەی لەگەڵ بۆرژوازیدا نییە. لەژێر سایەی هەلومەرجەکانی ئەو رۆژگارەدا ئامانجی نوێکردنەوەی ئەو قاڵبانەی هزری ئایینییە کە سەردەمیان بەسەرچووە. بزووتنەوەی گونجاندنی ئایینە بەگوێرەی کات و سەردەم. ئەویش پارچەیەکی شۆڕشی هزرە. رۆشنگەری شۆڕشێکی بەرفراوانتری هزرە. تاڕادەیەکی مەزن تێپەڕکردنی جیهانبینی هزراندنی کۆن و لێدانی مۆرکی پارادیگمای نوێیە لە قۆناخەکە. لەهەموو لایەنێکەوە نوێکردنەوەی شێوازەکانی هزرە. هەردوو گۆڕەپانی گرنگ پەیوەندییان بەشۆڕشی زانست و فەلسەفەوە هەیە. هاوکاتبوونی لەگەڵ چاخی بازرگانی رێککەوتە،

بەڵام چینی بۆرژوا پشت بە کارەکتەری خۆی دەتوانێت خاوەندارێتی لێبکات و بیکات بە موڵکی خۆی. هەردوو گۆڕەپانیش بۆخۆی دەکات بە سەرمایەی رۆشنبیری. ئەم بزووتنەوەیە گرنگی و بایەخێکی مەزنی هەیە. چونکە لەسایەیدا ناونیشانی چینێکی رەوا بەدەست دێنێت. بیرمەندەکانی رۆشنگەری رۆڵێکی زۆریان هەبووە لەوەی ناوەڕۆکی پاوانخوازی کە بەلانی کەم هێندەی رەهابوون و ئەرستۆکراتی مشەخۆرە، پشتگوێ بخرێت. لەبەرئەوەی بۆرژوازی پێکهاتەیەکی چینایەتی نوێ بوو، هێندە بیر لەو ئەنجامانە نەکرابوویەوە کە لەگەڵ خۆیدا دێنێت، تەواوی خراپییەکان دەکرانە موڵکی چینەکۆنەکان. بۆرژوازی رۆڵێکی سەرەکی لەوەدا بینیوە کە تایبەتمەندێتی چینی ناوین مۆری خۆی لەو سەردەمە بدات.

پشتگیری کردنی بۆرژوازی بۆ ئایدیۆلۆژیای میللیگەرایی (نەتەوەپەرستی) بە ئامانجی ئاواکردنی پاوانخوازییە لەسەر بازاڕی نەتەوەیی. لە پاکتاوکردنی دوژمنەکانی بۆرژوازیدا میللیگەرایی رۆڵێکی کاریگەری بینیوە. بۆتە مایەی پەراوێزکردنی سەرمایەی بازرگانی نەتەوە و میللەتەکانی دیکە و بناخەی هەموو جۆرە نەژادپەرستی و شەڕە نەتەوەیی، ئەتنیکی و ئایینیەکانی داناوە. پێشکەوتنی میللیگەرایی دوولایەنەی پەرەپێداوە. لەبەر ئەم هۆکارەیە لە تەواوی جیهاندا هەستەکانی نەفرەت بەرامبەر یەهودییەت پەرەیسەندووە. ئیتر یەهودییەکان سەرچاوەی خراپییەکانن، مەزنترین کۆسپن لەبەردەم هیوا نەتەوەییەکانیاندا. بەرامبەر بەم رەوشە یەهودییەکانیش بە ئامانجی پاراستنێکی نێودەوڵەتی، پێشخستنی دۆستەکانیان و لەناوبردنی دوژمنەکانیان رێکخراوی ماسۆنیان پێشخستووە. هەرچەندە رەگەکەی بۆ چاخی ناوینیش بگەڕێتەوە، بەڵام رۆڵە سەرەکییەکەی لەم قۆناخەدا بایەخداربووە. لەناو چەندین بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیدا خاوەن رۆڵ بووە. میللیگەرایی یەهودی رێگای لەپێش زایۆنیزم کردۆتەوە.

کاتێک گرێدانی پەیوەندی بازرگانی و کۆلۆنیالیزم لەگەڵ سەردەمی لەدایکبوون و پێشکەوتنەکانی دواتری رەچاوبکرێت، لە قۆناخی مارکانتیالیزمدا چاوەڕوانی قەڵەمبازی لێدەکرا. کۆلۆنیالیزمی ئەم قۆناخە

وەک داگیرکاری رووبەڕوومان دەبێتەوە. ئەمریکا و ئوسترالیا وەک دوو کیشوەر کە لەمێژووی خۆیاندا ئاشنای کۆلۆنی نەبوون، هەزاران دوورگە لەم قۆناخەدا ئاشنای داگیرکاری بوون. تەواوی کیشوەرە کۆنەکانی جیهان لەسەرووشیانەوە ئەفریقیا و ئاسیا بۆ ئەوەی بکرێن بەکیشوەری داگیرکراو سەرلەنوێ کەشف دەکرێنەوە. بەم ئامانجەش خەباتی لەجۆری ئوریانتالیزم (رۆژهەڵاتناسی) و ئەنترۆپۆلۆژییان دەست پێکردووە. لەبواری پەیوەندی نێوان زانست و کۆمەڵگای نوێوە دەشێت بە نموونەیەکی باش لە قەڵەم بدرێت. تیۆرییەکانی نەژادی باڵا لەم قۆناخەدا پەرەیان سەندووە. خواستوویانە داروینیزم لەسەر کۆمەڵگاش پەیڕەو بکەن. بەدەستهێنانی خەباتی مێژوو و جوگرافی لەمیانەی هەمان جیهانبینیەوە لەپێناو هەمان ئامانجدایە. کرانەوەی سەرمایەداری لە دونیادا هاوشێوەی کاروخەباتی دۆزینەوەو داهێنانە.

کۆلۆنیکرن یاخود داگیرکاری کە ئەنجامە سیستەماتیکەکەیەتی، لە بنەڕەتدا سیاسەتی پەلهاویشتنی پاوانخوازی بازرگانییە. شێوە هاوچەرخەکانی تالانن. سەرمایەداری بازرگانی ئەورووپا تارادەیەکی مەزن لە سەربنەمای تالانکاری کۆلۆنیەکان پێکهاتووە. لەکاتێکدا زێڕو زیوەکانی ئەمریکا تالان دەکران، بەرهەمە هەرزانەکانی رستن و چنین بە نرخێکی خەیاڵی بووە بەئامرازی سەرەکی ئەم تالانکاریانە. تەنیا دانانی نرخی ناهاوسەنگ لە بازرگانیدا جێگای باس نەبووە، بەڵکو لەزۆر قۆناخدا بەشێوەیەکی یەکلایەنە نرخەکان دانراون. کۆلۆنی رۆڵێکی سەرەکی لەوەدا بینیوە کە پاوانەکانی بازرگانی نرخ بسەپێنن و قازانجێکی زۆر بەدەست بێنن. هەڵبەتە بەکارهێنانی جیاوازی نرخی بازاڕەکان یان بەکارهێنانی پەیڕەوی هەمەجۆر (کاڵای ئێکسپایەر ، نەبوونی کاڵا) بۆ دروستکردنی ئەو جیاوازییە بناخەی قازانجی بازرگان پێکدێنێت.

فرناند براودل ئاماژە بەوە دەکات کە بزاوتی دەڵاڵەکان(قەبڵێنەران)ی بازرگانی مەزن رۆڵێکی دیاریکەریان لە پێکهێنانی سەرمایەداریدا بینیوە. هەروەها دەڵێت: 'گۆڕانکارییە هاکەزاییەکانی بازاڕ رۆڵی نییە و ئەمانە کردەیەکی ئاسایی ئابوورین. ئابووری بە پەرەسەندنی ئاڵوگۆڕەوە دەست

پێدەکات. بەرهەمهێنانی کالا بە ئامانجی بەکارهێنان بە ئابووری دانانرێت. کاتێک گەیشتە سەرەتاکانی پرۆسەی ئالوگۆڕکردنی واتە ئابووری دەستی پێکردووە. لەم گۆڕەپانەدا قازانج جێگای باس نییە. دەشێت باس لە دەسکەوتی لایەنەکانی ئالوگۆڕکردن بکرێت. ئەمەیان بابەتی قەبلاندن نییە، قەبلاندنی سەرەکی لەگۆڕەپانی بازرگانی مەزندایە. لە ڕێگای جیاوازی نرخەکانەوە بە تایبەتیش لەمیانەی یاریکردن بەنرخەکانەوە بەدیدێت. وەک مالی سەرمایەداری پێناسە دەکرێت. هەروەکو بلێی ناخوازن بە روونی ئاشکرای بکەن کە: بە ئابووری لە قەلەم نادرێت و "شتێکە" لەدەرەوە سەپێنراوە. پێناسە نەکردنی قۆناخی دواتری ئەم رەوشە وەک کەموکورییەکی مەزن جێگای پرسیارە".

فرناند براودل ئاگاداری جیاوازی نێوان دەسەلات و دەولەتە. هەرچەندە وەکو مارکس رۆلی دەولەت و دەسەلات بە بێبایەخ نیشاننەدات، بەلام دیاری ناکات کە چەندە بەکاریگەرە. کاتێک مارکسیزم دەولەت وەک "چڕبوونەوەی ئابووری" پێناسە دەکات، هەندێک جار نزیک بەراستییە. بەلام ئەمە گشتگیرکردنێکی زۆر ئەبستراکتە. دەسەلات و دەولەت لە بنچینەدا "ئابوورییەکن کە ئابووری نییە". واتە ئابووری وەک گۆڕەپانی زەوتکردنی زێدە ـ بەرهەم و بەهاکان دەبینێت و لەم گۆڕەپانەدا پاوانی خۆی ئاوا دەکات. لەم چوارچێوەیەدا لە گۆڕەپانی ئابووریدایە. زۆر پێیەوە پەیوەندیدارە. تەواوی میکانیزمەکانی لەپێناو دەستبەسەردا گرتنی زێدە ـ بەرهەم و بەهاکانە لە ڕێگای پەیڕەوی هەمەجۆرەوە. کشتوکال، بازرگانی و پیشەسازی لەسەرووی ئەو گۆڕەپانانەوە دێن کە پاوانی تێدا ئاواکردووە. باج لەسەرووی پەیڕەوەکانەوە دێت. بۆ نموونە باجە ناڕاستەوخۆکان پەیوەندی ڕاستەوخۆی دەولەتە کە بەشێوەی پاوانی بازرگان دەجوولێتەوە. لێرەدا دەولەت بازرگانێکی تەواوە. نەک وەک گوزارشتێکی چڕبۆوە، ڕاستەوخۆ بازرگانە. هەروەکو دەزانرێت بەشی ئەم باجانە نیوەی زیاتری داهاتی دەولەت پێکدێنن.

هەروەها دەولەت لەبەرئەوەی رەوشی کێلگەکان، بازارەکانی کشتوکال و نرخی بەرهەمە کشتوکالییەکان دەستنیشاندەکات تەواو پاوانخوازییەکی

ئابوورییە. لەئاژێندای ئابووری ئەورووپادا بەردەوام پەیوەندی ئابووری لەگەڵ دەوڵەت و دەسەلاتدا بە ناڕوونی دەهێڵدرێتەوە. سەرەڕای ئەوەی سۆسیالیست و لیبراڵەکان بەدەیان هەزار بەرگە پەرتووکیان نووسیوە، بەلام ئەم گۆڕەپانەیان ڕۆشن نەکردۆتەوە، لێی دوورن. دەستنەبردنی مارکس بۆ ئەم بوارە یان بەشنەکردنی تەمەنی بۆتە هۆکار، کەموکوڕییەکی مەزنە. بەشی ئەم کەموکوڕییە لە پەشێوییە گەورەکەدا مەزنە.

لەکام لایەنەوە سەیری سەرکەوتنی قۆناخی بازرگانی ماوەی نێوان سەدەکانی ١٥ و ١٨بکەین پێویستە دان بەوە دابنێین کە میکانیزمەکانی دەرەوەی ئابووری ڕۆڵی سەرەکییان بینیوە. ئەو کاتە ئەگەر ئابووری نییە، ئەی چییە؟ هەرچەندە بەگشتی بەکارهێنانی ئەم گۆڕەپانە لەلایەن هێزێکی دەرەوەی دەسەلاتەوە، بەتایبەتیش لەلایەن دەوڵەتەوە کە گوزارشتی حقوقی دەسەلاتە، مەحاڵ نەبێت بەلام زۆر زەحمەتە. دەشێت باس لە گرووپی جیاوازی هێزە پاوانخوازەکان بکرێت، بەلام ئەمانەش لە ئەنجامدا ناچارن پەیوەندییان لەگەڵ دەسەلات یان گوزارشتە کۆنکرێتییەکەی واتە پەیوەندییان لەگەڵ دەوڵەت هەبێت. هەندێک جار دەشێت بەگۆڕەپانی پارە (دراو)یش ناوببرێت. کاتێک پارە وەک ئامرازێکی سادەی ئاڵوگۆڕکردن نەما و تێپەڕیکرد، لە ڕاستیدا بەلانی کەم هێندەی شمشێر دەتوانێت ڕۆڵێکی بەهێز ببینێت. سەبارەت بە بابەتی سوپا ناپلیۆن لەخۆڕا نەیگووتووە "پارە، پارە، پارە". بەلام ئەمە کامە پارەیە؟ ئەمە ئەو پارەیەی ئامرازی ئاڵوگۆڕکردن نییە. ئەو پارەیەیە کە ئابووری نییە. پارەی بازرگانییە گەورەکەیە، پارەی ئامرازی قەبلاندنە. لەم گۆڕەپانانەدا پارە فەرماندەیەکی تەواوە. بەڕێوبەرە. لەبەرئەوەی بۆرژوازی باش دەرکی بەم خاڵەکردووە، ڕۆڵێکی مەزنی بە پارە داوە. بۆ ئەوەی بەردەوام پارە هێزی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا بێت، بە چەقۆی قەساب کۆمەڵگا پارچە پارچە کراوە. کۆمەڵگا، تەنانەت دەوڵەتیش بەرەوشێک گەیەنراون پارە نەبێت ناتوانن بژین.

گەیشتن بەم خاڵە لەوانەیە شۆڕشی ڕاستەقینەی بورژوازی بێت. کۆمەڵگا و دەوڵەتێک ناچاری پارە بێت، واتە کەوتۆتە ژێر فەرمانی

بۆرژوازییەوە. ئەم پێگەیەی دەتوانین شۆڕشی پارەشی پێ بڵێین بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا لەم قۆناخەی ئەورووپادا بەدیهاتووە. بۆ نموونە ئیتر پێویست ناکات وەک کۆیلە یان بەندەیەکی جاران کرێکار ببەسترێتەوە. هەڵبەتە ئەگەر ڕۆژانەکەی وەرنەگرێت بەبرسێتی دەمێنێتەوە. برسێتیش مەحکومی پارەی دەکات. کرێکار خراوەتە ڕەوشێکەوە کە جگە لەوەی خۆی رادەستی پارە بکات هیچ چارەیەکی دیکەی نییە. لەم سۆنگەیەوە بۆ دەستەمۆکردنی کرێکار و بەڕێوەبردنی پێویست ناکات وەک خاوەنە کلاسیکەکانی کۆیلەداری و دەرەبەگایەتی بجووڵێنەوە. ئەمە هەم خەرجی زۆرە، هەم بەرپرسیارێتی زیاتری دەوێت. هەرچی سەرمایەدارە تەنیا هێزی پارە نیشاندەدات، چۆنی بوێت کرێکار بەدەست دێنێت و بەکاری دەهێنێت.

سەبارەت بەشمەک دەتوانرێت ئاماژە بەخاڵی هاوشێوە بکرێت. شمەک وەکو کاڵا بەدۆخێک گەیەنراوە پارە نەبێت نابزوێت. هەرجۆرە جموجۆڵێکی شمەک گرێدراوی پارەیە. بەرهەمهێنانی، گواستنەوەی و بەکارهێنانی بەبێ پارە نابێت. ئەمەش شۆڕشێکی مەزنی سەرمایەدارییە: ئابووری دەخاتە ژێر فەرمانداریێتی ڕەهای پارە. ئیتر ئابووری وەک یارییەکی منداڵانەی دەست پارەیە. لەهیچ سەردەمێکدا بەم رادەیە ئابووری بە پارەوە گرێنەدراوە. لێرەدا پارە تەواو دەوڵەتێکە. ناڵێم وەک، بەڵکو دەوڵەتە! تەنانەت دەوڵەتیش بەمجۆرە گرێدراوی پارەیە. دەوڵەتی بێ پارە وەک کرێکاری بێ پارە و کاڵای لێکراوە. هەرچەندە پارادۆکس ببینرێت، لە راستیدا دەوڵەتی دەوڵەت پارەیە. گەیاندنی دەوڵەت بەم پێگەیە داهێنانی سەدەی شازدەهەمی هۆڵەندا و ئینگلتەرایە. دەوڵەتی بەهێز خولقێنراوە. بەڵام ئەمە دەوڵەتێکی گرێدراوی پارەیە. مێژووناسەکان دەڵێن لەبەرئەوەی فەرەنسا ئەم سەرکەوتنەی بەدەست نەهێنا شەڕی هەژموونگەرایی بەرامبەر ئینگلتەرا و هۆڵەندای لەدەست دا. لەچاخی فینانسدا تۆزێکی دیکە گفتوگۆ لەبارەی بابەتی پارەوە بکەین ڕۆشنکەرەوە دەبێت.

دەتوانرێت بەشێوەیەکی بەرفروان گفتوگۆ لەبارەی کاریگەری

بۆرژوازی بازرگانییەوە لەسەر تەواوی کۆمەڵگا بکرێت کە وەکو فاکتەرێکی گرنگ لە پێشکەوتنی شارستانی ماوەی نێوان سەدەکانی ١٥ - ١٨ سەریهەڵدا. تایبەتمەندێتییەکانی کۆمەڵگای بازرگانی دەناسرێت. وەک پارە پەرستێکی زێدەڕۆ، سوودپەرست، ربا خۆر و خاوەن بانک جێگاکەی لەیادەوەری مرۆڤدا تا دواڕادە خراپە. ئەم فاکتەرانە کوشندەترین گورزیان لە ئەخلاق وەشاند، هەروەها لەسەرووی ئەو بابەتانەوە دێن کە لەم سەدانەدا هونەر بە تایبەتی ئەدەب بەچڕی باسی دەکات. هەروەکو بڵێی ڤایرۆسێک کەوتۆتە ناو کۆمەڵگا. ئیشوکاری کراندنی کۆمەڵگایە. بەرپرسیارە لەخراپبوونی ئاستی گشتی کۆمەڵگا. پەیوەندییە گەرم و مرۆییانەکەی جاران بەرامبەر ڕووی ساردی پارە دەیبەستێت. ئەوەی پارەی نەبێت، هەروەکو بڵێی شەڕی ژیانی لەدەستداوە. چیتر وەک جاران بۆ پیشاندانی مەزنایەتی پێویستی بە تەختی زێڕین، دەفری زیوین، کۆشکی بە ئەستێرە، شان و شەوکەت، نمایشی هێزی قەبە، جلوبەرگی گرانبەها و سفرەی ڕازاوە(لوکس) نییە. تەنیا شوێنێکی شاردنەوەی پارەت هەبێت بەسە. ئیتر تۆ هەرە مەزنیت. گەیشتنی مرۆڤایەتی بەم دۆخە، ناشێت هەڵکشان بێت. هەرچەندە ناوی چاخی نوێ بێت، بەڵام گوزارشت لەهیچ نوژەنییەک ناکات. هەرئەوەندەیە کە تەنیا دەتوانێت ببێتە سەرەتای قەیرانی شارستانی. سەبارەت بە یەکێک کە ڕێزی خۆی بەرامبەر کۆمەڵگا لەدەست نەداوە، بیر لە ڕەوشێک ناکرێتەوە کە لەمە هەستیارتر و زیاتر جێگای سووکایەتی پێکردن بێت.

وەک دەبینرێت سەرمایەداری بازرگانی لەم قۆناخەدا سەبارەت بە بوارەکانی دیکە دڵخوازانە نەبووە. ڕادەی خستنەڕوو و قازانجی پێشکەشکراو ڕازی نەکردووە. هیچ گۆڕەپانێک بە ئاستی قازانجەکانی بازرگانی مەزن ناگات. کشتوکاڵ و مانیفاکتۆر تەنیا کاتێک قازانجێکی نزیک بە قازانجی بازرگانی مەزن پێشکەش بکاتەوە دەستیان بۆ دەبردرێت. هەربۆیە دەرفەتێکی سنوورداری پەرەسەندنیان بەدەست هێناوە.

لەبواری مێژووی سیاسییەوە ئەم قۆناخە بەشڵەقاندنی مەزندا تێپەڕیوە. ئیسپانیا، فەرەنسا و نەمسا بۆ ئەوەی ببن بە بەردەوامی

ئیمپراتۆرییەتی مەزنی رۆما کێشمەکێشێکی مەزنیان لەنێواندا بووە، بەهۆی مەیلیان بۆ شێوەی کۆنی ئیمپراتۆرییەت لە ژێرکەوتن رزگاریان نەبوو. پەیوەندی پارە ـ دەوڵەت رۆڵێکی گرنگی لەمەدا بینیوە. ئەوەی یەک بەدوای یەک هۆڵەندا و ئینگلتەرای بەرەو هەژموونگەرایی برد ئیتر هێزی فەرمانداریێتی پارەی بازرگانی مەزن بوو. لەکاتێکدا بەو قەرزەی لەبازرگانەکانیان وەرگرتبوو دەوڵەتیان بەهێزکرد، خۆشیان بەتایبەت وەکو بازرگان جوڵاونەتەوە. دەوڵەت و سیاسەتێک جێگای باسە کە ئیتر قازانج بەدەست دێنێت. بەتایبەتی کاتێک خۆ پڕچەککردن و سوپای نوێ دامەزرا هێزی فەرمانداریێتی پارە سەلمێنرا بوو. سەرکەوتنی سەرمایەداری لە ئابووریەکەیاندا بەرهەمهێنانی هەرزان بوو. بەرهەمهێنانی هەرزان واتای بالابوونی بازرگانییە. ئەمەش بە واتای دۆڕاندنی دوژمنەکانی (ئەو دەوڵەتانەی خوازیارن چۆکیان پێ دابدەن)دێت لە گۆڕەپانی نێودەوڵەتیدا. خۆی لەخۆیدا لە گۆڕەپانی سەربازیدا تا رادەیەکی مەزن ژێرکەوتبوون. دەستوەردانی پیلانگێڕیانەی هۆڵەندا و ئینگلتەرا لە شۆڕشەکان، لەبواری سیاسیشەوە بالابوونیانی سەلماندووە. ئاشکرایە کە لەتەواوی ئەم گۆڕەپانانەدا بالابوونیان بەسەر دوژمنەکانیان دەبێتە بالابوونێکی هەژموونگەرایی. ئەم بالابوونەیان بە دەستگۆڕکێی کۆلۆنیەکانی پێشووتری پورتوگال و ئیسپانیا سەلماندووە، هەربەدوایدا دەستگۆڕکێی هاوشێوە لە ئاسیا و ئەفریقیادا و لەوێش بالابوونی بازرگانیان بەدیهاتووە. لە رێگای ئەو رێککەوتنانەی لە کیشوەری ئەوروپادا پێشیان خستووە، فەرەنسایان بێکاریگەر کردووە، هیوای نەمسایان بە ئیمپراتۆرییەتی ئەڵمانیا شکاندووە، بەپێی داخوازییەکانیان روسیای قەیسەرییان بەکارهێناوە. ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیشیان خستبووە ناو پرۆسەی نیو ـ داگیرکارییەوە کە یەکێک لە ئیمپراتۆریەتە بەهێزەکانی ئەو قۆناخە بوو. بەرامبەر بە شێوەی دەوڵەت و بەرهەمهێنانی سەرمایەداری هەروەکو ئیمپراتۆرییەتی خانەدانەکانی دیکە عوسمانییەکانیش سەردەمیان بەسەرچووبوو. ئەو چارەنووسەی چاوەڕوانی ئیمپراتۆرییەتەکانی چین و هیندستان بوو داگیرکاری و نیو ـ داگیرکاری بوو. قۆناخی پاکتاوبوونی شارستانییە کۆنەکان بەخێرایی لە

ڕۆژەڤی مێژوودا بوو. نوێیەکەش بەبێ زانینی چییەتییەکەی هەرشتێک بوو کە پێشکەوتنی لەخۆوە دەگرت. هەروەکو لە هەموو ئایینێکی نوێدا دەبینرێت بە ئیمانەوە پێیەوە گرێدراو بوون. ئایینەکەی بازرگانی، خوداوەندەکەشی پارە بوو.

## ب ـ شۆڕشی پیشەسازی و سەردەمی ئیندوستریالیزم

پرۆسەی پیشەسازی زیاتر لەگەڵ شۆڕشی پیشەسازیدا وەک یەک دەبینرێن. لەکاتێکدا کە بەدرێژایی مێژوو پیشەسازی هەر هەبووە. تەنانەت یەکەمین بەردی داتاشراویش ئیندوستری یان پیشەسازییەکە. دۆزینەوەی کشتوکاڵ لە بواری خۆیدا بۆخۆی شۆڕشێکی پیشەسازییە. پیشەکاری (کاری دەست) پیشەسازییەکە. هەر پەیڕەو، زانیاری و ئامرازێکی نوێی پەیوەندیداری بەرهەمهێنان پێشکەوتنێکی پیشەسازییە. جۆری مرۆڤ تاکە بوونەوەرێکە کە بۆ بەدەستهێنانی خواردەمەنی، پۆشاک و حەوانەوە ئامراز بەکاردێنێت. پیشەسازی، واتە بەرهەمهێنان لە رێگای ئامرازەوە تایبەت بە مرۆڤە.

ئەوەی لەکۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا لە ولاتی هەژموونی ئەورووپا واتا لە ئینگلتەرا روویدا، راستتر بڵێین ئەو دیاردەیەی پێشەنگایەتی دەکرێت، ئەڵقەیەکی گرنگی ئەو نوژەنیەیە کە ماوەیەکی درێژە بەردەوامە. سوڕانەوەی چەرخی ئامێرەکان بەو وزەیەی لە رێگای هەڵمەوە بەدەست دێت، گوزارشتێکی سیمبۆلییە. هێزی هەڵمی و ئامێرەکان لە مێژبوو دەزانراو بەکاردەهێنران. لە هۆڵەندا و ئینگلتەرادا پێشتر لە گۆڕەپانی کشتوکاڵ و مانیفاکتۆردا پێشەنگایەتی بەدەست هاتبوو. بەروبوومی هەرە هەرزان و جەماوەری بەرهەم دەهێنران. ئەمانەش بە شۆڕشی پیشەسازی لە قەڵەمدەدران. سەرەتا فەرەنسا و ئیتاڵیاش لایەنێکی دواکەوتوویان لە پیشەسازیدا جێگای باس نەبوو. هەرزانی و جەماوەرییبوونەکەی خاڵی بەهێز بوون. ئەم دیاردەیە لە بناخەی هەژموونگەراییدا شاراوەیە. گرنگی ئەو پیشەسازییەی لە سەدەی نۆزدەهەمدا هەڵمەتێکی ئەنجامدا لە قازانجەکەیدایە. واتا لەبواری دەسکەوتەکانی سەرمایەوە لە ریزی پێشەوەدا بوو. ئەو بوویەرەی بە شۆڕش ناودەبرێت، ئەوەیە: بە بەراورد لەگەڵ قازانج و دەسکەوتی کشتوکاڵی و بازرگانی، ئەو قازانجەی لە بەرهەمهێنانی پیشەسازیدا بەدەست دەکەوت بە خێرایی چەندین

قات زیادی دەکرد و گەورە دەبوو. بۆ یەکەمین جار بوو لەمێژوودا بەرهەمهێنانی پیشەسازی پێگەی پیشەنگایەتی بەدەست دەهێنا. ئەم دیاردەیە لە ناوەڕۆکی شۆڕشەکەیدا شاراوەیە. پێشتر کشتوکاڵ و مانیفاکتور گۆڕەپانە باوەکانی بەرهەمهێنان بوون. بازرگانیش بەشێوەی کڕین و فرۆشتنی زێدە ـ بەرهەمەکانی هەردوو گۆڕەپان بوو. ئەوەش ناوەڕۆکی ئەو چالاکیانە بوو کە بە ئابووری ناو دەبرێت.

ئەگەر تەنیا لەبواری بەرهەمهێنانەوە تەماشای بکەین، شتێکی ئەوتۆ لە شۆڕشی پیشەسازی فێرنابین. ئەگەر لەلایەنی هەمەڕەنگییەوە بێت یان زۆرییەوە بەردەوام دیاردەی بەرهەمهێنان رووبەڕوومان بۆتەوە. تەنانەت دەتوانرێت بگووترێت لەبواری ماوەو گرنگییەوە تائێستاش هیچ شۆڕشێک بەو شۆڕشە ناگات کە کۆمەڵگاکان لە ڕێگای شۆڕشی کشتوکاڵی پێیدا تێپەڕیوون. لەم سۆنگەیەوە گرنگی شۆڕشی پیشەسازی لە شوێنێکی دیکەدا شاراوەیە، نەک تەنیا لە شوێنێکدا لەچەندین شوێندا شاراوەیە.

١ـ بۆ یەکەمین جار لەمێژوودا بەرووبوومی شار پێش بەروبوومی گوند کەوتوود. وەک بەرهەمهێنەرێکی بە ریشە شارنشین بە هەزاران ساڵ پیشەکار بەرهەمهێنەرێکی یاریدەدەری هەمیشەیی لادێ بوو. ئەویش نەبوایە، لادێ دەیتوانی بەردەوامی بەهەبوونی خۆی بدات. دوای هەزاران ساڵ شۆڕشی پیشەسازی سەدەی نۆزدەهەم ئەم قۆناخەی هەڵگێڕایەوە. ئەگەر سەدەکانی ١٥ ـ ١٩ وەک سەدەکانی هاوسەنگی لەقەڵەمبدەین، ئەوا سەدەی نۆزدەهەمین بە تەواوی تای تەرازووی ئەم هاوسەنگییەی بەلای شاردا شکاندەوە. ئەم پێشکەوتنە نوژەنییە، پێشکەوتنێکە کە ئەنجامی زۆر گرنگ لەگەڵ خۆیدا دێنێت.

٢ـ نوژەنییەکی دیکەی گرنگ لە گۆڕەپانی کۆمەڵگادایە. کۆمەڵگای شار پێش کۆمەڵگای لادێ دەکەوێت. لەکاتێکدا پێشتر شارەکان پاشکۆیەکی سادەی کۆمەڵگای لادێ بوون، شۆڕشی پیشەسازی بەشێوەیەکی نائاسایی هێزی کۆمەڵگای شاری زیادکرد. ئیتر بە تەواوی پێکهاتەکانی سەرخان و ژێرخانییەوە کۆمەڵگای لادێ دەکەوێتە ژێر حوکمڕانی کۆمەڵگای

شارەوە. جۆرێک لە دیالیکتیکی کۆڵۆنی شار ـ لادێ پێشدەخرێت. ئیتر چەوساندنەوەی کۆمەڵگای لادێ لەلایەن کۆمەڵگای شارەوە دەستی پێکرد بوو. لە گۆڕەپانی ئایدیۆلۆژییەوە تاکو ئامرازەکانی بەرهەمهێنان، لە ئەخلاقەوە تا دەگاتە هونەر حوکمڕانییەکی داگیرکەرانەی زەقی شار لەسەر لادێ جێگای باس بوو. بەهەموو خێراییەکەیەوە شۆڕشی زهنی رێگای لەپێش باڵابوونی شار دەکردەوە.

٣ـ لەبواری چینایەتیشەوە وەرچەرخانی مێژوویی جێگای باسە. لەرێگای شۆڕشی پیشەسازییەوە بۆرژوازی بە رەوشێک گەیشتبوو بەرامبەر تەواوی چین و توێژەکانی دیکە باڵابوونی خۆی رابگەیەنێت. بۆرژوازی کە چینی کرێکاریشی کردە یەدەگی خۆی بەرامبەر بە توێژە پیشەکارەکانی لەسەردەمی دەرەبەگایەتی مابوونەوە، خۆی وەکو یەکێک دەبینێت کە هەرە پێشکەوتنخوازە، تاکە خاوەنی راستییەکانە، ئاشنای ژیانی مۆدێرن و خاوەن جیهانبینییە: لە رێگای میتۆلۆژی، ئایین، فەلسەفە و زانستەکەیەوە دەیگوت من خۆم خودی کۆمەڵگا، نەتەوە و مێژووم. ئەوانی دیکەش بەهاکانی مۆزەخانە بوون کە لە رابردوو مابوونەوە و دەبوایە بەمجۆرە بمێننەوە.

٤ـ بۆ یەکەمین جار لە رێگای شۆڕشی پیشەسازییەوە دەتوانرێت باسی بەشداریکردنی بە بەرنامەی زانست لە بەرهەمهێناندا بکرێت. پێشتر ئامرازەکانی (ئامێرەکانی) بەرهەمهێنان و زانست هەریەکەو بەجیا لە کەناڵی خۆیەوە پەرەیدەسەند. یەکەمین جاربوو دەستی یەکیان دەگرت. ئیتر زانست وەک ئامانج نەبوو، کرابوو بە ئامراز. گۆڕانی زانست بۆ ئامراز داڕووخانێکی قورسی کۆمەڵگاشی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا.

٥ ـ قازانجی پیشەسازی چەندین قاتی قازانجی تەواوی گۆڕەپانەکانی دیکەبوو. ئەکتەرە نوێکانی کۆمەڵگا پیشەسازکاران بوون. لەهەر گۆڕەپانێکدا پیشەسازی بە واتای باڵابوونی ستراتیژی دەهات. ئەوەی بەشێوەیەکی بەکاریگەر ئەم چەکەی بەدەستەوە بگرتایە پشتی لە عەرز نەدەدەرا. تەنانەت بازرگانیش باڵابوونی خۆی لەدەستدا بوو. کشتیارانیش پەراوێزکرابوون و بچووک دەبینران.

٦ـ ئەنجامە سیاسیەکانی زۆر گرنگتربوو. لەلایەک ریگای لەپێش دەوڵەت ـ نەتەوە کردەوە، بەرەو دەرەوەش پرۆسەو قۆناخی ئیمپریالیزمی دەست پێکرد. پەلامارەکانی بۆسەر جیهان لەچاو داگیرکاریدا شێوەیەکی سیستەماتیکی گرتووە. ئیتر دەوڵەتە سەرەکییەکانی پیشەسازی لە رەوشێکدابوون دووەمین هەڵمەتی مەزنی جیهانگیریان بەسەر جیهاندا دەسەپاند. یەکەمین هەڵمەت کە داگیرکاری بوو، شانبەشانی ئەوەی رووبەرووی زەحمەتی بۆوە، پەیرەوێکی بەپیتی حوکمڕانی نەبوو. هاوشانی هەناردن (تصدیر)ی سەرمایە داگیرکاری لە رێگای بەکرێگیراوە خۆجێییەکانەوە بەهێز دەکرا. هەرچی ئیمپریالیزمە شۆڕشی پیشەسازی دەرفەتێکی زیاتری بۆ دەرەخساند.

هەروەکو بینیمان ئەنجامەکانی شۆڕشی پیشەسازی بەرفراوان بوو. ئەنجامە کۆمەلایەتی و سیاسییەکانی شۆڕش بەلانی کەم هێندەی ئەنجامە ئابوورییەکانی بەکاریگەر بوو. ئەوەی سەرکەوتنی شارستانی ئەوروپای مسۆگەر کرد هەڵمەتەکانی پیشەسازی سەدەی نۆزدەهەم بوو.

لەکاتی هەڵسەنگاندنی شۆڕشی پیشەسازیدا رەخنەکردنی هەندێک چەمک بایەخدارە. یەکەمیان ئەوەیە شۆڕشی پیشەسازی و سەرمایەداری وەک یەک شت دەبینرێن. بەجۆرێک دەرکی پێکراوە هەروەکو بڵێی ئەنجامی راستەوخۆی سەرمایەدارییە. پێویستە ئەم چەمکە بشکێنرێت. هەروەکو رێنسانس، ریفۆرماسیۆن و رۆشنگەری شۆڕشی پیشەسازیش قۆناخێکی کۆمەلایەتی و مێژوویی تایبەت بە خۆی هەیە. ئەنجامی کەڵەکەبوونێکی درێژخایەنی مێژوویی و کۆمەلایەتییە.

بەشێوەیەکی گشتی پاوانخوازی دەوڵەت، بەتایبەتیش پاوانخوازیەکانی سەرمایەداری دەزگایەکن بەردەوام لەسەر زێدە ـ بەرهەم و بەهاکان قاڵدەبنەوە. لەکوێ توانایەکی زێدە هەبێت، وەک سەقاقوش یەکسەر بۆنی دەکەن و بەرەو ئەوێ دزە دەکەن. سەبارەت بەم بابەتە لووتیان زۆر هەستیارەو باش بۆن دەکەن. مەحاڵ بوو ئەوە نەبینرێت وزەو ئامێر کە لەخۆیەوە کاردەکات کاتێک لەبواری بەرهەم هێنانەوە بەکاربهێنرێت رێگا لەپێش سەرچاوەیەکی سەرسوورهێنەری قازانج دەکاتەوە.

ئەوەی سەرمایە سەبارەت بە بابەتی پیشەسازی توانی ئەنجامی بدات، بەستنەوەی ئەم دوو دیاردەیە بووە بە بەپیتترین گۆڕەپانی قازانجەوە.

جاری یەکەم بوو وزە لە وابەستەبوون بەهێزی بازووەوە رزگاری دەبوو. ئامێرەکان بوون بە خاوەن داینەمۆیەک کە تاڕادەیەکی مەزن دەیتوانی رۆڵی کاری بازوو ببینێت. کاتێک خەڵووز، نەوت، کارەباو ئاویش وەک سەرچاوەی وزە هاتنە پاڵ هەڵم، سەرچاوەی وزە شۆڕشێکی راستەقینەی بەخۆیەوە بینی. یەکگرتنی جۆرە نوێیەکانی وزە لەگەڵ ئەو سیستەمەی ئامێردا کە لە خۆیەوە کاری دەکرد، بووە بناخەی تەقینەوەی بەرهەمهێنان. میکانیزمی ئەم ئامێرانە و جۆرەکانی وزە کە تا رۆژی ئەمڕۆمان بە ملیۆنان جۆری لێ زیاد بوو، بەخێراییەک کە کەس نازانێت کۆمەڵگاو سروشت بەرەو کوێ دەبات و زیاتر بەشێوەیەکی نەرێنی هەڵیان دەوەشێنێت، پارچەو پەرتەوازەیان دەکات. سەرمایە کە ئەمە بەگەورەترین دەرفەتی مێژووی خۆی دادەنێت لە ئاستێکدا کە هاوتاکەی نەبینراوە شێوەکانی دەسەڵات لەسەر کۆمەڵگاو سروشت وێناو پراکتیزە دەکات. کۆمەڵگاو سروشت رووبەڕووی هێرشە بێهاوتاکانی سەرمایەیە. پاراستن یان بەرگریکردن لە کۆمەڵگاو سروشت زۆر لەسەروو تێکۆشانی چینایەتی و کۆمەڵایەتییەوە، بۆتە کێشەیەکی ئۆنتۆلۆژیانە. لە رێگای باسکردنی چەند رووداوێک وەک نموونە دەتوانرێت ئەم گریمانەیەمان بەشێوەیەکی دیاربخەینە بەرچاو.

ا- بوونی شار بەشێرپەنجەیەک و هەرەسی لادێ جێگای باسە. دوانەی کۆمەڵگاو سروشت هەم هەریەکەیان لەناوخۆیدا، هەم ئەوەی لەنێوانیاندایە لە شێوەیەکی ژیان بەدەر دەنرێت. رووبەڕووی ئەو رووداوەین کە بە بەردەوام نەبوونی سروشت (ژینگە) و کۆمەڵگای نەخۆش ناو دەبرێت. لەجیاتی شێوەیەکی هەبوون کە دەتوانرێت لەناویدا بژیت، کۆمەڵگا بۆ پارچەیەک و پاشکۆی سیستەمی ئامێری چەوسانەوەو بالادەستی دەگۆڕدرێت. بەشێوازێک کۆمەڵگاو تاک و سروشت رووبەڕووی یەک کراونەتەوە کە لەهیچ قۆناخێکی مێژووی مرۆڤایەتیدا نەبینراوە، تاکڕەوێتی و سروشتیش کە هاوسەنگی ژینگەیی لەدەستداوە،

وەک دوو دژی هێرشکار، لە رەوشێکدان وەک بڵێی تۆڵە لە کۆمەڵگاو ژینگە دەکەنەوە. زانستی پزیشکی رۆژانە لە ریگای سەدان نموونەوە دەیسەلمێنێت کە شێرپەنجەی تاکە کەسی سەرچاوەکەی لە کۆمەڵگا و لایەنی کۆمەڵایەتیدایە. کاتێک ئەوە بێنینە بەرچاوان تەنیا جگەرە کە راهاتنێکی کۆمەڵایەتییە (تووتن، سەرچاوەیەکی قازانجی سەرمایەدارییە، بۆیە هانیدەدات) هۆکاری هەرە سەرەکی شێرپەنجەیە، ئەو کاتە باشتر دەرکی پێدەکرێت کە باسکردنی شێرپەنجەی کۆمەڵگا زاراوەیەکی راستە. ئیتر کۆمەڵگا وەک چوارچێوەیەکی ژیان نەماوە.

گەورەترین هەرەشەی ئیندوستریالیزم (تەنیا بینینی پیشەسازی وەک سەرچاوەیەکی قازانج) ئەوەیە کە بەرەهەندی دژە ـ کۆمەڵگا گەیشتووە. یەکێک لەو بابەتانەی کە مارکسیزم لەبارەیەوە زۆر ناتەواو ماوە ئەمەیە. بەهۆی بونیادە پۆزێتیڤیستەکەیەوە، بەبێ هیچ نارەزاییەک کۆمەڵگای پیشەسازی وەک دیاردەیەکی نموونەیی پەسەند دەکات، تەنانەت دەیکات بە ئیلاهی. چونکە لەو بڕوایەدایە کە چینی کرێکار بەبێ ئەو ئاوانابێت و ناتوانێت بژیت. ئەمە لە کرۆکی تیۆریەکەیدا شاراوەیە. بچووکترین رەخنە دەرهەق بە پیشەسازی ناکەن، لە بەرامبەر ئەمەشدا بەشێوەیەکی بێ سنوور سیستەمی ئامێر و کارگەکان شکۆدار دەکەن، هەربۆیە بە دڵنیاییەوە دەکرێت بگووترێت کە بەلانی کەم مارکسیستەکانیش هێندەی سەرمایەداری لە پێکهاتەی ئایینی ئیندوستریالیزم خاوەن رۆڵن. لەمێژە ئیندوستریالیزمیش بەلانی کەم هێندەی لیڤی ئەتهانی دەوڵەت ـ نەتەوە بەدۆخی لیڤی ئەتهانێکی جیهانگیر گەیشتووە.

شار رۆڵی خانەی سەرەکی شێرپەنجەی کۆمەڵگا دەبینێت. لەگەڵ ئەوەی زۆرجار ئاماژەمان بە مێژووی ئاواکردنی شار و رۆڵەکەی کردووە، بەڵام ناچارین بەردەوام پەیوەندییەکەی لەگەڵ پەرەسەندنی کۆمەڵگادا تاوتوێ بکەین. شار بەوئەندازەیەی شێوەیەکی کۆمەڵگایە، لە هەمان کاتدا رۆڵی بڕیارگای جیابوونەوەی چینایەتی و ئاواکردنی دەوڵەتیش دەبینێت. بۆچوونێکی گشتی پەسەندکراوە کە هەرسێ دیاردەی سەرەکی (کۆمەڵگاکانی چینایەتی، شار و دەوڵەتی) بە واتای شارستانیبوون دێت.

لە خۆرا ناوەکەی دیکەی شارستانی بە "مەدەنییەت" ناونەبراوە. بە زمانی عەرەبی تایبەت بە شارە، بە واتای ژیانی شارنشینی دێت. بەرامبەری (Civilisation) مانایەکی نزیک لەمە لەخۆوە دەگرێت.

لەلایەکی دیکەوە تەنیا بینینی شار وەک دیاردەیەکی شارستانی دەبێتە هەڵوێستێکی تەسک. شار ناچار نییە ببێتە شوێنی شارستانی، یان خۆی ببێت بە شارستانی. هەروەکو چۆن ئاواکردنی گوند دیاردەیەکی مێژوویی ژیانی کۆمەڵگایە، دەشێت شاریش لەم چوارچێوەیەدا شرۆڤە بکرێت. کۆمەڵگا ناتوانێت بەردەوام لە ئەشکەوت و لە کونە دارەکاندا بحەوێتەوە، هەروەها ناچاری رەوشێکی بەمجۆرەش نییە کە لە گوند دەرنەچێت. ناچار بوو ژیان و شوێنێک ئاوابکات کە ئەشکەوت و گوند تێپەڕ بکات. وەک ئەنجامێکی ئەم لێکەڕینانە شار جێگای خۆی لەمێژوودا گرتووە. رۆڵی شار لە پێشکەوتنی ژیری ئەنالیتیکیدا گرنگە. شار وەک جێگای کۆمەڵگای تێکەڵ و ئاڵۆز، پێویستی بە خەباتی ئەنالیتیکی ئەقڵ هەیە. بۆ ئەمە ناچاری دەکات. بەگوێرەی ئەو راستییەی کە مێشک شوێنی گەڕانە بەدوای چارەسەریدا بۆ ئەم پرسیارە زیادبووانەی کۆمەڵگا، پێشکەوتنی بەشی پەیوەندیداری مێشک بەشێوەی ئەنالیتیک بابەتێکی مایەی تێگەیشتنە. هەڵبەتە خودی کۆمەڵگا پێویستی بەمجۆرە ژیرییە هەیە. شار ئەمە بەرەو ئاستی ژوور دەبات. هەروەها دەتوانرێت شار وەک شوێنی هاوبەشی پێویستی گروپەکانی گوند پێناسە بکرێت.

ئەم خاڵە زۆر گرنگە. فەلسەفەی ئاواکردنی شار لەم دیاردەیەدا دەدۆزینەوە. ناشێت بەبێ هەبوونی گوند بیر لە دامەزراندنی شار بکرێتەوە. ئەم چەمکە بەربڵاوەی دەتوانرێت وەک (Citisim) واتا شارگەرایی هەڵسەنگێنرێت و بەڵام ناوی لێنەنراوە، لە گەوهەری خۆیدا لادێ بە دژی شار دادەنێت. کارەساتەکە لەم چەمکەدایە. جێگیرکردنی شار لەپێگەی دژایەتی کردنی لادێدا، نەک هەر چەمکێکە، بەڵکو مەیلێکە کە لەناو پەرەسەندنی مێژوودا زۆر ئاشنای بووین: بینین و هەڵسەنگاندنی شار وەک دیاردەیەکی دژ بە گوند و لادێ. ئەم مەیلەی لە بنەڕەتدا لە فەلسەفەی ئاواکردنی شار و بنەما مێژووییەکەیدا نەبووە، چەمکێکی

چینایەتی و دەوڵەتی پیشان دەدات. ئەم راوەستەیەی بەرامبەر گوند کە بە واتای دەسەڵات و زێدە ـ بەرهەمێکی زیاتر دێت جێگای خۆی لە قووڵایی شارستانیدا گرتووە. بچووک بینینی گوند و لادێ، سووکایەتی پێکردنی، بارکردنی بەسیفەتەکانی بێهۆشی، نەزانی، دوور لە رێز و قەبا سەرچاوەی خۆی لەو هەڵوێستەوە وەردەگرێت کە ئەم چەمکە بەدرێژایی مێژوو نیشانیداوە. هەروەک بڵێی دەوڵەت و شار بەرامبەر بە گوند و لادێ، لێرەشەوە بە قورسی بەرامبەر یەکینەکانی تیرەو خێڵەکانی خەڵکی ناوچەکانی دەرەوەی شار لەناو رێککەوتنێکی مێژووییدان. بەمجۆرە بەشێوەیەکی ناهەق و لە ریگای دوورخستنەوەی شار لە فەلسەفەی راستەقینەی ئاواکردنیەوە، شێواندنی و گەیاندنی بە رەوشێکی پڕ لە کێشە، ناکۆکییەکانی نێوان شار و گوندی تا رۆژگاری ئەمرۆمان هێناوە.

لەراستیدا شار و گوند وەک دوو شوێنی کە کار لەیەکتریدەکەن، دەتوانرا بەشێوەیەکی تەباو هاوسەنگی وەک گۆرەپانی دەست لێبەرنەدراوی ژیانی کۆمەڵگا ئاوابکرایە. بە تایبەتیش لەنێوان هەردووکیاندا، بەشێوەیەکی گشتیش دەتوانرا لەنێوان ژمارەی دانیشتوانی کۆمەڵگاو ژمارەی دانیشتوانی شار و لادێدا هاوسەنگییەکی ئیکۆلۆژی ئاوابکرێت، رێژەیەکیان بۆ دابنرێت، ئەمەش دەبوو بە چارەسەرییەکی هەرە نموونەیی. یەکێک لە خراپەکارییە هەرە گەورەکانی شارستانی ئەوەیە کە بەردەوام لە دژی گوند و لادێ شاری گەورە کردووەو وەک ناوەند و شوێنێکی چەوسانەوە و حوکمڕانی هێشتوویەتییەوە. لەسەر ئەم بنەمایە رۆڵەکەی دەشێوێنێت. شارەکان لە رۆڵی سەرەکی خۆیان خاڵیدەکرێنەوە. تەنیا گەیاندنی ئەم شوێنە بە فەلسەفەی راستەقینەی دامەزراندنی پێویستی بە چالاکییەکی مەزنی کۆمەڵگا هەیە.

ئەنجامێکی دیکەی لە مێژووی شار پێی دەگەین، بەبێ ئەوەی رەچاوی پەیوەندییەکەی لەگەڵ ژینگەدا بکرێت وەک تەنێکی شێرپەنجەیی گەورە دەبێت. پرسیاری: **"پێویستە شوێن و سنوورەکەی کوێ بێت؟"** وەڵامی نییە. لۆژیکی شێوێندراوی شارو ئەو شارستانیانەی لە سایەی ئەم لۆژیکەدا سەریانهەڵداوە، بەپێچەوانەی مەزەندەکانەوە بەرهەمی ئەقڵ نییە، بەڵکو

هی بێ ئەقڵییە، راستتر شاکارێکی ئەقڵی ئەنالیتیکە کە لەدەنگی تەنەکە دەچێت، پەیوەندی بە ژیان و راستییەوە نەماوە. ئەمڕۆ باشتر دەرک بە رەهەندەکانی کارەساتەکان دەکرێت. دیسان لەچاخەکانی یەکەمیندا شار پێکهاتەیەکی شکۆداربوو. هەست و هۆشمەندی هێندە لەدەست نەدرابوو. لە شارستانی سۆمەر و میسردا ناکۆکییەکانی نێوان سروشت و گوند ـ دەرەوەی شار هێشتا قووڵ نەببۆوە. هێشتا تای تەرازووی هاوسەنگییەکان بەلای گونددا بوو. ئەو شارانەی لەدەوروبەری قەڵای دەرەوەو ناوەوە گەورە دەبوون لەبواری شوێنەوە لەگەڵ کشتوکاڵدا ئاوێتە بوون. زۆر دەگمەن بوو قەبارەکەیان سەد هەزار کەس تێپەڕ بکات. لەوانەیە چەند پایتەختێک بەم ئاستە گەیشتبن. کێشەی پیسکردنی ژینگە بە ئاستێک نەگەیشتبوو قورسایی دروست بکات. بیناسازییەکی واتاداریان هەبوو، لەبواری ئۆرگانییەوە یەکپارچەبوو. لە شارستانی گریک ـ رۆمادا پەرستگا، بازاڕ، ئەنجوومەن، هۆڵی شانۆگەری و ژیمناسیۆم[1] پشتیان بە بیناسازییەکی شکۆدار دەبەست. سەکۆ و باخچەکان و سیستەمی ماڵ یەکپارچەیی ئۆرگانییان تەواو دەکرد. پاشماوەکانیان تاکو ئێستاش جۆش و ئەشقی خودایی لای مرۆڤ دەئافرێنن. شوێنێک بوون پیرۆزییەکی دیار و واتایەکی فەلسەفییان هەبوو.

لەمیانەی ئەو بازرگانییەی لەچاخی ناوینا زیادی کرد هەرچەندە یەکپارچەیی شێوابێت، بەڵام هەر بەردەوام بوو. کاریگەری قورسایی کلتووری مەعنەوی بیناسازی ئایینی دەرخستە پێش. هیچ کاتێک قەبارەیان بەو ئاستە نەگەیشت ببن بەهەڕەشە. لەگەڵ گوڕەپانی لادێ ـ دەرەوەی شار زیاتر نزیکی هاوسەنگی بوون. تەواوکردنی یەکتر لایەنی لەپێشتر بوو. گرنگی کشتوکاڵ، پیشەکاری ناو شاریشی کرد بە کەرتێکی پێگەیشتوو. پیشەکار پێویستی بەلادێ هەبوو، لادێیش پێویستی بەپیشەکار هەبوو. لە ناکۆکی زیاتر لەناو یەکێتییەکی سروشتیدا بوون. تاکە مەترسییان کارەساتە خۆڕسکەکان (بوومە لەرزە، وشکەساڵی) و شەڕبوو. شکۆداری سیستەمی قەڵاو شوراکان بەردەوام بوو. بازرگانی

---
١ یاریگا

مەزن هێشتا بەو ئاست و ڕەهەندانە نەگەیشتبوو پیشەکاران و گوند قووت بدات. بازرگانی وەک کەرتێکی ئابووری لەسەر ڕێگای ئاسایی خۆی بوو. لەماوەی نێوان سەدەکانی ١٢ و ١٦هەمدا بەهۆی کاریگەری ڕێنسانسیشەوە ئیتر شارەکانی ئیتاڵیا دوا نوێنەری ئەم قۆناخە بوون. ڤینسیا، جەنەوا و فلۆرەنسا ڕۆڵی ئەو پردەیان دەبینی کە شارستانی کلاسیک و چاخی نوێیان دەکرد بەیەک.

لەگەڵ هاتنی چاخی نوێدا شارگەرایی واتایەکی دیکەی لەخۆوە گرت. باڵادەستی بازاڕ لە ئاسۆوە دیاربوو. لەگەڵ بەسەرچوونی کاتدا بازرگانی قورسایی خۆی زیاد دەکرد. ئیتر هاوسەنگی مێژوویی هێدی هێدی دژ بە گوند ـ لادێ دەگۆڕا. بیناسازی شارێک دەردەکەوتە پێش کە پێویستییەکانی بازرگانی بە بنەمادەگرت. پەیوەندی ژیان و ژینگە لە دەست دراوە، زهنییەتی قازانج بە ڕەوشێک گەیشتبوو هەمووشتێکی دەست نیشان دەکرد. ئەو شارانەی ئاواکران لە سەرووی هەمووشیانەوە پاریس، لەندەن، ئەمستردام و هامبۆرگ مۆرکی قۆناخی نوێ، واتە مۆرکی مارکانتیلیزمیان پێوە بوو. شارەکانی سەردەمی بازرگانی هەم جیاوازی خۆی لەگەڵ چەمکی شاری کۆن زیاتر دەکرد، هەم بەشێوەیەکی خێرا ناکۆکیەکانی لەگەڵ سروشت و کۆمەڵگای لادێ دەخستەڕوو. شار وەک مەڵبەندی سەرەکی لیڤی ئەتهانی هاوچەرخ چەپۆکی خۆی بۆ تەواوی کۆمەڵگاو بوارەکانی ژینگە درێژ کردووە. سەردەمی ئیندوستریالیزم مەرگی شارە. ڕەهەندی سەیرتری مەسەلەکە ئەوەیە، نەخۆشی شێرپەنجەی بایۆلۆژیش بە قورسایی نەخۆشییەکی شارە. مسۆگەر شێرپەنجە گرێدراوی ئەو دۆخەیە: شار کۆمەڵگای خۆی دەکاتە کۆمەڵگایەکی نەخۆش.

شۆڕشی پیشەسازی کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا بە خێرایی پێشکەوت، سەرەتا لە مەڵبەندەکانی لەدایکبوونییەوە گورزی لە کۆمەڵگا وەشاند. دامەزراوەکانی پیشەسازی کە وەکو هەرەسی بەفر لەشار گەورە دەبوون، هەروەک لە سروشتیاندا هەیە بەهۆی پێویستی ژیان نەبوون، بەڵکو سەرچاوەی خۆیان لە پێویستی قازانجەوە دەگرت. نیشتەجێی

شەوانەو گەڕەکەکانی تەنیشت شار کە بۆ حەوانەوەی پرۆلیتارەکان (کۆیلەهاوچەرخەکان) زۆر ببوون، زەمینەیەک بوو شار لێی نامۆبوو. نوێنەرایەتی داگیرکردنی لادێیان دەکرد. شارەکانی نیشتەجێی شەوانەو گەڕەکەکانی کەنار شار وەک کۆلۆنیەکی ناوخۆ زۆر لە بزاوتی کۆلۆنیەکانی چاخی بازرگانی مەترسیدارتربوون. ئەگەر خاوەن کاربن یان بێکار ئەم گۆڕەپانانە بۆ پیشەسازی وەک کۆگای رەنج بوون. کۆگا بۆ بازرگانی چی بێت، نیشتەجێی شەوانەو گەڕەکەکانی کەنار شار بۆ پیشەسازی هەمان شت بوون. گرێدراو بەم دیاردەیە گەلێک دیاردەی لابەلا پەیدابوون. لەپێناو کارگەکاندا ژمارەی زۆری دانیشتوان (ئەوانیش وەک کارگە بەخێرایی زۆر دەبن) شار داگیر دەکات. چەمکی مۆدێلی چاخی کلاسیک لەبیر کرا. شارەکان بوون بە مەڵبەندی قووتدانی کۆمەڵگا. لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا سیاسەتی ئیندوستریالیزم سەبارەت بە شار: وەهای لەشارکرد لەژێر هەوری تەم و مژدا بە زەحمەت هەناسە بدرێت. بۆ یەکەمین جار لەمێژوودا شاری خاوەن دانیشتوانی ملیۆنی سەریانهەڵدا. بەگوێرەی پێشداوەری زانیارییەکانی بیناسازی نەک شاری یەک ملیۆنی، بەڵکو ئەو شارەی ژمارەی دانیشتوانی نیو ملیۆن تێپەڕ بکات خاوەن رۆڵ نابێت. ملیۆنێک و زیاتر بە واتای ئاشکرابوونی رەهەندی قەیرانی نەخۆشییەکان دێت.

ئەو دیاردەیەی بەشێرپەنجە ناودەبرێت، گەورەبوونی خانەیەکە بەشێوەیەک تەواوی بونیادی جەستە بگرێتەوە. لە دۆخێکی بەمجۆرەدا خانە ئۆرگانییەکانی دیکە بەرەوشێک دەگەن کە ناتوانن ئەرکی خۆیان جێبەجێ بکەن، نەخۆشەکە دەمرێت. گەورەبوونی شاریش سەبارەت بە کۆمەڵگا ئەنجامی هاوشێوەی لێدەکەوێتەوە. دیاردە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکانیش رەهەندو قەبارەی خۆیان هەیە. ئەگەر یەکێک لەم رەهەندانە وەک هەرەسی بەفر گەورە ببێت، واتە شێرپەنجە دەستی پێکردووە. شارێک کە ملیۆنێک، بەتایبەتی دە ملیۆنی تێپەڕکردبێت لە دۆخی کۆمەڵگا دەردەچێت: گەیشتنە بە دۆخی کۆمەڵگای مێگەل کە بە ئاپۆڕا ناو دەبرێت. هەروەکو چۆن ئاخوڕ پڕ لەمێگەلی ئاژەڵ

دەکرێت، لەناو شاریشدا ئەو وشەیەی بە باشترین شێوە گوزارشت لە کۆمەڵگای مرۆڤ دەکات ئاخورە. ئەو مرۆڤانەی بوون بەمێگەل، ئەو ئاخورە پڕ دەکەن کە شاری پێدەڵێن. لەمێژە بەوە رازیکراون کە ببنە کۆمەڵێکی سادەی بەکاربردن. مێگەلەکەی ئاخوڕیش هەر بەمشێوەیەیە. هەروەها مێگەلێکی بێکارانیشیان لە تەنیشتیانەوە داناوە. لە رێگایەوە ئارام دەکرێنەوە. مەڵبەندی بەڕێوەبەرایەتی و کۆشکی تایبەت و خانووە باخدارەکانیان وەک زاراوە لەگەڵ رۆحی شار گونجاو نین. دەتوانن ناوەندی بەڕێوەبەرایەتی لە شاخیش ئاوابکەن. کۆشک و ماڵە باخدارەکان پێویستی بە شار نییە. دەتوانرێت لەهەموو شوێنێک ئاوا بکرێن.

ئەو کاتە چی لەشاردا دەمێنێتەوە؟ لەمێژە پەرستگا، شانۆگەری، ئەنجوومەن، بازاڕ و ژیمناسیۆم شوێنی خۆیان بۆ نموونەکانی جیهانی سیمولاسیۆن جێهێشتووە. کەواتە بەناوکردنیان بەو شوێنانەی کە هەناسەدانی دروستکراوی تێدایە گونجاوترە. بەم دۆخەیەوە ئاییندەی شار نادیارە. بەخێوکردنی شارێکی دە ملیۆنی، بە واتای مردنی کۆمەڵگای ئیکۆلۆژی دەڤەرێک دێت. تەنانەت بەخێوکردنی ئەم شارە پێویستی بە کۆمەڵکوژی کۆمەڵگاو ژینگە دەبێت. بۆ کوشتنی ولاتێک تەنیا چەند شارێکی ٥ـ١٠ ملیۆنی بەسە. تەنیا پیسکردنی ئاوو هەوا لەرێگای بەکارهێنانی ئۆتۆمبیل و هاتوچۆوە بۆ مردنی شار بەسە. بەهۆی زیادبوونی لە رادەبەدەری ژمارەی دانیشتوانەوە شار واتای خۆی لە دەستداوە. شوێنێک واتای نەبێت باس لە ژیان ناکرێت. هەڵبەتە ئەگەر بەتەنیا هەناسەدان بە ژیان لە قەڵەم نەدەین.

جاران شار گۆرەپانێک بوو کە راستییەکانی لێدەدۆزرایەوە و فەلسەفەی تێدا پێشدەخرا. ئێستاش لەشارە رووخاوەکانی ئێندوستریالیزمدا ئەو کێڵگە تەویلانەن کە لە رێگای خاڵیکردنەوەی ناوەڕۆکی سێکس، سپۆر و هونەرەوە بە مێگەلبوونی تێدا ئەنجام دەدرێت.

ب ـ رەهەندێکی دیکەی لەناوبەرانەی پەیوەندی ژیان ـ ژینگەیە. لەکاتێکدا شار زیاتر لەناوەوە کۆمەڵگا تووشی شێرپەنجە دەکات، ئێندوستریالیزم بەشێوەیەکی سەرتاپاگیری پەلاماری ژینگە ـ سرووشت

دەدات. سیاسەتی ئێندوستریالیزمی دەوڵەت ـ نەتەوە کە تاکو ئێستاش گرنگی خۆی لەدەستنەداوە، پێویستی بەوە هەیە کە سەرچاوەکانی تەواوی وڵات و کۆمەڵگا وابەستەی پیشەسازی بێت. ئەمە وەک ڕێگایەکی گەشەپێدان دەبینێت. لە ڕاستیدا ئەم سیاسەتە هیچ پەیوەندییەکی بە دەوڵەمەندکردن، گەشەپێدان و بەهێزکردنی وڵاتەوە نییە. هۆکاری سەرەکی ئەوەیە، بەرزترین ڕێژەی قازانج لەم گۆڕەپانەدا بەدەست دێت. ئێندوستریالیزم بزاوتێکی بەڕێوەبەرایەتی قازانجە. زاراوەکانی وەبەرهێنان و گەشەپێدان پەردەیەکن ئامانجی بنچینەیی دەشارنەوە. قازانج هەبێت وەبەرهێنان و گەشەپێدان دەبێت. ئەگەر نا سەربەخۆ وەبەرهێنان و گەشەپێدان هیچ واتایەکی نییە. ئێندوستریالیزم دزییەکی هەزاران قات لە موڵکداری گەورەترە. بەتایبەتیش دزییەکە لە تەواوی گەل و سروشتی وڵات دەکرێت. دەبێت ئاماژە بەو خاڵە بکەم کە شێوەی سەربەخۆ وەبەرهێنان و بەرهەمهێنانی پاڵپشت بەکارگەمان مەحکوم نەکردووە. لە چوارچێوەی بە بنەماگرتنی ئاسوودەیی و بەختەوەری کۆمەڵگا و سروشت هەمووکاتێک دەتوانرێت مۆدێلێکی گونجاوی کارگەو وەبەرهێنان پێشبخرێت. ئەمانە بە تەنیا خراپییان لێناکەوێتەوە. کاتێک دەکەونە ژێر فەرمانی قازانجەوە ڕێگا لەپێش شێرپەنجە دەکەنەوە. ئەو پیشەسازییەی لەپێناو قازانجدایە بۆ پێداویستییەکانی کۆمەڵگا نییە. ڕێسای قازانجی هەرە زۆر سەرچاوەی خۆی لە پێویستییەوە وەرناگرێت. لۆژیکی خۆی هەیە. گۆڕەپانی پێویستییەک کە قازانجی لێبکەوێتەوە پێیەوە خەریک دەبێت. ئەگەرنا ڕووبەڕووی مردن بەجێدەهێڵرێت. ئەگەر ئەو تەکنۆلۆژیانەی هەن بەشێوەیەکی ڕاست پێشبخرێن و بەکاربهێنرێن، هیچ یەکێک لە کێشەکانی بێکاری، هەژاری، نەخۆشی و بێ پەروەردەیی وەک کێشەیەکی کۆمەڵگا لە ئارادا نامێنن. لەهەمووشیان گرنگتر پێویستی ئەوە نامێنێت لەپێناو گەڕان بەدوای سەرچاوەدا لە ڕێگای تەکنۆلۆژیاو کارگەکانەوە ژینگە کاول بکرێت.

بەهەزاران گۆڕەپان کە مسۆگەر دەتوانن بەئاسانی پێویستییە ژیانییەکان دابین بکەن، تەنیا لەبەرئەوەی قازانجیان لێ بەدەست نایەت لە

کار خراون. هەرچی لەپێناو قازانجدایە بەبێ ئەوەی ڕەچاوی دەرئەنجامە ژیانییەکانی بکەن لەماوەیەکی کورتدا ئەو سەرچاوانەی بۆ وشک دەکرێت کە دەرئەنجامی گەشەکردنی ملیۆنان ساڵن. بەهۆی بەدەستهێنانی قازانجەوە سیاسەتەکانی نەوت، دەریا، دارستان و کانزاکان ژینگەیان کردووە بەگۆڕەپانی مان ـ نەمان. هیچ دیاردەیەک هێندەی کۆمەڵکوژی ژینگە ڕەهەندی هۆڤێتی ڕووداوی قازانج ڕوون ناکاتەوە. بەهەزاران زانا دەست نیشانیان کردووە کە نەک چەند سەدەیەکی دیکە، بەڵکو تەنیا چەند دەیەیەکی دیکە ئەم چاوچنۆکییەی قازانج بەردەوام بێت، کارەساتی ژینگەیی مسۆگەر دەبێت.

ئیندوستریالیزم سەرکەوتنێکی نائاسایی ئەقڵی ئەنالیتیکە. بەڵام ژێرکەوتنێکی جەرگ بڕانەی ئەقڵی سۆزداریشە. ئیندوستریالیزم سەرلەنوێ زیندووکردنەوەی سروشە خوداییە کۆنەکەیە کە تەواوی بوونەوەرانی جیهان دەخاتە ژێر خزمەتی مرۆڤەوە. گووتەی خزمەتی مرۆڤیش چەوتە. لەپێناو خەونی قازانجی چڵێسیانەی چەند کەسانێکدا تەواوی زیندەوەران دەکرێنە قوربانی. لە حاڵەتێکی بەمجۆرەدا بە تایبەت پێشکەشکردنی مرۆڤ وەک قوربانی بووە بە مەسەلەیەکی کات. هیچ نموونەیەک هێندەی ئیندوستریالیزم بەگوێرەی پێناسەی خراپی پەرتووکی پیرۆز گونجاو نییە.

ج ـ نابێت ئیندوستریالیزم وەک کێشەیەکی بەرهەمهێنان ببینرێت. ئەگەر بە قازانج و پاوانخوازی سەرمایەی سەر بەرهەمهێنانی بەناوبکەین ئەو کاتە واتا بنەڕەتییەکەی بەدەستەوە دەدات. ئەگەر پیشەسازی نەکەوێتە خزمەتی پاوانەکانی قازانجەوەو پێویستییە سەرەکییەکانی کۆمەڵگاو هەلومەرجەکانی ژینگە ڕەچاو بکرێت، هەمووکاتێک دەکرێت بەگوێرەی دەرفەتەکانی زانست و تەکنۆلۆژیا بەرهەمێنان یان سیاسەتی وەبەرهێنان وێنابکرێن. ئەمە بە ئامێربێت یان بێ ئامێر جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە. تەنیا ئەوەندەیە کە یەکێکیان هێدی، ئەویتریان خێرا بەرهەمدێنێت. ئەوەی لێرەدا دیاریکەرە پێویستییەکانی کۆمەڵگاو مەرجە گونجاوەکانێتی لەگەڵ دەوروبەرو ژینگەدا. خێرایی یان هێدی بوون بە تەنیا نابێتە ئامانج. لەم

سۆنگەیەوە ئامێریش بە تەنیا خۆی باش یان خراپ نابێت. ئەو دیاردەیەی بە ئیندوستریالیزم دەناسرێت لەسەدەی نۆزدەهەمەوە تا رۆژگاری ئەمڕۆمان: کاتێک ئامانجی قازانج مۆری خۆی لە تەواوی پرۆسەکانی وەبەرهێنان، بەرهەمهێنان و بەکاربردن دەدات ئینجا ئەمانە خێرا یان هێدی بن، ئەوکاتە هەمووشتێک دەبێت بە کێشەو کانگرێن. هەربۆیە بەشێوەیەکی نائاسایی شارەکان گەورەبوون. بەشێوەیەکی مەترسیدار چەک بەرهەمهێنرا و پێشخران. سوپای زەبەلاح دامەزرێنران. شەڕی سامناک لە ئاستی جیهاندا روویدا. کۆمەڵکوژی ژینگە دەستی پێکرد. جانەوەری دەوڵەت ـ نەتەوە ئافرێنرا. ناوەڕۆکی ژیان بەتەواوی خاڵیکرا. سیاسەت لەناوبرا. کاتێک سەرمایەداری وەک پاوانخوازی مۆری خۆی لە بەرهەمهێناندا جانەوەری ئیندوستریالیزم پەیدا بوو. ئەمەیە ئەو خاڵەی دەبێت بەگرنگییەوە راوەستەی لەسەر بکرێت.

پاوانخوازی دەوڵەت سەرەتا لە کشتوکاڵ و دواتریش لە بازرگانیدا زێدە ـ بەرهەمی بەدەست هێنا. لەسەدەی نۆزدەهەمدا لەسەر بەرهەمە بێ هاوتاکانی پیشەسازی قازانجێک بەدەست هێنرا کە لەهیچ قۆناخێکی مێژوودا بەدەست نەهێنرابوو، بەگووتەیەکی دیکە وەک بەرامبەرەکەی زێدە ـ بەرهەم سەرمایە بەدەست هێنراوە. کاتێک قازانج بەسەر پیشەسازیدا دەسەپێنرێت هەمووشتێک لە سنووری خۆی دەردەچێت. کەواتە قازانجی پیشەسازی و ئیندوستریالیزم زاراوەی زۆر لەیەکتر جیاوازن. هەروەها ئیندوستریالیزم ئابووریش نییە **"پاوانخوازی ئابوورییە"** پاوانێکە بەسەر بەرهەمی پیشەسازیدا سەپێنراوە، ئینجا پاوانخوازی دەوڵەت بێت یان تایبەت هیچ فەرقی نییە. لێرەدا مەبەست گفتوگۆکردنی ئەو خەباتە ئابووریانە نییە کە هەزاران ساڵە کۆمەڵگا لە رێگای رەنجی دەست و بازوویەوە بەبێ ئەوەی لەخۆی نامۆببێت لە گۆرەپانەکانی بەرهەمهێناندا بەشێوەکانی کارگە، دەزگا (وەرشە)، کێڵگەکانی کشتوکاڵ و مانیفاکتۆر ئەنجامیان دەدات. کێشەکە لەبەرهەمهێنانی بەروبوومەوە لەم گۆڕەپانانەدا سەرچاوە ناگرێت. هەروەها لە ئاڵوگۆڕکردنی ئەم بەروبوومانەوە لە بازاڕیشدا سەرچاوەناگرێت. کاتێک راستەوخۆ دەوڵەت بۆخۆی یان

هەندێک کەس بەناوی دەوڵەتەوە ئەم گۆڕەپانە بەپیت و گونجاوانەی دابینکردنی پێویستییەکانی مرۆڤ بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە، لەمیانەی پەیڕەوەکانی باج، تالان و قازانجەوە زیادەکان ئاودیوبکەن، ئەو کاتە کێشەی جددی ئابووری و کۆمەڵایەتی سەرهەڵدەدات. لەدوای ئەو قۆناخەی بەرهەمهێنان کە بەشۆڕشی پیشەسازی ناویدەبەین، لەسەدەی نۆزدەهەمەوە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان، دوای ئەوەی بوو بە گۆڕەپانێکی نائاسایی بەدەستهێنانی قازانج، لە ئاکامی داسەپاندنەکانی پاوانخوازی، لەسەرڕوویانەوە شەڕە چینایەتی و نەتەوەییەکانەوە کۆمەڵگا هەم لەناوخۆیدا، هەم لەگەڵ کۆمەڵگاکانی دەرەوە، هەروەها بەرامبەر بە سروشتیش پێکدادانەکانی قووڵ بۆوە. کۆمەڵگا لەژێر دەسەڵاتی هەژموونێکدایە کە هیچ کاتێک بەخۆیەوە نەبینیوە. هەمووان لەگەڵ یەکدی شەڕ دەکەن. بە واتایەکی دیکە جانەوەرەکەی هۆبز لیڤی ئەتهان کۆتایی بە "**شەڕی هەمووان لەگەڵ یەکدیدا**" ناهێنێت. بەپێچەوانەوە بۆ شەڕی "**هەمووان بەرامبەری یەکتری**" و لەگەڵ سروشت و خودی خۆیدا دەگۆڕێت. ئەمەش ئەو دوا قۆناخەیە کە جانەوەر بووە بە کۆمەڵگا، کۆمەڵگاش لەجێگای جانەوەر دەژێت.

د - زاراوەی کۆمەڵگای پیشەسازی بەتەنیا واتای نییە. کاتێک پاوانەکانی پیشەسازی ئاوادەکرێن کۆمەڵگا زیاتر بە شمەکەوە دەبەسترێتەوە، شمەکیش بەو بەروبوومەوە دەبەسترێتەوە کە بۆ ئاڵوگۆڕ پێشکەش دەکرێت، بەرهەمهێنانیش بە پیشەسازییەوە دەبەسترێتەوە. سەرمایەداری پاوانی پیشەسازی ڕەوشی گرێدانی گۆڕەپانەکانی بەرهەمهێنانە بە پیشەسازی پاوانخوازییەوە. لەم چوارچێوەیەدا دەشێت کۆمەڵگای پیشەسازی وەک قۆناخێکی دیکەی شارستانی ببینرێت. ئەگەر بڵێین قۆناخێکی بەمجۆرەی شارستانی مۆری خۆی لە سەدەی نۆزدەهەم دا واقیعییە. لەبەرئەوەی لەهەمووکاتێک زیاتر دەرفەت بە دزینی قازانجی زیاتر دەدات، دەشێت بە سەردەمی شکۆداری سەرمایەداریش ناوببرێت. چڵێسی قازانج تەواوی کۆمەڵگا دەتەنێتەوە. بوون بە سەرمایەدار دەکرێتە ئامانجی ژیان و وەک شێوازی سروشتیانەی ژیانی لێدەکرێت.

بەڵێ لەم بوارەدا کۆمەڵگای پیشەسازی یەکەمینە. کۆمەڵگایەکی ئاستی هەرە بەرزی سەرمایەداریتییە. رەوشی پادشای رووتە، واتە دۆخێکە بۆ یەکەمین جارە سەرمایەدارە لەپیشەکان بۆ گرووپێکی پادشا نوێکان دەگۆڕێن کە لە کۆنەکان جیاوازترن، جلوبەرگ و عەنعەنەکەیان ئاساییە و خۆیان وەکو هاووڵاتی ئاسایی پێشکەشدەکەن. پادشاکانیش زیاد دەبن، خۆیان لەدۆخی عەنعەنە و شکۆداری جاران دادەماڵن، بەمجۆرە دەبنە خاوەن هەبوون. لەم چوارچێوەیەدا کۆمەڵگای پیشەسازی کۆمەڵگای پادشا رووتەکانە.

ئەو کرێکارەی بەکرێوە گرێدراوە رەوشی لەم کۆمەڵگایەدا بەربڵاو دەبێت. چینێکە کە بەجۆرێک لەجۆرەکان لەکۆمەڵگا دابڕێنراوە. جیاوازییەکەی لەگەڵ کۆیلایەتی کلاسیکدا ئەوەیە کە گرێدراوی کۆیلایەتی بەکرێیە. گووتەی کامەیان باشترە لەبواری ئەخلاقییەوە راست نییە. یەکێک لەهەڵە هەرە گرنگەکانی مارکسیستەکان ئەوە بوو: بۆرژوازی پیشەسازی و چینی کارکەری ئەم کۆمەڵگایەیان بە پێشکەوتووخواز لەقەڵەمدا، مۆری کۆنەپەرستیشیان لە بەشەکانی دیکەی کۆمەڵگادا. کەچی پێچەوانەکەی راستە. لەوانەیە بەیەکەوەبوونی چینی کارکەر و پیشەسازی خەسڵەتێکی مۆدێرنیتە بێت: بەڵام سەبارەت بە یەکسانی، ئازادی و دیموکراتیزەبوون دەکەونە چوارچێوەی دەوڵەتی پاوانخوازەوە. زیاتر راوەستەیەکی دژ بە کۆمەڵگابوون نیشاندەدن. هاوپەیمانێتی رۆشنبیران لەگەڵ ئەم رێککەوتنە چینایەتییەدا سەبارەت بە سۆسیالیزم خراپترین لادان بووە. کۆمەڵگای پاوانە پیشەسازییەکان وەک زاراوە بەردەوام کۆمەڵگاکانی شەڕە. لە خۆڕا دەوڵەت ـ نەتەوە نەبۆتە شێوەی دەوڵەتی ئەم قۆناخە.

هـ ـ سیاسەت و دەوڵەتی پاوانخوازی پیشەسازی، خودی دەوڵەت ـ نەتەوەیە کە لەسەر بنەمای گونجاندنی دۆخی هەرە سەختی میللیگەرایی و دەوڵەت لەگەڵ تەواوی کۆمەڵگای نەتەوەییدا پێکهاتووە. هەرە زێدە لەم قۆناخەدا دەوڵەت ـ نەتەوە هەم ئایدیالیزە، هەم ریالیزەکراوە. هۆکاری سەرەکی ئەمەش، قازانجی لە رادەبەدەری سەرمایەو بڵاوبوونەوەیەتی لەناو کۆمەڵگادا. زیادبوونی قازانج، وابەستەبوونی تەواوی کۆمەڵگا بە

پاوانەکانی پیشەسازییەوە دەکاتە پێویستییەک. ئەمەش شەڕی ناوخۆیە. بەڵام لە ڕێگای میللیگەراییەکی خەست و دەوڵەت ـ نەتەوەوە کە بە شێوەیەکی هەرە بەهێز دەسەڵاتی تێدا چڕبۆتەوە، ئەم شەڕە ناوخۆییە سەرکوت دەکرێت. بەمجۆرە سیستەمی قازانجی هەرە زێدە دەخرێتە ژێر گەرەنتییەوە. لەم قۆناخەدا وەک سیستەمێک هێدی هێدی پەرەسەندنی فاشیزم بوویەرێکی تایبەت نییە. بەمێگەلبوونی کۆمەڵگاو بڵاوبوونەوەی دەسەڵات تا سنوورە هەرە هەستیارەکانی، تەنیا لە ڕێگای بە ئایینبوونی میللیگەراییەوە بەدی هاتووە.

مۆدێرنیتەی ڕۆژئاوا کە لە سیانەی پیشەسازی، دەوڵەت ـ نەتەوە و سەرمایەداری پێکهاتووە، بەهۆی ئەم چوارچێوەیەوە دەبێتە خوێناویترین شارستانی و سەردەمی مێژوو. ئەم سێ مۆدێرنیتەیەی بەناویەکتردا چوون هەروەک لەناو کۆمەڵگادا پێگەی شەڕی ناوخۆیی (فاشیزم) لەناو دەوڵەتیشدا پێگەیان شەڕە نەتەوەیی، هەرێمی و جیهانییەکانە. هەروەک بەردەوام دووبارەی دەکەینەوە، سەرهەڵدانی قازانج و شێوەی دابەشکردنی لەژێر ئەمەدا شاراوەیە. لەکاتێکدا دەوڵەت ـ نەتەوە پیشەسازیبوون دەکاتە ئامانجی سەرەکی خۆی، خەسڵەت یان تامەزرۆیی سەرمایەداریتی دەخاتە ڕۆژەڤەوە. هەروەها کاتێک سەرمایەدارەکان ئامانجی سیاسی خۆیان بەشێوەی دەوڵەت ـ نەتەوە دەست نیشان دەکەن، تەنیا لەمیانەی نەتەوەپەرستییەوە دەتوانن نەتەوە سڕیش بکەن و دەوڵەت ـ نەتەوە ئاوابکەن، ئەمەش وەک زەرورترین سیستەمی دەوڵەت بۆ سیستەمی قازانج نیشاندەدەن. کاتێک پیشەسازی دەبێتە ئامانجی سەرەکی سەرمایەداری و دەوڵەت، چارەنووسی هەردوو سەدەی ١٩ و ٢٠ دیار دەبێت. پیشەسازیش وەک کشتوکاڵ و مانیفاکتۆر سەردەمێکی بەرهەمهێنانە. پشت بەمیراسی شارستانی دەبەستێت. بەڵام هیچ سەردەمێکی بەرهەمهێنان هێندەی سەردەمی پیشەسازی هێزی زیادبوونی دەسەڵات و قازانجی بە پاوانخوازی سەرمایەداری نەداوە. لەبەرئەم هۆکارە هەم دەوڵەت هەم سەرمایەدار لەپێناو پیشەسازیدا لەناو پێشبڕکێدان. لەبەرئەوە نییە کە زۆر بیر لە کۆمەڵگا و تاک دەکەنەوە، یان

ڕێزیان بەرامبەر بەنەتەوە هەیە، بەڵکو لەبەرئەوەی دەرفەتێکی مێژوویی قازانجیان دەسکەوتووە وەها کوێرانە خۆشیان دەوێن.

کۆمەڵگای پیشەسازی بەشێوەیەکی مێژوویی لە نزیکەوە پەیوەندی بە بانگەشەکانی هەژموونگەرایی و شەڕەوە هەیە. کاتێک ڕێککەوتنی ئینگلتەراو هۆڵەندا لەلایەن فەرەنساوە تووشی هەڕەشە هات، ئەو دەوڵەتانە بۆ لەدەستنەدانی پێگەی هەژموونگەرایی خۆیان دیسان پەنایان بردە بەر قەڵغانی بەرهەمهێنانی هەرزان. مێژوو ئەوە نیشاندەدات ئەگەر ئینگلتەرا لە شۆڕشی پیشەسازیدا پێشەنگایەتی نەکردایە لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا بەتایبەتیش بەرامبەر بە ناپلیۆن ئەگەری لەدەستدانی هەژموونگەراییەکەی هەبوو. باس لەوە دەکرێت کە شانسی هەژموونگەرایی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و روسیای قەیسەریش هاوشانی فەرەنسا جێگای باسە. دواتر ئەڵمانیاش بەشداری ئەم پێشبڕکێیەی کرد. تاکە شانسی ئینگلتەرا، شۆڕشی پیشەسازییە. ئەم رەوشە جارێکی دیکە نیشانیدەدات کە پێویستی دایکی داهێنانە. ئامێری هەڵمی و میکانیکی رستن وچنین جارێکی دیکە رەورەوەی مێژوو بەلای ئینگلتەرادا دەشکێنێتەوە. لەگەڵ بەرهەمهێنانی پیشەسازی نوێدا نوێبوونەوە سیاسی و سەربازییەکان نوژەن و بەهێز دەبن. ئەمەش سەرکەوتنی سەربازی یەک لەدوای یەک لەگەڵ خۆیدا دێنێت.

کاتێک سیستەم بونیادنرا، شکاندنی زەحمەت دەبێت. ژێرکەوتنی ناپلیۆن شانبەشانی هۆکارەکانی دیکە، شیمانە دەکرێت ئەنجامێکی شۆڕشی پیشەسازی بێت. هەژموونگەرایی بەریتانیا لە ڕێگای شۆڕشی پیشەسازییەوە هەنگاوی بۆ ئیمپراتۆرییەتە زەبەلاحەکەی جیهانی سەدەی نۆزدەهەم هاوێشت. سەدەی نۆزدەهەم سەدەی شان و شکۆی ئینگلتەرایە. بۆ یەکەمین جار ئینگلتەرا لەم سەدەیەدا نازناوی 'ئەو ئیمپراتۆرییەتەی خۆری لێ ئاوا نابێت' بەدەست دێنێت. ئەمە ئیمپراتۆرییەتێکی کلاسیک نییە. بۆ نموونە کردەوەیەکی شێوازی رۆما و عوسمانییەکان جێگای باس نییە. هەبوونی چەندین پێکهاتەی سیاسی لەئاستی دەوڵەتدا و لەژێر دەسەڵاتیدا کۆسپ بۆ ئیمپراتۆرییەتەکەی دروست ناکات. وەک

مۆدێلێک کە چەندین پێکهاتەی سیاسیانەی تایبەتی هەمەجۆر لە ناواخنی خۆیدا دەگرێت، هەرچەندە بەرەو لاوازیش دەچێت، بەلام تا رۆژگاری ئەمرۆشمان ئەگەر تەنها بەوەشەوە مابێتەوە کە لەژێر ناوی کۆمەڵەی نەتەوە ئینگلیزەکان (Commnnwealth)دایە زانیویەتی بژی.

هەناردنی (تصدیر) شۆرشی پیشەسازی بۆ جیهان بەشێوازی هاوشێوەی شارستانییەکانی دیکە پەرە دەسەنێت. دوای ئەوەی خۆی دەسەلمێنێت و دەچەسپێنێت، سەرەتا بۆ ئەورووپای رۆژئاوا، لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمیشدا لەسەرتاسەری ئەورووپا درێژە بە پەلهاوێشتنی خۆی دەدات. لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا کرانەوەی بۆ تەواوی جیهان خێرا دەبێت. ناهاوسەنگی کرانەوەی پێشبرکێی پاوانەکانی پیشەسازی کە پاوانەکانی ئینگلتەراو ئەڵمانیا پێشەنگایەتیان بۆ کرد، بوو بە بابەتی دوو شەری مەزنی جیهانی و چەندین شەری هەرێمی و خۆجێیی. جارێکی دیکە ئەو راستییە رووبەرووومان دەبێتەوە کە قازانجی پیشەسازی پاوانکارییە، پاوانکاریش دەوڵەت ـ نەتەوەیە، دەوڵەت نەتەوەش شەرە. کاتێک ئەوە بێنینە بەرچاوان کە هیچ دەوڵەت ـ نەتەوەیەک بەبێ شەر دانەمەزراوە، ئەو کاتە بەشێوەیەکی بەرچاو کاریگەری مێژووی چەپەڵ و خوێناوی شەرەکانی بەپیشەسازیکردن و دەستبەسەرداگرتنی هەرێمەکان بۆ کردنیان بەدەڤەرەکانی هەناردەی پیشەسازی دەبینن. زۆر ئاشکرایە قازانج لە ناوەرۆکی شەرو دەوڵەت ـ نەتەوەدا شاراوەیە.

واتاداربوونی قۆناخی پیشەسازی بەناوی ئیمپریالیزم پەیوەندی بە پێشکەوتنێکی سنووورداری پیشەسازی لەناوچەی داگیرکراو، نیو داگیرکراوو ئینتیدابەکاندا، هەروەکو چاوەروانی لێدەکرا بەواتای دەست پێکردنی شەری ناوخۆو دەرەکی دێت. شەری رزگاری نیشتمانی کە دیاردەیەکی بەهێزی سەدەی بیستەم بوو، لە گەوهەری خۆیدا گرێدراوی بەرنامەی بەپیشەسازیکردنی ناوچە داگیرکراو و نیو ـ داگیرکراوەکانە. پێگەی پێشەنگایەتییان هەرچییەک بێت، هەموویان دەوڵەت ـ نەتەوەیان خستۆتە سەرووی ئامانجەکانیانەوە، دەوڵەت ـ نەتەوەش پیشەسازیبوونی

خستۆتە سەرڕووی بەرنامەکانییەوە، ئەمەش یەکێک لەبەردەکانی بناخەی هەنگاونانە بەرەو سەرمایەداری جیهان. لەم چوارچێوەیەدا شۆڕشەکانی روسیا و چینیش لە دوا شیکاردا شۆڕشێکی دەوڵەت ـ نەتەوە و پیشەسازییە. گۆڕانکارییەکان بەشێوەیەکی بەرچاو ئەم پرۆسەیەیان پشتڕاست کردووە. لە رەوشێکی بەمجۆرەدا سەدەی بیستەم سەردەمی پیشەسازیبوونی ناوچەکانی دەرەوەی ئەوروپایە، ئیتر ئەمە بە رێبازەکانی رزگاری نیشتمانی بێت یان پەیڕەوی دیکە.

تا دوا چارەگی سەدەی بیستەم ئەم قۆناخە بەهێڵە گشتییەکانی و هەموو قورساییەکەیەوە جێگای باس بوو. هەرچی ئەوەی دواترە قۆناخی هەناردنی ئەو پیشەسازییە بۆ دونیا کە قازانجێکی ئەوتۆ بۆ ئەوروپا بەدەست ناهێنێت و دەبێتە بار (پیسبوونی ژینگە، کرێی زۆرە). سەرەتا بەشێوەی کاڵا، لەسەدەی نۆزدەهەمدا کاڵاو سەرمایە، هەرچی سەدەی بیستەمە بەشێوەی هەناردنی کاڵا، سەرمایە و پیشەسازی لەمیانەی میکانیزمێکی سیپانییەوە بۆ جیهان گواسترایەوە. هیچ ناوچەیەکی جیهان نامێنێت ئاشنای پیشەسازی نەبووبێت. بەمجۆرە دەتوانین بڵێین سەردەمی پیشەسازی قورسایی سەرەکی خۆی لە دەستداوە، راستتر لە رێگای سەرمایەی فینانسەوە پیشەسازی جێگیر کردووە. شارستانی ئەوروپا کە سەردەمی یەکەمی بە بازرگانی، دووەمینیشی لە رێگای شۆڕشی پیشەسازییەوە بەڕێوەبرد، وەک دوا قۆناخ لەسەردەمی فینانسی جیهانگیریدایە. لە ساڵانی حەفتاکان بەدواوە ئیتر سەردەمی فینانس رۆڵی پێشەنگایەتی خۆی دەست پێکردووە. ئەمەش بابەتی بەشی دواترە.

هەر سەردەمێک کۆتایی بە قۆناخی پێشتر ناهێنێت، دەیخاتە پلەی دووەمەوە. بازرگانی لەسەدەی نۆزدەهەم بەردەوام بوو. بەڵام لەچاو پیشەسازیدا هێزی جارانی بەدەستهێنانی قازانجی لەدەستدا، لە پلەی دووەمدا مایەوە. سەردەمی فینانس زۆر پێشتر بناخەکانی خۆی دانابوو. کۆمارەکانی شارەکانی ئیتاڵیا جۆرێک لە کۆماری فینانس بوون. لە رێگای فینانسەوە چەندین پادشایەتیان بەخۆیانەوە بەستەوە: لەقۆناخی سەردەمی بازرگانیشدا بزاوتی مامەڵەکردن بە دراوەوە لەقەرزپێدان و

وەرگرتندا خێراو بەربڵاو بوو. بیمە ببوو بە ڕێگایەکی گرنگی قازانج، بەڵام کەرتێک بوو لە بەدەستهێنانی قازانج لە ریزی سێیەمدا بوو.

ڕەخنەگرانی پیشەسازی کاتێک بینییان مەترسییەکانی تێکچوونی ژینگە بە بەرچاوەوە هەڕەشە لە هەسارەکەمان دەکات، ڕەخنەکانیان زیادی کردووە. چۆنییەتی تێکۆشان بەرامبەر ئەو کارەساتانەی ئێندوستریالیزم خولقاندوویەتی بابەتێکە بە فراوانی گفتوگۆی لەبارەوە دەکرێت. بەشێوەیەکی سەرتاپاگیری ناکۆکییەکانی لەگەڵ ژیاندا بەئاستێک گەیشتووە ئیتر بەرگەی ناگیرێت. ئیتر ئەم بابەتە بۆتە مەسەلەی گفتوگۆکردن هێندە تا بەرپرسیارانە بەکارهێنانی زانست و تەکنۆلۆژیا بە واتای قیامەت دێت.

قازانج و پەیوەندییە پیشەسازییەکان لە بناخەی تەواوی کێشەکاندا شاراوەیە. یەکگرتنی جلەونەکراوی هەردووکیان، نەک تەنیا گەشەسەندن فەراهەم ناکات، بەڵکو بۆتە گرێی کێشەکان. حوکمڕانیکردن و دەستبەرسەرداگرتنی تەواوی گۆڕەپانەکانی کۆمەڵگا لەلایەن پیشەسازییەوە، نەمانەوەی هیچ گۆڕەپانێکی کۆمەڵگا کە نەکرابێت بە بابەتی شتومەک، کێشە کۆمەڵایەتییەکانی بە ڕەهەند و ئاستێک گەیاند کە پێشتر نەبینراوە. چەندین گۆڕانکاری کە لە پیشەسازییەوە سەرچاوە دەگرن، بە ئەندازەی ناکۆک بوونیان لەگەڵ سروشتی کۆمەڵگا لەگەڵ ژینگەشدا ناکۆکن. تازە بەتازە ڕووبەڕووی ئەنجامەکانی قووتدانی تەواوی ناوچە لادێ نشینیەکان دەبینەوە. هەروەها تازە ئەنجامەکانی کردنی شار بەدژی دەبینرێت. پێویستییەکانی چییەتی ئەڵتەرناتیڤ لە گفتوگۆکردن بەولاوە زیاتر نەچووە. بێگومان کۆمەڵگا بەبێ پیشەسازی ناژی. بەڵام چیتر چاوەڕوانی پەسەندکردنی ئەو کردەوانەشی لێناکرێت کە بەناوی پیشەسازییەوە ئەنجامدەدرێت. لەوانەیە ئیتر دژە ـ پیشەسازی بوون بەهێز بێت. خەباتەکانی ژینگەو شار چەندین ڕەوتی بەمجۆرەی هێناوەتە ریزەکانی خۆیەوە. گواستنەوەیان بۆ بواری سیاسیش چەندەی دەچێت دەبێت بە ڕۆژەڤ. چاوەڕوانیکردنی ڕاستکردنەوەی ناهاوسەنگییە تێکچووەکەی هەردوو سروشت لەم هەوڵانەی سنوورەکانی ریفۆرمیان

تێپەڕ نەکردووە دەبێتە سافێتی. تا لەچوارچێوەی جیهانبینی شارستانی ئێستادا بمێنێتەوە جگە لە گۆڕانکارییەکی رووکەشیانە چاوەڕوانی ئەنجامێکی دیکە لەم هەوڵانە ناکرێت.

ئەو خراپەکارییانەی شارستانی پێنج هەزار ساڵە لەگەڵ خۆیدا هێنابووی، سەردەمی پیشەسازی بەتەنها خۆی چەندین هێندەی لەسەر زیادکردووە. ئەمە بۆچوونێکە تەواوی چاودێران لەبارەیەوە هاوڕان. گەرمبوونی کەشوهەوا تەنیا نموونەیەکیانە. وێرانکاری زۆر لە مەزندەکان قووڵترو بەرفراوانترە. نەک تەنیا سەردەمی پیشەسازی بەڵکو پێویستە تەواوی شارستانی رەخنەبکرێت. سەرباری ئەوەی مارکسیست و رکابەرەکانی دیکە کێشەکەیان خستۆتە چوارچێوەیەکی تەسکی ئابووریخوازی چینایەتی، یان پۆلینی لەجۆری ئیکۆلۆژی، کلتوورگەرایی و فیمینیزمەوە، رێگایان لەپێش دەرکەوتنی هەندێک ئەنجامی ئەرێنی کردۆتەوە. بەڵام وەکو دیارە نەگەیشتنیان بە بەرنامەو کردارێکی سیاسی جددی گرێدراوی کەموکوڕییە ریشەییەکانیانە.

چەندەی قاڵبوونەوە لەبارەی بژاری شارستانێتی دیموکراتی زیاتر دەبێت رۆژبەڕۆژ ئاشکرا دەبێت کە ئەمە بژارێکی راست و لەجێگای خۆیدایە. بەڵام تەنیا کاتێک بژارە ریشەییەکانی شارستانێتی دیموکراتی شانبەشانی بەرنامەو رەخنەی بەرفراوان لەگەڵ رێکخستن و چالاکی پراکتیزەکراودا بێت بەیەک، ئەوکاتە دەتوانین لەمیانەی جیهانبینی کۆمەڵگای دیموکراتی، یەکسان و ئازادیخواز سەیری سروشت و ژیان بکەین و رێگا ببڕین.

### ج - سەردەمی فینانس - پارە (دراو)ی فەرماندە

بێگومان گەیشتنی پارە بە دۆخی هێزی بڕیاری کۆمەڵگا ڕووداوێکی گرنگە. ئەم ڕەوشە شیکار نەکرێت تێگەیشتنی کۆمەڵگا زۆر ناتەواو دەمێنێت. پارە بەهایەکە لەژیانی ئابووریدا سوڕی لێشاوەکە فەراهەم دەکات، وەک نموونەی خوێنی ناو دەمارەکانە کە لەپێناو دروستکردنی وزەی پێویست بۆ جەستە خۆراک بۆ خانەکان دەگوازێتەوە. جددیترین دیاردەی کۆمەڵگایە کە پێویستە بزانین چییەو چۆن گەیشتە ئەم پێگەیە. ئەم ئامێرە پۆخڵەواتێکی مەزنیشی لەخۆگرتووە، لە ئاکامی کام فاکتەری کۆمەڵایەتی و مێژووییدا ئەم ڕەوشەی بەدەست هێنا؟ لە ڕاستیدا چی لەناو کۆمەڵگا ئەنجامدەدات؟ بەبێ ئەو کار مەیسەر دەبێت یان نا، دەتوانرێت چی لە جێگای دابنرێت؟ دەتوانین پرسیارەکان زیاد بکەین.

ئەوە مایەی تێگەیشتنە کە کاتێک پارە بە مەبەستی ئاڵوگۆڕکردن بەکاردەهێنرێت ئامرازی کردەیەکی سادەیە. دیسان پێویستە وریا بین چییە ئەوەی ئاڵوگۆڕ دەکرێت؟ ئایا دەشێت پارە ئامرازێک بێت کە پێوانەیەکی دادوەرانە لەنێوان دوو شتی ئاڵوگۆڕکراودا فەراهەم بکات؟ ئاشکرایە کە لە سەرەتاوە کێشەکە زەحمەتی مەزن لەخۆوە دەگرێت. ئەگەر نموونەیەکی سادەی لەجۆری ئاڵوگۆڕکردنی سێو لەگەڵ هەرمێدا بێنینە بەرچاو، بابڵێین ڕێژەکە یەک بە دووە: سێوێک = ٢ هەرمێ. پارەش بەمجۆرە لە بازاڕدا ڕۆڵ ببینێت. بۆچی یەک بە دووە، یەک بە سێ یان یەک بە یەک نییە؟ ئەو کاتە بەساکارترین شێوەیەوە بەهای ڕەنج دەکەوێتە ناو مەسەلەکەوە. دەشێت پرسیارەکان یەک بەدوای یەکدا بێنە گۆڕێ. چییە ئەوەی بەهای ڕەنج دەدات؟ لەوانەیە بڵێین جۆری ڕەنجەکە، بەمجۆرە بەبێ کۆتایی پرسیارەکە دووبارە دەبێتەوە. ئاشکرایە ئاستەمە پارە بتوانێت پێوانەی دادوەرانە لە مەسەلەی کڕین و فرۆشتندا بەرقەرار بکات. شیمانەیەکی مەزن ئەوەیە هێز و متمانەی خۆی لە بژارێک وەردەگرێت. لە بەرئەوەی بەمجۆرە ئەرێ دەکرێت، پەسەند دەکرێت. گەڕان بەدوای پێوانەکانی دادوەری، بەهاو ڕەنجدا لە بناخەکەیدا کەسانی

ئامادەی سەردەم و جێگایەک بێهوودەیە. ئەوانەی لە زەمان و شوێنێکدا ئامادە بوون گووتوویانە با بۆ ئاسانکردنی کارەکەمان نێوەندکارێک هەڵبژێرین. ئەو شتەی رۆڵی نێوەندکاری بینیوە بە پارە ناویان بردووە. لەرێگای ئەم چیرۆکە کورتەوە هەوڵی پێناسەکردنی پارە دەدەم. بەڵام رووبەڕووی ئامرازێکی نێوەندکاری ئەوتۆین، ئەگەری دەستبەرداری ئەم پێگەیەی بێت و رۆڵی دیکە ببینێت لەوانەیە هەمووشتێک تێکەڵ و ئاڵۆز ببێت.

با لە رێگای نموونەیەکەوە رۆشنی بکەینەوە. کۆمەڵگا تەنیا ئەوە پەسەند دەکات کە ژنێک تەنیا بەپیاوێکەوە گرێدراو بێت و لەماڵەکەی خۆیدا بەشێوازێک بژیت کە بەشەرەفمەندانە دەناسرێت. کاتێک ژن لەم رەوشە دەردەچێت و چەندین پیاو بێنێتە ماڵەوە، یان بەپێچەوانەوە پیاو چەندین ژن بێنێتە ماڵەوە رەوش چۆن دەبێت؟ هەڵبەتە سەراوبن دەبێت. لە مەسەلەی پارەدا رەوشەکە ئاڵۆزتریشە. ئەگەر درێژە بەنموونەکەمان بدەین، لەبەرئەوەی ژن رێسای گشتی شکاندووە لە رێگای دەرکردنی لەماڵەوە ئەگەری گەیشتن بە رێگەچارەیەک هەیە، بەڵام لەمەسەلەی پارەدا لەوانەیە کارەکان هێندە ئاسان نەبن. ئەوەی پارەی بەدەستەوەیە، ئەگەر یەکێکی نەفس بەرز نەبێت، چەندە پارە بچێتە سەر پارەکانی، لەوانەیە پەسەندی بکات. کەچی هەروەکو مەسەلەی ژنەکە، کۆمەڵگا پارەی بۆ نێوەندکاری پەسەند نەکردووە. شیمانەیەکی بەهێز ئەوەیە کۆمەڵگا گووتوویەتی کۆکردنەوەی پارە گەورەترین بێ شەرەفییە.

بەبڕوای من مەسەلەکە تەواو بەم شێوەیە بووە: ئەم نێوەندکارە بە کات و شوێنێکی یەکجار رێژەییەوە سنووردارەو بە ئامانجی ئاسانکاری بەکارهێنراوە، هەرگیز بۆ ئەوە پەسەند نەکراوە بە هەموو کات و شوێنێکدا بڵاوبێتەوە. مەسەلەی قۆستنەوەیەکی مەزن جێگای باسە. دەتوانێت بڵێت هەرگیز پەسەندی ناکەم. لەوانەیە کارلەکار ترازابێت، بۆیە حوکمەکەی تێری نەکردووە. لەم سۆنگەیەوە شیمانەیەکی بەهێز ئەوەیە کە پارە بووبێت بە خودی سۆزانییەک کە بەگوێرەی هەلومەرج یاری دەکات و هاوتاکەی نەبینراوە. لەوانەیە بۆ هەندێک کەس کرێیەکەی دۆلارێک،

هەندێکی دیکەش هەزار دۆلاربێت. ئیتر هیچ هێزێک ناتوانێت ڕێگری لێ بکات. چۆن بەم ڕەوشە گەیشت؟ با تۆزێکیش زمانی ئابووری بەکاربێنین و هەوڵی ڕوونکردنەوەی بدەین.

هەرچەندە بە ئاڵوگۆڕ دەستپێکردن بە ئابووری واتایەکی ئەوتۆ نەبەخشێت، خودی ئاڵوگۆڕکردن فاکتەرێکی گرنگی ئابوورییە. دوو شت کە بە یەکتر بگۆڕێنەوە کاڵا یان موڵکیان پێدەڵێن. کۆمەڵگا کاتێک جگە لە بەهای بەکارهێنان هێشتا ئاشنای هیچ بەهایەکی دیکە نەببوو، بۆ ماوەیەکی درێژخایەن ئاڵوگۆڕی دوولایەنەی بەئەخلاقی نەبینی. گرێدراوی سیستەمێک مایەوە کە بە ئابووری دیاری ناو دەبرێت. بەهایەکی بەهادار کە بەرهەمیان دەهێنا یان دەستیان دەکەوت، بە دیاری پێشکەشی ئەوانەیان دەکرد کە لایان بەهادار‌بوون. کلتووری دیاری گوزارشت لە شکۆدارکردن دەکات. دیاری پێشکەش بە شکۆدارکراوەکە دەکرێت. بەمجۆرە بەهای بەهادار دەسەلمێنرا، ڕێزی لێدەگیرا. شتەکانی دیکەش بۆ ژیانی ڕۆژانە خەرج دەکران. بەچاوێکی باش سەیری کەڵەکەکردن نەدەکرا. جڤات ـ کۆمەڵەکانی مرۆڤ هەزاران ساڵ بەمشێوە ژیان. بەهیچ جۆرێک ئەخلاق و ویژدانی مرۆڤ بە ئاڵوگۆڕکردن بەرامبەر بە پارە یاخود موڵک ڕازی نەدەبوو. چونکە لەو بڕوایەدابوو کە ئەو بەهایەی خوڵقاندوویەتی نرخ و بەرامبەرەکەی نییە. لەبواری ئەخلاقیشەوە بیرکردنەوەیەکی بەمجۆرەی گونجاو نەدەبینی. لەوانەیە هەستی هۆشمەندانەی یاخود تێگەیشتنی ئەخلاقییانەی ئەمەی بەتەڵەکەبازی دانابێت.

. ئەگەر سەرەتای ئاڵوگۆڕکردن سەرەتای ئابووری بێت، ئەوا بەسەرەتایەکی بەمجۆرە کەوتنە ناو ئابووری بە باش دانانرێت. چونکە سەرباری نەریتە ڕەسەنەکە ئەمە ئەنجامدراوە. لە قەڵەمدانی ئاڵوگۆڕکردن وەک بناخەی پەیوەندی ئابووری دەشێت گریمانێک بێت، بەڵام لەقەڵەمدانی بەتاکە گریمانەی هەبوو بۆ پەیوەندی ئابووری لە جێگای خۆیدا نابێت. دەشێت بەزانستکردنی ئابووری لەمیانەی فاکتەری جیاوازتر لە ئاڵوگۆڕکردنەوە ئەنجامبدرێت، تەنانەت شێوەیەک پێشبخرێت کە پشت بە نێوەندکارێکی لەجۆری پارە نەبەستێت، بەڵکو پشت بە ئاڵوگۆڕێکی پەسەند

ببەستێت. تیۆری و پراکتیک لە پێشخستنی ئەم شێوانەدا، لە خولقکاری دواناکەوێت. ئەوەی لە ئاڵوگۆڕکردن گرنگترە مەسەلەی گۆڕانی بەرهەمە بۆ موڵک. کاتێک بەهای بەکارهێنان دەبێتە بابەتی ئاڵوگۆڕکردن، ئەوکاتە وەک شت و موڵک پێناسە دەکرێت. سەرهەڵدانی دیاردەی شمەک لەناو کۆمەڵگادا لە قۆناخێکی نزیک بە سەردەمی شارستانیدا بووە. شتومەک فاکتەری سەرەکی پەسەند کردنی بازرگانییە. خودی شمەک هاوکاتی ئەو ساتەیە کە لەدەستی یەکەمین خاوەنەکەی دەردەچێت. پەسەند کردنی لەدەست دەرکەوتن سەرەتای بوونێتی بەشمەک. کاتێک شتێکیش لەبەرامبەریدا وەرگیرێت ئەوا پرۆسەی بوون بەشمەک تەواو دەبێت. دیسان نموونەیەکی دیکە بێنینەوە. بیر لەوە بکەینەوە، یەکێک چەندین ساڵ ئاسکێک بەخێو دەکات، لەگەڵ بزنێک دەیگۆڕێتەوە کە بەهەمان شێوە چەندین ساڵ یەکێکی تر بەخێوی کردووە. هیچ کاتێک ناتوانرێت ئەوە بسەلمێنرێت کە ئەم ئاڵوگۆڕکردنە دادوەرانەیە. چونکە هیچ کاتێک نازانرێت رەنج و ماندووبوونی کامەیان زیاترە. لەوەش گرنگتر هیچ کاتێک ئاسک و بزن یەکسان نابن. بێگومان ئەم بەراوردکارییانە بەئامانجی گەیشتن بە ناکۆکییەکانی لۆژیکی ئاڵوگۆڕکردن باس دەکەم. هەروەها ناکۆکی بەمجۆرە بەردەوام لەئارادایە.

کاتێک لەسەر بنەمای بینین و پەسەندکردنی ئەم ناکۆکییە دیسان بۆ بابەتی پارە بگەڕێینەوە ئەو کاتە باشتر دەرک بە ناکۆکییەکانی ناواخنی دەکەین. لەکاتی ناسینی کۆمەڵگاکاندا باشتر تێگەیشتنی خاڵێک زۆر بایەخدارە: دیاردە کۆمەڵایەتییەکان دیاردەی فیزیایی نین. ئەگەر رەهاش نەبێت لە هەلومەرجەکانی جیهاندا ($H_2O$) توخمی ئاوە. واتایەکی دیکەی نابێت. هەرچی کۆمەڵگایە سەندوقی ئەو دیاردانەیە کە مرۆڤ دروستی کردووە. هەرچەندە پڕ لە نهێنی سەرسوڕهێنەریش بێت. کۆمەڵگا دەتوانێت بیانگۆڕێت و بونیادی نوێ ئاوابکات. کەواتە ئەم رێسایە سەرهەڵدەدات: راستینە کۆمەڵایەتیەکان راستینەی بونیادنراون (دروستکراون). سروشت یاخود خوداوەند پێی نەبەخشیوین. لە دۆخێکی وەهادا زۆر ئاساییانە پارەش راستینەیەکە دروستکراوە. بابەتی شمەک

و ئاڵوگۆڕکردنیش راستینەیەکی گریمانەیی دروستکراون. خەڵاتێکی سروشت یان خوداوەند نین.

گەورەترین گوناهی پۆزیتیڤیستەکان ئەوە بوو هەروەکو راستینە فیزیاییەکان راستینە کۆمەڵایەتییەکانیشیان لەمیانەی پێناسەی دیاردەوە خستە ناو هەمان پۆلێنەوە، کاتێک دیاردەی کۆمەڵایەتی لەگەڵ راستینە نەگۆڕاوەکان وەک یەک ببینرێت، تا دوایی دەرگا بۆ ئەو جیهانبینییە کۆمەڵایەتیانە ئاوالا دەکرێت کە بەهەڵەدا چوونی مەزن لەخۆوە دەگرێت. کاتێک لەروانگەی پۆزیتیڤیستیەوە تەماشای ئابووری بکەین، ناشێت ئەم مەترسیانە نەبینین. لە رەوشێکی وەهادا کاتێک نەتەوەپەرستی وەک گوزارشتی راستینەی ئۆبژەیی قەبووڵ بکەیت، دەکەویتە رەوشی هیتلەر و ستالینەوە کە هەرچەندە پێگەشیان جیاوازبێت، بەڵام لەبواری فەلسەفییەوە هەمانشتن. هەردووکیان، تەواوی پۆزیتیڤیستەکان و ماتریالیستییە قەباکان بەهای دیاردەی رەهایان بەو راستیانەداوە کە لەناو کۆمەڵگادا پەسەندیان کردووە. فاکتەرێکی دیکەی بابەتی پارەی کردووە بە مەسەلەیەکی یەکجار ناسک سەرچاوەی خۆی لەو چەمکەوە وەردەگرێت کە بەچاوی ئەم هەڵوێستە پۆزیتیڤیستە تەماشای کۆمەڵگا دەکات: پارە بەراستی لەقەڵەمدەدات. لەم سۆنگەیەوەیە دەستکۆڕکێ لەمیانەی نێوەندکاری پارەوە ئیتر بۆ راستییەکی تەواو دەگۆڕێت.

لەگەڵ ئاڵوگۆڕکردندا هاتنی پارە بۆناو ئابووری و لێکۆڵینەوەی ئەو پەرەسەندنانەی بەدرێژایی مێژوو بەخۆیەوە دیوە بابەتی ئێمە نییە. بەڵام کاتێک بۆ ئابووری دەبێتە فاکتەرێکی دەست لێبەرنەدراو، بە واتای گەورەبوونی ئەو مەترسیانەش دێت کە لە ناواخنیدا هەیە. کاتێک لەگەڵ ئەو ناکۆکییە بەراوردی بکەین کە تاکە ئاڵوگۆڕێک لە خۆیەوە دەگرێت، ئەو کاتە دەرکی پێدەکرێت کە گەیشتنی پارە بەهێزێکی بێ سنووری ئاڵوگۆڕ رێگا لەپێش رەوشێکی چەندە مەترسیدار دەکاتەوە. بوونی بەدۆخی بەرجەستەی هەزاران ناکۆکی شتێکی ئاسان نییە. کاتێک بەم دۆخەیەوە لەئابووریدا دوای بڕینی رێگایەکی دووروودرێژ گەیشتنی بە سەردەمی فینانس، تەواو وەک سامناکی رەوشەکە نەبینرێت،

رۆشنکردنەوەی کۆمەڵگا لەخۆ خەڵەتاندن بەولاوە هیچ واتایەکی دیکەی نابێت. ئەوەی مەترسیدارە: بەم هەموو ناکۆکیانەی هەناویەوە پارە بە بەرکەماڵترین سەردەمی خۆی دەگات. ئەمەش هەروەکو ئەوەیە، زۆرداریێکی خاوەن رابردوو و تۆمارێکی خراپ بکرێت بە سەرلەشکری سوپایەکی زەبەلاح. ئەم ئامرازە گوماناوییە کە لەسەرەتادا تەنها پشت بەرەزامەندی ساتەوەختی ئەو بەشەی کۆمەڵگا کە لەوێدا ئامادەبوون بەشێوەیەکی کاتی پێگەی پێدراوە، دواتر بۆ پلەی خوداوەندی کۆمەڵگا بەرزدەکرێتەوە. بەکاریگەرترین هێزی بڕیاریشی لەدەستدایە.

لێکۆڵینەوەی مێژووی پەرەسەندنی پارە زۆر سەیر دەبێت. باس لەوە دەکرێت کە یەکەمین سکەی زێڕینی مێژوو لەلایەن کریۆزۆسی لیدیایی دانراوە. هەروەها دەڵێن لەشاری ساردی سەر بە مانیسا نیشتەجێ بووە کە تاکو ئێستاش بەهۆی گەڕان بەدوای زێڕدا کێشەی لێدەکەوێتەوە. پارە شتێکی ئەوتۆی وەهایە کە پێگەیەکی زۆر زەحمەتی هەیە، هەبێت هەر زەحمەتییە، نەبێت هەر زەحمەتییە. ئەوە دەزانرێت: شمەک، ئالوگۆڕ و پارە دەستی یەکیان گرتووە، بەخێرایی گەشەیان کردووەو گۆشەی سەرەکی ئابوورییان زەوتکردووە. لە رێگای سەدان جۆری ئەو سکانەوە تا رۆژی ئەمرۆمان هاتوون دیاردەبێت کە لە شارستانی پارس و گریک - رۆمادا بەکارهێنانی پارە زۆر بڵاوبووە.

لەشارستانی ئیسلامیدا ریال بەلانی کەم هێندەی سوڵتانەکان بە پێگەیەکی متمانەپێکراو گەیشتووە. لە شارەکاندا تەختی پارە زامن بوو. بە تایبەتیش سەرافە یەهودییەکان گرنگییەکی مەزنیان بەدەست هێنابوو. سەراف و بازرگانە یەهودی و ئەرمەنییەکان هاوتەریبی شارەکانی سەر رێگای بازرگانی ئەوروپا تا دەگاتە هیندستان هێڵێکی پاوانخوازی بازرگانی و پارەیان ئاواکردبوو. ئەم هێڵەی سەرمایەی هاوتەریبی بالادەستی سیاسی زۆر بەکاریگەربوو. تاڕادەیەکی زۆر سوڵتان و میرنشینەکانی بەخۆیەوە گرێدابوو. چالاکییەکانیان لە ئاسیا و ئەوروپادا بەردەوام زیادی دەکرد. ئەم راستینەیە رۆڵێکی زۆری لەو کاردانەوانە هەیە کە کۆمەڵگاکان لەبەرامبەر قەومی یەهودی و ئەرمەنی نیشانیدەدەن.

کاتێک لێکۆڵینەوە لەبارەی جینۆسایدی سیستەماتیکەوە لەسەر یەهودی و ئەرمەنییەکان بکرێت ئەمە خاڵێکە پێویستە بەگرنگییەوە رەچاوبکرێت.

لە ناوەڕاستی سەدەی ١٣هەمین شارەکانی ئیتاڵیا پێشەنگایەتی بازرگانی و پارەیان لە جیهانی ئیسلام وەرگرت. بە تایبەتیش ڤینسیا، جەنەوا و فلۆرەنسا بوون بە پەرجوویەکی راستەقینەی بازرگانی و پارە. ئەو شارە ئەستێرانە بوون کە تا سەدەی شازدەهەم بە رێنسانسیشەوە لەهەموو بوارێکەوە پێشەنگایەتییان بۆ ئەورووپا کرد. شارەکانی ئیتاڵیا تەنیا بەئەنجامدانی شۆڕشی رێنسانس نەوەستان: بەڵکو یەکێک لە ئەندازیارە گرنگەکانی شۆڕشی پارەش بوون. هەرچەندە پێشەنگە یەکەمینەکانیان لەجیهانی ئیسلامدا دۆزییەوە، بەڵام کۆمەکیان یەکجار مەزنە. تەواوی فاکتەرە پێویستییەکانی لەجۆری بانک، دەستاوێز، پارەی کاغەز، بیمەو ژمێریاری کە بۆ مۆدێرنیتە ژیانین، ئەم شارانە پێشیان خستن، کردیانن بە دەزگا. ئەم گۆڕانکاریانە رۆڵێکی مەزنیان لەمێژووی پارەدا هەیە. لەپێشکەوتنی بازاڕ و بازرگانیدا هەریەکە و رۆڵی شۆڕشێکیان بینی. بەسەدان قات خێرایی کاڵا و پارەیان زیاد کرد. بەردی بناخەی پەرەسەندنی باڵادەستی پارە بوون.

هێدی هێدی کۆمەڵگا بۆ کەوتنە ژێر دەسەڵاتی ئەم ئامرازانە ئامادە دەکرا. ئەوەی روویدەدا لە رووخساردا وەک مامەڵەیەکی سادەی تەکنیکی دیاربوو. بانک دەبوو بە شوێنی کۆکردنەوەی پارە. بەڵگەکان پارچە کاغەزێک بوون کە لەجیاتی پارە بەکاردەهێنران. پارەی کاغەزیش جۆرێک لە دەستاوێزی گشتی بوو. سووک بوو. کارەکانی ئاسان و خێرا دەکرد. بیمەش ئەو برە پارەیە بوو کە بەرامبەر سوود بەقەرز دەدرا بەو کڕیارەی دووچاری نالەباری هاتووەو دواتر دەدرێتەوە. ئەویش خێرایی بەکارەکان دەدا، رێگری لەبێکاری و بەتاڵ دانیشتن دەکرد، لەجیاتی ئەوەی کەسی پەیوەندیدار بە تەمبەڵی دابنیشێت، وایدەکرد بەخێرایی کارەکانی جێبەجێ بکات، لەرێگای ئەو قازانجەوە کە بەدەستی دێنێت قەرزەکەی بداتەوە. ژمێریاریش هەریەکە و دەستاوێزێک بوون قازانج - زیان و داهات - خەرجی و ئیش و کارەکانیان یەکلایی دەکردەوە. وەک

ئاوێنە قۆناغ قۆناغ رەوشی کەس یان کۆمپانیاکانی نیشاندەدا. ئەمانە شۆڕشی سادەبوون، بەڵام ئەنجامی سەرسوڕهێنەریان هەبوو. شارەکانی ئەورووپا لەسەرووی هەمووشیانەوە سیڤلیا، لیسبۆن، لەندەن، ئەمستردام، هامبۆرگ، لیۆن، ئانڤێرس و پاریس شانبەشانی بەرهەمەکانی رێنسانس بەشێوەیەکی خێرا بەرهەمی ئەم شۆڕشانەی شارەکانی ئیتاڵیایان بۆ وڵاتەکەیان گواستەوەو شۆڕشەکانیان لە تەواوی کیشوەری ئەورووپا بڵاوکردەوەو مەزنیان کرد.

پێشتر بەشێوەی گەلالەیەک ئاماژەمان بەو خاڵە کردبوو کە چۆن لەسەدەی ١٦هەمدا لە رێگای یارمەتییە بەکاریگەرەکانی بەرهەمی ئەم شۆڕشانەوە هۆڵەندا و ئینگلتەرا سەرەتا کشتوکاڵ و بازرگانی، دواتریش لەمیانەی پیشەسازییەوە بۆ شۆڕشێکی گشتی سەرمایەدارییان وەرچەرخاندووە. سەرمایە، سەرمایەدار و سەرمایەداری پلیکانە بەرایییەکانی سەڵتەنەتی پارەیە. ئەوان (هۆڵەندا و ئینگلتەرا) هەریەکە و پادشایەکن کە ئەم پلیکانانەیان بڕیوە: پادشای رووتن. سەردەمی بازرگانی سەبارەت بەو قازانجەی بەخێرایییەکی یەکجار زۆر گەورە بوو تاڕادەیەکی مەزن قەرزداری پارە و ئامرازەکانێتی. دەسەڵاتی پارە بەشێوەیەکی بێدەنگ لە قووڵایییەوە پەرەیدەسەند. نەک تەنیا پادشایەتی بەڵکو رۆڵی ئیلاهیشی وەردەگرت. بەتایبەتیش بەبێ دەمامک و بەناوی خودی خۆیەوە. سەردەمی پیشەسازی هەم زۆر قەرزداری بوو، هەم دەرفەتێکی زۆری بۆ رەخساند. ئەگەر بازاڕ، شار، کاڵاو چڕبوونەوەی بازرگانی لەناو کۆمەڵگادا پێشنەکەوتایە، شۆڕشی پیشەسازیش نەدەبوو. ئەگەر پارە نەبوایە تەواوی ئەم پرۆسانە پێکنەدەهات. خێرابوونی پارەو کاروبارەکانی رۆڵی سوڕی خوێنی ناو ئۆرگانەکانی جەستەیان دەبینی. بڕینی یان پچڕاندنی، بە واتای لەکارکەوتنی ئۆرگانەکان و بێ کەڵک بوونیان دەهات. ئەمەش بە واتای مردنیان دەهات.

کاتێک پەیوەندی نێوان کرێکار- کارگە شیکاربکەین باشتر دەرک بە رەوشەکە دەکرێت. مەحاڵە لە رێگای کۆیلەی کۆن و سەپانی گوندنشینەوە کارگە بخرێتە گەڕ. تا لە خاوەنەکەی، ئاغا و خاک دانەبڕێت

نابێت بەکارکەر. کرێکارێکی تەواو لە ڕێگای کرێی ڕەهاوە بەدیدێت. هەرچی کرێیە بەهایەکە پارە نەبێت نادرێت. بەمجۆرە مەحکومبوونی کرێکار بە پارەوە مسۆگەر دەکرێت. ئیتر پارە بەپێگەیەک گەیشتبوو بەبێ بوونی خاوەن کۆیلە و ئاغا دەیتوانی کۆیلەی نوێ بخاتە ژێر دەسەلاتی ڕەهای خۆیەوە. ئەمە هەنگاوێکی مەزنی دەسەلاتداریتییە. بەمجۆرە کۆمەڵگای پیشەسازی نوێ دەبوو بەیەکەمین شێوەی مەزنی کۆمەڵگا کە لەم ڕێگایەوە بە تەواوی دانی بە دەسەلاتداریتی پارە داناوە. هیچ یەکێک لە کۆمەلگاکانی شارستانییەکانی پێشووتر تا ئەم ڕادەیە دانیان بە دەسەلاتی پارەدا نەنابوو. ئیتر لە کۆمەڵگای پیشەسازیدا پارە کلتوورێکە. هەموو شتێک لە دەوروبەری پارەدا واتادار دەبێت. بەو ئەندازەی ڕێگا لەپێش خەیاڵی مەزن دەکاتەوە، پارە نەبێت هیچ یەکێک لە پڕۆژە مەزنەکان دەست پێناکرێت. لەگوندێکی پەراوێزکراوەوە تا دەگاتە سیستەمە پێشکەوتووەکانی شار، لە کڕینی جووتێک پێڵاو بۆ منداڵەکەی تا هەڵکردنی گڵۆپی ماڵەکەی، هەر خێزانێک ئاگاداری پێویستی ڕەهای پارەیە. هەمووکەسێک ناچار کراوە لەپێناو بەدەستهێنانی پارە چی پێویست بێت پێشکەشی خوداوەندە نوێیەکەی بکات.

لە ڕووخساردا بەهای پیرۆزی ڕەنج دەفرۆشرا. ئەم ڕەوشە یەکێک لە نموونەییترین بەهەڵەدا چوونەکان بوو کە پارە ڕێگای لەپێش کردبۆوە. ئەوەی بە پارە دەفرۆشرێت، واتە ئەوەی لەدەست دەچێت تەنیا ڕەنج نییە. بۆ بەدەستهێنانی ڕەنج پێش هەمووشتێک پێویستی بەجەستەیەکی تەندروستانە هەیە، بۆ بەدەستهێنانی جەستە دایک پێویستە، بۆ بەدەستهێنانی دایک پێویستی بە ژنێک هەیە. ئەم 'بۆ'یانەی بەدەست هێنان تا ناکۆتا درێژە دەبێتەوە. هەروەها پێویستە ڕەنج خاوەن بەهرە بێت. بەهرە نەبێت کڕین و فرۆشتنی نابێت. لەم پێناوەشدا پێویستی بە شارەزاو خاوەن وەرشە هەبوو: بۆ ئەوانیش پێویستی بە ئەزموونی کاری هەزاران ساڵ و ڕەنجدەرەکانیان هەبوو. کرێیەکی سادە 'هەندێک لە بەشی سک تێرکردن زیاتر بێت' یاری زەوتکردنی تەواوی ئەم بەها پیرۆزانەبوو. مێژوو و کۆمەڵگا دەفرۆشران. مرۆڤ، تاک بەمجۆرە

کرابوو بە ئامراز. تائێستاش هیچ خوداوەندێکی کۆمەڵگا تا ئەم رادەیە فەرمانڕەوایەتی خۆی بەسەر بەندەکانیدا نەسەپاندووە.

یەکێک لە بەردی بناخە و یەکەمینەکانی مێژووی پارە رزگاربوونی بوو لەوەی بە کانزای بەهاداری لەجۆری زێڕ و مس ئاڵوگۆڕبکرێت. ئەم شۆڕشە مەزنە (شۆڕشی پارەی رەش) لە ١٩٧٠کاندا روویدا. ئیتر پارە تەواو ئازادببوو. یەکەمین ئازادی ئەو کاتە بەدیهاتبوو کە شارە ئازادەکانی ئیتاڵیا پارەیان بە ئامرازەکانی وەکو کاغەز، دەستاوێز و بیمەوە بەستەوە. دووەمین شۆڕشی مەزنیشی ئەوکاتە بەدیهات کە دۆلاری ئەمریکی بەفەرمی لە وابەستە بوون بەزێر و مسەوە رزگاری بوو.

لە رێگای ئەم شۆڕشەوە بەفەرمی هەنگاو بۆ سەردەمی فینانس هاوێشترا. ئەم دیاردەیە لەژێر ئەو پەرەسەندنە مێژووییەدا شاراوەیە کە سێیەمین هەڵمەتی جیهانگیری مەزنی پێدەگووترێت. هەروەکو دەزانرێت یەکەمین هەڵمەتی مەزنی جیهانگیری سەرمایەداری بزووتنەوەی داگیرکاری و نیمچە ـ داگیرکاری سەردەمی بازرگانی بوو (سەدەکانی ١٥ـ ١٨). دووەمین بزووتنەوەی مەزنی جیهانگیری هەڵمەتی ئیمپریالیزمی سەردەمی پیشەسازی (بەشێوەیەکی قەبە لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە تا دوا چارەکی سەدەی بیستەم) و قۆناخی شەڕە چینایەتیی و نەتەوەییە بەرفراوانەکان بوو کە سەرچاوەی خۆی لەهەڵمەتی ئیمپریالیزمەوە دەگرت. ئەم قۆناخانەی نزیکەی چوار سەد ساڵی خایاند، راستییەکی بەڵگەنەویستە کە پارە یەکێک لە بونیادنەرەکانیتی. ناوبردنی گشتیان بەسەردەمی پارە چەوت نییە. دەوڵەت ـ نەتەوە (زیۆس، جۆپیتەر) خوداوەندی مەزنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بوو، هەروەها خوداوەندی دەسەڵات و شەڕ (ئارس و مارس)بوو، هەرچی پارەیە خوداوەندە تازەکەی سەردەمی نوێ بوو کە لە ئابووری و مێژوودا بە واتا گشتییەکەی بەرامبەرێکی تری نییە. خوداوەندێکە تەواوی خوداوەندە کۆنەکانی سەرکوت کردووە و هەژموونگەرایی خۆی ئاواکردووە.

خەسڵەتی سەرەکی سەردەمی فینانس ئەوەیە دەزگای پارە (بەهەموو

ئامێر و ئامرازەکانییەوە) بە دۆخی پێشەنگ گەیشتووە. بەتەواوی پاوانەکانی بازرگانی و پیشەسازی خستۆتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە. وەک پاوانێک دەوڵەت (بەتایبەت دەوڵەت ـ نەتەوە)ی بە خۆیەوە بەستۆتەوە. پلاتفۆرمەکانی بەکارهێنان (بەکاربردن) و بەرهەمهێنان ـ ئاڵوگۆڕ کە چینە سەرەکییەکانی ئابوورین تەواو دەکەونە ژێر کۆنترۆڵی پارەوە. ئامرازە بەکارهێنراوەکانی لەجۆری سندوقی دراوی نێودەوڵەتی (IMF)، بانکی جیهانی، رێکخراوی بازرگانی نێودەوڵەتی: بانکە ناوەندییەکانی تەواوی دەوڵەتانی جیهان، بانکە جیهانگیرییەکان، دەستاوێزە هەمەجۆرەکانی بیمە، بازاڕ و بۆرسە، دەستاوێزەکانی پێدانی پارە و حەواڵەکردن، کارتی بەکاربردن، سوود و نرخی دراو.. هتد لیستەیەکی بەرفراوانی ئامرازەکانن. ئیتر لە رێگای ئەم دەزگایانەوە پارە بووە بە بوونەوەرێکی وەک شەوە. راستتر، وەک دۆخی بەڕێوەبەری پلەداری کۆنی خێزانی باوکسالاری لێهاتووە. لەجیاتی پارە ئەم دەزگایانەی تازە پێدەگەن رۆڵی منداڵ دەبینن. بەڵام ئەمەش راستییەکە گشتیان هەڵگری توخمی باپیرەیانن کە پارەیە.

ئەم دەزگایانە لەناوخۆیاندا وەک تۆڕێکی سەرسووڕهێنەرن. تا دوا رادە رێکخراون. چرکە بەچرکە رێکدەخرێن. کار لەیەکتری دەکەن. جموجۆڵەکانیان بەشێوەی کورت، ناوین و درێژخایەنی رێکدەخرێت. ناوبردنی کورت خایەنەکان بە "**پارەی گەرم**" مامناوەندەکان بە "**دەستاوێزەکانی پارەپێدان و حەواڵە**"، درێژخایەنەکانیش بە "**دەستاوێزی درێژخایەن**" پێویستییەکی مۆدەیانەیە. بەردەوام ناوو ماوە دەگۆڕن. یەکێک لەو راستینە دروستکراوانەی کۆمەڵگایە کە بەخێراترین شێوە ئاواکراوە. ئامرازی سەرەکی ژمێریاری دۆلار و یۆرۆیە. یەکینەی پارەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێتی ئەوروپان. لەگەڵ ئەوەی تائێستا سیستەم بەردەوام لەبەهێزکردنی تواناکانی، ئیتر تەواوبووە. کەواتە قازانج کە مەبەستی سەرەکییە، لەژێر ئەم سیستەمە نوێیەدا چۆن بەدیدێت؟

تەواوی پەیوەندی و ناکۆکییەکانی جیهانی ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسی وەک خۆی بۆ ئەم سیستەمە وەهمی ـ شاشەیی یە گواستراوەتەوە. تەنانەت ئامرازە ئایدیۆلۆژی، ئەکادیمی و کلتوورییەکانیش دونیایەکن ئەم

سیستەمە خستوویەتییە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. لە نزیکەوە سەیرکردنی ڕاستی هێزی واتامان زیاد دەکات.

بوونی دۆلار (یۆرۆ یەدەگە) بە یەکینەی سەرەکی ژمێریاری بە چ واتایەک دێت. ئایا گۆڕانی نرخی دراو لەنێوان گۆڕەپانەکانی کەڵەکەبوونی دۆلار و دراوە نیشتمانییەکاندا دەستاوێزەکانی پارەپێدان و حەواڵە و پشک لەجموجۆڵی بازاڕدا، گۆڕەپانی نرخ و سوودەکان، ڕەنگدانەوەی کامە ناکۆکی و پەیوەندی، ڕێککەوتن و شەڕی جیهانی بەرجەستەی بەرچاون؟ بەردەوام باسی سێیەمین شەڕی جیهانی دەکرێت، ئایا بە قورسایی بۆ ئەم جیهانە سیمبۆلییە وەهمی (شاشەیی)یە نەگوازراوەتەوە؟ بلێی هەرچی شەڕە لە گۆڕەپانی ڕاستەقینەدا بەوێنەی جیهانی بوومەلەرزە نەبێت کە جارجار لە درزەکانی هێڵی فایەوە[1] دەداتە دەرەوە؟

بۆچوونێکی پەسەندکراوی گشتییە کە لەدوای دووەمین شەڕی جیهانەوە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هێزی هەژموونگەرایی جیهانە. وەک یەکینەیەکی پارە لەسەر ئاستی جیهانیدا قورسایی دۆلار ئەنجامی ئەم هەژموونگەراییەیە. ئەوەی سەیرە لەکاتێکدا ئەم هەژموونگەراییە دەگاتە لووتکەی خۆی، دۆلار لە قەبڵاندنی ژێر ڕزگاری دەبێت. زۆر ئاشکرایە ئەمە ڕەنگدانەوەی بوونە بە هەژموونگەراییەکی جیهانی بێ حیساب و بێ بەرپرسیار. هەروەکو دەزانرێت لەساڵانی ١٩٨٠کان بەدواوە ئەمریکا بەبێ بەرامبەر چەندین قات تریلیۆن دۆلاری لە جیهاندا بڵاوکردەوە. ئەمە بوویەرێکی مەترسیدارە. تەنیا چاپخانەی سەنت بەکاربهێنرێت ساڵانە بە واتای یەک ترلیۆن دۆلار دێت. لەهیچ سەردەم و شوێنێکدا بەم چەشنە پارە بۆخۆی هێندە خۆی مەزن نەکردووە. ئایا ئامرازێک هەیە لەم دیاردەیە باشتر ئەو ڕاستییە روون بکاتەوە کە بۆ یەکەمین جار هەژموونگەرایی لەپارەدا ڕەنگ بداتەوە یاخود دان بەوە دابنێت کە پارە بۆخۆی بووە بە هەژموونگەرا. ئەگەر ئەوە بێنینە بەرچاو کە تەواوی دەوڵەت ـ نەتەوەکان لە دۆخی قەرزداری دان (سەیرە ئەمریکا گەورەترین دەوڵەت ـ نەتەوەی قەرزدارە) ئەو کاتە باشتر دەرکی پێدەکەین بۆچی

١ ـ فای: ناوی ئەو هێڵەیە کە لە هێڵکاری بومەلەرزەدا لەکوێدا بوونی هەبێت بەو واتایە دێت ئەو جێگایە ئەگەری ڕوودانی بومەلەرزە تێیدا زۆرە. بۆ نموونە وڵاتی چین لەهێڵکاری بومەلەرزەدا لەسەر هێڵی فایە.

پارە هەژموونی بەدەستەوەیە. بە دژواری شڵەژاندنی دونیا لە ئاکامی یارییە بچووکەکانی پارە لەلایەن بانکی ناوەندی ئەمریکاوە بەشێوەیەکی باش جێگیربوونی سیستەمی فینانس رووندەکاتەوە. واتە ئەو دیاردانە زۆرن کە هێزی پارە دەسەلمێنن.

پەیوەندی قەیرانەکان بەسیستەمەوە بەکاریگەرترە. ئەو قەیرانانەی بەشێوەی خولی کاریگەری لەسەر ئاسیا، روسیا و ئەمریکای لاتین دەکەن و بڵاودەبنەوە تەواو لە گۆرەپانی پارەدا روودەدات. رەنگدانەوەی لەسەر ئابووری واقیعی دواترە. لەکاتێکدا قەیرانەکانی پێشوو لە جیهانی واقیعدا دەستی پێدەکردو لەجیهانی پارەدا ئەنجامگیر دەبوو. قەیرانەکانی سەردەمی فینانس تەواو پێچەوانەیە. ئابووری واقیعی بۆ هەرە دوایی دەهێڵنەوە، بەڵام هەژموونگەراکانی دونیای فینانس بەپێی خواستی خۆیان، دوای ئەوەی وڵاتی پەیوەندیدار یان جەمسەرەکانی ئەو وڵاتەیان هێنایە سەر رێ بەبێ ئەوەی قەیرانەکە قورستر بکەن کۆتایی پێدێنن. نموونەی روسیا ئەزموونبەخشە. دوای ئەوەی یەکێتی سۆڤێت لەساڵی ١٩٩١بەفەرمی پەرتەوازە بوو خرایە ناو قەیرانێکی قورسی فینانسەوە. لەساڵی ١٩٩٨دا قەیران گەیەنرایە ترۆپکی خۆی.

زۆر سەیرە لەو قۆناخەدا منیش لە مۆسکۆ بووم. گرێدراو بەوپێشهاتانەوە کە دەرکەوتنمی لە دیمەشق لەگەڵ خۆیدا هێنا. کاربەدەستە رووسەکان پێیان گووتم پێویستە بەخێرایی وڵاتەکەمان بەجێبهێڵیت، بۆ ئەوە چیمان لەدەست بێت دەیکەین. بەرپرسیارە زەبەلاحەکەی هەواڵگری دەیگووت: "**شەش مانگی دیکە بوایە هەمووشتێک ئاسان دەبوو. ئێمەش بەمجۆرە مامەڵەمان لەگەڵ نەدەکردی**" بەڵێ قەیرانی ١٩٩٨ روسیای دەستەمۆکردبوو، بەرپرسیاری یەکەمین دانی بەمە دادەنا. زۆر باشم لەبیرە وەزیری دەرەوەی ئەمریکا مادلین ئۆلبرایت، وەزیری دەرەوەی ئیسرائیل ئاریەل شارۆن کە سەرپەرشتیاری ئەو ئۆپەراسیۆنە تایبەتە بوون لەسەر من بە پەلەپەل هاتنە مۆسکۆ بەرامبەر بە دە ملیار دۆلار منیان خستە دەرەوەی مۆسکۆ. بەم ئامانجە رێککەوتن لەگەڵ (IMF) واژۆکرابوو. هەروەها بەرامبەر بەمن رێککەوتنی گازی سروشتی لەنێوان

تورکیا و روسیا واژۆکرا. سەرباری ناڕازیبوونی ئەمریکا، ئەمەش یەکێک لە مەرجەکانی روسیا بوو. دوای ئەوەی روسیا راکێشی سیاسەتەکانی نیولیبرالیزم کرا کە داخوازی هەژموونگەرایی سیستەم بوو، هێدی هێدی لەرەوشی ئیفلیج دەرکەوت و لەگەڵ سیستەم بوو بەیەک. بەمجۆرە لەسەردەمی شۆڕشە چەواشەکانی فینانس و جیهانی وەهمیدا دژە ـ شۆڕشێک ئەنجامدرا!

شیکارکردنی بەڕێوەبردنی دونیای واقیعی لەلایەن سەردەمی فینانسەوە زۆر ئەزموونبەخش دەبێت.

ا۔ بەردەوام ئاماژەمان بەم خاڵە کرد کە بەڕێوەبردنی جیهانی ئابووری واقیعی پەیوەندی بەگەیشتنی پارە بەئاستی هێزی بڕیارەوە هەیە. زیاتر ئەو پرۆژانە بە بنەما دەگیرێت کە خزمەت بە سیاسەتە بنچینەییەکانی هەژموونگەرایی دەکات. ئابووری جیهان بەگوێرەی سەردەمی فینانس چۆن دیزاین دەکرێت؟ کامە ناوچە، لەبارەی کامە موڵکەوە قاڵبێتەوە؟ بەشەکەی چی دەبێت؟ سیاسەتە سەرەکییەکانی ولاتان چۆن رێکدەخرێت، چۆن پێکهاتە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان نوێ دەکەنەوە، چۆن قەرزەکانیان بدەنەوە، چۆن سەرچاوەکانیان بەکاردێنن؟ هەروەها ئەو ولات و ئابوورییانەی بە رێگر و یاخی دادەنرێن چۆن بهێنرێنە سەر رێ؟ جەمسەری سۆڤێتی جاران، چین و ئەو ولاتانەی بە جیهانی سێیەم ناودەبرێن چۆن لەگەڵ سیستەمی هەژموونگەراییدا بکرێت بەیەک؟ پەیوەندی لەگەڵ ئیسرائیل چۆن رێکبخرێت؟ بەشێوەیەکی گشتی جیهان، ولات، دەوڵەت و گەلەکانی بەگوێرەی کامە پێودانگی سەردەمی نوێی فینانسی نیولیبراڵ بگونجێنرێن، لەسەر ئەم بنەمایە پرۆژە پێشکەش بە هەر ولات، کۆمپانیا، دەوڵەت و تاکێک دەکرێت. دوای ئەوەی ئەم پرۆژانە لەمیانەی وەبەرهێنانی گونجاوەوە بەچەندین مەرجی سیاسی و سەربازییەوە دەبەسترێتەوە فینانس، واتە ئامرازەکانی پارە فەراهەم دەکرێت. ئەوانەی گوێڕایەڵی ناکەن، قەیرانیان بەسەردا دەسەپێنرێت و بەخاڵی ئیفلاسکردنیان دەگەیەنن. خۆی لەخۆیدا سەردەمی فینانس واتای پێشکەشکردنی قەرزی مەرجدارە بە پرۆژەکان.

لەسەر ئەم بنەمایە کار بە سیستەم دەکرێت. تەنانەت ئەم شیکارەشمان بەشێوەیەکی روون نیشانی دەدات کە لە سەردەمی فینانسدا سەرمایەداری ئابووری نییە. بەو ئەندازەی یارییەکانی کاغەز ئابووری نییە، باشترین ئامراز و بەڵگەی سەلمێنەرن کە داسەپاندنێکی دەرەوەی ئابوورین: قازانجی هەرە زۆری پاوانخوازی لە رێگای ئەم کاغەزانەوە بەدیدێت. ئایا رەوشی دەرەوەی ئابووری لەوە روونتر هەیە؟ هیچ کەرت و قۆناخێک ناتوانێت هێندەی سیستەم و سەردەمی فینانس ئەوە روون بکاتەوە کە بەخێرایی قازانجێکی زۆر سەرووی سەردەمی بازرگانی و پیشەسازی بەدەست هاتووە. لە رێگای کۆبۆنی بچووکەوە هەرکەسێک دەخەنە ناو قازانجەوە، بەمجۆرە هەم دەکرێتە هاوبەشی تاوانی سیستەم، هەم سیستەم خۆی بەهێزتر دەکات، بەمجۆرە رزگاری دەبێت. سەردەمی فینانس زۆر لە ئیندوستریالیزم زیاتر لەدەرەوەی ئابوورییە. شێوەو کلتوورێکی کۆمەڵگایە.

روون و ئاشکرایە لە ئاستێکی بڵنددا رووبەڕووی پاوانی دراوین. قۆناخێکی پاوانکاری باڵا جێگای باسە کە دەوڵەتیش لەناوخۆیدا دەتوێنێتەوە (تەنانەت دەوڵەتی ئەمریکاش). بە پێگەی هێزێک گەیشتووە کە ٠گشت قۆناخەکانی دەسەڵات کۆنترۆڵ دەکات، پەرەی پێدەدات، تێکیدەدات و سەرلەنوێ ئاوایدەکاتەوە. ئەمەیە ناوەڕۆکی جیهانگیری نوێ. هەروەکو مەزەندە دەکرێت سەردەمی گەیاندن ناوەڕۆکی جیهانگیری دەستنیشان ناکات. لەئاستی جیهانگیریدا بەناویەکداچوونی بێ هاوتای ئابووری و سیاسەت و پاوانی سیاسی ناوەڕۆکەکەی پێکدێنێت. گوزارشت لە کۆنترۆڵکردنی تەواوی ئیرادە خۆجێیی، نەتەوەیی، سیاسی و ئابوورییەکان دەکات لەلایەن هێزەکانی پاوانی باڵای جیهانگیرییەوە. ئەمە رەوشێکی نوێیە و پێویستی بە قاڵبوونەوە هەیە.

ب ـ کاریگەریەکەی لەسەر واقیعی کۆمەڵگا تەواو بە ئامانجی فەتحکردنە. ئامانج لەمەش کۆمەڵگایەکی وەهمی و پارەیە. کاریگەرترین رێگاکانی کاپیتالیزەکردنی کۆمەڵگا هاوبەشی پێکردنی کۆمەڵگایە لە قازانجدا لە رێگای ئامرازەکانی دەستاوێزی پشک، حەواڵە، بەڵگەکانی

پارە پێدان. بەمجۆرە لەسەرووبانەوە چینی ناوین و کۆمەڵگا بەگشتی لەگەڵ دونیای فینانسدا دەبێتە یەک. بەرامبەر بە قازانجێکی کەم دەکرێتە هێزی پاراستنی سیستەم. تاڕادەیەکی مەزن پەرچەکردارییان بەرامبەر بە سیستەم دەشکێنرێت. لە ڕێگای بیمەی بەکاربردن، بیمەی بچووک و هەزار و یەک جۆری بیمەی پرۆژەکانەوە خوازیارن کۆمەڵگا چەک بکەن. ڕێبازەکەی ئاسانە. سەرەتا قەیران دەسەپێنرێت، بەمجۆرە جیهانێکی نوێی بێکاران دەخرێتە سەر دونیای بێکاران. چینی ناوین دەپووکێنرێتەوە، دەخرێتە رەوشێکی تکاکارانەوە. برسێتی و نەداری تا سنوورەکانی مردن دەسەپێنرێت. پشێوی و کائیوس قووڵدەکرێتەوە. دواتر بەشێوەیەکی مەرجدار بۆ سەرلەنوێ ئاواکردنەوە کۆمەڵگا بەبیمە دەبەسترێتەوە.

جاران لە ڕێگای شۆڕش و بزاوتە کلتووری - رۆشنگەرییەکانەوە هەوڵی وەرچەرخاندن و گۆڕینی کۆمەڵگا دەدرا. ئێستاکە لەمیانەی ڕێبازو پەیڕەوەکانی فینانسەوە بەشێوەیەکی سەرتاپاگیر و بەرنامەڕێژتر، بەبێ ئەوەی دەستی خۆی بخاتە ناو ئاگرەوە، بە مەقاش ئەنجامی خوازراو بەدەست دێنێت، خوازیارە بەدەستی بێنێت. سەبارەت بە تەواوی کۆمەڵگاکان سەرلەنوێ ئاواکردنەوە بەجۆرێک خراوەتە گەڕ کە بۆ ئاواکردنی چۆنیەکییەکی جیهانگیر خولقاندنی کۆمەڵگای مێگەل، بەبۆتەی یەک کلتووردا تێپەڕدەکرێت و شێوەیەکی پێدەدرێت کە ناڕەزاییەکی بچووکیش بەرامبەر سیستەم نیشاننەدات. بەجۆرێک لەجۆرەکان پرۆژەکانی کۆمەڵگا لەشوێنی یۆتۆپیاو شۆڕشەکانی جاران دادەنرێت. ئیتر پێویست بە یۆتۆپیاو شۆڕش ناکات. هەمووشتێک دەکرێت بە پرۆژە. هەروەها فینانسکارەکەی ئامادەیە. ئەمەیە کۆمەڵگای چەواشەکراو، کۆمەڵگای سیمیلاسیۆن کراو ، کۆمەڵگای وەهمی - شاشەیی، کۆمەڵگای خاوەن تاک زهنییەت. ئایا ئەوەی دەسەپێنرێت لەژێر دەمامکی نوێدا بەدیهێنانی ڕەهەندی جیهانگیرانەی پرۆژە و دونیای فاشیزم نییە؟ پێویستە لەهەموو بوارێکەوە کۆمەڵگای سەردەمی فینانس بناسرێت و پێناسە بکرێت.

ج ـ رامیاری دەوڵەت وسیاسەتی سەردەمی فینانس بەشێوەیەکی ڕێژەیی خەسڵەتی ناکۆکی لەگەڵ سەردەمی پیشەسازیدا هەیە. بەشێوەیەکی بنەڕەتی ئیندوستریالیزم سەبارەت بە سیاسەتەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە و میللیگەرایی قاڵدەبێتەوە. خوازیاری ئافراندنی پاوانخوازییە. بەهۆی پێویستی سەردەمی فینانس بە جیهانگیری ئیتر ئەم مۆنۆپۆلانە بەکۆسپ دادەنێت. لە دایکبوونی سەرمایەدازیش وەک سیستەمێکی جیهان تادوایی پشتگیری لە پاوانخوازی دەوڵەت ـ نەتەوە ناکات. پاوانخوازی دەوڵەت ـ نەتەوە کە مەیلی داخراوبوونیان بە رووی دەرەوەدا هەیە، دەبنە کۆسپ لەبەردەم ئەو پاوانانەی خوازیارن لەئاستی جیهانگیریدا جموجۆڵ بکەن. بە تایبەتی کە سەردەمی فینانس ئەگەر ئامرازەکانی خۆی لە ئاستی جیهانگیریدا بەکاربێنێت دەتوانێت قازانج زیاد بکات. لەرەوشێکی بەمجۆرەدا دەوڵەت ـ نەتەوە وەک بەربەستێکی جددی رووبەڕووی دەبێتەوە. بۆیە یان بەگوێرەی دۆخی نوێ دەگونجێندرێت یان دەڕووخێنرێت. کۆریای باکوور، لیبیا، سوریا، ئێران، ئێراق و .. هتد. لەبەرئەوەی لیبیا خۆگونجاندنی پەسەند کرد هەبوونی خۆی پاراست. ئێراقیش کە پەسەندی نەکرد، بەشێوەیەکی سیمبۆلییانە دووچاری غەزەبی سەردەمی سەرمایە هات. ناچارن نوێیەکەشی ئاوابکەن. ناتوانن هەرهەموویان بڕووخێنن. بە تایبەتی وڵاتانی وەکو بەرازیل، تورکیا، ئەرژەنتین، چین، هیندستان و روسیا لەبەرئەوەی بەخەستترین شێوە لەناو دەوڵەت ـ نەتەوەدا دەژین، لەسەرووی ئەو وڵاتانەوە دێن کە لە ڕێگای قەیرانەکانەوە پەروەردە دەکرێن و سەرلەنوێ لەگەڵ سیستەمدا دەگونجێنرێنەوە.

گرنگتریش ئەوەیە تاکە ستانداردێکی دەوڵەت ـ نەتەوە لە قووڵاییدا جیهانگیری بەربەست دەکات. لەجیاتی ناوەندێتی خۆجێیی جۆری دەوڵەت ـ نەتەوە، جیهانگیری چەشنێکی دەوڵەت دەکات بە رۆژەڤ کە قەبارەی بچووکترەو بە دەسەڵاتێکی وابەستەو سنووردار رازییە. لە ڕێگای یەکینە خۆجێییەکانەوە خوازیاری گۆڕینی ئەو دەوڵەتانەیە کە لەگەورەییدا قەبارەیان مامناوەندییە. مەزەندە دەکرێت ناکۆکبوونی دەوڵەت ـ نەتەوە

لەگەڵ جیهانگیری سەردەمی فینانسدا بۆ ماوەیەکی درێژ بەردەوام بێت. فاکتەرە سنووردارەکانی دژە ـ سەرمایەداری کە لە پێکهاتەکەیدا هەیە، ئەمە دەکەن بەناچارییەک. ئەو کەموکوڕییە قووڵانەی بەگشتی دەوڵەتی کلاسیک هەرە زێدەش دەوڵەت ـ نەتەوە ڕێگای لەپێش کردەوە، هەوڵدەدرێت لەمیانەی سیستەمێکی تامپۆنەوە دەربازبکرێت کە بە کۆمەڵی مەدەنی ناو دەبرێت، بەڵام لە ناوەڕۆکی خۆیدا تەواو نوێنەرایەتی کۆمەڵی مەدەنی ناکات. کۆمەڵی مەدەنی لە گەوهەرە دیموکراتییەکەی خاڵیدەکرێتەوەو هەوڵدەدرێت بۆ سووککردنی بنبەستبوونەکەی دەوڵەت ـ نەتەوە بەکاربهێنرێت. کۆمەڵی مەدەنی گۆڕەپانێکی سیاسییە کە شارستانی کلاسیک و شارستانێتی دیموکراتی هەرە زێدە کێشمەکێشی لەسەردەکەن. دیموکراتیزەبوونی کۆمەڵی مەدەنی کێشەیەکی بنچینەییە، شیکارکردن و کارکردن لەم بوارەدا یەکێک لە ئەرکە سەرەکییەکانی سیاسەتی دیموکراتیانەیە.

شەڕی شارستانییەکان، رادیکاڵیزم، تیرۆریزم، سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی دەوڵەت، جیهانگیری و هەڵکشانی ئایین لەسەرووی ئەو بابەت و کێشانەوە دێن کە سەردەمی فینانس لەبواری ئایدیۆلۆژییەوە کردوویەتی بەرۆژەڤ.

تێزی شەڕی شارستانییەکان لە دوو لایەنەوە گرنگە. چاوەڕوانی دەکرێت ئەو شارستانییە بسەپێنرێت کە هێزی هەژموونگەرایی سیستەم مەنسوبێتی. هەروەکو مەزەندە دەکرێت و هەندێ ناوەندیش بانگەشەی بۆ دەکەن شارستانی ئەنگلۆ ساکسۆنی سپی پێستە کرستیانییەکان جێگای باس نییە. لەبەرئەوەی ئەو شارستانییە سۆسیالیستییەی لە ڕێگای سۆسیالیزمی بونیادنراوەوە هەوڵی ئاواکردنی درا نەیتوانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری تێپەڕبکات، تەنانەت خەسڵەتەکانی دەربازکردنیشی نیشان نەدا و لەگەڵ سیستەم تێکەڵ بووەوە، دەرفەتی بە تێپەڕکردنی قەیرانێکی شارستانیدا کە شیمانەی هەبوونی دەکرا. لە ئاکامی پەرتەوازەبوونی یەکێتی سۆڤێتەوەو گۆڕانی چینەوە بەرەو سەرمایەداری ئاشکرابوو کە ئەو ململانێیەی لەنێوان هەردوو جەمسەردا هەبوو لەنێوان دوو

شارستانیدا نەبوو، بەڵکو لە نێوان دوو هێزی هەژمموونگەرایی بوو (نوێنەرایەتی هەمان شارستانیان دەکرد).

بەلام ئەو گۆڕەپانانەی بەجیهانی ئیسلام ناو دەبرێت، شانبەشانی ئەوەی گۆڕەپانێکی زۆر کۆنی شارستانییە، پێگەی جۆرێک لە میللیگەرایی هەرێمی ئیسلام، هەروەها ناکۆکییەکانی لەگەڵ ئیسرائیل کێشەی شارستانییەکانی کرد بە ڕۆژەڤ. لەهەرسێ سەردەمی سەرمایەداریدا بەهیچ جۆرێک ڕۆژهەلاتی ناوین لەگەڵ سیستەم نەبوو بەیەک. دەوڵەت ـ نەتەوەش لەجیاتی ئەوەی ببێتە ڕێگە چارە، کێشەکەی بنبەستتر دەکرد. پەرەپێدانی میللیگەرایی ئایینی لەلایەن هەردوو کەناڵی عەرەبستانی سعودی و ئێرانی شیعە، هەروەها بەهەموو دژوارییەکەوە کەوتنە گەڕی توندوتیژی و کاریگەرییە هەمیشەییەکانی کێشەی ئیسرائیل ـ فەلەستین گفتوگۆکانی شارستانی بەگوڕ دەکرد. ئەمەیان ڕەهەندی کێشەکە بوو لەناوخودی شارستانیدا. ڕەهەندەکەی تریش داخوازی گەلانی ناوچەکە و کۆمەڵگا هەمەڕەنگەکان بوو بۆ پاراستنی هەبوونی خۆیان، بەرگریکردن لە ناسنامە کلتوورییەکەیان و ڕزگاربوونیان لە پەشێوی دەوڵەتی دەسپۆت و دەوڵەت ـ نەتەوەکان و فاشیستەکان. بەواتایەکی دیکە ڕەنگدانەوەی هەرێمیانەی پێکدادانی نێوان شارستانی کلاسیکی دەستپۆت و شارستانێتی دیموکراتی بوو کە وزەی بەهێزی هەیە. ئاشکرایە کاتێک کاریگەری مەسەلەکانی ئاوو نەوتیشی بێتە سەر لە ڕۆژهەلاتی ناویندا دەتوانرێت باس لە کێشەی نێوان شارستانییەکان بکرێت.

لە ناوەڕۆکی خۆیدا ڕادیکالیزم کاردانەوەیەکی دەوڵەت ـ نەتەوەیە بەرامبەر جیهانگیری سەردەمی فینانس. پێهەڵگرتنێکی ئایدیۆلۆژی ـ سیاسین کە خاوەن ڕەنگی ئایینی و نەژادین و زیاتر ئامانجیان دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی داخراوە بە ڕووی دەرەوەدا. لەهەموو بوارێکدا نموونەیان هەیە. شانبەشانی ئیسلامی، کریستیانی، هیندۆس، ڕوحگەراکانی ئەفریقیا، فاکتەرە نەژادپەرست ـ میللیگەرا ڕاستڕەوەکانی ناو هەر دەوڵەت ـ نەتەوەیەک نوێنەرایەتی باڵە ڕادیکاڵەکەی دیکە دەکات. زۆر جار بینراوە کە هەردووکیان یەکدەگرن. بەرامبەر بە جیهانگیری نوێنەرایەتی

شێوەی کۆنەپەرستی خۆجێیی دەکەن. لەلایەکی دیکەشەوە رەوتە دیموکراتییە خۆجێییەکان، کلتووری و فێمینیستەکان و چەپە نوێیەکان ئەگەر ناتەواویش بێت بەرامبەر بە جیهانگەرایی لە پلاتفۆرمی وەکو 'فۆرمی کۆمەڵایەتی جیهان'دا دێنە لای یەکتر و لەپێناو شارستانێتی دیموکراتیدا گفتوگۆ دەکەن. شیمانەی مەزن تیرۆریزم بزاوتێکی مەزنی گێرەشێوێنییەکە سیستەم خۆی دروستی کردوون. نیشانە و هێمای بەهێز لە ئارادان کە ئامرازێکن بە ئەنقەست بەکاردەهێنرێن تا بیانووی رەوا بۆ دەسەڵاتی سەردەمی فینانس بخوڵقێنن. بۆ نموونە ئەلقاعیدە هێشتا وەک نهێنییەک ماوەتەوە. خودی سەردەمی فینانس خەسڵەتی بەهێزی تیرۆریستی لە خۆوە دەگرێت. ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیانەی پارە وێرانی کردوون بە تەنیا بۆخۆی کێشەیەکی مەزنی تیرۆریزمە. هیچ تیرۆرێک هێندەی هەژموونگەرایی پارە بۆ دوورخستنەوەی کۆمەڵگا لە پەیوەندییە قووڵەکانی بەکاریگەرنابێت. بەشێکی هەرە زۆری ئەو کردارانەی سیستەم لە پێناو ئاواکردن و درێژەدان بە بوونی خۆی لە بوارەکانی ئابووری، کۆمەلایەتی و سیاسیدا ئەنجامیدەدات دەکەوێتە چوارچێوەی تیرۆرێکەوە کە بەدەگمەن لەمێژوودا بینراوە. خوازیارن لە رێگای فاکتەرە گێرەشێوێنەکانەوە تیرۆری مەزن بشارنەوە. بەدەستهێنانی قازانجێکی زۆری پارە لە رێگای پارەو دەرەوەی ئابووری واقیعی، گەیشتنی پیاوی بەهێزە بەدۆخی سیستەم و جێگیربوونێتی لە لووتکەی کۆمەڵگادا. تالانەکانی چل جەردەکە ناکاتە یەک لە ملیاری تالانەکانی پاوانخوازی سەردەمی فینانس. تالانکاری هێندە مەزن تەنیا لە سیستەمێکی تیرۆردا ئەنجامدەدرێت. لەم چوارچێوەیەدا ئەو دیاردەیەی سەردەمی گەیاندنی پێدەڵێن تەنیا بۆ داپۆشینی تیرۆری فینانس پێویستیان پێیەتی. لەوانەیە بەمجۆرە ئەو زاراوەیە واتادار بێت کە تیرۆری میدیای پێدەڵێن. بەکورتی خودی سیستەم گەورەترین تیرۆریستی مێژووی رابردوو و داهاتووە.

پەرەپێدانی ئایینیش لەپێناو داپۆشین و شاردنەوەدایە. شێوازی داگیرکردن و چەوسانەوە پێویستی بە هێزێکی بالای مەشروعییەت پێدراوی وەک ئایین هەیە. قۆناخی بەدەرنانی کۆمەڵگا لە بەرهەمهێنانی

پێویستییە سەرەکییەکان کە پێشتر دەستی پێکردبوو لەسەردەمی فینانسدا بەلووتکە دەگات. بێکاری بەکۆمەڵ سەرهەڵدەدات. ئەو پرۆسەو قۆناخانەی زەحمەتە لە رێگای زانستەوە روون بکرێتەوە (ئەو گۆڕانکاریانەی پەسەند ناکرێن) تەنیا لە رێگای ئایینەوە نەرم دەکرێت و دەرفەتیان پێدەدرێت. ئەوەی دەخرێتە ژێر فشارەوە کلتووری ئایینی نییە، بەڵکو ئەو بوویەرەیە کە بە سەرلەنوێ زیندووکردنەوەی ئایین ناودەبرێت. ئەمە ئەو مەحافەزەکارییە ئایدیۆلۆژییەیە کە لەکاتی مەحافەزەکاربوونی هەر سەردەمێکدا روودەدات. بەمجۆرە بەبێ پیشاندانی هیچ ناڕەزاییەک کۆمەڵگا لە رێگای ئەڵقەکانی قازانجی ئابووری، کۆمەڵگای بەمێگەلکراو، پێکدادانی شارستانییەکان، تیرۆر و مەحافەزەکاری ئایدیۆلۆژییەوە دەبەسترێتەوە. کاتێک قەفەسی ئاسنین و چاودێری مەزن نەیتوانی بە تەواوی کۆمەڵگا کۆنترۆڵ بکات، ئەم فاکتەرە نوێیە ئایدیۆلۆژیانەی لێ زیاد دەکرێت و دەخرێنە گەڕ.

سەرمایەی فینانس کە لە رووخساردا وەک بەهێزترین سەردەمی سەرمایەداری دەبینرێت بەهەموو خەسڵەتەکانییەوە ئاماژە بەهەرەس دەکات. نەمانی پۆتانسێلی بەردەوامبوونی سیستەم نیشاندەدات. سەردەمێک چەندە ناوەڕۆکەکەی خاڵی بێتەوە، بەو ئەندازەیە پێویستی بە مەحافەزەکاری دەبینێت. ئەم ناچارییە نیشانەی لاوازییە نەک بەهێزی. بەرهەمهێنان کردارێکی سەرەکی مرۆڤ و کۆمەڵگایە کە بەبێ ئەو ناتوانێت بژیت. هەرچی سەردەمی فینانسە دانناناە بە فەراهەمنەکردنی ئەم پێویستییەدا. سیستەمێک نەتوانێت بەرهەمهێنان بەرقەرار بکات سیستەمی بێکارییە. هەر ئەمەیە کە روویداوە. سیستەمێک تا ئەم رادەیە لەگەڵ کارکردن و بەرهەمهێناندا ناکۆک بێت، تاکە شانسی ژیانی تیرۆرە، هەر ئەوەشە کە زۆر باس دەکرێت، وەک لەرێ دەرچوونێک و لە رێگای گێرەشێوێنییەوە بەڕێوە دەبرێت.

لەسەرەتای ١٩٨٠ کاندا شەپۆلی تیرۆری سیستەم بە هێرشەکانی تاتشەر و رێگانی سەرۆکی هەردوو هێزی هەژموونگەرایی بەریتانیا و ئەمریکا بۆ سەر دوورگەکانی فۆکلاند و نیکاراگوا دەستی پێکرد.

دەسەلاتی هەردوو کودەتای سەربازی پاکستان و تورکیاش نزیکترین پاڵپشتیان بوون. ئەمریکای لاتین بە تەواوی تیرۆریزەکرابوو. پێشبڕکێی خۆپرچەککردن کە لە ڕێگای شەڕی ئەستێرەکانەوە بەردەوام بوو روسیای لە هێزی هەژموونگەرایی پاشگەز کردبۆوە. ریفۆرمەکانی دینگ سیاو پینگ لە چین قەرەبوویەک بوو بۆ سازش لەگەڵ سیستەمدا ئەنجامدرا. کۆتایی بەو قەرەبوودانەش هێنرا کە لە ڕێگای شەڕەکانی رزگاری نیشتمانی و دەوڵەتی خۆشگوزەرانییەوە فەراهەم دەکران، لەهەموو گۆڕەپانێکدا بای تیرۆری سەردەمی فینانس هەڵیکرد. کلینتۆن بەشێوەیەکی نەرمتر و لە ڕێگای سیاسەتێکی بەکاریگەرەوە درێژەی پێدا.

تەنیا رۆژهەلاتی ناوین مابۆوە کە تەواو فەتح نەکرابوو. ئەویش کرابوو بە گرێکوێرەی ئەو کێشانەی سەرچاوەی خۆیان لە شارستانی، رادیکالیزم، تیرۆرو ئایینەوە وەردەگرن. ئەگەر سیستەم خوازیاری گەڕانەوە دواوە نەبێت، بەڕێگایەک لەڕێگاکان دەبوایە فەتحی خۆی تەواوبکات. هەروەها مەسەلەی ژیانی نەوتیش جێگای باس بوو. نەوت کەرتێکە کە سەردەمی فینانس ریسکی هەرە زێدە لەپێناویدا رەچاو دەکات. پێویستی سەد ساڵی سیستەم بەم کەرتە دەست نیشانکرابوو. کێشەی عەرەب ـ ئیسرائیل وەک شمشێری دیموکلیتس لەسەر سەری سیستەم دەسوڕایەوە. ئێرانی شیعە وەک هەڕەشەیەکی مەزن بەردەوام بوو.

توانای ناوچە بۆ دروستکردنی گرفتی مەزن وەک میراسێک لە فەرەنسا و ئینگلتەراوە مابۆوە. لەراستیدا یەکەمین شەڕی جیهانی لە ناوچە کۆتایی پێنەهاتبوو. کودەتا، یاخیبوون، شەڕی ناوخۆیی و گەریلا هێمای کۆتایی نەهاتنی ئەم دۆخەبوو. تەنیا بەئامانجی زیادکردنی گرفت و کێشەکان سنوورەکان (نەخشەکان) بەراستەهێڵ کێشرابوون. مەزەندە دەکرێت کە بەهۆی ئەم کێشانەوە ماوەیەکی درێژ ئەمریکا بەدوای پرۆژەیەکەوە بوو. ئەگەر کێشەکانی شەڕی سارد، یەکێتی سۆڤێت، ئەمریکای لاتین و ئەوروپا لە ئارادا نەبوایە لەمێژبوو ناچاری دەستێوەردانی ناوچەکە بوو. کێشە ئاماژە

پێکراوەکان ئەگەر بەتەواوی نەبێت لەسەرەتاکانی ١٩٩٠دا بەشێوەیەکی ڕێژەیی کەوتبوونە سەر ڕێگای چارەسەربوون. هەرچی کێشەی ڕۆژهەڵاتی ناوینە ببوو بە کانگرێن و بەردەوام بوو. یان دەبوو تەواو دەستبەرداری بێت، یان بە تەواوی دەستوەردانی بۆ بکات. دەستبەرداری بێت نەوت و ئیسرائیل لەدەست دەچن، شانسی هەژموونگەرایی بۆ ئێران دەڕەخسێت. سەددامیش دەیخواست ببێت بە بیسمارکی[1] عەرەبەکان.

سەردەمی بازرگانی لەمیانەی شەڕە مەزنەکانی تاڵانکردنی کۆلۆنیەکانەوە بەڕێوەچوو. سەردەمی پیشەسازیش پڕاوپڕ لە ڕێگای هەردوو شەڕی گەورەی جیهانی، شەڕی چینایەتی ناوخۆیی و لەدەرەوەش شەڕەکانی ڕزگاری نیشتمانی بەڕێوەچوو. هەرچی سەرمایەی فینانسە بوو بەشەڕی دەسەڵاتی تەواوی کۆمەڵگا لەگەڵ خۆی. لەدۆخی لەدەستدانی تەواوەتی ڕۆژهەڵاتی ناوین لەوانەیە پاوانی هەرە دوایی شارستانی لەژێر کائیوسی بونیادیدا بخنکایە. هەڵبەتە ئەوەی ڕوویدا ڕەوشێکی نزیکی ئەمەبوو. تاڕادەیەکی مەزن شانسی سیستەم بەپێشکەوتنەکانی ناوچەکەوە گرێدرابوو. هەربۆیە ڕووداوەکان بریتین لە شەڕێکی سێیەمی جیهانی، بەڵام بەگوێرەی هەلومەرجە تایبەتەکانی ناوچەکە. گۆڕانکارییەکانی دواتر ئەم ڕاستییەیان سەلماند.

لەو بڕوایەدام پەیوەندییە هەستیارو ستراتیژییەکەی ئەم پرۆسەیە بەمنەوە لەداهاتوودا بەشێوەیەکی ڕوونتر دەرکی پێدەکرێت. هەڵبەتە چەندەی دەچێت بابەتەکە یەکلایی دەبێتەوە. کاتێک هەردوو سەرکردەی بەکاریگەری سوریا و ئەمریکا حافز ئەسەد و بیل کلینتۆن دووجار دیداریان کرد، دواتر زانیم کە نیوەی ڕۆژەڤەکەیان سەبارەت بە من بووە. ئیتر ئاشکرا ببوو کە بە پێگەیەک گەیشتووم ڕۆڵی کلیل دەبینێت. بە شێوەیەکی درێژخایەن لە پرۆژەی ڕۆژهەڵاتی ناوینی گەورە ڕۆڵێکی ستراتیژییان بۆ کوردان تەرخان کردبوو. لەچارەسەرکردنی کێشەکانی ناوچەکەدا لەگەڵ سەرمایەداری فینانس کورد و کوردستان وەک قۆچی قوربانی بەکاردەهێنرێن. لەسەردەمێکدا ئەرمەنی و هاوشێوەکانیان بۆ ئامانجی بەمجۆرە بەکارهێنران (هێلینییەکان،

---

[1] ـ بێسمارک: سەرۆک دەوڵەتێکی ئەڵمانە، لەنێوان ساڵانی (١٨١٥ ـ ١٨٨٩)دا ژیاوە. لەنێوان ساڵانی (١٨٦٧ ـ ١٨٩٠) حوکمڕانی کردووە، لەبەرئەوەی گوتویەتی کە ئەڵمانیای نوێ لەسەربنەمای شمشێر و خوێن دادەمەزرێت، نازناوی "سەرۆکێک لەپۆڵا"ی دراوەتێ؛ یەکێتی ئەڵمانیای دروست کردووە.

ئاشوورییەکان، تەنانەت یەهودییەکان، عەرەب و فەلەستینییەکان). بەکارهێنانی کورد وەکو دارێک بۆ هەڵوەشانەوەی ئەو هێزە ستاتۆپارێز و دەوڵەت ـ نەتەوە دەمارگیرانەی لەجیاتی ئەوەی یارمەتی چارەسەرکردنی کێشەکان بدەن قووڵیان دەکردەوە و دەستبەرداری حەسرەتەکانی بوون بە هەژموونگەرایی ناوچە نەدەبوون، زۆر کاریگەر دەبوو.

وەکو دیار دەبێت ئەو پیلانەی لە ساڵی ١٩٧٠کانەوە ئامادەکرابوو من وەک فاکتەرێکی چاوەڕواننەکراو تێی کەوتم، بەڵام بە بینینی ڕۆڵی کلیل منیش کەوتبوومە ناو مەسەلەکەوە. یان تەواو دەبووم بە سەربازێکی ملکەچی فەرمانەکانیان یان بەلاوە دەنرام. کارەکتەرم بۆ سەربازێتی سیستەم لەبار نەبوو. لەم سۆنگەیەوە بووم بەو فاکتەرەی پێش هەمووان و بەشێوەیەکی ئاسانی بەلاوە بنرێم، ئەمەش دۆخێک نییە مایەی تێگەیشتن نەبێت. یەکەمین شەڕی جیهان لە دوای کوشتنی شازادەی نەمسا بەدەستی ملیتانێکی سربی دەستی پێکرد. بەڵام لە ڕۆژهەلاتی ناوین شەڕ بەردەوام بوو. بەدژوارییەکی زیاترەوە بەردەوام دەبوو. بەلام وەک سێیەمین شەڕی جیهانی. هەرچی قوربانییەکەیە، ئەمجارە تەواو بەپێچەوانەوە بە پیلانی تەواوی هێزە ڕێکخراوەکانی سیستەم من بووم. لێکچوون و دووبارەبوونەوەی مێژوو بەنوێ بوونەوەوە بەکاریگەرە. لەو بەرگرینامەیەی پێشکەش بەدۆزی دادگای ئیستینافی ئەسینام کردبوو گوتبووم: **"هەروەکو چۆن خوداوەند زیۆس و یاریدەدەرەکەی خوداوەندە ژن ئەسینا لەگەڵ هادەس و ئارەس دەستی یەکتریان گرت و پرۆمیتۆسیان لە گاشە بەردەکانی قەفقاسیا بەستەوە، مرۆڤەکانی نەوەی ئەم خوداوەندانەش منیان قۆڵبەست کرد و لە گاشەبەردەکانی دوورگەی ئیمرالی منیان زنجیرکرد".** پێموایە وەک دەرکەوتووە ئەم دەستنیشانکردنە هێشتا ناتەواوە.

لەمیانەی ئەم شیکردنەوەم باشتر ڕوون دەبێتەوە کە خوداوەندێکی راستەقینە منی قۆڵبەستکردووە. ئەم منداڵە بچکۆلەیەی خوداوەند کە بەنهێنی لە ڕاڕەوەکانی مێژوودا گەورەبوو، درەوشایەوە و بوو بەپارە، لەسەردەمی سەرمایەداریدا لەناو کۆمەڵگا ئاشکرا بوو و هاتە مەیدانەوە. بەجۆرێک خۆی شیرین کرد و پەسەندکرا، تەواوی خوداوەندەکانی چاخەکانی پێشووتر لەناوچوون. پادشاکان لەسەر زەوی بەکێش کران. لە کەللەیان

درا. خوێناویترین سەردەمی بەسەر مرۆڤایەتیدا سەپاند، تا مۆخی ئێسقان چەوسانەوەی بەڕێوەبرد. ژێر زەمین و سەرزەمینی پیسکرد، تێکەڵی کرد. لەراستیدا مرۆڤ و زیندەوەرەکانی دیکەی قڕکرد.

بە ئیلاهیکردنی پارە دیاردەیەکە زۆر لە راستییەکەی مەترسیدارترە. ئەگەر لەمیانەی ئەم دێڕانەوە توانیبێتم کەمێک ئاماژە بەو سیستەمە بکەم کە پشتی پێدەبەستێت و بەڕێوەی دەبات، ئەمە ئەو دیاردەیە کە بەختەوەری پێدەڵێن و بە تایبەتیش بووە بە بەشی من. سپینۆزا گووتبووی: "**تێگەیشتن ئازادییە**". منیش لەو بڕوایەدام کە لەدەرەوەی ئەمە ئازادی نییە. ئازادبوونم بەقەدەر توانای تێگەیشتنم، وزەی بەهێزی ژیانمە. گەورەترین خوداوەندی سەردەمی فینانس لەگەڵ تەواوی یاریدەدەر و بەکرێگیراوەکانی بوون بەیەک و منیان لەبەردەکانی ئیمرالی بەستەوە. بەڵام هەڵگیرسانی مەشخەڵی ئازادی شاخەکانی زاگرۆس و تۆرۆسیان لەبەرامبەر خۆیان بینییەوە، کە هەرگیز جارێکی دیکە ئاگرەکەی ناکوژێتەوە و شوێنی تەختی تەواوی خوداوەندە پیاو و خوداوەندە ژنەکانی مێژووی لێبوو.

ئاپۆلۆن خوداوەندی رووناکی و بەرگری بوو. کەمێک حەزم لێیەتی. دیۆنسیۆس خوداوەندی ئەشق و خۆشی و شەرابی شاخەکان بوو. حەزم لە کلتوورەکەیەتی. هەردووکیشیان شێوەی گواستراوەی خوداوەندە کۆنەکانی زاگرۆس ـ تۆرۆسن بۆ ئەنادۆڵ. ئاشکرایە گوزارشت لە ناسنامەی پالاوتەی هەزاران ساڵەی گەلان دەکەن. کاتێک گەیشتینە سەر هەردوو خوداوەندی دێرینی ناوچە گودیا و ئەڵڵا، سەبارەت بە ئەوانیش هەوڵی قالبوونەوە و شیکارکردنیان دەدەم. خوازیارم تێبگەم بۆچی ئەوانە گەلەکانمانیان بەرامبەر بە "پارەڵڵا" بەبێ رووناکی و بەرگری هێشتووە و بەوە رازیبوون کە لەناو خوێن و ئازاردا بمێنێتەوە. وەک رۆڵەیەکی ئاشقی ناوچەکە بەختەوەرم کە گەلانم لەژێر چنگی خوداوەندی پارەی کوێر و تەڵەکەباز جێنەهێشتووە. بەردەوام لەو بڕوایەدام کە دۆستەکانم و ئەو کۆمەڵگایانەی ئاوایانکردووە تا کۆتایی بە بەختەوەری لەگەڵمدا دەمێنن.

## ٦ـ ئەنجام:

**ئایا شارستانی دەوڵەتی دەتوانێت لەگەڵ شارستانێتی دیموکراتی ڕێککەوێت؟**

هەوڵدەدەم کورتە ئەنجامێکی پوختەی ئەم پەرتووکەی بەرگرینامەکەم پێشکەش بکەم.

١ـ تا پێکهاتەی دەسەڵات بەدرێژایی مێژوو شیکارنەکەین ناتوانین خەباتێکی تەندروستانەی کۆمەڵناسی ئەنجامبدەین. ئەو زانستە کۆمەڵایەتیانەی لەمیانەی چەمک و جیهانبینی زانستی پۆزێتیڤیستەوە هەوڵی پێشخستنی دراوە تەواو بنبەست بووە. لە رەوشێکی پێچەوانەدا ناتوانین ئەم دیاردانەی شەڕ و چەوسانەوە روون بکەینەوە کە هێندە پەرەیان سەندووە. زاناکان (پیاوانی زانست) ناشێت لە پیاوێکی ئایینی یان ئەخلاقناسێک کەمتر بەرامبەر کۆمەڵگا بەرپرسیار بن. مادام زانست هێزی واتای لە میتۆلۆژی، ئایین و فەلسەفە بەهێزترە، سەرباری ئەوەی شۆڕشی خۆی ئەنجامدا و سەرکەوتنی بەدەست هێنا (سەدەی ١٧)، بۆچی ئەم بالابوونەی بەرامبەر دیاردەکانی شەڕ و چەوسانەوە نیشاننەدا کە هاوتایان نەبینراوە؟ دەشێت گۆڕانی زانست بۆ دەسەڵات وەک هۆکارێکی ئەم رەوشە نیشانبدرێت. ئەو زانستەی ببێتە دەسەڵات ئازادی خۆی لەدەستدەدات.

ئەگەر زانست وەکو پێگەیشتووترین شرۆڤەی واتا پێناسە بکەین، بەم خێراییە ئاوێتەبوونی لەگەڵ دەسەڵات یان دۆڕاندنێکی زانستە، یان ئەوەی وەک زانست پێناسەکراوە کێشەیەکی جددی واتای هەیە. خوازیارم ئەم کێشەیە بە پۆزێتیڤیزم ببەستمەوە. سەرباری ئەوەی بۆخۆی زۆر

رەخنەی کردوون بەڵام پۆزیتیڤیزم زۆر لەدواوەی ئایین و میتافیزیایە، تەنانەت ئایین و میتافیزیایەکی تێکەڵ بە ماتریالیزمی قەبایە، بەتایبەتیش ئەمە بەشێوەیەکی ئاشکرا لە ئاستی نا بەرپرسیاریتی (بەرامبەر بە شەڕ و چەوسانەوە هیچیان نەکرد. بەگرفتی خۆیانیان نەبینی. راستتر بڵێین زانستی دەسەڵات بوون) لقەکانی زانستدا دەرکەوتووە. گرنگترین ئەنجامێک کە لەمە هەڵبهێنجرێت: بەشێوەیەکی ژیانی زانست پێویستی بە سەرلەنوێ شرۆڤەکردنەوەی واتا هەیە. زانست لە رووی پارادیگماوە پێویستی بە شۆڕشێکی نوێ هەیە. وەکو پراکتیزەکردنی بەهرەی واتادان هێزی شرۆڤەی خۆم لەم کارەدا تاقیکردەوە. ئەنجامەکانیش پەیوەندییان بەم تاقیکردنەوانەوە هەیە.

٢ـ پێویستە دەسەڵات وەک نەریتێک ببینرێت، یەکێک لە نەریتە هەرە کۆنەکان. تەواوی ئەو کردەوانە نییە کە بەشێوەیەکی رۆژانە حوکمی لەدایکبوون بەسەر کۆمەڵگادا پەیڕەو دەکەن. پێویستە باشتر دەرک بەو راستییە بکرێت کە بە تەنیا دەوڵەت نییە. هەروەکو زۆرجار ئەنجامدراوە، بچووککردنەوەی دەسەڵات لە دەوڵەت و شێوەکانی دەوڵەتدا بناخەی گشت چەوتییەکانە. بەتایبەتیش یەکانگیرکردنی کردەوەکانی شەڕ لەگەڵ کرداره زەقەکانی دیکەی دەسەڵات و بەمجۆرە پێشکەشکردنیان دەبێتە هەڵپەرستانەترین روونکردنەوەی دەسەڵات. لەم کارەدا زۆرجار زاراوەی خەیاڵی 'پیاوی بەهێز و فێلباز'م بۆ ئەمە بەکارهێنا. باس لە 'دەستێکی نهێنی' دەکرێت کە بازاڕ رێکدەخات، ئەمەش شتێکی هاوشێوەیەتی. بەڵام بۆ تێگەیشتن لە بناخەی دەسەڵات لەو بڕوایەدام کە بەهایەکی فێربوون و ئەزموونبەخشی مەزنی هەیە. ئەو پەیوەندییانەی هەندێک جار دەردەکەونە مەیدان، زیاتریش لەپشتەوەی کۆمەڵگا دەسەڵات رێکدەخەن، بەڵێ ئەم پەیوەندییانە و خاوەنەکانیان بونیادنەرانی دەسەڵاتن.

دەسەڵات دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە کە هەرە زێدە لە ئامادەباشی قاڵبوونەوە و هەمیشەیی بووندایە. ئەو پیاوەی ژنیماڵیکرد لەوانەیە خاوەن یەکەمین و گەورەترین بەش بێت. کاریگەری زۆری هەبووە لەسەر ئەوەی شامانەکان هێزی واتا پاوان بکەن، ببن بەراهیب و

ناسنامەی ئایینی بەدەست بێنن و هێزی رووتی دەسەڵات پیرۆز بکرێت و وەک نهێنی لێبێت. دەشێت میتۆلۆژیای دەسەڵات و تەواوی زاراوە ئیلاهییەکان بۆ ئەم گروپە بگەڕێنینەوە. گووتەی میتۆلۆژی و ئایینی تاڕادەیەکی مەزن کاریگەری لەسەر بونیادنانی دەسەڵات و مەشروعییەت پێدانی هەیە. سیانەی "راهیب + بەڕێوەبەر + فەرماندە"ی رژێمی پلەداری پیاوسالاری ئەو گروپە بوون کە بەشێوەی هەرە فراوان زەمینەی دەسەڵاتیان لەناو کۆمەڵگادا بڵاوکردەوە. ئافرێنەری یەکەمین نەریتی تەخت دانان و سیمبۆلیزەکردنی دەسەڵاتن. زاراوەکانی ئیلاهیبوون، تەخت، شکۆداربوون، دابڕان و جیابوونەوەی خوداوەند ـ مرۆڤ، لەبەرچاو کەوتنی خوداوەندە ژن و پەیدابوونی کۆیلایەتی هێما بەهێزەکانی دەسەڵاتن کە لەو قۆناخەوە ماونەتەوە.

٢ـ دەسەڵاتی دەوڵەت، شێوەیەکی هەمیشەیی و بەرجەستەی دەسەڵاتە کە لەسەر کۆیلایەتی بەندەکان و زەمینەی ژنیماڵیکراوو پلەداری رادەوەستێت. گوزارشت لە رێکخستنی پەیوەندییەکانی دەسەڵات دەکات کە لەناو کۆمەڵگادا بەربڵاوبووە، بە بەرپرسیارێتییەکی دیاریکراویان دەگەیەنێت و بەشێوەیەکی ئابووریانە و کاریگەرتر بەکاریان دێنێت. دەسەڵات دەوڵەت لەخۆوە دەگرێت. بەڵام زۆر لە دەوڵەت زیاتر لە ناواخنی خۆی دەگرێت. دەوڵەت ئەو دەزگا پاوانخوازەیە کە لەمێژوودا هەرە زێدە زاراوەی لێ بەرهەم هاتووە و مێژوو بەخۆی دەست پێدەکات. لە دواشیکاردا گوزارشتە لە دابڕینی هێزی ئابووری زیادبووی کۆمەڵگا لە بابەتی سیاسەتی دیموکراتیانە و پاوانکردنێتی بۆخۆی وەک هێزی دەسەڵات و بەمجۆرە دەستگرتنەسەر زێدە ـ بەرهەم و بەهاکاندا. هەمووشتێکی دیکە کە پەیوەندی بەدەوڵەتەوە هەیە، میتۆلۆژی، فەلسەفە، ئایین، زانست، شەڕ و سیاسەت گرێدراوی ئەم ئامانجە بنەڕەتییەن. تەنانەت ئەگەر دەوڵەتێکی کۆمۆنیستیش بێت ئەنجامەکە ناگۆڕێت. لە رێگای دەوڵەتەوە دەسەڵات لەناو کۆمەڵگادا فەرمی دەبێت. مەشروعییەت بەدەست دێنێت.

ئەو گووتەو شەڕو کردەوانەی لای کۆمەڵگا واتادار بێت، بابەتێکن

هەرە زێدە ئەو کەس(گروپ)انە پێیەوە خەریک دەبن کە بەناوی دەوڵەت دەجوڵێنەوە. لەبواری حقوقییەوە دەوڵەت بریتییە لە یەکپارچەیی ڕێساکان. دەتوانرێت وەک دۆخی ڕێساییانەی نەریتەکە پێناسە بکرێت کە لە ڕێگای هێزەوە پاڵپشتی کراوە. لەم چوارچێوەیەدا دەتوانرێت بە کۆی پێگەیشتووترین پەیوەندییە ئەبستراکت (مجرد)ەکان ناوببرێت. هەرچەندە ناوەکانی دەوڵەتی ئایینی، دەسپۆت، پادشایەتی، ئیمپراتۆرییەت، کۆماری، گشتگیری، نەتەوەیی، چینایەتی، ئەتنیکی، حقوقی، عەلمانی، دیموکراتی ۆ کۆمەڵایەتی لەبواری شێوەو ڕووخساردا جیاوازییان هەبێت، لەناوەڕۆکدا گشتیان ڕێکخستنی دەسەڵاتە. دۆخی بەرجەستەبوونی پەیوەندییە. چەندە لەبواری کۆمەڵایەتییەوە شارەکان ئاڵۆزبن و جیابوونەوەی چینایەتییان تێدا پێشکەوێت، لە ئاواکردنی دەوڵەت و دەسەڵاتدا ڕۆڵی پێشەنگ دەبینن. بەڵام شار تەنیا بریتی نییە لە دەوڵەت و هاوتاکەی نییە.

٤ـ شارستانی گوزارشتی گشتگیری حوکمڕانی کۆمەڵایەتیانەی دەوڵەتە کە لەچوارچێوەی قاڵبوونەوەیدا لەسەر شار بەدەستی هێناوە. بەڕێوەبردنی شار لەلایەن دەوڵەتەوە یەکەمین هەنگاوی جددی شارستانییە. وشەی 'مەدەنییەت' کە هاوتاکەی تری شارستانییە خۆی لەخۆیدا لەمیانەی خەسڵەتەکانی شاری و شارنشینییەوە ئەم واتایەی ڕوون دەکاتەوە. شارستانی هەندێک تایبەتمەندێتی هەیە دەوڵەت تێپەڕدەکات. پەیوەندی بەکات و شوێنەوە بەهێزە. ژمارەیەکی زۆری ئەتنیک، قەوم، نەتەوە، ئایین، بیروباوەڕ و هزر لەخۆوە دەگرێت. دەوڵەت ناوکی شارستانییە. بەڵام هەموو شتێکی نییە. بۆ دەوڵەت شاریش شوێنە بنچینەکەی دەوڵەتە. بەڵام شار تەنیا دەوڵەت تەنانەت تەنیا دەسەڵاتیش نییە. لەشوێن و کاتی جیاوازدا شارستانییەکان دەتوانن زیادبکەن. وەک میسر، سۆمەر، پارس، گریک ـ ڕۆما، کریستیانی، ئیسلامی، هیندی، چین، ئازتەک و شارستانی ئەورووپا. ئەوەی هاوشێوەبوونی لەنێوان هەموویاندا فەراهەمکردووە شارنشینی، جیاوازی چینایەتی و دەوڵەتە. پەیوەندییەکانی ناو خودی شارستانییەکان و لەگەڵ یەکتردا گرێدراو بە ناوەڕۆکی پاوانخوازی سیاسی و ئابوورییەوە دەشێت ئاشتیخواز

یان شەڕانگێزانە بێت. کاتێک بەبەشی خۆیان رازیبن، بە دابەشکردنێکی دادوەرانەی دادەنێن، ئاشتەواییان لەنێواندا دەبێت. لەحاڵەتێکدا رازی نەبن شەڕ بووە بە ئامرازێکی بەدیهێنانی دادوەری کە هەرە زێدە شارستانی و دەوڵەت پەنایان بردۆتە بەر. پەیوەندییەکی بەهێز لەنێوان شەڕ، توندوتیژی، شارستانی و دەوڵەت لەگەڵ دادوەری - حقوقدا هەیە. لەگەوهەری خۆیدا گوزارشت لە خاوەندارێتی تاک و گروپە کۆمەڵایەتییەکان لەچالاکییەکان (ئابووری، سیاسی، ئایدیۆلۆژی)یان، یاخود خاوەندارێتیکردنی تاک و گروپی دیکە لەم چالاکیانەیان دەکات. شارستانی بریتییە لە گشتگیری پەیوەندی تەواوی ئەم نەریت، دەزگا و رێسایانە. هەندێک جاریش گرێدراو بەشێوازی پێکهاتنی چینایەتی و زێدە بەرهەمیش ناودەبرێت: وەک شارستانی کۆیلەداری، دەرەبەگایەتی و سەرمایەداری. ژنیماڵیکراو + باوکسالاری پلەدارێتی + دەوڵەت + شارستانی = ئەو راستییە فۆرمێلە دەکات کە دەسەڵات وەک پارچەیەکی چین چینکراو کۆی سەرتاپاگیری پەیوەندییەکانی هێزە.

٥- ژیار یان شارستانێتی دیموکراتی پۆلێنێکی کۆمەڵایەتییە و لە شارستانی دەوڵەتی جیاوازترە. زاراوەیەکە بە ئامانجی ناولێنانی فۆرمە کۆمەڵایەتییەکانی بەر لە سەرهەڵدانی دەوڵەت و شارستانی، یاخود ئەو پێکهاتانەی لەدەرەوەی دەوڵەتن. بەدرێژایی مێژوو دەوڵەتەکان گرنگییەکی تایبەتیان بەو حاڵەتەدا کە بەردەوام خۆیان وەک هاوتای کۆمەڵگا نیشانبدەن. گووتەی کۆمەڵگابوونێکی لەدەرەوەی دەوڵەت دەرفەتی نییە لە سەرووی بانگەشە ئایدیۆلۆژییەکانی خۆیەوە جێگیرکرد. ئەگەر بڵێین کۆمەڵگا لە دەوڵەت جیاوازترە و ناکۆکییان لەنێواندا هەیە، گووتەیەکن کە هەرە زێدە دەبنە هۆکاری پەرچەکرداری خاوەنەکانی دەوڵەت. بەڵام زۆر گرنگە ئەگەر دان بەو راستییەدا بنرێت: لە ناوەڕۆکی خۆیدا دەوڵەت پاوانێکی تەسکی داهاتە، ئەو کارانەی نەکردۆتە ئامانجی سەرەکی خۆی کە بەگشتی (کاری هاوبەشی کۆمەڵگا) ناو دەبرێت، تەنیا وەک قەڵغانێکی مەشروعییەت بۆخۆی بەکاریدێنێت.

بێگومان لەدوای قۆناخی کۆمۆنەی سەرەتاییەوە کۆمەڵگا ئاڵۆزتر

بووە و چەندین کاری کۆمەڵگا پەیدابوون کە پێویستییان بە بەڕێوەبردنی هاوبەش هەبووە. لەکاتێکدا دەوڵەت ئەم کارانە بۆخۆی دەکات بەبیانووی مەشروعییەتی خۆی هەبوونی کۆمەڵگا پەراوێز دەکات، بەڵام دیموکراسی پێشنیاز دەکات ئەم کارانە لەلایەن خودی کۆمەڵگاوە جێبەجێبکرێت، یاخود دەرفەتی جێبەجێکردنی فەراهەم دەکات. ئەم دیاردەیە لە ژێر جیاوازی نێوان شارستانی دەوڵەت و شارستانێتی دیموکراتیدا شاراوەیە. ئەم دیاردەیە گرنگییەکی ژیانی هەیە. کاتێک جڤاتەکان سەبارەت بە تەواوی کاروبارەکانی خۆیان بوون بە هێزی گووتەو کردار دەشێت باس لە دیموکراتبوونیان بکرێت. لە دۆخێکی پێچەوانەدا کاتێک زۆربەی کارە هاوبەشەکانیان لەلایەن دەوڵەت یاخود گروپی دیکەوە جێبەجێبکرێت، دووچاری لەدەستدانی بەهرە، ئازادی، یەکسانی و هۆشیاری دەبن. ئەو تاک و گروپانەی گوزارشت لە خۆیان نەکەن و نەتوانن ببن بە خاوەنی چالاکی هۆشیارنابنەوە، نابنە خاوەن بەهرەو لەناو یەکسانی و ئازادیدا ناژین. جیاوازی دیاردە رێگا لەپێش ئەم چەشنە ئەنجامە گرنگ و بایەخدارانە دەکاتەوە.

سەرەکیترین دیاردە کە پێویستە سەبارەت بە کۆمەڵگا ئاماژەی پێبکرێت سیستەمی کۆمینالی کلان و تیرە سەرەتاییەکانە کە ملیۆنان ساڵ لەناویدا ژیاون. دەتوانین سەرەتاییترین دۆخی دیموکراسی لەم سیستەمە کۆمیناڵەدا بدۆزینەوە. چۆن دەوڵەت ناوکی شارستانییە، سیستەمی کۆمۆنەی سەرەتاییش ناوکی شارستانێتی دیموکراتییە. هەر تەنها ئەم دیاردەیە رادەی بەهێزی بنکەی دیموکراتیبوون روووندەکاتەوە. مێژووی نووسراو بەردەوام باسی شارستانی دەوڵەتی دەکات. چۆنییەتی ژیانی ملیۆنان ساڵی جڤاتەکان لە سیستەمی کۆمیناڵدا و بەڕێوەبردنی کاروبارەکانیان، جێگای خۆی لەناو ئەم مێژووەدا ناگرێت. ئەمە لەکاتێکدا کە پێویستە ئەمەیان مێژووی راستەقینە بێت. چونکە ئەو ژیانە کۆمیناڵەی هەم لە بواری شوێن هەم لەبواری کات جۆری مرۆڤ بۆ ماوەیەکی درێژ و لە دەوروبەرێکی بەرفراواندا تێیدا ژیاوە، گوزارشت لە خودی کۆمەڵگا دەکات. لە بنەڕەتدا ئەمە کۆمەڵگایە. هەرچی دەوڵەت و شارستانییە زۆر

دواتر سەرهەڵدەدەن و دروستکراون. لە راستیدا وەک جۆرێک لە ئامرازی رازاندنەوەی بێواتا و بێکەڵکن کە دەستیان بەسەر کۆمەڵگادا گرتووە. ئەوانیش نەبوونایە کۆمەڵگا بەردەوامی بە گەشەی خۆیدەدا. تەنانەت بەردەوامیشی پێداوە. بەڵام مەحکومی بەردەوامبوونێکی شێوێنراو، خوێناوی و پڕ لە چەوسانەوە کراوە.

کاتێک تەماشای مێژووی نووسراوو زمانی کۆمەڵگای دەوڵەتی بکەین، دەبینین ئەوەی بەکارهێنراوە بەردەوام زمانی درۆ، فێڵبازی، ستەم و فشار بووە. دونیایەکی خەیاڵی بونیادنراوە هەروەک بڵێی ژیانێکی بێ فشارو چەوسانەوە، بێ بەندایەتی و کۆیلایەتی بۆ کۆمەڵگا مەحاڵە. لە خەیاڵەوە بەرەو واقیع هەنگاونرا، هەر لە منداڵییەوە لێشاوە سروشتییەکەی ژیان، واتە وزەی شاراوەی دیموکراسی ژیانی جڤاتەکان کۆت و بەندکراوە. ئەم رەوشە ئاسایی نییە، واتە شارستانی بەندکراو ئاسایی نییە. ئەگەر بڵێین ئەم شارستانییە بۆمبای ئەتۆمی بەکارهێنا، تەنها سێسەد ساڵ لە تەمەنی پێنج هەزار ساڵی بە ئاشتی ژیاوەو ئەوی تری هەموو هەر شەڕبووە، بەرامبەر رەوشی نالەباری ژینگە و گەیشتنی تەواوی کێشە کۆمەڵایەتییەکان بە ئاستی کانگرێن بەرپرسیارە، بانگەشەی بەهێزی بیانووی قەڵەمبازی دیموکراتییانەیە. ئەوەی سروشتی نییە گەورەبوونی شارستانی دەوڵەتی و بە گرگنی مانەوەی شارستانێتی دیموکراتییە. ئەمە ئەو ناکۆکییە سەرەکییەیە کە لەناواخنی تەواوی کۆمەڵگاکاندایە. پێشنەکەوتنی دیموکراسییانە: نەخۆشی شارستانی دەوڵەتی بێ گووتە و بێ کردارە. پێویستە دۆخی ئاسوودەیی و ئەڤینداری کۆمەڵگا بەلانی کەم هێندەی حاڵەتی ئێش، خەمباری و بێبەریبوون لە ئەشق ئاسایی ببینرێت. **شارستانێتی دیموکراتی کۆمەڵگای ئاراستەگرتنە بەرەو شارستانێتی دۆخی ئاسوودەیی و ئەشق.** ئەمە تەنیا بژارێک نییە، جیاوازی هەرە ئاسایی ژیانی ئازادە، بەگوێرەی سروشتی جۆری مرۆڤەو ژیری ئەنالیتیکی و سۆزداری تێدا کردووە بەیەک.

٦- هەروەکو مەزەندە دەکرێت سیستەمی سەرمایە بەرهەمێکی سەرمایەداری ئەم چوار سەد ساڵەی دوایی نییە، بەرهەمی شارستانی

دەوڵەتی پێنج هەزار ساڵەیە. ئەو زێدە ـ بەرهەمەی لە کشتوکاڵ دەمێنێتەوە بناخەی ماددی پێکهاتنی سەرمایەیە. ڕێکخستنی یەکەمینی لە زەمینەی پەرستگا ئەنجامدراوە. ئەو سیستەمەی نهۆمی سەرەوەی هی خوداوەندە (بەڕێوەبەری سەروو)، نهۆمی ناوین هی هێزی مەشروعییەتکار راهیبە (یاریدەدەری بەڕێوەبەری باڵا، پەیامبەری تایبەت بە جڤات و کۆیلەکان) نهۆمی خوارەوەش هی ئەو کۆیلانە بوو کە بە نانەسکی کاریان دەکرد، تا رۆژگاری ئەمڕۆمان بەردەوام زیادی کردووە، جیابۆتەوەو چەندین چینی تری لێ زیادبووەو هاتووە. لەدوا شیکاردا شارو جیاوازی چینایەتی و دەوڵەت زادەی زێدە ـ بەرهەمن. کاتێک کۆمەڵگا لەسەر بنەمای زیادبوونی زێدە ـ بەرهەم بەردەوام دووچاری دابەشبوونی کار دەبێت، دەکرێت بە پلەداری و بەهێز تەیار بکرێت، بەپێگەی بەرگری و هێرش دەگەیەنرێت: دەبێتە ئەو دیاردەیەی کە شارستانی پێدەگووترێت، ئەمەش بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا پەیوەندییەکەی لەگەڵ سەرمایە دەخاتەڕوو. هەرچەندە بە واتا بەرتەسکەکەی سەرمایە وەک ئابووری خۆی بە دۆخی زیادبوون بۆ ماوەی کورت پێناسە بکات، بە واتا گشتییەکەی لەگەڵ دۆخی زیادکردندا بۆ ماوەی درێژ هەمان مانایان هەیە. مایەی رۆژانەی بازرگانێک چەندە سەرمایەیە، زێدە ـ بەرهەمی ساڵانەی پاوانی (دەوڵەتی کشتوکاڵی) زەویش بەو ئەندازەیە دەتوانرێت بە سەرمایە پێناسە بکرێت.

مێژوو نیشانیدەدات کە سەردەمی بازرگانی لە شارستانی درێژخایەنترە (لە سەردەمی ئوروک ٤٠٠٠پ.زتا رۆژی ئەمڕۆمان) شەش هەزار ساڵە. شارستانی بازرگانی کە بەگوێرەی شارستانێتی کشتوکاڵی لە پلەی دووەمدا مابووەوە، بەپێی سەردەم و شوێن هەرچەندە ناوەبەناوە ڕێگای لەپێش شارستانی شکۆداری شار کردبێتەوە، لەلایەن کۆمەڵگاکانەوە هێندە رەواجی نەبووە. کارەکتەری خراپی بەکارهێنانی قازانج رۆڵێکی گرنگ لەمەدا دەبینێت.لە گۆشە تەنیاو راڕەوەکانی مێژووی کۆمەڵگادا جێگای زیاتریان گرتووە. بەدرێژایی چاخەکانی شارستانی بەردەوام پەرەی بە پێشکەوتنی خۆیداوە. کەرتی بازرگانی کە بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا سەرەتا لە نێوان سەدەکانی ١٣ـ١٦ لە شارەکانی ئیتاڵیا،

لەنێوان سەدەکانی ١٥-١٨ لەتەواوی شارەکانی ئەوروپا بوو بە هێزێکی هەژموونگەرایی، ڕۆڵێکی سەرەکی لە سەرهەڵدانی شارستانی ئەوروپا بینیوە. وەک چۆن بۆ پێگەی نوێنەرە نوێیەکەی کۆمەڵگا بەرزبۆتەوە، پلاتفۆرمی سیاسیشی خستۆتە ژێر کاریگەری خۆیەوە. پاوانە بازرگانی مەزنەکان و تالانکاری کۆلۆنیەکان ڕۆڵێکی دیاریکەریان لە زیادبوونی سەرمایەدا بینیوە. توانیویەتی بزاڤەکانی ڕێنسانس، ریفۆرم و ڕۆشنگەری بخاتە ژێر هەژموونی خۆیەوە.

لە ڕێگای شۆڕشی پیشەسازییەوە پیشەسازی بوو بە گۆڕەپانی سەرەکی قازانجی سەرمایەداری. کۆنترۆڵکردنی بەرهەمهێنان، هەڵسوڕان و بەکاربردن لەلایەن پاوانەکانی پیشەسازییەوە لووتکەی شارستانی ئەوروپای پێکهێناوە. ئەم ڕەوشە لەناوەوە ڕێگای لەپێش شەڕە چینایەتیەکان، لەدەرەوەش ڕێگای لەپێش شەڕەکانی ڕزگاری نیشتمانی کردۆتەوە. ئایدیۆلۆژیای هەژموونگەرایی سیستەم بەرامبەر بە سازش هەردوو بزاوتی بەرخودانی لەناوە خۆیدا بێکاریگەر کرد. کارەکتەری ئەو قەیرانانەی لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا ئێندوستریالیزم ڕێگای لەپێش کردۆتەوە لەسەرووی هەمووشیانەوە کێشەکانی شار و ژینگە، بونیادیانەیە. ئەنجامی ئەمەش سەردەمی فینانسە. ئەم قۆناخە کە تێیدا سەرمایە لە بەرهەمهێنان و پارەش لەبوون بە یەدەگی زێر دابڕاو تەواو بێ کێشە بوو، بۆ قۆناخی قەیرانی سەرتاسەری شارستانی گۆڕاوە. پۆتانسیێلی کۆمەڵایەتیانەی سەرمایە وشکی کردووە، هەوڵدەدات بەشێوەی سیستەمی وەهمی (شاشەیی) خۆی نوێ بکاتەوەو درێژە بە هەبوونی خۆی بدات. سیستەمی سەرمایە ـ قازانج کە بە دۆخی پشتبەستن بە تۆماری کاغەز گەیشتووە، لە ڕێگای قەیرانە بەردەوامەکانەوە خاڵیکردنەوەی کۆمەڵگا لە پەرچەکردار تاقیدەکاتەوە. ئەو دیاردەیەی بەسێهەمین هەڵمەتی جیهانگیری ناو دەبرێت لە ڕاستیدا سێهەمین و دواترین قۆناخی قەیرانی بونیادی شارستانییە.

هەڵسەنگاندنی خودی سەردەمی سەرمایەداریمان وەک قەیرانی کۆمەڵایەتی لەجێگای خۆیدا بینی. وەک تێزێکی سەرەکی جەختمان

لەسەر ئەوە کردەوە هەرچەندە سەرمایەداری وەک شارستانی ئابووری ناوببرێت، بەڵام ئابووری نییە، وەک پاوانی هێزێک کە لەدەرەوە خۆی دەسەپێنێت ناکرێت بە رەوا ببینرێت. هێزێکی خۆپەرست، سوودپەرستی وەک سەرمایەداری کە هەرە زێدە پەنا دەباتە بەر شەڕ، حوکمڕانیکردنی بەسەر دیاردەیەکی وەک کۆمەڵگاوە کە یەکێتی جڤاتەکانە رەوشێکی "نائاسایی"ی مێژووە، واتە تەنیا گوزارشت لە دۆخی قەیران دەکات. سەردەمی فینانس ئاشکرابوونی ئەم راستییەیە لە گشت لایەنەکانەوە، ئەمەش لەهەر پارچەیەکی کۆمەڵگادا دەکەوێتەڕوو. بەردەوام ئافراندنی تیرۆر لەلایەن سیستەمەوە، بە بێکاری هێشتنەوەی بەشی هەرە زۆری کۆمەڵگا، تەنانەت گەیاندنی کارکردنیش بەئاستی بێکاری، رێکردنەوەی لەپێش کۆمەڵگای مێگەل و ئاپۆرا: گۆڕینی هونەر، سێکس و وەرزش بۆ پیشەسازی، دزەکردنی دەسەڵات بۆ هەموو شوێنێک تەنانەت تا ناو موولوولەکانی خوێن، ئەمانە گشتیان نیشانەکانی وشکبوونی سیستەمن. کەشوهەلومەرجێکی وەها خوڵقێنراوە هەروەکو بڵێن تەواوی مێژوو و ئاییندە تەنیا لەسەر بنەمای سیستەمی سەرمایە دەتوانێت بەردەوام بێت.

رۆڵی سەرەکی ئەو کەرتەی بەمیدیا ناودەبرێت لەوەدا شاراوەیە کە کۆمەڵگای سیمیلاسیۆن و وەهمی وەک واقیع پێشکەش بکات. هەرچی ئەو کۆمەڵگایەیە کە پێویستە بونیاد بنرێت و لەناویدا بژین، بەبێ بەرهەم و خەیاڵی ناودەبرێت و بەردەوام لەدەرەوەی رۆژەڤ دەهێڵدرێتەوە. بەپێچەوانەی مەزەندەکان، هەرلەسەرەتاوە سەرمایە سیستەمێکی توندوتیژی و پاوانی هێزە کە باڵی بەسەر ئابووریدا کێشاوە، هێندەی لەدەستی هاتووە شێواندوویەتی، لەجیاتی بابەتەکانی پێویستی تەنیا وەک تەنێکی نەخۆشی قازانجی گەورە کردووەو رۆچۆتە قووڵایی گۆڕەپانەکانەوە.

٧- بەپێچەوانەی سیستەمی سەرمایەوە، ئابووری گۆڕەپانی دابینکردنی پێداویستییە ماددییەکانە. بۆ ماوەیەکی درێژخایەن مانەوەی ئابووری لەچوارچێوەی بەهای بەکارهێناندا پەیوەندی بەسیستەمی

کۆمیناڵەوە هەیە. یەکپارچەیی کۆمەڵگا لە ڕێگای پرەنسیپێکەوە بەشێوازێک بەڕێوە دەبردرێت کە ژیانی هەموو کەسێک گەرەنتی دەکات. سروشتی جۆری مرۆڤیش پێویستی بەمەیە. هیچ کاتێک بە ئامانجی قازانجکردن بیر لە بەرهەمهێنان نەکراوەتەوە. دوای دوو دڵنیەکی زۆر و درێژخایەن، وەک ئەنجامێکی دابەشبوونی کاریش کە لەناو کۆمەڵگادا لە زیادبووندابوو، ئابووری ئاڵوگۆڕکردن دێتە کایەوە. جگە لە بەهای بەکارهێنان، پەیدابوونی بەهای ئاڵوگۆڕیش بە ئامانجی قازانج نەبوو. زیادبوونی هەمەڕەنگی پێداویستییەکان و دابینکردنیان لەسەر بنەمای وابەستەیی دوولایەنە لەخۆوە دەگرێت. پەیوەندی کاڵا، بازاڕ و پارە لەسەرەتادا بە ئامانجی قازانج پێشنەخرا، بەڵکو بە ئامانجی دابینکردنی پێداویستییە هەمەڕەنگەکان و ڕەواندنەوەی ئەو وابەستەییە بوو کە بۆ ئەم پێداویستییانە هاتبووە کایەوە. ئەو دیاردەیەی بە ئابووری بازاڕ ناودەبرێت، هەروەکو مەزەندە دەکرێت ئابووری سەرمایە ـ قازانج نییە، ئەو ئابوورییەیە کە بەشێوەیەکی چڕ ئاڵوگۆڕی تێدا کەوتوتە گەڕ. بازرگانی کاتێک بەرامبەر بە هەوڵێکی دیاریکراوو بەشی هەڵسوڕان بەرامبەرەکەی (هەقەکەی) خۆی دەسکەوت دەبێتە کردەیەکی ئابووری سوودبەخش و پێویست. ئەو بازاڕەی کە نرخەکانی لەمیانەی پێشبڕکێیەکی دەرەوەی پاوانخوازی دیار دەکرێت، دەبێتە ئەو گۆڕەپانەی کە دڵی ئابووری تێیدا لێدەدات. پارە ئامرازێکە تەنیا ئاسانکاری بۆ ئاڵوگۆڕکردن دەکات. هەرجۆرە گروپێکی بە بازرگانی بچووک و خاوەن پیشەیان ناو دەبەین، بەومەرجەی پرۆسەی بازاڕ نەقۆزنەوە، فاکتەری ئابووری پێویست و بەکەڵکن. ئەو کاتە جیابوونەوەی پێویستییەکان بۆ کەرتی هەمەجۆری وەک خۆراک، پۆشاک، حەوانەوە، گەیاندن و ڕابواردن دەبنە نیشانەی پێشکەوتنی ئابووری. هەوڵەکان سەبارەت بە تەواوی ئەم کەرتانە وەک چالاکی ئابووری واتاداردەبن. تەواوی ئەم خاڵانە کە لەناو کۆمەڵگادا دەرکیان پێدەکرێت، بەهادار و ئەخلاقی دەبن.

هەرچی ئەو دیاردەیە کە لەمیانەی پەرچەکردار و ناڕەزاییەکی مەزنەوە وەڵامی دەدرێتەوە و بەدرێژایی مێژوو بە جۆرێک دەرکی

پێکراوە کە دەبوایە هێندە خراپ، ناشیرین، ستەمکار و ناهەق نەبوایە، داسەپاندنەکانی پاوانخوازییە، کە یان لە ڕێگای زۆرەملێ و توندوتیژییەوە، یان پەیڕەوە وردەکانی خەڵەتاندنەوە (برسێتی، ئیکسپایەری کاڵاکان، یاریکردن بەنرخەکان و نرخی دراو) لەدەرەوە بەسەر ئابوویدا سەپێنراوە. بەشێوەیەکی گشتی ئەم سیستەمەی ئاواکردنی پاوانخوازی بەسیستەمی سەرمایە ـ قازانج ناودەبرێت. پرەنسیپەکەی ئەوەیە: کەسانێک قازانجێکی مەزن بکەن، بەشە زۆرەکەی تریش کە دەمێنێتەوە لە سنوورەکانی بێکاری، هەژاری و برسێتیدا بێت و بەردەوام ناچاری سیستەمی سەرمایە دەکرێت. بیانووەکەشی ئەوەیە، کاتێک دەرفەتی قازانجی مەزن بدرێت پێشبڕکێ دەست پێدەکات، ئەمەش ئابووری بەرەو پێشەوە دەبات. نەبوونی هیچ پەیوەندییەکی ئەوانەی ئەمڕۆ لە لووتکەی سەردەمی فینانسدا دانیشتوون بە ئابوورییەوە (جگە لە بابەتەکانی لەجۆری بۆرسە، سوودو نرخی دراو) دەردەکەوێت کە ئەمە درۆیەکی گەورەیە. پەیوەندی بەستنی ئەمانە بە ئابوورییەوە بە واتای قەیران دێت. جگە لە قازانج هیچ شتێکی دیکە پەیوەندیدارییان ناکات.

لەسایەی لقێکی چەواشەکاری زانستەوە کە گوایە ئابووریزانی ـ سیاسی پێدەڵێن کردارە ڕاستەقینەکانی ئابووری دەخرێتە دەرەوەی ڕۆژەڤ، ڕاپێچی دەرەوەی ئابووری دەکرێن، ئەو کردەوانەی کە پەیوەندییان بە ئابوورییەوە نییە(بۆرسە، سوود، نرخی دراو)، وەک فاکتەرە ژیانی و پیرۆزەکانی ئابووری پێشکەش دەکرێن. بەناوی ئابووری باڵاوە هەوڵی هەرسکردنی دەدەن. پاوانەکانی هێز بەشێوەیەکی زۆر ڕوون و ئاشکرا ئەوەی ئابوورییە بەناوی ئابوورییەوە پێشکەشی ناکەن. ئەوەی ئابووریش نییە، تەنانەت دژی ئابوورییە لەژێر ناوی ئابووریدا وەک باڵایی و پیرۆزییەکانی ئابووری پێشکەشی دەکەن. ئەگەر بپرسین سەرەکیترین کێشەی ئابووری چییە؟ هەڵبەتە وەڵامەکەی: پێش هەمووشتێک ڕزگاربوونە لەم پاوانە تاڵانکارە. بۆ ئەوەی ببێت بە ئابووری ڕاستەقینە، دەبێت لەوە ڕزگاری بێت کە ئابووری نییە، دژی ئابوورییە و لە دەرەوە لەلایەن پاوانخوازی هێزەوە سەپێنراوە. ڕزگاربوونە لە

گەمەی سوود، بۆرسە و نرخی دراوی دەلالە (قەبلێنەرە)کان. ئابووری راستەقینە: بەشێوەیەکی تەندروستانە بەرهەمهێنان، دابەشکردن و بەکاربردنی پێداویستییە راستەقینەکانە، کە دەستکەوتنی ئاسان بێت و بە تەکنۆلۆژیایەکی دۆستی ژینگە بەرهەم بهێنرێت، یەکەمین هەنگاوی پێویست بۆ بونیادنانی ئابوورییەکی بەمجۆرە ئەنجامدانی چالاکییەکی بەپلان، بە بەرنامە و رێکخراوە بۆ رزگاربوون لەوەی ئابووری نییە.

٨ ـ یەکەم جار تیرە و هۆزەکانی کۆلۆنی و نیو ـ کۆلۆنیەکان بەرامبەر هۆڤێتی سەردەمی سەرمایەداری بەرخودانیان کرد و یاخیبوون. تیرەی هیندییە سوورەکانی ئەمریکای باکوور و شارستانی ئازتەکی ئەمریکای باشوور تا دوایی بەرخودانیان کرد. ژیار، تیرە و قەومەکانی ئاسیا و ئەفریقیاش (شارستانییەکانی چین، هیندستان و حەبەشە و هەزاران تیرە) بەردەوام درێژەیان بە بەرخودان و یاخیبوونەکانیان داوە. شێوەی هۆشیار و رێکخراوانەتر لەچوارچێوەی شەڕی رزگاری نیشتمانی سەدەی بیستەمدا، هەرچەندە کەموکوڕی و بەهەڵەداچوونیشیان هەبێت، سەرکەوتنی گرنگیان بەدەست هێنا. هەرچی لەناوەوەیە پرۆسەی بوونە پرۆلیتاریا خۆی ئاگادارکەرەوەیەکی مەزن بوو. هەروەکو مەزەندە دەکرێت بەشێوەیەکی ئازاد فرۆشتنی رەنج لەبازاڕدا، رزگاربوون نییە لەسەپانی و نیو- کۆیلایەتی: بەپێچەوانەوە مەحکومبوونە بە ستەم لێکراوترین کۆیلایەتی کە لە کرێ بەولاوە هیچ چارەیەکی دیکەی نییە. بە ئەندازەی زەحمەتییەکانی دۆزینەوەی کار، بەردەوام کەمی کرێ، کارەکتەری رژێمی ستەمکاری نوێ ئاشکرا دەکات.

تەواوی یاخیبوونە گەورەکان بەرامبەر سەرمایەداری لەپێناو ئەوەدا بووە بەدۆخی ئەم کارکەرانە نەگەن. ئەم یاخیبوونانە تێکۆشانێکە لەپێناو نەبوون بە کرێکار نەک پێچەوانەکەی. لە ئەنجامی پێناسەیەکی هەڵە گووتەی "بژی تێکۆشانی کرێکاران" هاوتای گووتەی "بژی کۆیلایەتی"یە. ئەوەی راستە و ژیانیش پشتگیری لێدەکات، بەرەنگاربوونەوەی مەحکومبوون بە کرێیە. یاخیبوونی ئەم نیو- لادێیی، نیو- خاوەن وەرشەکان کە لەخۆیەوە وەک هەرەسی بەفر گەورە دەبێت لەگەڵ مێژووی

سەرمایەداریدا بەناویەکدا چووە. لەلایەکی دیکەوە ئەو رۆشنبیرانەی لە داهاتووی سیستەمی دەرەبەگایەتی بەختەوەر نەبوون و نەیاندەتوانی پەی بەوەش ببەن کە سیستەمی نوێ چۆن شتێک دەبێت، بەردەوام لە وڵاتێکی خۆر دەگەڕان. یۆتۆپیاگەراکانی یەکەم هەرگیز مژدەی هاتنی سەرمایەدارییان نەدا. بەپێچەوانەوە، ئەگەر خەیاڵیش بێت بەرامبەر بەم دێوەزمەیە لەپێشخستنی پڕۆژەی پڕ لە ئومێد دوودڵیان نەکرد. قۆناخی پەرینەوە بۆ سەرمایەداری لە هەمان کاتدا قۆناخی تێکۆشانی سیستەمی کۆمینالی، ئازادی و یەکسانی نەوەیەکی قارەمانی بەرفراوان بوو کە یۆتۆپیاگەرا مەزنەکانی وەک سان سیمۆن[1]، کامپانێلا[2]، فۆریە[3] و ئاراسمۆس لەسەرروویانەوە دەهاتن.

بەپێشەنگایەتی کارل مارکس و فریدریک ئەنگلس بەرامبەر سەرمایەداری یەکەمین ئاڵای تێکۆشانێکی خاوەن بنەمای زانستی بەرزکرایەوە. هەرچەندە هەڵە و ناتەواوی گرنگیش لە ناواخنیدا هەبێت، ئەم بزووتنەوەیە کە لەژێر ناوی سۆسیالیزمی زانستیدا بەرامبەر سیستەم بەڕێوەچوو، بەدرێژایی سەدو پەنجا ساڵ بوو بە دێوەزمەی خەونەکانی سەرمایەداری. قارەمانێتی زۆر مەزن نیشاندرا. سەنگەری گرنگ بە دەستهێنرا. حەفتا ساڵ بوو بە ئایدیۆلۆژیای فەرمی یەکێتی سۆڤێت. کێشوەری چینی هەڵساندە سەرپێیان. بوو بەسەرچاوەی ئیلهامی بزووتنەوەکانی رزگاری نیشتمانی. بێ بەختی ئەم بزووتنەوەیەی دژی سیستەم ئەوە بوو مۆدێرنیتەی سەرمایەداری شیکار نەکرد و دابڕانێکی

---

١ ـ سان سیمۆن: ئابووریزان و کۆمەڵناسێکی فەرەنسییە، لەنێوان ساڵانی (١٧٦٠ ـ ١٨٣٥)دا ژیاوە. بەهۆی بۆچوونەکانییەوە لەسەر زانستی کۆمەڵناسی بەباوکی هزری کۆمەڵناسی دەژمێردرێت. داکۆکی لەوە کردووە کە پێویستە کۆمەڵگا بەڕیفۆرمێکدا تێپەربکرێت و بەپێی پیشەسازی سەرلەنوێ رێکبخرێتەوە. لەبەرئەوەی بانگەشەی ئەوەی کردووە کە کاتی دامەزراندنی زانستێکی کۆمەڵایەتی پشت ئەستوور بەهزری زانستی هاتووە و چاخی هزری پۆزێتیڤیستانە دەستی پێکردووە، بەیەکێک لە دامەزرێنەرانی هزری پۆزێتیڤیزمیش دەناسرێت. گرنگترین بەرهەمەکانی "سەرلەنوێ رێکخستنەوەی کۆمەڵگای ئەورووپی" و "سەبارەت بە سیستەمی پیشەسازی" و "نۆخی زانستیانەی پیشەسازیگەری".

٢ـ گیۆڤانۆ دۆمینیکۆ کامپانێلا ناسراو بە تۆماس کامپانێلا، شاعیر و نووسەر و فەیلەسوفێکی ئیتاڵییە، لەنێوان ساڵانی (١٥٠٩ـ١٥٨٨)دا ژیاوە. لە فەلسەفەدا رەوتی ئەفلاتونی گرتۆتە بەر. لە یۆتۆپیاگەراییدا بە بەرهەمە بەناوبانگەکەی بە ناوی "وڵاتی خۆر" ناسراوە. لەم بەرهەمەیدا شێوەی دەوڵەتەکەی ئەفلاتونی بە نموونە وەرگرتووە. هەموو رووبەرەکانی وڵاتی خۆرەکەی رۆشنبیرن. بەرزترین بەڕێوەبەری وڵاتەکەشی راهیبێکی فەیلەسوفە. هەموو تاکەکانی کۆمەڵگا بەشێوەیەکی سوودبەخش ئەرک دەگرنە سەرشان و موڵکایەتی تایبەت بوونی نییە و هەمووشتێک هاوبەشە.

٣ـ جێن باپتیست جۆزێف فۆریە بیرکاریزان و فیزیاگەرێکی فەرەنسییە. لەنێوان (١٧٦٨ـ ١٨٣٠)دا ژیاوە. گرنگترین بیردۆزی "بیردۆزی ئانالیتیکانەی گەرمی"یە.

رادیکاڵانەی ئەنجام نەدا. جیهانبینی زانستەکەی پۆزێتیڤیست بوو. زۆر کەم دەرکیان بە شارستانی دەوڵەتی و راستینەی بەردەوامکردنی نەریتی دەسەڵات لە شارستانی سەرمایەداریدا کرد. دیسانیش شایستەی ئەوە بوون ببن بە یەکێک لە بەردەکانی گۆشەی شارستانێتی دیموکراتی.

پێویستە هەرگیز هەڵوێستی دژە - سەرمایەداری ئەنارشیستەکان بچووک نەکرێتەوە. لەسەرووی هەموویانەوە پرۆدۆن، باکۆنین و کرۆپۆتکین شۆڕشگێڕێکی شارەزای یەکخستنی رەخنەکانیان بوون سەبارەت بەسیستەم لەگەڵ کۆمینالیزمی دیموکراتیدا. ئازادی و کۆمین لە زۆر شتدا قەرزاری ئەمانەیە. کەموکوڕی و بەهەڵەداچوونە سەرەکییەکانی ئەم بزووتنەوەش ئەوەبوو: سەرمایەدارییان تەنیا وەک سیستەمێکی ئابووری بینی، بە تەواوی ئەو شارستانی و بناخەی دەسەڵاتیان نەبینی کە پشتی خۆی پێ بەستووە، هەروەها قاڵبەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییان نەشکاند.

بزووتنەوەی رۆشنبیران - لاوان کە لەساڵی ١٩٦٨دا قەڵەمبازێکیان ئەنجامدا، گەورەترین بزاڤی پرۆتستۆکردنی هەنگاونان بوو بۆ سەردەمی فینانس. هەرچەندە لایەنی خەیاڵی لەپێش بێت، لەبەرامبەر تاریکترین و چەپەڵترین قۆناخ بوو بە مەشخەڵی ئازادی و رۆشنگەری. بزاڤە کلتووری، فێمینیستی و ژینگەپارێزەکان یەک بەدوای یەک سەریانهەڵدا لە رێگای یەکەمین رێنومایی دژە مۆدێرنیستییەکانیانەوە رێگایان لەپێش سەردەمێکی نوێ کردەوە. درزیان دروست کرد. بەبێ پشتبەستن بە دەسەڵات کرانەوەی تێکۆشانی دیموکراتی، ئازادی و یەکسانییان بەرفراوان کرد. ئەم رکابەرانەی سیستەم کە بۆ جاری یەکەم بەرامبەر سەرمایەپەرستی جیهانگیر دەنگی کۆمەڵگای جیهانگیریان بەگوێی جیهان گەیاند، دەکرێت لە رێگای رەخنەدان سەبارەت بە رابردوو، بۆ یەکەمین جار لەمیانەی چەمکێکی تیۆرتەسەلترەوە سەبارەت بە کۆمەڵگا و مێژوو بەهێزببن، تەواو لە شارستانی سەرمایەداری دابڕێن و لەگەڵ شارستانێتی دیموکراتیدا ببن بەیەک و لە رێگای ئازادی، یەکسانی و کۆمینالیزمدا بەرەو پێشەوە بچن.

٩- ئەوەی لەژێر بنکەوتنی شۆڕشگێرەکانی سەدەی ١٩-٢٠ مدا شاراوەیە، بەهەڵەدا چوونیان بوو سەبارەت بە بابەتی دەسەڵات و دەوڵەت - نەتەوە کە ئەویش دۆخە مۆدێرنە بەرجەستەکەی دەسەڵاتە. بۆ چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکان ئەڵقەی سەرەکی ئامانجیان گرتنە دەستی دەسەڵات بوو. لەبەرنامەکانیاندا دەسەڵات گرتنە دەست وەک یەکەمین ئامانج ئاماژەی پێکرابوو. تەواوی شێوەکانی تێکۆشانیان گرێدراوی ئەم ڕێنومایییە بوو. ئەمە لەکاتێکدایە کە دەسەڵات بۆخۆی بەواتای دژە دیموکراسی، نەبوونی ئازادی و دیموکراسی دێت. ئەم ئامرازە خاوەنی خەسڵەتی نەریتی باوی ئەوتۆیە، تەنانەت تەندروست و تۆکمەترین شۆڕشگێڕیش لێی نزیک بێتەوە تووشی نەخۆشی دەکات. بەڵام شیکارێکی مێژوویی - کۆمەڵناسییان سەبارەت بە بابەتی دەسەڵات نەبوو کە بە ئامرازی ڕزگارییان دانابوو. چۆنییەتی پەرەسەندنی دەسەڵات بەدرێژایی مێژوو، ئەو قۆناخانەی پێیدا تێپەڕیبوو، پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئابووری و دەوڵەت، ئەو ڕۆڵەی لەناو شارستانییەکاندا گێڕاویەتی و چۆنییەتی جێگرتنی لەناو کۆمەڵگادا تەنانەت نەخرایە ڕۆژەڤیشەوە. وەک بڵێی ئەگەر بکەوێتە دەستی شۆڕشگێران وەک "گۆچانی سیحراوی" بەر کوێ بکەوێت دەیکات بە بەهەشت. بەر کامە کێشە بکەوێت یەکسەر چارەسەری دەکات. تەنانەت شێوازی دیکتاتۆریەتیش لەوانەیە بە سەرنج ڕاکێش دەزانرا. بەرامبەر دیکتاتۆریەتی بۆرژوازی دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریایان ڕاگەیاندبوو. لەمە باشتر نەدەکەوتنە ناو تەڵەزگەوە. تێکۆشانی قارەمانانەی سەدو پەنجا ساڵ لەناو گەردەلوول و گێژاوی دەسەڵاتدا خنکا. دواتر دەرکی پێکرا ئەو ئامرازەی لەدەستیدا مابۆوە، واتە دەسەڵات میکانیزمێکی هەرە کۆنەپەرست، دژە دیموکراسی، دوور لەیەکسانی و ئازادی تایبەت بە سەرمایەدارییە. بەڵام ئیتر زۆر شت لەدەست درابوو. بوو بە نموونەیەکی دووبارەی ئەو نەخۆشەی دەسەڵات کە لە مێژووی کریستیانیدا هەبووە.

هەڵوێستیان دەرهەق بە دەوڵەت - نەتەوە بەدۆخێکی قورستری کارەسات گەیشتووە. ئەم لیڤی ئەتهانەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری کە

لە ریگای دەمارگیرترین نەتەوەپەرستی، رەگەزپەرستی، ئایینگەرایی و زانستپەرستییەوە شێلرابوو، وەک چوارچێوەیەکی بنچینەیی و راستی تێکۆشان پەسەندکرا. لەجیاتی کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی دەوڵەت ـ نەتەوەی ناوەندی وەک ئامرازێکی پێشکەوتووخوازتر و چارەسەرئامێزتر بۆ کێشەکان، راستتر وەک ئامانجێک پێشکەشکرا. دەسەلات لە ریگای گشتگیری نەتەوەپەرستی، کۆمەڵگای رەگەزپەرست، فەناتیزمی ئایینی و پۆزیتیڤیزمی زانستی سەیرترین هاوولاتی فووتێکراوی مێژووی خوڵقاند، هیچ لەبارەی دەوڵەت ـ نەتەوەوە وەک بناخەی ئەو پێکهاتەیەی پێشنەخست کە بەتەواوی کۆمەڵگا لەناو دەوڵەتدا دەتوێنێتەوەو دواجار بەرەو فاشیزمی دەبات، شیکردنەوەی پێش نەخست. ئەو ئامرازەی تا پەرژینەکانی کۆمەڵگا تەشەنەی کردبوو، کاتێک بوو بەبژاری سۆسیالیزمی زانستیش، ئیتر چارەنووسی سۆسیالیزم دیاربوو. راگەیاندنی هەڵوەشاندنە فەرمییەکەی ١٩٨٩ مەسەلەیەکی رووالەتکاری بوو. کاتێک لەسەرەتادا شۆرشی ئۆکتۆبەر ناوەرۆکی دیموکراتیانەی خۆی لە دەستدا، ئیتر دەرک بەو راستینەکرابوو ئەوەی ئاوا دەکرێت سۆسیالیزم نییە، سەرمایەدارییە. بە دەست نەهێنانی ئەنجامی چاوەروانکراو لەلایەن رزگاری نیشتمانییەوە، لە نزیکەوە گرێدراوی ئەم شێوەی دەسەلات بوو. ئامرازێک کە سەرکوتکردنی دیموکراسی و یەکسانی و ئازادی بنەماکانی بێت، چۆن ئازادی و یەکسانی لە ریگایەوە دەستەبەر دەکرێت. لەبەرئەوەی دیموکراسی وەک ئامرازێکی خاوکرنەوەی دەسەلات دەبینرا، هەر لەسەرەتاوە لە ئەژێندای دەسەلات بەدەر نرابوو.

دەوڵەت ـ نەتەوە وەک فاشیزمێکی بەرایی بە وێنەی بلدۆزەر تەواوی ئەو دەوڵەمەندێتیانەی شێلا کە بە درێژایی مێژوو کۆمەڵگا بەدەستی هێنابوو، بەمجۆرە هیواکانی داهاتووشی خستە چاڵی تاریکییەوە. ئەوەی دەمایەوە دەوڵەت ـ نەتەوەیەک بوو کە خۆی لەرێی ئایینێکی نەتەوەپەرستانەی پۆزیتیڤیستی ئۆبژە پەرستەوە دەپاراست، وەک تاکە راستی خۆی بونیادناوەو بووە بە ئیلاهی. ئەم پاوانخوازییەی هێز کە لە ئاکامی لەیەک بۆتەدا تواندنەوەی ئایدیۆلۆژیا، کۆمەڵگا، سیاسەت

و ئابووری مێژووی پێنج هەزار ساڵەی سەرمایە بەدی هاتبوو خۆی سەرچاوەی تەواوی ئەم کێشانە بوو. ئاشکرایە تا دەوڵەت ـ نەتەوە وەک زاراوە و کردار دەرباز نەکرێت، تێکۆشانی سۆسیالیزم لەخۆ فریودان بەولاوە هیچ واتایەکی دیکە نابەخشێت. تا وەک جمکەکەی دەوڵەت ـ نەتەوە ئێندوستریالیزم شیکار نەکرێت، ناتوانرێت رەوشی شێرپەنجەی شارو وێرانبوونی ژینگە بەربەست بکرێت. ئێندوستریالیزم کە وەکو ئامانجێکی شۆڕشگێڕی نیشاندەدرێت، گرنگترین شێوەی قازانجی پاوانخوازی دەوڵەتە. مەگەر تەنیا وەک سۆسیالیزمی فیرعەونی واتایەکی هەبێت. تا هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤێت، لە رۆژی ئەمرۆشماندا سۆسیالیزمی چین، وەکو قەبەترین پەیڕەوەکانی ئێندوستریالیزم، بوون بە دوو رژێم کە هەرە زێدە سیستەمی سەرمایەدارییان بەخێوکردووە. کاتێک هەردووکیان بەدۆخی وشکترین دەوڵەت ـ نەتەوە و مۆدێرنیتەی ئێندوستریالیزم گەیشتن، ئەمە سەرکەوتنێکی سەرمایەداری لیبراڵ بوو.

بەپێچەوانەوە خوێندنەوەی سیستەمێکی وەک سەردەمی فینانس کە خۆی وەک ئابووری نیشاندەدات، میتۆدێکی ئەزموونبەخشترە. واتا کاتێک دەڵێت فینانس، دەبێت وەک دەسەلاتێک لێی تێبگەین کە تا پەرژینەکانی کۆمەڵگا بلاوبۆتەوە: کاتێک دەڵێت ئابووری، وەک دەرەوەی ئابووری تەنانەت دژەکەی بیخوێنییەوە: کاتێکیش دەڵێت نیولیبرالیزم، وەک مەحافەزەکارێکی وشک دەرکی پێبکین، ئەمە بەرەو شرۆڤەیەکی راستترمان دەبات.

دەوڵەت ـ نەتەوە، ئێندوستریالیزم و پاوانخوازی فینانس نەک تەنیا مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەڵکو ئامرازی وەستاندنی هەڵوەشانەوەی پێکهاتەی شارستانی پێنج هەزار ساڵەن. تا بەسەرلەنوێ ئاواکردنێکی بگەیەنن کە هەمیشەییتریان بکات ناچارکردنی ئەلتەرناتیفەکانیان بۆ هەنگاونانی هەڵە و ناتەواو، یاخود مالیکردن و بێ کاریگەریکردنیان لەناوخۆدا وەک چەکێک بەکاردەهێنن و بەشێوەیەکی توند خۆیانی لێدەئاڵێنن.

١٠ـ بەدرێژایی مێژوو توێژە کۆمەلایەتییە هەژار و دیموکراتەکان بۆ

تێکۆشانیان سواری "ئەسپێکی ناشیاو و هەڵە" بوون. لەوبڕوایەدابوون تەنیا لە ڕێگای بەکارهێنانی هەمان چەکی دوژمنەکانیانەوە دەتوانن بەسەریاندا سەربکەون. چەکی گونجاویان بەگوێرەی پێکهاتە و کارەکتەری دیموکراتی، یەکسانیخوازی و ئازادیخوازی خۆیان پێش نەخست. ئەگەر پێشیان خستبێتیش دوای سەرکەوتن یان سەرنەکەوتنیان بە ئاسانیی دەستبەرداری بوون. چەکە پێشکەوتووەکانی ڕەقیبەکانیان لەلا باشترو ئاسانتر بووە. نەک تەنیا تەکنۆلۆژیاو ئامرازی سەربازی، بەڵکو لە ئافراندنی خوداوەندەکانەوە تا پۆشینی جلوبەرگ، لەبیناسازییەوە تاکو شێوازی بیرکردنەوە، لەشێوەی چەوساندنەوەوە تا دەگاتە وێناکردنی دەسەڵات ئەو زهنییەت و دەزگایانەی شارستانی کە پێشتر ئاواکرابوون، وەک خۆی وەریان گرتوون. یاخود لەناویاندا تواونەتەوەو وەک ئەوانیان لێهاتووە. هەڵبەتە ئەنجامی سواربوونی هەمان ئەسپی ڕەقیبەکەت و بەئامانجکردنی ئامانجەکەی ئەو هەر ئەمە دەبێت.

گەورەکانی تیرە ئاریانی و سامییەکان کە لەچوار لاوە هێرشیان دەکردە سەر شارستانی سۆمەر، یان وەکو خۆی بوون بە بەرپرسیاری دەزگاو زهنیەتی سۆمەر یان لەناویدا بوون بە کۆیلە. بەمجۆرە قارەمانێتی و داستانی هەزاران ساڵەی تیرەکان بەفیڕۆ چوو کە تاکو ئێستاش ئاوازە بە دەهۆڵ و زوڕناکانی دڵمان دێنێتە لەرزە.

زۆربەی زۆری ئەو ئابیرۆیانەی پەلاماری شارستانی میسریاندا بوون بەکۆیلە و کەمێکیشیان پلەی بیرۆکراتی کۆشکیان تێپەڕنەکرد. تیرەیەکی عیبرانی دەناسین. کە وەک میراسی شارستانی سۆمەر ـ بابل و میسر ماونەتەوە. ئەوانیش هەم بۆخۆیان، هەم بۆ جیهان بوون بە بەڵا. نە تەواو بوون بە کۆیلە، نە تەواو ئازادبوون.

تیرەکانی ئیسکیت و میدیا سێسەد ساڵ بەرامبەر ئیمپراتۆرییەتی ئاشوور بەرخودانیان کرد، هێرشیان بردە سەر. لەئەنجامدا ڕێگای ئیمپراتۆرییەتی پارس و ئورارتوویان کردەوە کە کۆپیەی ئاشوورییەکان بوون. هەندێکیان بوون بە بەرپرسیاری سەربازی، زۆربەشیان لە کۆیلایەتی ڕزگاریان نەبوو.

بەرامبەر بە شارستانی گریک ـ رۆما لە دەرەوە لێشاوو بەرخودانی تیرەکانی کلیتیک، نۆردیک، گۆتیک و هونەکان، لەناوەوەش یاخیبوونی کۆیلەکان و بەرخودانی کریستیانی کە پارتی تەواوی هەژاران بوو، بەدرێژایی پێنج سەد ساڵ بەبێ وەستان بەردەوام بوو. ئەو دەستکەوتەی بەدەست هات، کۆپیەکی لاوازی تاجی رۆما وەک ئامرازێکی رازانەوە چووە سەری پاپاو هەندێک لەسەرۆک تیرەکان. یادی ملیۆنان بەرخودانڤان کە دەرخواردی شێر دران، سووتێنران و لەخاچدران لە لێکدانەوە سەهۆڵ ئاساکانی شارستانیەتدا بە بەستەڵەکی مایەوە.

ئەوەی لەهێرش و بەرخودانەکانی حەوت سەد ساڵەی قەوم و تیرەکانی هێلین، چەرکەس، ئاشووری، ئەرمەنی، کورد، تورک و عەرەبەکان بۆ سەر شارستانی ساسانی و بێزەنتی (میراتگەرەکانیان)مایەوە وەک کۆپیەیەکی لاوازی شارستانی جاران تاجی سوڵتانێتی ملیۆنان تیرەی هەژار، کۆیلە و بەندەی ئاغاکان بوون.

بە وردەکارییەوە باسی بەسەرهاتی ئەوانەمان کرد کە بەرامبەر شارستانی ئەورووپا بەرخودانیان کردووە و یاخیبوون.

هەرچی میراسی سیستەمی کۆمۆنالیستی کۆمەڵگا شۆڕشگێڕە مەزنەکەی چاخی نیولیتیکە کە پڕ لە پیرۆزییە سەرباری ئەوەی تەواوی شارستانییەکان لێی دەخۆن و هێشتا تەواویان نەکردووە بێ وەستان دڵمان، دڵم دەگوشێت. پێویستە مێژووی ئەم هێرش و بەرخودانە سەر سوڕهێنەرانە بەمێژووی خۆمان دابنێین. واتە "**مێژووی شارستانێتی دیموکراتی**". بەڵام پێویستە ئەم مێژووە لەبیرکراو و زەوتکراوە بژار بکەین ئینجا بینووسینەوە و خاوەندارێتی بکەین. پێویستە هەرگیز ئاشقی تاجە رازاوەکانی شارستانی نەبین، خاوەندارێتی لەمێژووی خاوەن تاجە لاوازەکانی کۆیلەی کۆشکەکان نەکەین کە خیانەتیان لە رەنجی هەژارانی تەواوی تیرە، قەوم، ئەتنیک و بەرخودان، یاخیبوون، قارەمانێتی و داناییەکانیان کرد. ئەم جیاوازییە نەکرێت ناتوانرێت مێژووی شارستانێتی دیموکراتی بنووسرێت. تا ئەم مێژووەش نەنووسرێت ناتوانرێت بەشێوەیەکی سەرکەوتوانە تێکۆشانی هەنووکەیی دیموکراتی، یەکسانی

و ئازادی بەڕێوەببرێت. مێژوو ڕەگە. هەروەکو چۆن زیندەوەرێک پشت بە ڕەگی خۆی نەبەستێت ناتوانێت بەردەوامی بە هەبوونی خۆی بدات، جۆری مرۆڤیش پشت بە مێژووی کۆمەڵایەتی خۆی نەبەستێت ناتوانێت ڕێگای ژیانی ئازاد و شەرەفمەندانە هەڵبژێرێت.

شارستانی دەسەڵاتدار داکۆکی لە تێزێک دەکات کە مێژووی خۆی تاکە مێژووە و مێژووی دیکە پەسەند ناکات و بە نەبووی دادەنێت. تا دابڕان لەم چەمکە دۆگما و میتۆدی بچووککردنەوەیەی مێژوو بەدینەیەت، هۆشیاری مێژووی کۆمەڵایەتی - دیموکراتی گەشە ناکات. مەزەندەی ئەوە نەکرێت کە مێژووی شارستانێتی دیموکراتی ڕووداو، پەیوەندی و دەزگای خۆی نییە یاخود ناتەواوە. بەپێچەوانەوە ئەم مێژووە پڕ لە ماتریالی دەوڵەمەندە. بەلانی کەم هێندەی مێژووی شارستانیی (دەوڵەتی) میتۆلۆژی، ئایین، فەلسەفە، زانست، هونەر، دانا، هۆزان و نووسەری خۆی هەیە. تەنیا ئەوەی گرنگە، بزانین لە پارادیگمای خۆمانەوە سەیری بکەین، هەڵیبژێرین و جیای بکەینەوە و بینووسین! ناڵێم ناتوانین سوود لە چەک، دەزگا و زهنییەتی دوژمنان و ڕەقیبەکانمان وەربگرین. بەڵام بە ئەندازەی سوود وەرگرتنێکی کەم، زهنییەت، دەزگا و چەکەکانی خۆمان ئاوانەکەین و بە بنەمایان نەگرین، لە دۆڕاندن بەرامبەر زهنییەت، دەزگا و چەکەکانیان ڕزگارمان نابێت و وەکو ئەوانمان لێدێت.

١١- وەک ئەنجام نابێت دەرهەق بە تەواوی تێز و چارەسەرییەکانم بە داوەرییەکی وەها بگەن کە "شارستانییەکان لەگەڵ یەکدیدا ناگەنە سازش، یەکتری لەناو دەبەن و تا بەدەستهێنانی سەرکەوتن دەجەنگن". ئەم داوەریانەی کە لەچەمکی دیالیکتیکی یەکتر لەناوبەر (نفي النفي) سەرچاوە دەگرێت، هەروەک لە چەمکی فەلسەفیمدا هەوڵی ڕوونکردنەوەیم دابوو بەگوێرەی لێشاوی دیالیکتیکی گەردوونیش گونجاوی نابینم. هەڵبەتە ئەو ترۆپکانەش هەن کە یەکتری لەناودەبەن، بەڵام ئەوەی سەرەکییە گرێدانی دوولایەنە و پێشکەوتنیانە لە ڕێگای یەکتر تەواوکردنەوە. لە سروشتی کۆمەڵگادا زیاتر ئەم گەوهەرەی دیالیکتیک کارایە. ژیانی هاوبەش دۆخی سەرەکی کۆمەڵگاکانە کە یەکتری تەواوکردن و ڕێککەوتن بەبنەمادەگرێت.

بەشی هەرە زۆری مێژوو تا رۆژی ئەمڕۆمان ئەم سروشتەی کۆمەڵگاکان نیشاندەدات. ئەو شێوانەی پەیوەندی کە لەناوبەرن و جیاوازییەکان بە ئەویدیکە ناودەبات، بەشێوەی ڕێزپەڕ(شاز) بوونیان هەیە. هەروەک شازبوونی شێر لە جیهانی ئاژەڵاندا.

دەشێت شارستانی دەوڵەتی و شارستانێتی دیموکراتی بەبێ ئەوەی یەکتر لەناوببەن، سازش بکەن و بەیەکەوە بژین. یەکەمین مەرجی ئەمەش، دەبێت شارستانییەکان دان بە ناسنامەی یەکتردا بنێن و ڕێزی لێبگرن. لە ڕێگای زۆرە ملێیی یاخود پشتبەستن بە خاڵی بەهێز و لە پێشینەییەوە ناسنامەی خۆت بەسەر ئەوانەیتردا بسەپێنی ئەمە سازش نییە، ڕێبازی لەناوبردنە. ئەم پەیڕەوە ڕێگای دەسەڵات ـ شەڕە کە زۆر جار لە مێژوودا ڕووبەڕوومان بۆتەوە و لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا تا پەرژینی کۆمەڵگاکان بڵاوبۆتەوە. ئەوروپا، ئەمریکاش بەشێوەیەکی ڕێژەیی، وەک هێزی هەژموونگەرایی سیستەمی سەرمایەداری، پەندی پێویستییان لەپەیڕەوی دەسەڵات ـ شەڕ وەرگرتووە کە چوارسەد ساڵە پەیڕەو دەکرێت، لەجیاتی ئەوەی بەتەواوی بیرووخێنن (چونکە ئەم جۆرە ڕێکخستنە هۆکاری سەرەکی شەڕە ناوخۆیی و دەرەکییەکانە) بەشێوەی یەکینەی فیدراڵی هەوڵی سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی دەوڵەت ـ نەتەوە دەدەن. فاکتەری مافەکانی مرۆڤ، کۆمەڵی مەدەنی و دیموکراتیزەبوونیشی تێکەڵ دەکەن. ئاشکرایە دەخوازن شێوەی وشکی دەوڵەت ـ نەتەوەی جاران نەرم بکەنەوە، بیکەن بە ئامرازێکی دەوڵەت کە زیاتر بۆ چارەسەری لەباربێت. لە ڕوسیا و چینیش پێشکەوتنی هاوشێوە جێگای باسە. کۆریای باکوور، ئێراق، سوریا، تورکیا..و هاوشێوەکانیان کە پێداگری لەسەر وشکبوونی جاران دەکەن بەتوندی فشاریان دەکرێتە سەر. وەک عیبرەت ئێراق کرایە ئامانج. ئیتر دەخوازن بە زیانێکی کەم لەو قەیرانە دەرکەون کە بە دۆخی کائیوس گەیشتووە.

گفتوگۆ لەوبارەیەوە دەکرێت کە ئایا سیستەم ئیمپراتۆریەتێکی لەشێوەی ڕۆمایە یان نا. بەڵگەنەویستە بەڕێوەبەرایەتییەکی جیهانگیری زۆر لە ڕۆما بەکاریگەرتر جێگای باسە. هەژموونگەرایی بێت یان

ئیمپراتۆرییەت هێزی ئەم ئیرادەیە قورساییەکەی حاشا هەڵنەگرە. بەردەوام سیستەم ڕەستۆرە دەکات و هەوڵی لەسەر پێ مانەوە دەدات. ڕێکخستنی کیشوەرانەی لەجۆری یەکێتی ئەوروپا لە ئاسیا، ئەفریقیا و ئەمریکاش کەوتۆتە ڕۆژەڤەوە. پرۆژەی ڕۆژهەڵاتی ناوینی مەزنیش سەبارەت بە ڕۆژهەڵاتی ناوین پێشدەخرێت. بیر لە ریفۆرماسیۆنی نەتەوە یەکگرتووەکان دەکرێتەوە. سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی ئابووری، کلتووری و کۆمەڵایەتی بەردەوامی بەخۆیەوە دەبینێت. واتە ئەو سیستەمەی شارستانی کە لە بەرامبەرماندایە و تائێستاش لەناویدا راپێچ دەکرێین، هەرچەندە لە قەیراناویترین قۆناخی کائیوسی دوا سەردەمی خۆیدا بێت دیسان دەست بەتاڵ ناوەستێت.

ئەگەر بگووترێت ئایا کاردانەوەیەکی وەک ڕێککەوتن بوونی هەیە؟ بەبڕوای من پەیڕەوەکانی لەم لایەنە بێبەری نەکردووە. پەیڕەوێکە بەردەوام تاقیکراوەتەوە و ئەنجامیشی بەدەست هێناوە. کاتێک هۆشیاری، ڕێکخستن و دەستپێشخەری ئازادی لایەنی بەرامبەر لاواز بێت بەردەوام سیستەم لایەنی سەرکەوتووی ڕێککەوتنەکان دەبێت. بۆ نموونە لە ڕێگای ئەم پەیڕەوەوە سۆسیالیزمی بونیادنراویان بێکاریگەر کرد، لەسەرووشیانەوە یەکێتی سۆڤێت و چین. لاوازییەکانیانی بەرامبەر مۆدێرنیزم (دەوڵەت ـ نەتەوە، ئیندوستریالیزم، پۆزیتیڤیزم) بەکارهێناو بەسەرکەوتن گەیشت. بەشێوەیەکی ئاسانتر بزووتنەوەکانی رزگاری نیشتمانی و سۆسیال ـ دیموکراتەکانی تواندەوەو بێکاریگەری کردن. هەندێک بزووتنەوەی رادیکاڵ، ئەنارشیست، فیمێنیست و ژینگە پارێزیشی مارژیناڵ کرد.

سەرەڕای تەواوی ئەم نیشانانە، هێزی سیستەم هەمووشتێک نییە. لەمەش بەولاوەتر، لە لاوازترین قۆناخی خۆیدایە. ئەگەر بەرەی شارستانێتی دیموکراتی تائێستا بەگوێرەی داخواز و پێویستییەکان و ئەو ئاستەی شایستەیەتی دەسکەوت بەدەست ناهێنێت، هۆکارە سەرەکییەکەی ئەوەیە: تاکو ئێستا تەواو شۆڕشی پارادیگمایی پێویستیان ئەنجامنەداوە، بەهێزی تەواوی بەرنامە، ڕێکخستن و چالاکی

نەگەیشتوون. ئەمانە ئامانجێک نین کە نەتوانن بەدەستی بێنن یان پێی بگەن. بزووتنەوەی شارستانێتی دیموکراتی لەمیانەی خاوەندارێتی لە ناسنامە راستەقینەکەی (ئازادی، یەکسانی، دیموکراتی) و ئەنجامدانی شیکاری مێژوویی ـ کۆمەڵایەتی، دەتوانێت لە ئاستی جیهان، ناوچەو خۆجێییدا شێوەکانی رێکخستن، چالاکی و بەرنامەی خۆی ئامادەبکات. دەشێت لەئاستی جیهاندا کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی جیهان: سەبارەت بە ئاسیا، ئەفریقیا، ئەورووپا و ئوسترالیاش کۆنفیدرالی دیموکراتی هەرێمی بخرێتە رۆژەڤەوە. بەتایبەتیش سەبارەت بە رۆژهەڵاتی ناوین، لەناو هەلومەرجی پڕ لە کائیوسدا پرۆژەی کۆنفیدرالیزمی دیموکراتیانەی رۆژهەڵاتی ناوین دەبێتە خەباتێکی زۆر واتادار.

دەبێت لەو هەڵوێستە تەکتیکیانەی "یان هەموو، یان هیچ" بەبنەما دەگرێت و تارۆژی ئەمرۆمان تێی کەوتبوون دووربکەونەوە، بەواتایەکی تر تادوایی لە رێگای شۆڕش یاخود شەڕەوە، یان پێچەوانەکەی لە هەڵوێستی حەزرەتی عیسادا هەیە و دەبێت تا دوایی با هەر بە ئاشتی بێت، هەڵوێستی باون و بەرامبەر بە دیاردەی دەسەڵات سەرکەوتوو و بەکاریگەر نابن. پێویستە بەرخودان، یاخیبوون و خەباتی ئاواکردن بکرێتە شێوەیەکی ژیان، دەسپێشخەری ئازادی لە دەستدابێت. **بەمجۆرە لەکات و شوێنی خۆیدا رێکەوتن لەگەڵ تەواوی هێزەکانی سیستەمدا، پەیڕەوێکە دەسکەوتی زیاتری دەبێت و پێشکەوتنی زیاتر لەگەڵ خۆیدا دێنێت. بەڵام دەبێت دووبارەی بکەمەوە، بەمەرجێک کە بزانین شارستانێتی دیموکراتی ناسنامەمانە، دەتوانێت رێککەوتن ئەنجامبدات، بەڵام هەرگیز خۆی لەناو شارستانی دەوڵەتیدا ناتوێتەوە و ون ناکات ،هەروەها دەبێ بزانین ئاوای بکەین و بیپارێزین!**

١٢ـ خوازیارم لە رێگای ئاماژەکردن بە چەند خاڵێک دەرهەق بەشێوازی نووسینەکەم ئەنجام تەواو بکەم. کاتێک دەستم پێکرد گووتبووم کە بەکارهێنانی پۆلێنەکانی میتۆلۆژی، ئایینی، فەلسەفی و زانستییەکانی واتا لەناویەکدا وەک پەیڕەوێک تاقی دەکەمەوە. وابزانم لەم بارەیەوە تارادەیەک سەرکەوتووبووم.

ناتوانین دەستبەرداری شێوازی گێڕانەوەی میتۆلۆژی ببین. بەتایبەتی قۆناخی بەرلە مێژوو، نیولیتیک، مێژووی چاخی کۆن و شارستانێتی دیموکراتی بەشی هەرە زۆری میتۆلۆژییە. لە ئەفسانەو باس و گێڕانەوەی داناکاندا ئاماژەیان پێدەکرێت. ئەگەر لەبواری کۆمەڵناسییەوە شیکارێکی سەرکەوتوانەیان لەبارەوە بکرێت، مسۆگەر مێژوو بەهێزو هەمەڕەنگ دەکەن.

بەمەرجێک نەک وەک خۆی کە هەیە، بەڵکو جۆرێک کە بەشرۆڤەی کۆمەڵناسیدا تێپەڕبکرێت، بۆچوونی ئایینیش مسۆگەر بەڵگەی دەست لێبەرنەدراوی گێرانەوەی مێژووە. تاڕادەیەکی مەزن مێژوو لە دۆگما ئایینییەکاندا شاراوەیە. ئەمە هۆکارێکی زۆری هەیە. هەروەها پێشکەوتنە کۆمەلایەتییەکانیش زیاتر لەمیانەی شێوازی تایبەتی گێڕانەوەی ئایینەوە لەناویدا جێگایان پێدراوە. بەگرتنەبەری هەڵوێستێکی کۆمەڵناسی ـ مێژووییانە دەبنە سەرچاوەیەکی سەر سووڕهێنەری زانیاری.

ئاشکرایە کە بەبێ فەلسەفە مێژوو نانووسرێت. سەرباری ئەوەی پۆزیتیڤیزم بۆخۆی قەبەترین میتافیزکە، ئەو تێزەی کە دەڵێت تەنیا بەپاڵپشتی دیاردەکان دەتوانرێت مێژوو بنووسرێت قسەیەکی پڕوپووچە. پۆزیتیڤیزم کە بۆچوونی فەرمی و ئایینی سەرمایەدارییە، هەروەک بڵێی سەرمایەیەکی مێژوو جێگای باس نییە، ئەو هەڵوێستانەی کە وەک ئەوەیە لە ئاسمانەوە هەمووشتێک بە زەمبیل بۆ ئەوروپا هاتبێتە خوارەوە، لە راستیدا میتۆلۆژیین. کاتێک دەبن بە ئایین نوێنەرایەتی ئۆبژەپەرستی سەردەمی مۆدێرنیزم دەکەن. لەم سۆنگەیەوە بەکارهێنانی فەلسەفە بەشێوەیەکی چڕ و بەردەوام ژیانیترین سەرچاوەی گێڕانەوەی مێژوویی کۆمەلایەتییە.

ئەوەی لە رێگای هەڵوێستی زانستییەوە ئامانجم بوو شێوەی گێڕانەوەیەک نەبوو کە قورسایی بخاتە سەر سۆبژە یان ئۆبژە . ئاگاداری هاوتایی یاخود لێکچوونی هەست و دیاردەم. لەبەرئەوەی تەواوی سەرچاوە ئاماژەپێکراوەکانم لەناویەکتردا بەکارهێناوە دەشێت پەیڕەوە زانستییەکەم وەک "راڤەکاری" هەڵسەنگێنرێت. لەشێوازی

شیکارکردنەکەمدا زۆر باش دەرکی پێدەکرێت کە قورسایی زۆرم بە ئۆبژەگەرێتی نەدا و بەپێویستم نەبینی. کەسانی شارەزا لە بابەتەکەدا زۆر بە ئاسانی هەستی پێدەکەن کە زۆر بەرەو سۆبژەگەرێتیش نەخزاوم.
بەبێ ئەوەی نکوڵی لەجیاوازی نێوان سۆبژە ـ ئۆبژە بکەم بەردەوام بۆ تێپەڕکردنی، هەوڵی پێشخستنی هێزی شرۆڤەم داوە، ئومێدەوارم لە ناتەواوی و کەموکوڕییە قەباکان بمبوورن. ئەگەر سەبارەت بە کۆمەڵگا هێزم بەهێزی واتای هەرکەسێک بەخشی بێت خۆم بەختەوەر دەبینم.

## فەرهەنگۆک

| | |
|---|---|
| ئاکتیف | کارا، چالاک |
| ئانترۆپۆلۆژی | مرۆڤناسی |
| ئانسترومان | ئامێری مۆسیقی |
| ئانیمیزم | رۆحگەرایی |
| ئەوەنتاژ | شیاوی، خاڵی بەهێز |
| ئایدیالیزم | نموونەگەرایی، (مثالیة) |
| ئەبستراکت | نابەرجەستە (مجرد) |
| ئەبستمۆلۆژی | زانیناسی |
| ئەتیمۆلۆژی | وشەناسی |
| ئەتنۆلۆژی | نەژادناسی |
| ئەدرەس | ناونیشان |
| ئەزبەرە | دەرخکراو، لەبەرکراو |
| ئەرستۆکراسی | خانەدانی، بەڕێوەبەرایەتی کەسانی دەوڵەمەند و زووردین |
| ئەسترۆنۆمی | ئەستێرە ناسی، گەردوون ناسی |
| ئەڵتەرناتیف | (بدیل) |
| ئەماتۆر | نا شارەزا، نا وەستا |
| ئەنالیز | لێکدانەوە، شیکردنەوە |
| ئیندوستریالیزم | پیشەسازیبوون، پیشەسازی خوازی، پیشەسازی پەرستی |
| ئەیالەت | هەرێم |
| ئۆپۆرتۆنیزم | هەل پەرستی |
| ئۆپۆزسیۆن | رکابەر، (معارضة) |
| ئۆرجین | رەسەن |
| ئۆرگانی | سروشتی |
| ئۆرگانیزاسیۆن | رێکخراو، رێکخستن |
| ئۆنتۆلۆژی | بوونخوازی |
| ئیکۆنۆمی | ئابووری |
| ئیکۆنۆمیزم | ئابووری خوازی، ئابووری پەرستی |

| | |
|---|---|
| ئیکۆلۆژی | سروشت پارێزی، ژینگە پارێزی |
| بایۆلۆژی | زیندەوەرزانی |
| بەرخودان | (مقاومة) |
| جڤات | کومەل، مۆلبوون |
| تابلێت | تاتە قوڕینەکان کە نووسینیان لەسەر کراوە |
| تاک خودایی | یەکتاپەرستی |
| تەرز | شێواز، (اسلوب) |
| تراژیدیا | مەرگەسات |
| تیۆلۆژی | خوداناسی، (الاهیات) |
| پارادیگما | پارادایم، جیهان بینی |
| پارۆمەترە | پێوەر، پێوان |
| پاسیف | نا کارا، نا چالاک |
| پانتەییزم | یەککگرتنی سروشت و خودا |
| پەرجوو | (معجزة) |
| پەسن | ستایش، مەتح، وەسف |
| پراکتیزە کردن | پێکهێنان، جێبەجێ کردن |
| پرەنسیپ | (مبدأ) |
| پرۆتۆکۆل | ڕێکەوتن نامە |
| پروفیشنال | وەستا، شارەزا |
| پۆتانسیل | ماتە ووزە، وزەی شاراوە |
| پۆزەتیف | ئەرێنی |
| پۆزیسیۆن | دۆخ، پێگە |
| چالاکوان | هەڵسوڕاو |
| جیۆلۆجی | زەوی ناسی |
| دەستاوێز | سەنەد، بەڵگە |
| دەسپۆت | سەرەڕۆ، ستەمکار |
| دەستپێک | سەرەتا |
| دۆگماتیک | قالبگیری، بیروشکی |
| دووالیزم | دوانەیی، دووانەگەرایی |
| دیماگۆجیەت | قسەی بێ کردار، چەنەبازی |

| | |
|---|---|
| دیموگرافی | باری نیشەجێیی، جوگرافیای کلتووری |
| ژەرەنتۆکراسی | پیرسالاری |
| راچەتە | ئەو پسولەیەی پزیشک دەیدا بە نەخۆش و لەسەری دەرمانی بۆ دەنووسێت. |
| رادیکاڵ | توندڕەو |
| راسیۆنال | عەقڵانی |
| رەستورە | پینەکردن، سواقدان(تعمیر) |
| رەمەک | (غریزة) |
| رەنوو | هەرەس |
| رەوان ناسی | دەروون ناسی |
| ریسک | مەترسی |
| ریفلێکس | کاردانەوە، پەرچەکردار |
| زایەند | سێکس |
| زیرەڤان | پاسەوان،(حارس) |
| زراڤ | ورد، باریک |
| سەنترالیزم | ناوەندگەرایی، (مرکزیة) |
| ستادیۆم | یاریگای گەورە |
| سۆزانی | لەشفرۆش |
| سۆسیۆبایۆلۆژی | زیندەوەرزانی کۆمەڵناسانە |
| سۆسیۆسایکۆلۆژی | دەروون ناسی کۆمەلایەتی |
| سۆسیۆلۆژی | کۆمەڵناسی |
| سیمولاسیۆن | بەیەک چواندن، چۆنیەکسازی |
| شارستانی | (المدنیة) |
| شارستانیتی | ژیار، (الحضارة) |
| فۆرماسیۆن | پێکهاتن، شێوە گرتن |
| فیزیۆلۆژی | جەستەیی، لایەنە فیزیاییەکانی جەستەی مرۆڤ |
| فیلۆلۆژی | زمان ناسی |
| فینانس | پارەدارکردن، (تمویل) |
| قەپلاندن | سپێکلاسیۆن |
| کائوس | کائیوس، گێژاو، (دوامة) |
| کاتاگۆری | پۆلی ئەو شتانەی پۆلێن کراون (کاتاگۆریزەکراو: پۆلێن کراو) |
| کاست | چینی جێگیر و دیار |
| کارەکتەر | تایبەتمەندی، خەسڵەت، کەسایەتی |

| | |
|---|---|
| کریستیان | مەسیحیەت |
| کۆلۆنی | داگیرکاری |
| کۆمیدی | بەزمەسات |
| کۆمپلێکس | گرێی دەروونی |
| کوالیتی | چۆنیتی، (نوعیة) |
| کرکن | بستەبالا، (قزم) |
| گلۆبال | جیهانگیری |
| ماجەرا | (مغامرة) |
| مارژینال | سنووردارکراو و دوورخراوە لە ئامانج |
| ماکرۆ | گەورە،درشت |
| مەترەپۆل | شارە گەورەکان |
| مەتن | دەق، نووسراو |
| مەنگەنە | پێچ، گیرە |
| مۆنۆپۆل | پاوان |
| مۆدێرنیتە | (الحداثة) |
| میتۆلۆژیا | ئەفسانەناسی، ئەفسانە |
| میکرۆ | بچووک، ورد |
| میللیگەرایی | نەتەوە پەرستی |
| نێچیرڤانی | راوچێتی |
| نێگەتیف | نەرێنی |
| نهێلیست | نکۆلیکار، پوچگەرا، هیچگەرا |
| هەیمەنە | هەژموون هەیمەنە |
| هۆڤ | درندە، کێوی |
| وەعزدان | ئامۆژگاریکردن، فتوادان |
| یادگا | یادەوەری، (ذاکرە) |
| یۆتۆپیا | خەیال |
| یونیتار | ناوەندی، یەکگرتوو |



ئەم منداڵە
بچکۆلەیەی خوداوەند کە بەنهێنی
لە ڕاڕەوەکانی مێژوودا گەورەبوو،
درەوشایەوە و بوو بەپارە، لەسەردەمی
سەرمایەداریدا لەناو کۆمەڵگا ئاشکرا بوو و هاتە
مەیدانەوە. بەجۆرێک خۆی شیرین کرد و پەسەندکرا،
تەواوی خوداوەندەکانی چاخەکانی پێشووتر لەناوچوون.
پادشاکان لەسەر زەوی بەکێش کران. لە کەللەیان درا.
خوێناویترین سەردەمی بەسەر مرۆڤایەتیدا سەپاند،
تا مۆخی ئێسقان چەوسانەوەی بەڕێوەبرد. ژێر
زەمین و سەرزەمینی پیسکرد، تێکەڵی کرد.
لەراستیدا مرۆڤ و زیندەوەرەکانی
دیکەی قڕکرد.